# الوجيز



# فى أصول الفقه

## بەكوردى

دانانى:
دكتۆر عەبدولكەريم زەيدان

عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوايى
كردويەتى بەكوردى

بەرگى يەكەم

# الوجيز

# في أصول الفقه

## به كوردی

دانانی

دكتۆر عه‌بدولكه‌ريم زه‌يدان

(ڕه‌حمه‌تی خوای لیٚ بیٚت)

عه‌بدوڵڵا مه‌لا ئه‌حمه‌د، ئه‌حمه‌دئاوایی

كردوويه‌تی به‌ كوردی

دووه‌م چاپ

١٤٣٨ - ٢٠١٧

## پێناسی کتێب

*ناوی کتێب: الوجيز فِي أُصوُل الفقه، به کوردی.
* دانانی: دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان
* وەرگێڕانی: عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی
*پەیوەندیکردن: shexnami@yahoo.com
* هەڵەچن: ئەندازیار مەلا ڕاستگۆ گەچێنەیی.
* نۆرەی چاپ: چاپی دووەم
*بڵاوکردنەوەی: کتێبخانەی بێخود – سەییدسادق، ﴿٠٧٥٠١٢٤٦٨١٨﴾.
*ساڵی چاپ: ١٤٣٨ – ٢٠١٧

**ژمارەی سپاردنی ( ١٢٣٧ )ـی، ساڵی (٢٠١٣ )ـی، پێدراوە.**

# ﴿قسەی وەرگێڕ﴾

«بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ»

**إنَّ الحَمدَ لِلّهِ نَحْمَدُهُ وَ نَستَعينُهُ وَنَستَغفِرُهُ، وَ نَعُوذُ باللهِ مِنْ شُرُورِ أنْفُسِنا وَ مِنْ سَيِّئاتِ أعمالِنا، مَنْ يَهْدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ لَهُ، وَمَنْ يُضْلِلْ فَلا هادِيَ لَهُ، وَ أشْهَدُ أنْ لا إلهَ إلا اللهُ وَحْدَهُ لا شَرِيكَ لَهُ، وَ اشْهَدُ أنَّ مُحَمَّداً عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ.**

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾ آل عمران: ١٠٢

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِي خَلَقَكُم مِّن نَّفْسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِي تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلْأَرْحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾ النساء: ١

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوْلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصْلِحْ لَكُمْ أَعْمَٰلَكُمْ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ فَازَ فَوْزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾ الأحزاب: ٧٠- ٧١

**أمّا بعد: فإن أصدق الحديث كتاب الله وخير الهدي هدي محمد ﷺ وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة وكل بدعة ضلالة وكل ضلالة في النار.**

**پاشان: جەنابی دکتۆر مستەفا زەڵمی، لە پێشەکی چاپی پێنجەمی کتێبەکەیدا، ﴿أُصول الفقهِ الاسلامي، فِي نسيجِهِ الجَديد﴾، زۆر جوانە، کە فەرموویەتی: " شتێکی حاشا هەڵنەگرە، بۆ هەرکەسێ کە دەس و پەنجەی لە گەڵ دەقە شەرعییەکاندا نەرم کردووە، و دەیەوێت گەوهەری زانست لە قوڵایی ئەو دەقانەدا هەڵبهێنجێت، پێویستە لە چوار زانستدا زۆر شارەزا بێت، کە یەکێکیان (زانستی ئوصوڵی فیقه)ـە، و پاشانیش بەردەوامی دەدات، بە گوفتارەکەی و دەڵێت، پێشەوا غەزالی فەرموویەتی، (مَنْ لا مَعْرِفَةَ لَهُ بالمَنطق، لا ثِقَةَ بِعِلْمِهِ!)، بەلام دکتۆر دەڵێت، من گوتومە: (مَنْ لا مَعْرِفَةَ لَهُ بأُصول الفِقهِ، لا ثِقَةَ بِعِلْمِهِ!)، خودای مەزن سەرفرازی بکات، بۆ جوانی ئەم فەرمایشتە بە پێزەی، بە ڕاستی هەرکەس سەرنجێکی وردی ئەم زانستەی نەدابێت، نازانێت، ئەم فەرمایشتەی چەندە لە جێگای خۆیدایە !**

**جا ئەمڕۆ کە سەدان لێکۆڵینەوە، و ماستەرنامە، و دکتۆرا، تایبەت لەم بوارەدا**

دەنووسرێت، ئاستی نرخ و بایەخ و مەزنی ئەم زانستە پیرۆزە دەردەخات.

ئەگەر چی زانایانی کوردیش، بە زمانی عەرەبی لەم بوارەدا زۆر داهێنەر، و بە توانا بوون، هەر لە (إبن الحاجب)، تا (ئامێدی)، و( مەلا موحەممەدی جەلی زادەی کۆیی)، و دەیانی تر، کە بە بەرگی کوردی، بەڵام بە زمانی عەرەبی، ڕێگا تاریك و تەسکەکانی ئەم زانستەیان بۆ تامەزرۆیانی زانست لە جیهانی ئیسلامیدا ڕووناك کردۆتەوە، و سوپاس بۆ خوا ئێستاش وورده وورده بە زمانی کوردی، خەریکە وەرگێڕان، و شەرح، و لێکدانەوە، و نووسین، دەکەوێتە کتێبخانەی کوردییەوە، و تامەزرۆیانی زانستی لە کوردستاندا پێی بەهرەمەند دەبێت.

بۆیە منیش لە بەر ڕۆشنایی ئەو گرنگییەی ئەم زانستەدا، و وەك خزمەتێك بە قوتابیانی زانستی شەرعی لە کوردستاندا، بە بیرمدا هات، کە لەم بوارەدا، پەرچڤەی ﴿الوجيز فِي أُصول الفقه﴾، پێشکەش بکەم، کە پەڕاوێکی ناسراوە، لە مەڵبەندە زانکۆیی، و ئەکادیمییەکاندا، بە هیوای ئەوەی کە جێی خۆی بگرێت، و خوای گەورە فەقیّ، و قوتابیانی زانستی شەرعیی پیّ بەهرەمەند بکات.

لە وەرگێڕانەکەدا، زیاتر پشتم بە پەرچڤەی گشتی و ماناداان بە دەستەوە بەستووە، و خۆم لە تەرجەمەی حەرفی پاراستووە، و لە بە کوردی کردنی ئایەتەکاندا، (تەفسیری ڕامان)ـی، (مامۆستا مەلا ئەحمەد کاکە مەحموود)ـم، بە کارهێناوە، "ڕەحمەتی خوای لیّ بێت".

ئومێدەوارم خودای پەروەردگار، بە هۆی ئەم پەڕاوەوە فەقیّ، و خوێندکاران، و تامەزرۆیانی زانستی شەرعیی کوَرد، لە هەر جێگایەك هەن، پێی سوودمەند بکات، منیش لە دووعای خێر بێبەش نەکەن، و ئەوەی من نووسیومە، ئەگەر پێکابێتم، لە خودای مەزنەوەیە، و ئەگەر هەڵەشم کردبێت، لە خۆمەوەیە، و ئومێدەوارم هەڵەکان لە خزمەت مامۆستایاندا ئیصلاح بکەن، و ئیتر هەر بە تەمای دووعای خێر .....

## «بِسْمِ اللّٰهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ»

## ( نــرخاندن و دەستخۆشی )

**(بە پێنووسی عەللامە مامۆستا نوری فارس حەمەخان)** [1]

زانستی ئوصولــی فیقهــ، یەکێکە لـە زانستە بە نرخە هەرە گرنگە شــەرعییەکان، فەقیهـــ و شەرعزان بە بێ ئەم زانستە نابێ بە شەرعزان و فەقیهی تەواو، و هۆی ئەم پاشا گەردانییەی کە ئێستا لـە بابەت شـەرع و فیقهەوە سـەری هەڵداوە، لـە سەرانسەری جیهاندا، دەگەڕێتــەوە بۆ دوورکەوتنەوەی (خۆ بـــە موفتیکردووەکان) لـەم زانستە، کـە بنـەما و سەرچـاوەیە بـۆ تێگەیشتنی تەواو لـە (قورئان) و (سوننەت).

جا لـەبەر گرنگی و بایەخی ئەم زانستە، زۆربەی زانا گەورەکان بایەخ و گرنگیی تەواویان بەم زانستە پڕ پیت‌و فەڕ و بەرەکەتە داوە، و بەرهەمی گەورە و بـە نرخیـان نووسـیوە، وەك (موختەصەری ئیبــن حاجیب)، (الـمُستَصفی)ــی، ئیمـامی غەزالــی، (جَمْعُ الــجَوامِع) و حاشیە و شەرحەکانی، و بە زۆر زمـانی زینـدوو تەرجەمـە و شــەرح و ڕاڤـەکراون و شــی کراونەتەوە و بوون بە مایەی پیت‌و فەڕ و پیـرۆزی بۆ نەتەوەی ئیسلام!

وە لـەبەر ئەوەی لـەم ڕۆژگارەدا، خوێندنی ئایینی پێویستی بە بەرنامەی نوێ و گەشەکردن و ئاسـانکاری هەیە، و ژیان ئەوەندە لق و پۆپ‌و چڵی بە هەر چوار لادا لێ بۆتەوە، مامۆستا ئایینیە مەزنە دڵسۆزەکانی ئایــن و ژیان و نیشتیمان‌و هاونیشتیمانانی خۆیان، بـە پەرۆشــەوە هەوڵ و کۆششی زۆریان داوە، کە پەرە و گەشە بەم زانستەیـــە بدەن، کە فەرزی کیفایەیە.

جا لـەم ڕووەوە مامۆستای فرە زانا، و خواناسی گەورە و ئوصولزانی شـارەزا، مامۆسـتای زانا (عەبدولکەریم زەیدان) کتێبێکی جوانی داناوە، بە ناونیشانی (الوَجيز فِي أُصوُل الفِقه)، و لـە هەموو ڕوویەکەوە زەمینەی زۆر جوانی بۆ ڕەخساندووە، و ئەوەی کـە پێویـست بـێ بـۆ تێگەیشتنی تـەواو لــەم عیلمــە شـاعیلمە ڕەچـاوی کـردووە، و بــە ڕاسـتی ئـەم کتێبـە بـۆ

---

[1] زانای مەزن، مامۆستا نوری فارس حەمەخان ناسراوە بە (وەرگێڕە کوردەکـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ، و وەرگێڕی (ریـاض الـصالِحیـن)، و (موختەصــەری صـەحیحی بوخـاری)، و (موختەصــەری صەحیحی موسلیم)، و (التاج الـجامِع لِلأُصـوُل)، و (بلـوُغ الـمَرام)، و (اللؤلـؤ و الـمَرجان)، و هەزاران فەرموودەی پێغەمبەرە (ﷺ) بۆ سەر زمانی کوردی، و خۆیشی زۆر جوانی فەرمووە:

نووری تا ماوە مەمنونی خوایە      کە تەرجومانی ڕەسولوڵلایــە!

فێرخوازانی ئەم سەردەمە، باشترین سەرچاوەیە بۆ فێربوونی (عیلمی ئوصولی فیقهـ)، چونکە:

**یەکەم:** بە زمانێکی ڕەوانی ئاسان دارێژراوە.

**دووەم:** بەرەکەتی هەناسەی پیرۆزی دانەرەکەی وەك باوەشێکی فێنك، چاو و دڵ و دەروونی خوێنەری فێنكو ڕۆشنو ڕووناك دەکاتەوە، ووشە بە ووشە و ڕستە بە ڕستە، دەڵێی مامۆستای زەیدان ـ ڕەحمەتی خوای لیٚ بێ ـ دەچپێنیٚ بە گوێچکەی خوێنەردا، کە واتاو مەعنای ئاواو ئاوایە! جا سوپاس بۆ خودا، لە کوردستانی لانەی ئاینو ژیانو مسوڵمانەتیو کوردایەتیو مەردایەتیو زانست پەروەردا، کۆمەڵیٚ لاوی خوێنگەرم، زیرەكو ڕۆشنبیرو بیر ڕووناكو زاناو دانا، بە پێی پێویست، چاکی مەردیان لیٚ هەڵکردووە، و لە هەموو بوارە باشەکاندا بە قەڵەمە نوورانییەکانیان شاکاری جوان دەرازێننەوە، و پێشکەشی دەکەن بە جەماوەری سەربەرزی خواپەرستو ئیسلامدۆستی کوردستان.

**جا لەم خاڵەوە، لاوی خامە ڕەنگین:** (مامۆستا عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی)، هەڵساوە بە تەرجەمەی ئەم شاکارە جوانە، شاکاری (الوَجیز فِي أُصوُل الفِقه)، و سوپاس بۆ خودا لە زۆر ڕووەوە، گەلیٚ سەرکەوتووە، و تەوفیقی خودای لەگەڵە، لە ڕاستیدا بۆ ئوصولخوێنی کورد، ئەم وەجیزە کوردییە، دەبیٚ بە هۆکارێکی کاریگەر بۆ تێگەیشتنی تەواو، لەم زانستە پیرۆزە، کە زانینیو فێربوونیو بەخششی گەورەترین عیبادەتو پەرستشە، خوا بە ڕەحمەتی خۆی بەشی باشمانی تیٚ بخات، ئامین.

بەندەی خادیمی زانایانو مەشایخو هەژاران، زۆر ئەم وەرگێڕانەم بە دڵە، و دەستخۆشی لە (م. عەبدوڵڵا) دەکەم، و لە خودای گەورە و مەزن داوا دەکەم، کە نموونەی (مامۆستای زەیدان) و (مامۆستا عەبدوڵڵا) زۆر بیٚ لە وولاتا، و دەنگی زوڕنای زوڕناژەنەکانی شەیتان لە هەموو لایێ کپ بیٚ، وە بە دڵێکی پڕ لە پەژارە و ئێش و ئازارەوە، لە خوای خۆم دەلاڵێمەوە و دەڵێم:

**يا مَنْ تَرى النِّمالَ فِي جُحوُرِها الدُّجى كَما**
**تَرى الشّموُسَ وَالنّجوُمَ الزُّهْرَ فِي جَوِّ السَّما**
**يا مَنْ لِأَجْلِ ناقَةٍ دَمَّرْتَ قَوْماً كامِلاً**
**أَلا تَرى الأَذي الّذي قَدْ عَمَّ (شامِي) شامِلاً**

أَلَيسَ فيهِم مُؤْمِنٌ كُلِّفَ فَوْقَ الطّاقَةِ
أوْ طِفْلَةٌ يَتيمَةٌ بَريئَةٌ كَالنّاقَةِ
يا أرْحَماً مِنْ كُلِّ راحِمينَ رُحْماكَ المُنى
لِكُلِّ مَظلومٍ، وَ قَهرك المَنى لِمَن جَنىَ

کورت و پوخت بە کوردی پەتی، لە پەسنی ئەم پەڕاوەدا ئەم شیعرە بەسیەتی:

لَخَيْرُ ما يُهْدى إلى عَبْدٍ وَفِي     لِرَبِّه، نَظيرُ ذَا المُصَنَّفِ

**باسێکی تر**: فەقێ بووم لە مزگەوتی شێخ مەحموودی قەرەچێواری، عەبدوڵلا یەزدیم دەخوێند، هەموو ڕۆژێ دەچووم بۆ لای مامۆستا مەلا غەفوری حاجی ئەحمەدی کانی سپیکەیی، لە مزگەوتی بن طەبەق، کە ئەو لەوێ فەقێ بوو، لە لای مامۆستا مەلا مستەفای زەڵمی، کە ئیمامی مزگەوتەکە بوو، دەرسەکەمان دەخوێند، موستەعیدێکی تری لێ بوو، زۆر فەقێیەکی بە ویقار و سەلار و سەنگین بوو، زۆر نەدم بوو، زۆر ثیقەی بە خۆی هەبوو، لە گەڵ مامۆستا مەلا غەفوردا زۆر بەینیان خۆش بوو، چونکە هەردووکیان مەیلی تەصەوفیان هەبوو، مامۆستا مەلا غەفور زۆر لێی ڕازی بوو، دەیگوت: (ئەمە مەلا ئەحمەدە[1]، جاربەجارێ کە قسەیەکی نهێنییان هەبێ لە گەڵ مامۆستا مەلا مستەفای زەڵمیدا بە هەورامی قسە دەکەن، مامۆستا مەلا ئەحمەد بە تەمەن لە ئێمە گەورەتر بوو، ئێمە بە چاوی برای گەورەی خۆمان تەماشامان دەکرد، ئەو کاتە وا دەزانم، یان (لُبُّ الأُصُوْل) یان (جَمعُ الجَوامِع)ی، دەخوێند، چونکە زۆر جار گلەیی لە مامۆستا مەلا مستەفای زەڵمی هەبوو، کە بۆ ئەوەندە خۆی بە خەڵکی گەڕەکەوە ماندوو دەکا، بە تایبەتی لە پرسی شەرعدا، دەڵێی:"دەرسی ئوصولی فیقهیان بۆ ڕوون دەکاتەوە ! ".

هەموو جارێ مامۆستا مەلا غەفور دەیفەرموو:(ئەم مەلا ئەحمەدە، ئەهلییەتێکی عیلمیی باشی هەیە، ئەگەر بواری بۆ بسازێ و مەدرەسەی هەبێ، مەلایەکی گەورەی چاکی لێ دەردەچێ! !)، زۆری نەخایاند، کە مامۆستا مەلا مستەفای زەڵمی بوو بە ئیمامی عەسکەری، و مامۆستا مەلا ئەحمەدیش چوو بۆ لای مامۆستا مەلا مارفی خاوێیی، و لای ئەو ئیجازەی وەرگرت، یادی بە خێر!

---

[1] . واتە: مامۆستا مەلا ئەحمەدی ئەحمەدئاوا، باوکی ئەم مەلا عەبدوڵلایەی وەرگێڕی ئەم پەڕتووکە.

**مەبەستێكی تر**: بەڕێز كاك مەلا عەبدوڵڵای مامۆستا مەلا ئەحمەدی – ئەحمەدئاوایی، جەنابی مامۆستای پایەبەرز و هێژا مامۆستا شێخ جەلال شێخ عەبدوڵڵا دەمەیەوی ئیجازەی عیلمیی – مەلایەتی بۆ نووسیوە، كە جاران و بگرە ئێستایش بەڵگەی زانایی و شارەزایی ئیجازە پێدراوەكەیە لە هەموو عیلمە شەرعییەكاندا، وەك علومی تەفسیر و حەدیث و فیقهـ و علومی ئالە، وە بەندەی هەژار شایەتی دەدەم كە هەم مامۆستای موجیز و هەم مامۆستای موجاز شایانی ئەم بەخشینی ئیجازە و وەرگرتنی ئیجازەیەن، و تەئییدی ئیجازە نامەكەیشیم كردووە و خۆیشم ئیجازەیەكی تایبەتی خۆمم بۆ نووسیوە، و داوا لە كاك مەلا عەبدوڵڵا دەكەم، كە جێگەی ئومێدی هەموومان بێ، و قەڵەمە كاراكەی لە خزمەتی ئیسلام و پەخشی نووری قورئان، درێغی نەكات، و لە خوا داوا دەكەم كە هەمیشە كاك مەلا عەبدوڵڵا سەركەوتووی دین و دونیا بێت، و بۆ ئێمەیش و بۆ خۆیشی و بۆ هەموو دۆست و برادەران مایەی دۆعای خێر بێت. ئامین.

**دۆعا گۆتان**

**نوری فارس حەمەخان حەسەن**

**خادِمُ العُلَمَاءِ وَ الـمَشَايِخِ وَالفُقَرَاءِ**

**٢٨ / ١٠ / ٢٠١٦**

**سلێمانی – گەڕەكی مامۆستایان**

# ژیاننامەی عەللامە دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان
## (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)

دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان بەهیج ئەلعانیی، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، لە ساڵی (١٩١٧)، لە شاری (بەغداد)ی، پایتەختی عێراق، لە دایک بووە، و یەکێك بووە، لە زانایانی ئەهلی سوننە لە عێراق، و ئەمینداری پێشووی کۆمەڵەی (أخوانُ المُسلمِین)بووە، هەر لە عێراق، و بەڵام دواتر وازی لە حزبایەتی هێناوە، و خۆی بۆ خزمەت کردنی زانستە ئیسلامییەکان یەکلایی کردۆتەوە، و هەروەها یەکێك بووە، لە زانا زۆر شارەزاکانی زانستی ئوصولی فیقهی ئیسلامیی، و شەریعەتی ئیسلامیی، و سەردەمی نەشونماکردن، و گەورە بوون و خوێندنی هەر لە شاری (بەغداد)ی، پایتەختی عێراقدا بووە، و پاشان گەشتی کردووە، بۆ وڵاتی (یەمەن)، و لە زۆر لە زانکۆکانی ئەوێدا ماوەتەوە، و هەر لە شاری (بەغداد)، (خانەی مامۆستایانی سەرەتایی)، تەواو کردووە، و و بووەتە مامۆستای سەرەتایی، و پاشان چۆتە (کۆلێژی ماف)، و ئەویشی تەواو کردووە، و دواتر کراوەتە بەڕێوەبەری (ئامادەیی نەجیبە خاتونی ئایینی)، و دواتر پەیوەندی بە پەیمانگای شەریعەتی ئیسلامییەوە، لە زانکۆی (قاهیرە)، کردووە، و بڕوانامەی ماستەری، بە پلەی(نایاب)، بە دەست هێناوە، و هەر دوای ئەمەیش بڕوانامەی دکتۆرای لە زانکۆی (قاهیرە)، لە ساڵی، (١٩٦٢)، بە پلەیەکی بەرز پێدراوە، و دکتۆر عەبدولکەریم زەیدان، (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، پسپۆڕی فیقهی ئیسلامیی بووە، و ئاگاداری سەرجەمی سەرچاوە گرنگەکانی بووە، بە تایبەت پەرتووکەکانی، شیخ الإسلام، (ئیبن تەیمیە)، و (ئیبن قەییمی جەوزی – قوتابی)، و هەروەها لە پرس و باسی تایبەت بە فیقهی ئیسلامییدا، گۆڕینەوەی بیروڕای زانستی زۆری لە گەڵ زانایانی پایەبەرزدا کردووە.

**- دواتر لە ژیانیدا، ئەم پۆستانەی وەرگرتوون:**

(١). مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووە، و هەروەها سەرۆکی بەشی شەریعەتی

ئیسلامیی بووه، له (كۆلێژی ماف)، له زانكۆی بەغداد.

(٢). مامۆستای وانه شەرعییەكان بووه، و هەروەها سەرۆكی بەشی ئاین بووه، له (كۆلێژی ئاداب)، له زانكۆی بەغداد.

(٣). مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووه، له كۆلێژی توێژینەوه ئیسلامییەكان، و هەروەها ڕاگرایەتیشی كردووه. .

(٤). له ساڵی،(١٩٩٢) به دواوه، تا كۆتایی تەمەنی، مامۆستای شەریعەتی ئیسلامیی بووه، له كۆلێژی توێژینەوه ئیسلامییەكان، و هەروەها خوێندنی ماجستێر، و دكتۆرا، بووه، له زانكۆی (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٥). هەروەها مامۆستای بەشی (فیقه، وئوصول)، بووه، هەر له زانكۆی (ئیمان)، له شاری (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٦). هەر له حەفتاكانەوه، ئەندامی كۆڕبەندی زانایانی زانكۆی ئیسلامیی بووه.

(٧). له ساڵی،(٢٠٠٠)به دواوه، ئەندامی كۆڕبەندی فیقهی بووه، كه سەر بە(ڕابیتەی جیهانی ئیسلامیی)ییە.

(٨). ئەندامی كۆڕبەندی كۆمیتەی فیقهی ئیسلامیی بووه، له زانكۆی (ئیمان)، له شاری (صەنعا)ـی، پایتەختی یەمەن.

(٩). له شەستەكاندا، چەندەها وانەی له، (ڤیستیڤاڵی هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)دا، داوەتەوه، له وڵاتی (كوەیت).

(١٠). له شەستەكاندا، چەندەها وتار، و بابەتی له (ئینسكلۆپیدیای فیقهی ئیسلامیی)دا، هەر له وڵاتی (كوەیت)، نووسیوه.

(١١). بەشداری له بازنەی زانستی، (یاسا، و زانسته سیاسییەكان)دا، كردووه، كه له ساڵی، ( ١٩٦٩)دا، كه له شاری (بەغدا)ـی، پایتەختی عێراقدا، به چاودێری، (كۆمكاری وڵاتانی عەرەبی)، سازدرابوو، كه وتارێكی، سەبارەت به، (یاسای نێودەوڵەتی گشتی، و شەریعەتی ئیسلامیی)، پێشكەش كردووه.

(١٢). له حەفتاكاندا، وەك ئەندامی ئەنجومەنی ئەمیندارانی (زانكۆی ئیسلامیی)، دیاری كراوه، له شاری (مەدینەی منەووەره).

(١٣). له حەفتاكاندا، بەشداری (هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)، كردووه، و وتارێكی پێشكەش كردووه له شاری (ڕیاض)، له سعودیه.

(١٤). له ساڵەکانی (١٩٩٥ – ١٩٩٦)دا، بەشداری (هەفتەی فیقهی ئیسلامیی)، کردووە، له وڵاتی قەتەر.

(١٥). سەرپەرشتی سەدان نامەی ماجستێر، و دکتۆرای کردووە، له زانکۆکانی (بەغدا)، و (صەنعا)ـی، پایتەختی وڵاتی یەمەن.

(١٦). ئەندامی لیژنەی دادوەری بووە، بۆ پێدانی خەڵاتی (هائیل سەعید)، بۆ زانست و ئاداب.

(١٧). له ساڵی (١٩٥٤)دا، له سەربازگەی (سوارە تووکە)، له کوردستانی عێراق، سەرپەرشتیاری ئاینی، و پەروەردەیی بووە، لەو سەربازگەیەدا.

(١٨). خەڵاتی، (مەلیك فەیصەڵی جیهانی، له توێژینەوە ئیسلامییەکان)، له ساڵی، (١٤١٧ ك – ١٩٩٧ز)، پێیدراوە، بە هۆی کتێبە مەزنەکەیەوە، (المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم في الشريعة الإسلامية)، کە (١١) بەرگە، و بە پێی مەزهەبە جیاوازەکان نووسیویەتی.

له گەڵ چەندەها پایەی زانستی و ئەکادیمی تر.

### * کتێبەکانی:

١. أحكام الذميين والمستأمنين في دار الإسلام.
٢. المدخل لدراسة الشريعة الإسلامية.
٣. الكفالة والحوالة في الفقه المقارن.
٤. أصول الدعوة.
٥. الفرد والدولة في الشريعة.
٦. المفصل في أحكام المرأة وبيت المسلم في الشريعة الإسلامية، (١١) بەرگە.
٧. الوجيز في شرح القواعد الفقهية في الشريعة الإسلامية.
٨. الشرح العراقي للأصول العشرين.
٩. نظرات في الشريعة الإسلامية.
١٠. الوجيز في أصول الفقه. (کە له بەردەستماندایە).

### * توێژینەوە زانستییەکانی:

١١. أثر القصود في التصرفات والعقود.

١٢. اللقطة وأحكامها في الشريعة الإسلامية.
١٣. أحكام اللقيط في الشريعة الإسلامية.
١٤. حالة الضرورة في الشريعة الإسلامية.
١٥. الشريعة الإسلامية والقانون الدولي العام.
١٦. الاختلاف في الشريعة الإسلامية.
١٧. عقيدة القضاء والقدر وآثرها في سلوك الفرد.
١٨. العقوبة في الشريعة الإسلامية.
١٩. حقوق الأفراد في دار الإسلام.
٢٠. القيود الواردة على الملكية الفردية للمصلحة العامة في الشريعة الإسلامية
٢١. نظام القضاء في الشريعة الإسلامية.
٢٢. موقف الشريعة الإسلامية من الرق.
٢٣. النية المجردة في الشريعة الإسلامية.
٢٤. مسائل الرضاع في الشريعة الإسلامية.

له گەڵ چەندەها کتێب و باسی زانستی و ئەکادیمی تر.

### * کۆچی دوایـی:

دواجـار، عەللامـە دکتـۆر عەبدولکـەریم زەیـدان، (ڕەحمـەتی خـوای لــێ بێـت)، لـە بەرواری، (٢٨ – ١ – ٢٠١٤)، لە شاری (صەنعا)ـی، پایتـەختی وڵاتـی یەمـەن، کۆچـی دوایی کرد، غفَرَاللهُ لَهُ، و أَسْكَنَهُ فَسيحَ جِنَّاتِه.

# ﴿پێشەکی دانەر﴾

## ﴿بسم الله الرحمن الرحيم﴾

الحمد لله ربّ العالَمــين، والصلاة والسلام على سيّدنا محمّد وعلى آله وصحبه أجمعين.

**پاشان:** شەرعزانانی شەریعەتی ئیسلام، (ڕەحمەتی خوایان لێ بێت)، زانستێکی زۆر مەزنو بەسودیان بۆ داناوین، کە لە ناو گەلانی تری جیهاندا هاوێنەی نی یەو نەبووە، چ لە ڕابردووو چ لە ئێستادا، کە ئەو زانستەیش زانستی ئوصولی فیقهە، و مەبەست لە دانانو دەربڕینیو ڕوونکردنەوەی زانیارییەکانیو ڕەهەندو ماناکانی بریتی یە لە خزمەتکردنی ئیسلام، لە ڕێگای دروست حالّی بوونەوە لە قورئانو فەرموودەکانی پێغەمبەر (ﷺ)و دەرهێنانی حوکمەکان لەو سەرچاوانە، و هەروەها لە سەرچاوە بڕواپێکراوەکانی تر، ئەمەش لەبەر ڕۆشنایی کۆمەڵێك یاساو بنەمای بنچینەیی زانستی ئوصولی فیقهە.

پێش چەند ساڵێك چەند زانیارییەکم لەسەر ئەم زانستە مەزنە یاداشت کردو، گوتمەوە بە قوتابیانی قۆناغی چوارەمی کۆلێژی ماف لە زانکۆی بەغدادو، دواتر لە کتێبێکدا کۆم کردنەوە، و ناوم نایە:﴿الوجيز في أصول الفقه﴾، و لەچاپەکانی پێشوویدا، ئەوەی بە جێگای سوودم زانیوە لە پوختەکردنو، زیادەو کەم لەسەر کردنو هەموارکردنەوەو، نموونە بۆ هێنانەوەدا بۆم ئەنجام داوە، هەموو مرۆڤێکیش وایە، کاتێك ئەمڕۆ شتێکی نووسی، سبەینێ کەمو کوڕی تیادا بەدی دەکات، ئەمەش لە گەورەترین نیشانەکانی کەمو کورتی مرۆڤەو، تەنها پەروەردگار کامڵی ڕەهایە، و بەڵام زۆرکەس نازانن.

لەو زیادانەی کە بە پێویستم زانیـوە بـۆی زیادبکـەم کـە لەچـاپەکانی ڕابـردوودا نـەبووە، هەندێك نموونە بوون لە یاسا وەضعیەکان بۆ ئەو یاسایانەی ئوصولی فیقه، کە پەیوەستن بە ڕاڤەکردنی دەقەکانەوە، چونکە ئەو یاسا ئوصولیانە پێوەرن، بۆ تێگەیـشتن لـە دەسـتەواژە عەرەبیەکانو دروست حاڵی بوون لێیانو، زانینی مەبەستەکانیانو، لەبەرئەوەی کە(یاسا) بە زمانی عەرەبی نووسراوەتەوە، ئەوا بێگومان لەکاتی توێژینەوەو ڕاڤەکردنیـدا، پێویـستە کـە ملکەچی بۆ ئەو یاساو بنەمایانە ببێت، وەك دواتریش باسی دەکەین.

لە کۆتاییدا، ئومێدەوارم بەم کارە گچکەیە، ڕێگای حاڵی بوونم لەو شتانەی پێویستن لەم زانستەدا، بۆ قوتابیانمان ئاسان کردبێتو، داواکارم لە پەروەردگار منو ئەوانیش سەرفراز بکات، بۆ خزمەتی شەریعەتەکەی، و بەرز ڕاگرتنی فەرمانەکانی، و هەر خودا بیسەر، و وەڵامدەرەوەی نزاکانە.

**د. عەبدولکەریم زەیدان**

# ﴿پێشەکی﴾

١- دەرهێنانی حوکمە شەرعییەکان، لەو سەرچاوانەی کە لە رووی شەرعەوە بڕوا پێکراون، کارێك و پرۆسەیەك نییە کە بە پێی حەزو پێکەوتنی لاوەکی هاتبێتە ئاراوە، بەڵکو دەبێت، لە ئاراستەو ڕەوگەی دیاریکراو و دروستەوە کەس و زانای موجتەهید هەڵی هێنجابن، و بە بەرچاوڕوونی یاساو ڕێساکانی شەریعەت وەری گرتبن، و لەسەر چەند یاسا و بنەمایەك هێنابنی، کە دواجار لەگەڵ دەرهاوێشتەکانیاندا کۆك و تەبابن، و لەم ڕێگایەوە ئیجتیهادەکە دروستە و وەرگیراوە، و هەر لێرەیشدایە کە دەگەین بەو حوکمانەی کە دروست و گونجاو و بەردەستن.

٢- ئەو زانستەی کە بایەخ دەدات بە ڕاڤەو لێکۆڵینەوەی سەرچاوەکانی ئەحکام و، ئاستی بەدۆکیۆمێنت بوونیان و، پلەوپایەیان لەکاتی کردنیاندا بە بەڵگەی شەرعی و، مەرجەکانی ئەو بە بەڵگەکردنە، ئەمە زانستی ئوصولی فیقهە ئەم کارە دەکات و، نەخشە ڕێگای ئەو هەڵهێنجانی حوکمانە دیاری دەکات و، سەرجەم ئەو یاساو ڕێسایانەش دەردەهێنێت، کە پەیوەندیدارن بەم بابەتەوە، و پەیوەندی و کۆنتاکتیان لە گەڵیدا هەیە و، هەروەها باس لەو ڕێ و شوێنانە دەکات، کە کەسی موجتەهید دەبێت، پێیانەوە پابەند بێت، لەکاتی ناساندن و دەرهێنانی ئەو حوکمە شەرعیانەیدا، کە لە(الأدلة التفصيلية) وەردەگیرێن، ئەم باس وخواسە بە زانستی ئوصولی فیقهـ ناوزەد کراوە، بۆیە ئەم زانستەیش، وەك عەللامە ئیبن خەلدون فەرموویەتی: لە مەزنترین زانستەکانی شەریعەتەو، بە بایەخترین و بەسودترینیانە[1].

٣- ناوەڕۆکی زانستی ئوصولی فیقهـ ئەوەیە کە باسمان کرد، بەڵام زانایانی ئەصولی فیقهـ پێناسەی زاراوەیی(إصطلاح)ـی، بۆ دەکەن، بەو پێیەی کە ناوو نازناوە بۆ زانستێکی تایبەت لە زانستە شەرعییەکان و، لەو ڕوانگەیەوەقسەی لەسەر دەکەن، کە ئەم ووشەیە، (مورەکەبی ئیضافی) یەو، لە ووشەی (أصول)-و (الفقه) پێکهاتووە، کە (أصول) بۆلای (الفقه) ئیضافە کراوە.

لە ڕاستیدا، ئەم ڕەوگەیە قوتابی سوختە، واتە، ئەوەی کە لەسەرەتای ئەم زانستەدا بێت، سودمەند دەکات بەوەی کە زاراوەکانی و زانایانی ئەم زانستەی پێ دەناسێنێت و،

---

[1] مقدّمة إبن خلدون، ل ٤٥٢.

کاتێك کە گەڕایەوە بۆ سەرچاوەکانی ئەم زانستە تووشی شۆك نابێت، بۆیە ئێمە لەم کتێبەدا لەسەر ئەو ڕەوتە کارمان کردو ڕایان دەهێنین‌و، بۆیە باسی پێناسەی زانستی (ئوصولی فیقهـ) دەکەین لەو ڕووەیانەوە، کە (مورەککەبێکی ئیضافی)یەو، دواتر پێناسەی دەکەین بەو جۆرەی کە نازناوە بۆ زانستێکی تایبەت، کە ئێمە لەپێودانگی ڕاڤەو توێژینەوەیداین.

**٤- پێناسەی (ئوصولی فیقهـ)، بە گوێرەی ئەو پێودانگەی کە لە دوو بەشی بۆ لای یەکتر زیادکراو (المرکب الأضافي) پێك هاتبێت،** و پێناسەیش لەسەر ئەم شێوازە بەجودا هەردوو ووشەی (أصول)و (فقهـ) پێناسە بکەین، (أصول) کۆی (أصل: بنەما)یە، و لە زمانی عەرەبیدا ئەو شتەیە کە شتی تری لەسەر بنیات نراوە، ئیتر ئەو بنیاتنانە لەڕووی بەرجەستەیی (حسّي) بێت، یان عەقڵی چونیەکەو، لە پێناسەی زانایان‌و بەکارهێنانیان بۆی، مەبەستیان لە ووشەی (أصل) چەند مانایەکە، لەوانە[1]:

أ- بە مانای بەڵگە (الدليل) هاتووە، وەك دەگوترێت (أصل هذه المسألة الأجماع) واتە: بەڵگەکەی ئیجماعە، کۆڕای زانایانە، کە (أصل) مانای بەڵگەی) وەرگرتووەو، بەگوێرەی ئەم مانایەش کە گوترا، (أصول الفقه)، واتە: بەڵگەکانی ئوصولی فیقهـ، چونکە (فیقهـ) لەسەر بەڵگەی عەقڵی بنیات نراوە.

ب- بە مانای (الراجح: ڕاستتر) هاتووە، وەك ئەوەی کە دەگوترێت، (الأصل في الكلام الحقيقة)، واتە ڕەهەندی ڕاستتر (الراجح)ـی، قسە، ئەوەیە کە زیاتر بەلای ڕاستیدا دەکەوێت، نەك بەلای ڕەهەندی ناڕاست (المجاز) داو، هەروەها دەگوترێت (الكتاب أصل بالنسبة إلى القياس). واتە، قورئان ئەرجەحترە لەچاو قیاسدا.

ج- بەمانای یاساو ڕێسا (القاعدة) دێت، وەك دەگوترێت، گۆشتی مردارەوەبوو، بۆ کەسی ناچار حەڵاڵە، کە ئەمەش پێچەوانەی یاساو ڕێسای بنەڕەتی‌و گشتی یەو، هەروەها کە دەگوترێت، (الأصل أنّ الفاعل مرفوع)، واتە یاسای گشتی‌و هەمیشەیی لەسەر ئەوەیە، کە فاعیل مەرفوعە، یاخود مەرفوع بوونی فاعیل، لە یاسا بنەڕەتییەکانی زانستی ڕێزمانی عەرەبی (نحو)ـە.

---

[1] نهاية السول، شرح منهاج الأصول، الأسنوي، ل ٧، لطائف الأشارات. للشيخ عبدالحميد بن محمد علي قدس، کە شەرحێکە لەسەر (الطرقات لنظم الورقات)، ل٨.

د- هاوڕابوون، جا كه دەگوترێت، (الأصل براءة الذمّة) واتـه ئەسـتۆپاكى هاوڕايـه لەگـەڵ ئەو حاڵەتـەدا، كـه ئـەو كەسـه دووره لـه تۆمەتەكـه، تـا پێچەوانەى ئـەم شـتە ڕوودەداتو، ئەستۆپاكى نامێنێت، كه ئـەم ئەسـتۆپاكييه هـاوڕاى حاڵەتەكـه نـەبوو، ئـيتر كـابرا تۆمـەتى ئاڕاسته دەكرێت.

بـەڵام (فيقهـ) لـه زمـانى عەرەبيـدا بـوونى زانسته بـه شـتێكو، تێگەيـشتنه لێـى، بـەڵام بەكارهێنانى له قورئانى پيرۆزدا ئەوەمان فێردەكات، كه مەبەست لێـى زانست بـوونى ڕەهـا نى يه، بەڵكو بوونى تێگەيشتنێكى وردو هەست پێكردنێكى ناسـكه، نـەوەك زانـستى تـەواو، ناسينى مەبەستەكه بـەگوێرەى تێگەيـشتنى قـسەكەرو، لێرەيـشەوه خـواى پـەروەردگار لـه قورئـانى پـيرۆزدا دەفـەرموێت: ﴿قَـالُوا يَاشُـعَيْبُ مَـا نَفْقَـهُ كَثِيرًا مِمَّـا تَقُـولُ﴾[1] واتـه: ئـەى شـوعەيب زۆرو بەتـەواوى لـەو قـسانه تێناگـەين، كـه تـۆ دەيانكـەيتو، هـەروەها قورئـان دەفەرموێت: ﴿فَمَالِ هَؤُلَاءِ الْقَوْمِ لاَ يَكَادُونَ يَفْقَهُونَ حَدِيثًا﴾.[2] ئـەرێ ئـەو خەڵكـه دەڵێـى لـه قسه تێناگەن، كەواته فيقهـ بەماناى حاڵى بوونى تەواو نەهاتووه، بەڵكو ماناى بوونى زانستى نيوەو ناچڵى وەرگرتووه.

بەڵام فيقهـ له زاراوەى زانايانـدا بريتى يه له بوونى زانست به حوكمه شەرعييه كردارييـەكان، كـه له بەڵگه تەفصيليەكان وەرگيراون،[3] ياخود خودى ئەو حوكمانه بريتين له فيقهـ.

(أحكام: حوكمەكان)، كۆى حوكمه، و بريتى يه لـه جێگيركردنـى حاڵـەتێك بەسـەر شـتێك يان كەسێكى تردا، به بەڵگه و دۆكيۆمێنت، ئيتر ئەو حاڵەته پۆزەتيـف بێـت، يـان نێگـەتيف چونيەكه، وەك ئەو قسەيەى كه دەڵێت، (خۆر يان دەرهاتووه، يان هەڵنەهاتووه)و، (ئاو يان گەرمه، يان گەرم نى يه).

مەبەست له (الأحكام)، لەم بوارەدا، ئەوەيه كه كاروكردەوەى كەسـانى بـەربار (المكلّـف) جـێگير بكرێـتو، حاڵـەتى (واجـب)و (منـدوب)و (حـرام)و (كەراهـەت)و (مبـاح) بـوون، و دروستىو نادروستى (الصّحه والفساد)و، بەتاڵبيان ديارىو پـۆلێن بكرێـتو، هـەروەها مـەرج

---

١ هود (٩١).

٢ النساء (٧٨).

[3] منهـاج الأصـول، الأمـام البيـضاوي، ل ٢٢، الأحكـام في أصـول الأحكـام، للآمـدي، ب١،ل ٧، إرشـاد الفحول، للشوكاني، ل ٣، لطائف الأشارات، ل٨.

نییه، که زانستمان به سەراپای ئەحکامە شەرعییەکان بە ڕەهایی هەبێت، جا دروست بێت، ووشەی فیقهی بۆ بەکار بهێنین، بەڵکوبوونی زانست بە زۆرینەو، لەسەر ئاستی تێکڕا بە ئەحکامە شەرعیەکان بە فیقه هاتۆتە ئەژمارو، فیقهی ئەو بڕە زانست بوونەیەو بڕایەوەو، زانا بەو شتە بە کەسی (شەرعزان: فَقیه) ناوزەد کراوە، چونکە هونەرو توانای دەرهێنانو هەڵهێنجانی حوکمی شەرعی هەیە.

لەم سەروبەندەدا بە مەرج گیراوە، کە ئەو ئەحکامانە شەرعی بنو، درابنە پاڵ شەرعو لەویوە وەرگیرابن، ئیتر بە ڕاستەوخۆ وەرگیرابن، یان بە ناڕاستەوخۆو بەهۆی ئامرازی ترەوە چونیەکە، بۆیە ئەحکامی عەقڵی ناچنە چوارچێوەی ئەم پێناسەیەی ئێمە، وەك بوونی زانستو زانینی ئەوەی کە (الكل أكبر من الجزء): شتی گشتی گەورەترە، لە شتی فەرعیو چڵو پۆپە)، یاخود نیوەی دوو یەکە، یان ئەم جیهانە ئەفرێندراوە، ئەمانە ئەحکامی عەقڵینو شەرعی نینو ناچنە چوارچێوەی پێناسەکەمان، چونکە ئێمە گوتمان دەبێت حوکمی شەرعی بنو، هەروەها ئەحکامی بەرجەستەیی (حسّي) لە دەرەوەی ئەم پێناسەیەی ئێمەوەن، واتە ئەو حوکمانەی کە بە هەستو بەرجەستەبوون زانراون، وەك زانینی ئەوەی کە ئاگر سوتێنەرەو، هەروەها ئەو حوکمانە ناگرێتەوە، کە بە ئەزموون زانراون، وەك زانینی ئەوەی کە ژەهر کوشندەیەو، هەروەها حوکمی دانراو (وَضعي) ناگرێتەوە، وەك زانینی ئەوەی کە (كان و أخواتُها) موبتەدا مەرفوع دەکەنو، خەبەر مەنصوب دەکەن، کە ئەم یاسایە دانراوەو دەسکردە.

ئینجا لەو حوکمە شەرعییانەدا، ئەوە بە مەرج گیراوە، کە کرداری (عَملي) بن، واتە ئەوانەی کە پەیوەستن، بە کارو کردەوەی ئەو کەسانەی کە ئەرکیان لەسەر شانە (مكلّف)ن، وەك نوێژی نوێژخوێنانو، کڕینو فرۆشتنو، خواردنو خواردنەوەیانو، سزادانیان لەکاتی سەرپێچی کردندا، لە پەرستشو مامەڵەکانیاندا، بۆیە ئەو شتانەی کە پەیوەستن بە بیروباوەڕەوە ناچنە ناو ئەم باسەمان، وەك باوەڕبوون بە خواو ڕۆژی پەسڵان، ئەمانە ئەحکامی ئیعتیقادینو، هەروەها ئەو حوکمانە ناگرێتەوە کە پەیوەستن بە ئەخلاقو هەڵسو کەوتەوە وەك. واجب بوونی ڕاستگۆییو حەرامی درۆزنی، ئەمانە لە زانستی فیقهدا باس ناکرێنو، بەڵکو لە زانستی یەکتاپەرستی (التوحيد)و زانستی کەلام دا باس دەکرێن، ئەگەر ئەحکامی ئیعتیقادی بوونو، ئەگەر ئەحکامی ئەخلاقی بوون ئەوا لە زانستی ئەخلاقو تەصەوفدا باسیان لێوە دەکرێت.

هەروەها لەو حوکمە شەرعییە عەمەلیانەدا بە مەرج گیراوە کە وەرگیراو (مکتسب) بن، واتە لە بەڵگە تەفصیلیەکان وەرگیرابن، لەڕێی تێڕوانین‌و بەڵگە هێنانەوە (النظر والاستدلال)ـەوە.

و بەپێی ئەم مەرجە بێت، زانینی پەروەردگار بە ئەحکامەکان‌و زانستی پێغەمبەر (ﷺ) پێیان، هەروەها زانینی تەقلیدکارەکان بە ئەحکامەکان، ئەمانە هەموو لە زاراوەی زانایاندا بە فیقهـ ناوزەد نەکراون، و هەروەها زانەرەکەشیان بە (فەقیهـ) ناوزەد نەکراوە، چونکە بوونی زانستی پەروەردگار بەو ئەحکامانە، لە صیفاتە لازمەکانی زاتی پەروەردگار خۆیەتی، و ئەو زانایە بە حوکم‌و بەڵگەکانیش، و هەروەها زانستی پێغەمبەر(ﷺ) پێیان لە سروش (وەحی) وەرگیراوە، نەك لە بەڵگەکان‌و، هەروەها زانستی کەسی موقەلید، لەڕێگای تەقلیدەوە فێری بووە، نەوەك لەڕووی تێڕامان‌و ئیجتیهادکردنەوە.[1]

(الأدلة التفصيليّة)، ئەو بەڵگە جوزئیانەن، کە هەریەکەیان‌و هەر بەشێکیان پەیوەستن، بە پرسێکی تایبەت‌و، وەك دەق بەکارهێنراون بۆ حوکمێکی دیاریکراو، وەك:

أ- فەرمایشتی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَاتُكُمْ ﴾[2]، ئەمە بەڵگەیەکی تەفصیلی یە، واتە بەڵگەیەکی جوزئییەو، تایبەتە بە پرسێکی تایبەتەوە کە مارەکردنی دایك‌و دایکی باوك‌و دایکی دایکەو هەروەها بەڵگەیە لەسەر حوکمێکی دیاریکراو، کە حوکمی حەرامی مارەکردنی ئەو پێڕەیە کە ناومان هێنان.

---

[1] لێرەدا تێبینی ئەوە کراوە، کە کەسی تەقلیدکار کە بڕێك لە حوکمە شەرعیەکانی بە بەڵگەوە زانی، بە (فەقیهـ) ناونابرێت، چونکە کەسی (فەقیهـ) لای زانایانی ئوصول ئەوەیە کە هونەری دەرهێنانی حوکم‌و هەڵهێنجانی لە بەڵگەکانەوە هەبێت، ئیتر چونیەکە بە کردار ئیجتیهادی کردبێت‌و حوکمی هەڵهێنجابێت، یاخود ئیجتیهادی نەکردبێت،و حوکمی هەڵنەهێنجابێت، کەواتە (فەقیهـ ئەو کەسەیە) کە فیقهـ بوبێتە خولیای،و ئەمە هەڵگری مانای ئیجتیهادە، بەڵام لێرەدا گۆڕانێك لە ماناکەدا ڕوویداوە،و وشەی (فیقهـ) بۆ پرسە فیقهییەکان بەکارهێنراوە، ئیتر چونیەکە ئەو کەسە بە تێڕامان‌و بەڵگەهێنانەوە دەستی کەوتبن، یاخود بەڕێگای تێگەیشتن لە قسەی موجتەهیدەکان، یاخود بەڕێگای تەقلیدکردن،و لەبەرکردن، هەروەك چۆن کەسێك بەو ڕێگایانەی باسمان کرد زانیاری دەست کەوتبێت، هەر بە (فەقیهـ: شەرعزان) ناوزەد کراوە،و ئەم مانا نوێیەش، لەلای زانایانی فیقهـ، بڵاوبۆتەوە، نەوەك لەلای زانایانی ئوصوڵی فیقهـ، بڕوانە (مذكرات في تأريخ الفقه)، للشيخ فرج السنهوري، ل٤.

[2] النساء (٢٣).

ب- فەرمایشتی قورئان: ﴿ وَلَا تَقۡرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةٗ وَسَآءَ سَبِيلٗا (٣٢) ﴾[1] کە بەڵگەیەکی جوزئییەو تایەتە بە پرسێکی دیاریکراو، کە داوێن پیسی یەو، بەڵگەیە لەسەر حوکمێکی تایبەت، کە حوکمی حەرامی داوێنپیسی کردنە.

ج- هەروەها فەرمایشتی قورئان کە دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّواْ لَهُم مَّا ٱسۡتَطَعۡتُم مِّن قُوَّةٖ وَمِن رِّبَاطِ ٱلۡخَيۡلِ ﴾[2] کە بەڵگەیەکی جوزئی یە، لەسەر پرسێکی دیاریکراو، کە ئامادەکاری سەربازی‌و هێزە لەلایەن کۆمەڵێکی دیاریکراوەوەو، هەروەها بەڵگەیە لەسەر حوکمێکی دیاریکراوی تایبەت، کە حوکمی واجب بوونی ئامادەسازی جەنگی یە، لەلایەن کۆمەڵی موسوڵمانانەوە، بۆ ترساندنی دوژمنانی ئیسلام.

د- هەروەها وەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: (العَمْدُ قَوَد: بۆ کوشتنی ئەنقەست، تۆڵەکردنەوە بە کوشتنەوەی هەیە)، ئەمە بەڵگەیەکی جوزئییە، کە پەیوەستە بە پرسێکی دیاریکراو، کە کوشتنی بەدەست ئەنقەستەو، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو حوکمەیش، کە حوکمی بوونی کوشتنەوەو تۆڵەکردنەوەیە.

هـ- بوونی (الأجماع: کۆڕای زانایان) لەسەر ئەوەی کە میراتی داپیرە شەش یەکە، ئەمەیش بەڵگەیەکی جوزئییە کە تایبەتە بە پرسێکی دیاریکراو کە میراتی داپیرەیەو، هەروەها بەڵگەیە لەسەر ئەو حوکمەی کە واجبە شەش یەك ببدرێت بە داپیرە.

کەواتە (الأدلة التفصيليّة) ئەو بەڵگانەن کە حوکمی هەموو پرسێکمان بۆ یەکلایی دەکەنەوەو، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە بوونەتە باس‌و خواسی فەقیهەکان، تا ئەو حوکمانەیان لێ هەڵبهێنجن کە لێیانەوە سەرچاوەیان گرتووە، ئەمەش بە پشت بەستن بەو یاساو ڕێسایانەی کە زانایانی ئوصوڵی فیقهـ بۆ دەرهێنانی ئەحکام‌و شێوازی پەیڕەوی بەڵگەهێنانەوە دایاننناون، بەڵام زانای ئوصوڵی لەسەر ئەم بەڵگانە توێژینەوە ناکات، بەڵکو لەسەر بەڵگە گشتی یەکان (الأدلة الأجماليّة) یاخود (الأدلة الكليّة) توێژینەوە دەکات، تا لەم ڕێگایەوە کۆمەڵێك یاساو ڕێسا دابنێت بۆ زانایانی فیقهـ، تا ئەوانیش بەسەر بەڵگە جوزئییەکاندا پراکتیزەیان بکەن‌و جێ بە جێ یان بکەن‌و دواجار بگەن بە زانینی حوکمە شەرعییەکان.

---

[1] الأسراء (٣٢).

[2] الأنفال (٥٩).

## ٥- پێناسەی ( ئوصوڵی فیقهـ ) لە زاراوە ( إصطلاح ) دا :

پێناسەی ئەم زانستە بە پێودانگەی کە نازناوە بۆ زانستێکی دیاریکراو بریتییە لە زانینی یاساو بەڵگە گشتییەکان، ئەو یاساو بەڵگانەی کە فاکتەرن بۆ گەیشتن بە ڕێگای هەڵهێنجانی فیقهـ،[١] هەروەك ئەم ناوەیش بردراوە بەسەر خودی ئەو یاساو بەڵگە گشتیيانەدا.

یاساو ڕێساکانیش (القواعد) ئەو پرسو دۆزە گشتی یانەن کە حوکمەکانیان جیّ بەجیّ دەکرێت بەسەر ئەو شتە لاوەکیو جوزئیانەیدا کە لەژێر ڕکێفیدان، ئیتر لەم ڕوانگەیەوە حوکمی ئەو شتە جوزئیانە[٢] دەزانین، و لەو نمونانەیش:

یاسای بنەڕەتی (ئەمر بۆ واجب بوونە تەنها لە کاتێکدا نەبێت کە نیشانەیەك بێتە ئاراوە، لەو ڕەوگەیەی لابدات)، ئەم یاسایە حوکمەکەی جیّ بەجیّ دەبێت بەسەر سەرجەمی دەقە جوزئیەکانی ژێر ڕکێفیداو بەسەریاندا پراکتیزە دەکرێن، وەك ئەم فەرمایشتە، پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوْفُواْ بِٱلْعُقُودِ﴾،[٣] و هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَءَاتُواْ ٱلزَّكَوٰةَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾[٤] کەسەرجەم دەستەواژە ڕاستەوخۆکانی ئەمرو فەرمانکردن دەچنە ژێر ئەم یاساو قاعیدەیەوەو لە ڕێگایەوە واجب بوونی ئەو شتانە دەزانین کە پەیوەستن بە دەستەواژە ئەمریەکانەوە، وەك واجب بوونی پابەند بوونی بە گرێبەستەکانی مامەڵەوەو، هەروەها واجبی نوێژو زەکاتدانو گوێڕایەڵی کردنی فەرمانەکانی پێشەوامان (ﷺ).

هەروەها وەك یاسای بنەڕەتی،( نەهی بۆ حەرام بوونی شتەکەیە تەنها لەکاتێکدا نەبێت کە نیشانەیەك خۆی قوت بکاتەوەو لەو ئاڕاستەیەی لابدات) ئەم یاسایە بەسەر ئەو داقانەدا

---

١ فتح الغفار، بشرح المنار، لإبن نجيم، ل ٧، تسهيل الوصول إلى علم الأصول، للمحلاوي، ل ٧، إرشاد الفحول، ل ٣

٢ ئەو یاساو ڕێشایانەیش بە بەڵگە گشتییەکان ناودەبرێنو ئەحکامەکانیش بە ئەحکامی گشتی ناودەبرێن. بۆیە فەرمانکردن (الأمر) بەڵگەیەکی گشتی یەو ئەو حوکمەی کە دەریکردووە کە واجب بوونەکەیە حوکمێکی گشتی یەو ئەو دەقانەی فەرمانەکەیان کردووە بەڵگەی جوزئینو، حوکمەکانیش حوکمی جوزئین.

٣المائدة (١).

٤النور(٥٦).

جێ بە جێ دەبێت کە مانای ڕاستەوخۆی (نەهی: ڕێگرتن) دەگەیەنن‌و لەم ڕێگای پراکتیزەکردنی یاسایانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە ئەو شتانەی دەستەواژەی (نەهی) یان بۆ بەکارهێنراوە حەرامن، وەك ئایەتی﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾،[1] و هەروەها ئایەتی: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تَأْكُلُوٓا۟ أَمْوَٰلَكُم بَيْنَكُم بِٱلْبَـٰطِلِ ﴾،[2] کەواتە بەگوێرەی دەقی یەکەم حوکمی داوێن پیسی حەرام بوونیەتی‌و حوکمی خواردنیماڵی خەڵك بە ناهەق ئەمیش دیسان حەرام بوونی ئەو کردەوە نەشیاوەیە.

لە ڕوانگەی ئەم یاسا بنەڕەتیانەوە کەسی موجتەهید دەگاتە ئاستی هەڵهێنجانی فیقە، واتە دەرهێنانی حوکمی شەرعی کرداری لە بەڵگە تەفصیلییەکان کە باسمان کردن، جا کە موجتەهید ویستی حوکمی نوێژ بزانێت ئەم ئایەتە دەخوێنێت﴿وَأَقِيمُوا۟ ٱلصَّلَوٰةَ ﴾، دەڵێت (أقيموا) دەستەواژەیەکی بێ پێچ‌و پەنای فەرمان کردنە‌و یاسای (الأمر للوجوب، الا لقرينة صارفة)، ئەمر بۆ واجب بوونەی بەسەردا جێ بەجێ دەبێت‌و دەرەنجام بەوە دەگات کە نوێژ کردن واجبە.

پاشان سەبارەت بە بەڵگە گشتییەکانیش (الأدلة الإجماليّة) ئەمانەیش بریتین لە سەرچاوەکانی حوکمی شەرعی وەك قورئان‌و فەرموودە‌و ئیجماع‌و قیاس،‌و زانینی ئەمانەیش لە ڕوانگەی زانینی ئاستی بە بەڵگە بوونیان‌و پایەیان لە بە بەڵگە کردنیاندا دەبێت‌و دێتە دی‌و هەروەها بە زانینی ڕەهەندەکانی بە بەڵگە کردنی ئەو دەقە لەڕووی ئاراستە جیاوازەکانی بە بەڵگە کردنییەوە‌و هەروەها بەزانینی مانای (الأجماع: کۆڕای زانایان)‌و مەرجەکانی‌و جۆرەکانی قیاس‌و عیللەت‌و ڕێگاکانی زانینی ئەو عیللەتانە‌و زانینی شتەکانی تری پەیوەست بە قیاس‌و بەڵگە گشتییەکانی تر، کەواتە بە زانینی سەرجەم ئەمانە، زانینی بەڵگەی ئیجمالی دێتەدی.

زانای ئوصوڵی فیقە توێژینەوە‌و بەدواداچوون لەسەر بەڵگە ئیجمالییەکان دەکات تا حوکمە جوزئییەکانیان لێوە وەربگرێت، ئەمەش بە پشت بەستن بەیاسا ئوصوڵیەکان‌و بە پشتیوانی پرس‌و باسی بەڵگە ئیجمالییەکان دەبێت.

---

١ الأسراء (٣٢).

٢ النساء (٢٩).

### ٦- ئامانج لە توێژینەوەی زانستی ئوصولی فیقهو ئاستی پێویستمان بەم زانستە:-

لەو باسانەوەی پێشتر لەسەریان دواین بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەستو ئامانج لە دانانی زانستی ئوصوڵی فیقهـ بریتییە لە گەیشتن بە حوکمە شەرعییە کردارییەکان ئەویش لەڕێگای دانانی یاساو ڕێساو پەیرەوگەلێك بۆ گەیشتن بەو کارە، ئەمەش بە شێوازێك دەبێت کە کەسی موجتەهید لە هەڵەو گرفت بپارێزێت کەواتە فیقهـ و ئوصولْ لەوەدا کۆکن کە مەبەست لێیان گەیشتنە بە حوکمە شەرعییەکان، چونکە ئوصولْ پەیرەوو ڕێگای ئەو گەیشتنەو ڕێگاکانی هەڵهێنجان ڕوون دەکاتەوەو فیقهیش بە کردەوە حوکمەکان دەردەهێنێت لەبەر ڕۆشنایی ئەو پەیڕەوەدا کە زانستی ئوصولْ دایناوەو بە جێ بەجێ کردنی ئەو یاسایانەی زانستی ئوصولْ دەری کردوون.

ئینجا نابێت بگوترێت ئێستا پێویستمان بەو زانستە نییە، چونکە دەگوترێت دەرگای ئیجتیهاد داخراوە، چونکە ئێمە دەڵێین ئیجتیهاد تا ڕۆژی دوایی بەردەوامە، بەڵام کۆمەڵێك مەرجی هەیەو ئەوەی فەتوا دەدات کە دەرگای ئیجتیهاد داخراوە ئەوە بە ئیجتیهادی خۆی ئەو قسەیەی کردووەو لە کاتێکدا بووە دیویەتی هەندێك خەڵکی نەزان بێ دەربایسی قسەیان لەسەر شەرعی پەروەردگار کردووەو هەر بە ئارەزووی خۆیان ئەحکامیان داناوەو شەرعیان بۆ خەڵك کردووەو، هەروەها دیویانە کەسانێك دروست بوون بانگەشەی ئیجتیهادیان کردووە، لەکاتێکدا کە تەنها ناوەکەیان زانیوەو لە ناوەڕۆکی ناحاڵین‌و ئەم فەتوایە لێرەوە سەرچاوەی گرتووە.

بۆیە هەرکەس نەگەیشتبێتە پلەی ئیجتیهاد هەر پێویستی بەوە هەیە کە ئەم زانستە بزانێتو، لە یاساکانی ڕابمێنێت تا سەرچاوەی قسەی پێشەوا مەزنەکانمان بزانێتو بنەڕەتی مەزهەبەکانیان بۆ ڕوون ببێتەوەو ئینجا لێرەوە تا ڕادەیەك دەتوانێت بەرابەری (المقارنة)و بەلاداخستن (الترجیح) بکات لەنێوان قسە جیاوازەکانیانداو هەروەها دەرهێنانی حوکمەکان لەبەر ڕۆشنایی پەیرەوی پێشەواکانی ئیسلامدا ئەو پەیڕەوو یاسایانەی کە لە هەڵاوێرکردن‌و دەرهێنانی حوکمەکاندا ئەو پێشەوایانە بەکاریان هێناون.

هەروەها کەسی بایەخدەر بە حوکمە شەرعییەکان، دیسان ئەمیش ناتوانێت دەسبەرداری ئەم زانستە ببێتو، کەسی ڕاسپێردراوو یەکلابووەوە بۆ یاسا مرۆڤکردەکان هەر لە پارێزەرو قازی‌و وانەبێژ، هەریەکەیان پێویستی بەم زانستە هەیە، چونکە ئەو یاساو ڕێسایانەی کە زانستی ئوصولْ دایناون، وەك قیاس‌و بنەماکانی‌و هەروەها یاسا ئوصولییەکان بۆ ڕاڤەی دەقەکان‌و ڕێگای بە بەڵگەکردن‌و واتاو دەستەواژەکان بەگوێرەی خودی ئەو مانایانەی کە

هەڵی گرتووەو هەروەها ڕەهەندی ئەو بە بەڵگەکردنەو یاساکانی تەرجیح لەنێوان ئەو بەڵگانەداو گشت ئەمانەو زانیاری تریش پێویستن بۆ ئەو کەسەی کە دەربارە بە ئەحکامی وەضعی توێژینەوە دەکاتو دەیەوێت ڕاڤەی ئەو ئەحکامانە بکاتو ئەو حوکمانەش بزانێت کە لەسەریان بنیات نراون بۆیە کۆلێژەکانی شەریعەو یاسا لە عێراقو وڵاتانی شامو میسرو هی تریش لە کۆنو ئێستادا بایەخیان داوە بە گوتنەوەی ئەم زانستە بە قوتابییەکانیان.

## ٧- ئەشونماکردنی زانستی ئوصوڵی فیقهـ:

لە سەردەمی دەرکەوتنی فیقهەوە ئوصوڵی فیقهیش هەبووە چونکە کە فیقهـ هەبوو بێگومان بوونی بنەماو یاساو ڕێساگەلێکیش پێویستە بۆی ئەو یاساو ڕێساگەلەیش پایەو کۆڵەکەی زانستی ئوصوڵو ناوەڕۆکەکەین، بەڵام فیقه پێش زانستی ئوصوڵ کەوت لەڕووی نووسینەوەو ڕێك خستنەوە، هەرچەندە لە هاتنەئارادا هاوشان بوون، واتە فیقه کۆکرایەوەو ڕێکخراو یاساکانی هەلاوێر کرانو بەشەکانی ڕێکخستنیان بۆ کرا پێش ئەوەی ئەم کارو پڕۆژەیە بۆ زانستی ئوصوڵی فیقهـ ئەنجام بدرێتو، لە زانستەکانی تر جودا بکرێتەوەو ئەمەش مانای ئەوە ناگەیەنێت کە تەنها لەو کاتەوە سەریهەڵدابێت کە نووسراوەتەوەو ڕێکخراوە، بەڵکو پێشتر هەبووەو زانایان بەبێ یاساو پەیڕەوی دیاریکراو حوکمیان دەرنەهێناوە، بەڵکو بە یاسای ئوصوڵی ئەو کارانەیان کردووەو ئەو یاساو ڕێسایانە لە هزری موجتەهیدەکاندا هەبووەو لەبەر ڕۆشنایی ئەواندا حوکمیان هەڵهێنجاوە بەڵام تا ئەو کاتە هێشتا بە سەربەخۆیی دەریان نەبڕیبوو بۆیە هاوەڵی مەزن عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود (خوا لێی ڕازی بێت) کە شەرعزانێکی مەزن بووە کاتێك دەیفەرموو ئەو ژنە سکپڕەی مێردەکەی مردووە عیددەکەی بە دانانی منداڵەکەی دەبێتو ئەوە عیددەیە بۆی لەبەر ئەم ئایەتە پێبڕۆزە بووە کە دەفەرموێت: ﴿وَأُوْلَٰتُ ٱلۡأَحۡمَالِ أَجَلُهُنَّ أَن يَضَعۡنَ حَمۡلَهُنَّۚ﴾،[1] و ئەوەیشی کردۆتە بەڵگە کە سوورەتی تەلاق کە ئەو ئایەتەی تیادایە لەدوای سورەتی بەقەرە دابەزیوە، کە ئەم ئایەتەی تیادا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿وَٱلَّذِينَ يُتَوَفَّوۡنَ مِنكُمۡ وَيَذَرُونَ أَزۡوَٰجٗا يَتَرَبَّصۡنَ بِأَنفُسِهِنَّ أَرۡبَعَةَ أَشۡهُرٖ وَعَشۡرٗاۖ﴾[2] بەم بەڵگە هێنانەوەیەش ئاماژە بە یەکێك لە یاساکانی زانستی ئوصوڵ دەکات کە دەڵێت: (إن النص اللاحق، ينسخ النص السابق: دەقی

١ الطلاق (٤).

٢ البقرة (٢٣٤).

دواتر دەقی پێشوو دەسڕێتەوە)، هەرچەندە ڕاستەوخۆ ئاماژەی بەمە نەکردووە،[1] بێگومان هەموو شتێکیش هەروایە، لە سەرەتادا دێتەدی، جا دواتر هەموار دەکرێت،و ڕێکدەخرێت،و کۆدەکرێتەوەو دەنووسرێتەوە،و ئەو کۆکردنەوەیەش سەلمێنەری ئەوەیە کە پێشتر هەبووە، هەروەك زانستی نەحو،و لۆژیك (منطق) کە پێشتر عەرەبەکان فاعیلیان مەرفوع کردووە،و مەفعولیان لە قسەکردندا مەنصوب کردووە، کەچی هێشتا زانستەکە نەنوسرابوویەوە،و چەندەها یاسای تری نەحو هەن، کە جێ بە جێ کراون، پێش ڕێکخستنو نوسینەوەو ڕێکخستنی زانستی نەحو،و خەڵکانی ژیرو وریا باسی شتی بەڵگەنەویست (بدیهی) یان کردووە، پێش ئەوەی کە زانستی لۆژیكو یاساکانی زانستی لۆژیك (مەنطیق) بنووسرێنەوە.

کەواتە زانستی ئوصوڵی فیقهـ هاوشانی فیقهەو لەگەڵ ئەودا سەریهەڵداوەو تەنانەت پێش زانستی فیقهیش هەبووە، چونکە ئوصول کۆمەڵە یاسایەکە بۆ دەرهێنانی فیقهـ و تەرازووی بیروڕاکانە، بەڵام تا ئەو کاتە ئاتاجمان نەبوو بە نوسینەوەیو ڕێکخستنی.

بۆیە لە سەرەتاداو لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) هەر پێویستمان بە قسەکردن لەسەری نەبوو، چ جای نووسینەوەی، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) خۆی سەرچاوەی فەتواو ڕوون کەرەوەی ئەحکامبوو هیچ پێویستیەك لەو سەردەمەدا نەبووە، بە ئیجتیهادکردنو فیقهـ، جا کە ئیجتیهاد نەبوو کەواتە پەیرەوی هەڵهێنجاوی حوکمیش نی یەو، ئیتر پێویست بە یاساو ڕێساش ناکات.

٨- دوای کۆچی دوایی پێغەمبەر (ﷺ) ڕووداوی زۆر جۆراوجۆر ڕوویاندا کە دەبوو بە ئیجتیهادکردنو دەرهێنانی یاساو ئەحکام لە قورئانو سوننەت ڕووبەڕوویان ببنەوە، بەڵام لەم نێوەندەدا ئەوە هەبوو کە شەرعزانانی هاوەڵان (خوا لێ یان ڕازی بێت)، پێویستیان بەوە نەبوو کە قسە لەسەر یاساکانی ئیجتیهادو ڕەوگەی بە بەڵگەهێنانەوەو هەڵهێنجان بکەن، چونکە زمانی عەرەبیو ڕەوتی زمانەکەیان دەزانیو هەروەها ڕەهەندی بەبەڵگەبوونی زاراوەو دەستەواژەکانیان وەك خۆی دەزانی، چونکە نهێنیو هونەری ڕاستەقینەی شەرع دانانیان پێ شارەزابووو هەروەها زانابوون بە هۆکارەکانی هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی قورئانو دەربڕینی فەرموودەکان.

پەیڕەوی ئەم کۆمەڵە لە دەرهێنانی ئەحکامدا، ئەوەبوو کە هەرکات ڕووداوێکیان بهاتایە بەردەست هەوڵیان دەدا حوکمەکەی لە قورئانی پیرۆزدا بدۆزنەوە، ئەگەر لە قورئاندا

---

[1] شرح التوضیح، للتنقیح، ب ١، ل ٣٩.

دەستیان نەکەوتایە، پەنایان دەبردە بەر سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا لەوێ دەستی بخەن‌و ئەگەر لە سوننەتیشدا دەستیان نەکەوتایە ئەوا ئیجتیهادیان دەکردو ئیجتیهادەکەشیان لەبەر ڕۆشنایی ئەو زانینەی خۆیاندا بوو، کە هەیانبوو سەبارەت بە ئامانجەکانی شەریعەت، هەروەها لە ڕوانگەی ئەو ئاماژانەوە ئیجتیهادیان دەکرد کە لە دەقەکان دەفامرانەوە، بۆیە تووشی هیچ سەختی نەدەبوون لە ئیجتیهاد کردنداو ئیتر پێویستیان بە نووسینەوەی یاساکانی ئوصولێ نەبوو، ئەمەش هۆکارەکەی ئەوەبوو کە ئەو حەزە فیقهیەی هەیانبوو ئاسانکاری لەم بارەیەوە بۆ دروست کردبوون کە ئەم زەوق‌و حەزە فیقهیەیشیان لەمەوە بۆ دروست بووبوو کە زۆر هاوەڵایەتی پێغەمبەریان (ﷺ) کردبووو زۆر لەخزمەتیدا بووبوون، ئەمەش سەرەڕای ئەوەی کە خۆیشیان بیر تیژو دەروون خاوێن‌و خاوەن هەستی باڵاو مەزن بوون. بەم جۆرە سەردەمی هاوەڵان بەڕێ کراو یاساکانی ئەم زانستی ئوصولی فیقهە ڕێك نەخران‌و هەروەها شوێنکەوتوانی ئەوانیش (التابعین) ئەم کارەیان هەر نەکردو لە هەڵهێنجانی حوکمدا هەر لەسەر پەیڕەوی هاوەڵان ڕۆیشتن، چونکە هێشتا سەردەمەکەیان نزیك بوو لە سەردەمی پێغەمبەرەوە (ﷺ)و هەروەها شەرع لەسەر دەستی هاوەڵان فێربیبون‌و زانستیان لەوان وەرگرتبوو، بۆیە هێشتا پێویستیان بەوە نەبوو زانستی ئوصولی فیقهـ بنووسنەوەو ڕێکی بخەن.

٩- بەڵام لەدوای بەکۆتاهاتنی سەردەمی تابعین، جیهانی ئیسلامی فراوان بووو ڕووداوی زۆرو جۆراوجۆرتر ڕوویانداو عەجەمەکان (بێگانە) تێکەڵی عەرەبەکان بوون‌و ئیتر زمانی عەرەبی بە پاراوییەکەی خۆی نەمایەوەو، لێرە ئیجتیهادو خەڵکی موجتەهید زۆربوون،و ڕێگاکانی هەڵهێنجانی حوکم زۆربوون‌و، ڕکابەری‌و چەلەحانێ‌و گفتوگۆی ناتەبا هاتنە ئاراو، لایەنی تێکەڵ‌و پێکەڵ‌و مانای زۆرهەڵگر دروست بوون‌و بەهۆی هەموو ئەمانەوە شەرعزانەکان هەستیان بەوەکرد کە کۆمەڵێك یاساو ڕێساو بنەما بۆ ئیجتیهادکردن دابنێن، تا موجتەهیدەکان لەکاتی ڕاجیاییدا بگەڕێنەوە بۆ ئەو یاسایانەو هەروەها تا ئەو بنەمایانە ببنە سەنگی مەحەك بۆ زانستی فیقهو ڕای دروست لێیانەوە سەرچاوە بگرێت.

ئەم یاساو بنەماگەلەیش لە زمانی عەرەبی‌و ناوەڕۆکەکەی‌و ئامانج‌و نهێنییەکانی شەریعەت‌و، ڕەچاوی بەرژەوەندی‌و پەیڕەوی هاوەڵان، لە بەڵگە هێنانەوە وەرگیرابوون‌و ئیتر لەم یاساو باس گەلە ((زانستی ئوصولی فیقهـ)) هاتە پێکهاتن.

١٠- ئەم زانستە بەشێوەی نوسراوو کۆکراوە، بەدەرکەوت لەسەر شێوەی کۆمەڵێك یاساو ڕێسا، کە لە قسەی شەرعزانەکان‌و ڕاشەکانیان لەسەر حوکمەکان وەرگیرابوون، جا کە شەرعزانێك باسی حوکمێکی دەکردو بەڵگەکەی بۆ دەهێناو ڕووی ئەو بەڵگەی

شیدەکردەوەو دیاری دەکرد لەم سەروبەندەدا تیشکی ئەم زانستە دەردەکەوت هەروەك پرۆسەی ڕاجیایی نێوان شەرعزانەکان (الخلاف بَيْن الفقهاء) بە کۆمەڵێك یاسای ئوصولّی دەڕۆیشت بەڕێوە کە هەر شەرعزانەو ئەو یاسا ئوصولّیانەی پشت پێ دەبەست، تا ڕاکەی خۆی بەهێز بکاتو بسەلمێنێتو، مەزهەبەکەی خۆی سەربخاتو چاوگی ئیجتیهادەکەی ڕوون بکاتەوەو ئەمەش شتێکە زانستی ئوصولّی زیاتر ڕۆشن دەکردەوە.

١١- گوتراوە کە یەکەم کەسێك لە زانستی ئوصولّی فیقهدا نووسیویەتی زانا ئەبویوسفی هاوەڵی ئیمام ئەبو حەنیفە بووە، بەڵام هیچ لەو کتێبو نووسراوانەیمان بە دەست نەگەیشتووە.

قسەی باو لای زانایان ئەوەیە کە یەکەم کەسێك ئەم زانستەی نووسییەوەو کۆکردەوەو لە کتێبی سەربەخۆدا داینا پێشەوا موحەممەدی کوڕی ئیدریسی شافعی بووە کە لەساڵی (٢٠٤)ی، کۆچیدا وەفاتی کردووە.[١]

ئیمامی شافعی کتێبی (الرسالة)ی، لەم زانستەدا داناوە، کە زۆر بەناوبانگەو تیایدا قسەی لەسەر قورئان کردووەو ڕوونکردنەوەکانی قورئانی بۆ ئەحکامەکان باس کردووە

هەروەها ڕوونکردنەوەی سوننەت بۆ قورئانو باسی ئیجماعو قیاسو (الناسخ)و (المنسوخ)و ئەمرو نەهیو ئاستی بە بەلگەبوونی فەرموودەی یەك کەس لە ڕیوایەتداو چەندەها بابەتی تری ئوصولی لەم کتێبەیدا باسکردووە.

پەیڕەوی ئیمامی شافعی لە کتێبی (الرسالة) دا پەیڕەوێکی ووردو قوڵەو ئەوەی دەیڵێت بە بەلگەو دۆکیۆمێنت سەلماندوویەتیو توێژینەوەی بیروڕای بەرامبەرەکانی خۆیی بە شێوەیەکی زانستیانەی پتەو کردووە.

لەدوای ئیمامی شافعی، پێشەوا (ئەحمەدی کوڕی حەنبەل) کتێبێکی سەبارەت بە گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) نووسیوەو هەروەها پەراوێکی سەبارەت بە (الناسخ والمنسوخ)و کتێبێکی دەربارەی (العلل: فاکتەرەکان) داناوەو دواتر زانایان بە شوێنیاندا دەستیان دایە

---

١ لای زانای پایەبەرز مەحمود شەهابی خوراسانی لە پێشەکی کتێبی (فوائد الأصول) دا لە (الحجة النائيني)ی شێخ موحەممەد عەلی کازمی خوراسانی یەوە هێناویەتی کە گوتویەتی: ژمارەیەك لە زانا پایەبەرزەکانی وەك (إبن خلكان)و (إبن خلدون)و حاجی خەلیفەی خاوەنی (كشف والظنون) ئەوەیان درکاندووە کە یەکەم کەسێك لە زانستی ئوصولّی فیقهدا کتێبی داناوە ئیمامی شافعی بووە، بەڵام ئەمە یەکلاکەرەوە نی یە، بەڵکو بۆی هەیە کە (أبو يوسف يعقوب بن إبراهيم) کە یەکەم کەسە نازناوی ( قاضي القضاة) هەبووە، پێش ئیمامی شافیعی لە ئوصولّدا کتێبی دانابێت.

نووسـینو، باسـەکانی ئوصـوڵیان بەتـەواوی ڕێکخـستو فراوانیـان کـردو زۆر زیادەیـشیان خستەسەر.

## ١٢- ڕەوگەی زانایان لە توێژینەوەی زانستی ئوصولی فیقهدا :-

زانایـان دەربـارەی توێژینـەوەی زانـستی ئوصـوڵی فیقهـ، تـەنها یـەك ڕەوتو ڕێگـەیان نەگرتۆتەبەر، بەڵكو خاوەنی چەند ڕەوتو میتۆدێكی جیان، هەیانـە كـە پـەیڕەوی داڕشـتنی یاساو بنەما ئوصولیەكانی گرتۆتەبەر بە پشت بەستن بە بەڵگەو دۆكیۆمێنت، بـەبێ گوێدانـە ئەوەی كە ئایا ئەو یاساو بنەمایانە كۆكن یان پێچەوانەن، لەگەڵ ئەو لقـە فیقهیانـەی كـە لـە پێشەوا موجتەهیدەكانەوە وەرگیراون، ئەمە ئاڕاستەیەكی تیۆری یە، مەبەسـت لێـی ئەوەیـە كە بنەڕەتی ئەم زانستە دابڕێژنەوە، بەو شێوازەی كـە بەڵگـەكان دەری دەخـەنو دەلالـەتی لەسـەر دەكـەن،و ئـەو یاسـاو بناغەیـە دەكەنـە پێـوەر بـۆ كـۆنترۆڵ كردنـی ئـەو پرۆسـەی بەڵگەهێنانەوەیـە (الأسـتدلال)، و هـەروەها ئـەو یاسـاو ڕێو شـوێنانە كراونەتـە پێـوەر بـۆ ئیجتیهادی زانا موجتەهیدەكانو نەكراونەتە خزمـەتگوزاری چـڵو پۆپـەو لقـی مەزهەبـەكان، ئـەم میتـۆدەیش بـە میتـۆدو ڕەوگـەی موتەكـەللمین ناسـراوەو لـەم بارەیـەوە موعتەزیلـەو شافعیو مالكیو زانایانی جەعفەری لە سەرەتادا كە فیقهیان نوسیەوە لەسەر ئـەم میتـۆدە دەڕۆیشتن، هەرچەندە دواتر جەعفەرییەكان ئەم میتۆدەیـان تێكـەڵ كـرد لەگـەڵ میتـۆدێكی تردا كە بریتی بوو لە داڕشـتنەوەی یاسـاكانی ئوصـوڵ لەبـەر ڕۆشـنایی پرسـە لاوەكیـەكانی مەزهەبەكاندا.[1]

ئەم میتۆدە پشت بە ئیستیدلالی عەقڵی دەبەستێت، لـە داڕشـتنی یاسـاكانی ئیجتیهـادداو دەمارگیری بۆ مەزهەبەكان نی یەو كەمتر باس لە بابەتە فەرعییەكان دەكاتو ئەو باسـكردنە كەمەیش تەنها بۆ نموونە هێنانەوەیەو هیچی تر.

١٣- ژمارەیەك لە زانایانی تر لەسەر میتۆدێكی تر دەڕۆن، كە بریتی یـە لـە داڕشـتنەوەی یاسا ئوصولیەكان لەسەر ئەو شێوازەی كە لـە پێـشەواكان وەرگـیراوە، لـە بابەتـە فەرعییـە فیقهییەكاندا، واتـە ئـەم زانایانـە ئـەو یاسـا بنـچینەییانەیان دانـاوە، كـەوای بـۆ دەچـن كـە پێشەوای مەزهەبەكانیان لەكاتی ئیجتیهادكردنو دەرهێنانی ئەحكامدا ڕەچـاویان كـردوون، ئەم كارەشییان لەبەر ڕۆشـنایی ئەوەدایـە كـە لـە بابەتـە فەرعییـە فیقهییەكانـدا گەیـشتۆتە دەستیانو زانایانی حەنەفی وا ناوبانگیان دەركردووە كە شوێنكەوتەی ئەم جۆرە میتۆدەنو

---

١ محاضرات في أصول الفقه الجعفري للشيخ محمد أبو زهرة، ل ٢٢

تەنانەت ئەم ڕەوتە بە میتۆدی حەنەفییەکان ناسراوە.

ئەم ڕەوگە و میتۆدە بەوە ناسراوە کە زیاتر شێوە ڕەوتێکی کرداری (الطابع العملي) وەرگرتووەو خۆی لە خۆیدا توێژینەوەیەکی کرداریو جێ بەجێ کاریو پراکتیزەییە بەسەر بابەتە فەرعییە فیقهییەکاندا، ئەوانەی کە لە پێشەوای مەزهەبەکانەوە گەیشتۆتە دەستیانو، هەروەها ڕەوگەیەکە بۆ دەرهێنانی یاساو ڕێساو بیردۆزەکانی زانستی ئوصولّ، کە ئەو پێشەوایانە لەکاتی هەڵهێنجانو ئیجتیهادکردنەکانیاندا ڕەچاویان کردوون، بۆیە ئەم میتۆدە ئەو یاساو ڕێسایانە دادەڕێژێتەوە کە لە خزمەت بابەتە فەرعییەکانی مەزهەبدان، تەنانەت ئەگەر یاسایەکی ئوصولّی لەگەڵ ڕیوایەتێکی فیقهیدا نەگونجابا ئەوا یاساکەیان دەسکاری دەکردو هەمواریان دەکردەوەو وازیان لەو ڕیوایەتە نەدەهێناو پەیڕەوانی ئەم میتۆدە بەرگری سەرسەختانە دەکەن لە ڕەوگەی پێشەوایانی ئەم مەزهەبە، لەکاتی ئیجتیهادکردنیانداو هەروەك زانای پایەبەرز (ئیبن خەلدون) یش دەڵێت: ئەم ڕەوتەو میتۆدەکەی زۆر گونجاوترن بۆ بابەتە فەرعییەکان،و نزیکتریشن لە خودی فیقهەوە.[1]

١٤- لەکاتی توێژینەوەی ئەم زانستەدا میتۆدی سێیەمیشم بۆ دەرکەوتووە، کە بریتی یە لە کۆکردنەوەی هەردوو ڕەوتەکەو، ئاشکراکردنی نهێنییەکانی ناخی پەیڕەوانیو، ئەم میتۆدە نوێیەش هەڵدەستێت بە داڕشتنەوەی ئەو یاساو بنەما ئوصولّیانەی کە لەسەر بەڵگە بنیات نراونو، ئەم کارەیش بەشێوەیەکی بێ لایەنانە ئەنجام دەدەن، تا ببێتە پێوەر بۆ هەڵهێنجانەدنو، ببێتە چاودێر بەسەر سەرجەم بیروڕاو ئیجتیهادەکانەوە، لە گەڵ ڕەچاوکردنی ئەو شتانەی کە لە پێشەواکانەوە گواستراوەتەوە، سەبارەت بە بابەتە فەرعییە فیقهییەکانو، هەروەها کاردەکات بۆ ڕوونکردنەوەو ڕاڤەکردنی ئەو بنەمایانەی کە ئەو بابەتە فەرعییانەی لەسەر بنیات نراونو، هەروەها سەرجەم یاساو بنەماکان پراکتیزە دەکاتو، دەیانبەستێتەوە پێیەوەو، دەیانکاتە خزمەتگوزاری فەرعەکانو زانایانی سەرجەم مەزهەبە جیاوازەکانی شافعیو مالکیو حەنبەلیو جەعفەریو حەنەفی لەناو پەیڕەوانی ئەم ڕەوتەدا بوونیان هەیە.

١٥- لەو کتێبانەی کە لەسەر میتۆدی موتەکەللمین دانراوە، وەك کتێبی (البرهان)ـی، ئیمامی حەڕەمەین، کە ناوی عەبدولمەلیکی کوڕی عەبدوڵڵای جوەینی شافعییەو لەساڵی (٤١٣)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو، هەروەها کتێبی (المستصفى)ـی، ئیمامی غەزالی، کە شافعی مەزهەب بووەو لەساڵی (٥٠٥)ـی، کۆچی دنیای بەجێ هێشتووەو هەروەها کتێبی

---

١ مقدمة إبن خلدون، ل ٤٥٥.

(المعتمد)ـی، ئەبی حوسەین محەمەدی کوڕی عەلی بەصرەیی، کە موعتەزیلە بووەو لەساڵی (٤١٣)ـی، کۆچی وەفاتی کردووە، و ئەم سێ کتێبە لە لایەن پێشەوا (فەخرەدینی ڕازی) یەوە کورتو پوخت کراونەتەوە، کە ئیمامی ڕازی شافعی مەزهەب بووەو لەساڵی (٦٠٦)ـی، کۆچی وەفاتی کردووە، هەروەك دیسانەوە پێشەوا سەیفەدینی ئامێدی شافعی کوردی پوختی کردوونەتەوەو زانیاری لەسەر زیادکردوون‌و، ئەم کارەی لە پەڕتوکێکدا ئەنجام داوە کە ناوی ناوەتە (الإحکام، في أصول الأحکام)، و ئیمامی ئامێدی لەساڵی (٦٣١)ـی، کۆچی لە دنیا دەرچووە.[1]

سەبارەت بەو کتێبانەی کە لەسەر ڕەوتی زانایانی حەنەفی دانراون، گرنگترینیان بریتین لە کتێبی (الأصول)ـی، ئەبوبەکر ئەحمەدی کوڕی عەلی ناسراو بە (جەصاص)، کە لەساڵی (٣٧٠)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو، هەروەها کتێبی (الأصول)ـی، ئەبوزەید عەبدوڵڵای کوڕی عومەری دەببوسی، کە لەساڵی (٤٣٠)ـی، کۆچی دنیای بەجێ هێشتووەو، هەروەها کتێبی (الأصول)ـی، فەخرولئیسلام عەلی کوڕی محەمەدی بەزدەوی کە لەساڵی (٤٨٣) ی کۆچی وەفاتی کردووەو هەروەها شەرحەکەی سەر ئەم کتێبە کە ناوی (کشف الأسرار)ـە، و عەبدولعەزیزی کوڕی ئەحمەدی بوخاری لەسەری نووسیوە، لە پەڕتوکەکانی ئەم میتۆدەن‌و ئەم عەبدولعەزیز بوخاریە لەساڵی (٧٣٠)ـی، کۆچی دنیای بەجێ هێشتووە.

لەو کتێبانەی کە لەسەر ئەو میتۆدە دانراون کە کۆکەرەوەی هەردوو ڕەوتەکەیە. وەك کتێبی (بدیع النظام) کە کۆکەرەوەی هەردوو کتێبەکەی بەزدەوی‌و ئامێدی یەو، پێشەوا مظفر الدین ئەحمەد کوڕی عەلی ساعاتی حەنەفی دایناوە، کە لەساڵی (٦٤٩)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو هەرواها کتێی (التنقیح)و (التوضیح) کە شەرحە لەسەری‌و صدر الشریعة عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودی حەنەفی دایناون، کە لەساڵی (٧٤٧)ـی، کۆچی دنیای بەجێ هێشتووە، و هەروەها کتێبی (شرح التوضیح) کە دانراوی شێخ سەعدەدینی مەسعودی کوڕی عومەری تەفتازانی یەو، ئەمیش لەساڵی (٧٩٢)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو هەروەها کتێبی (جمع الجوامع)، نوسراوی تاج الدین عەبدولوەهابی کوڕی عەلی سوبکیە، کە شافعی مەزهەب بووەو لە ساڵی (٧٧١)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو، هەروەها کتێبی (التحریر)ـی، ئیبن هومامی حەنەفی، کە لە ساڵی (٨٦١)ـی، کۆچی وەفاتی کردووەو هەروەها کتێبی

---

١ هەروەها جەنابی زانای پایەبەرزی کورد، مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مودەڕیس (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، (المستصفی)ـی، ئیمامی غەزالی کە ناومان برد، کورتو پوختی کردووەو ناوی ناوەتە (صفوة اللآلي من مستصفى الإمام الغزالي)و چاپکراوە. (وەرگێڕ)

(التقرير و التحبير)، كە شەرحی تەحریرەو موحەمەدی کوڕی موحەمەدی ئەمیر حاجی حەڵەبی، کە قوتابی ئیبن هومام بووە، ئەو شەرحەی نوسیوە لەسەری، و ئەمیش لە ساڵی (٨٧٩)ی، کۆچیدا وەفاتی کردووەو هەروەها کتێبی (مُسَلَّم الثبوت)ی، موحیەددین کوڕی عەبدولشەکور، کە لە ساڵی (١١١٩)ی، کۆچی دنیای بەجێهێشتووەو هەروەها ئەو شەرحەی کە زانای پایەبەرز (عبدالعلي محەمەدی کوڕی نظام الدینی ئەنصاری) لەسەر (مُسَلَّم الثبوت)ی، نووسیووە، ئەمەو چەندەهای تر لەو کتێبانەن کە لەسەر ئەم پەیڕەوەی کۆکەرەوەی نێوان دوو میتۆدەکە نوسراون.

ئینجا سەبارەت بەو کتێبانەی کە لەلای زانایانی جەعفەری گرنگن، وەك کتێبی (الذريعة إلى أصول الشريعة)ی سەیید شەریفی مورتەضا، کە لە ساڵی (٣٣٦)ی، کۆچی وەفاتی فەرمووەو هەروەها کتێبی (عدّة الأصول)ی، شێخ ئەبوجەعفەر محەمەدی کوڕی حسەینی کوڕی عەلی طوسی، کە لە ساڵی (٤٦٠)ی، کۆچی وەفاتی کردووە.[1] لە کتێبەکانی دوای ئەم پێڕەیش، پەرتوکی (القوانين) دێتە پێش، کە ئەبوحەسەنی گەیلانی دایناوەو لە ساڵی (١٢٠٥)ی، کۆچی لە نووسینی بووەتەوەو لە کتێبە هاوچەرخەکانیشیان وەك پەرتوکی (العناوين)، کە شێخ محەمەد مەهدی خالصی کاظمی دایناوەو لە ساڵی (١٣٤١)ی، کۆچی لە نووسینی بوەتەوە.

### ١٦- میتۆدی توێژینەوەی زانستی ئوصولْ:

باسەکانی زانستی ئوصولی فیقهـ، بریتین لە باسی حوکمی شەرعیو بەڵگەی حوکمی شەرعیو ڕێگاو ڕێبازی هەڵهێنجانی ئەو حوکمەو، باسی خودی هەڵهێنجەر، واتە: موجتەهیدەکە، لەو ڕووەوە کە ئایا تا چەند گونجاوەو لەو ئاستەدایە کە ئیجتیهاد بکات.

- لەم ڕوانگەیەوە، باسەکانی ئەم کتێبە، بەم شێوازەی لای خوارەوە دابەش دەکەین:
- **بەندی یەکەم:** دەربارەی حوکمە.
- **بەندی دووەم:** دەربارەی بەڵگەی ئەو حوکمانەیە.
- **بەندی سێیەم:** ڕێگاکانی دەرهێنانی حوکمو بنەماکامی حوکمو پاشکۆکانی ئەمانەیە، وەك: یاساکانی یەکلاکردنەوە (الترجيح) و باسی ناسیخو مەنسوخ.
- **بەندی چوارەم:** باسی ئیجتیهادو مەرجەکانی، و کەسی موجتەهیدو تەقلید و مانای تەقلید کردنە.

---

[1] فوائد الأُصول، ل ٥.

# «بەندی یەکەم»

# باسەکانی حوکم - بەشی یەکەم - حوکم و بەشەکانی

## ( بەشە باسی یەکەم )

## پێناسەی حوکم و بەشە بنەڕەتییەکانی

١٧- زانینی حوکمی شەرعی، ئامانجی سەرەکییە لە فیقهـ و ئوصولی فیقهدا، بەلاّم زانستی ئوصولّ لە ڕوانگەی دانانی ئەو یاساو ڕێسایانەوەو، ڕێگەی گەیشتن پێیان لە پرسەکە دەڕوانێت و، زانستی فیقهـ، لە ڕوانگەی هەلّهێنجانی کرداری حوکمەکەوە سەیری دەکات، ئەویش بە جێبەجێ کردن و پراکتیزە کردنی ئەو ئامرازانەی کە زانستی ئوصولّی فیقه، دایناون، بۆ گەیشتن بەو زانیارییانە.

حوکم لەلای زانایانی ئوصولّ، بریتی یە لە فەرمایشتی پەروەردگار، ئەو فەرمایشتەی کە پەیوەستە بە کارو کردەوەی کەسانی گەورە (مكلَّف)، لە ڕووی داواکردن، (إقتضاء)، یان سەرپشك کردن (التخيير)، یان لە ڕووی دانان (وَضع)[1]ـەوە، بێت.

مەبەست لە فەرمایشتی پەروەردگار (خطاب الله)، بریتی یە لە فەرمایشتی ڕاستەوخۆی خودای مەزن، کە قورئانی پیرۆزە، یاخود بەهۆی نێوەندگیرێکەوە فەرمووبێتی، کە لە فەرمایشتی ئەو زاتە سەرچاوەی گرتبێت. وەك سوننەت و ئیجماع و، ئەو بەلگە شەرعییانەی تر، کە شەرعدانەر، کە پەروەردگارە لە بنەڕەتدا دایناون، تا حوکمەکان بزانرێت.

سوننەت: ئەوەیە کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بەمەبەستی شەرعدانان دەربڕدراوەو، سوننەتیش لە چاوگی فەرمایشتی پەروەردگار وەرگیراوەو، ڕوونکەرەوەیە بۆی و، سروشی پەروەردگارە، بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ۝٣ إِنْ هُوَ

---

١ فواتح الرحموت، بشرح مسلَّم الثبوت، ب١، ل (٥٤)، و إرشاد الفحول، دانانی، ئیمامی شەوکانی، ل (٥).

﴿إِلَّا وَحۡيٞ يُوحَىٰ ٤﴾.[1] پێغەمبەر (ﷺ) هەر لە خۆیەوە قسە ناکات‌و، بەڵکو سروشی خودایە دەری دەبڕێت.

ئیجماعیش بە تۆبزی پێویستی بە بەڵگەی قورئان‌و فەرمووده هەیەو بەم پێودانگەیش بێت، ئەویش دەگەڕێتەوە بۆ فەرمایشتی پەروەردگارو هەر سەر بەوە.

هەروەها بەڵگە شەرعییەکانی دیکەیش سەرجەمیان ڕاڤیارو ڕوونکەرەوەو ئاشکراکاری فەرمایشتەکانی پەروەردگارن‌و، ڕۆشن کەرەوەی حوکمی شەرعین‌و، ناتوانن جێگیر (ثابت)ی بکەن.

مەبەست لە (الأقتضاء)، واتە داواکردن (الطلب)، ئیتر داواکردنەکە لە ڕووی کردن یان نەکردنەوە بێت، چونیەکەو، هەروەها چونیەکە کە ئایا ئەو داواکردنەوە بەجۆرێك لە جۆرەکان، داواکراوە کە بە تۆبزی بکرێت، یان بەو جۆرە هاتووە، کە (واباشترە، وابکرێت)ی، لێ بفامرێتەوە، واتە (تەرجیح) بکرێت.

مەبەست لە (التخییر: سەرپشك کردن)، ئەوەیە کە سەرپشکە لەنێوان کردن یان نەکردنی ئەو کارەدا، بەبێ ئەوەی کە لایەکیان بخات، بەسەر لایەکی تردا، و کابرای موکەللەف هەرکامیان ئەنجام بدات، هەر بۆی دروستە.

مەبەست لە (الوَضع: دانان)، ئەوەیە کە شتێك بکرێتە فاکتەرو هۆکار بۆ شتێکی ترو، ببێتە مەرج بۆ کردنی، یاخود بۆ نەکردنی.[2]

خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَوۡفُواْ بِٱلۡعُقُودِ﴾[3] ئەی باوەڕداران، بە گرێبەستەکانتانەوە پابەند بن، ئەمە حوکمێکی شەرعی یە، چونکە فەرمایشتی پەروەردگارەو، پەیوەستە بە کارێك لە کارەکانی مسوڵمانە باڵغ بووە ژیرەکان (مکلَّف)، کە ئەویش پابەندبوونە بە گرێبەستەکانەوەو، لە ڕووانگەی داواکاریشەوە فەرموویەتی کە ئەنجام بدرێت.

---

١ النجم (٣-٤).

٢ لێرەوە ناوزەدکردنی شتێك بەوەی کە (صحیح) دروستە، یان بەتاڵە، یان خراپ (فاسد)ـە، ناودەنرێت، هەروەك لە جێگای خۆیدا باسیان دەکەین.

٣ المائدة (١).

هــەروەها پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُواْ ٱلزِّنَىٰٓۖ إِنَّهُۥ كَانَ فَٰحِشَةً وَسَآءَ سَبِيلًا ﴿٣٢﴾﴾[1] کە ئەمەیش حـوکمێکی شـەرعی یـە، چـونکە فەرمایـشتی خـودی شـەرعدانەرە، کـە خودای مەزنەو، تیایدا داوای کردووە، کە کارێك هەیە ئەنجام نەدرێت، کە داوێن پیسی یە.

وە هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَٱصْطَادُواْۚ ﴾[2] کە ئەمەیش حوکمێکی شـەرعی یـە، چـونکە بێـژەی خودایـە، کـە ڕاوکردنـی حـەڵاڵ کـردووە، لـە دوای ئیحـرام شـکاندن‌و بەجێهێشتنی حەرەم.

هــەروەها پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِى ٱلْأَرْضِ﴾[3] کــە ئەمــەیش حــوکمێکی شــەرعی یــە، چــونکە ئــەمیش هــەر فەرمایــشتی پــەروەردگارە، کــە بڵاوبوونەوەی بەسەر زەویدا، لە دوای لێبوونەوە لە نوێژی هەینی حەڵاڵ کردووە.

هــەروەها پــەروەردگار دەفــەرموێت: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا ﴾[4] کە ئەمەیش حوکمێکی شـەرعی یـە، چـونکە بێـژەی پـەروەردگارە، کـە حـەجکردنی لەسـەر کەسانی موکەللەف واجب کردووە.

هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓاْ أَيْدِيَهُمَا جَزَآءًۢ بِمَا كَسَبَا ﴾[5] کە ئەمەیش حوکمێکی شەرعی یە، چونکە فەرمایشتی زاتی خودایە، کە دزی کردۆتـە هۆکـار بۆ واجب بوونی بڕینی دەستی دزی پیاوو ژن.

هــەروەها خــودای مــەزن دەفــەرموێت: ﴿ أَقِمِ ٱلصَّلَوٰةَ لِدُلُوكِ ٱلشَّمْسِ ﴾[6] کــە ئەمــەیش حوکمێکی شەرعی یە، چونکە فەرمایشت (خطـاب)ی پـەروەردگارە، کـە لادانـی خـۆری لـە نیوەی ئاسمان ڕوو بە ڕۆژئاوای[7] کردۆتە فاکتەر، بۆ واجب بوونی نوێژی نیوەڕۆ.

---

١ الأسراء (٣٢).

٢ المائدة (٢).

٣ الجمعة (١٠).

٤ آل عمران (٩٧).

٥ المائدة (٣٨).

٦ الأسراء (٧٨).

٧ الدُلُوك: لادانی خۆرە لە نیوەی ئاسمان، بەلای ڕۆژئاوای ئاسماندا.

هەروەها فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) کە فەرموویەتی: ((رُفع القلم عن ثلاثة، عن النائم حتى يستيقظ، و عن الصبيّ حتى يحتلم، و عن المجنون حتى يفيق)) واتە: سێ جۆر کەس تاوانیان لەسەر نییە، و لەو حاڵەتەیاندا لەسەر کردەوەکانیان سزا نادرێن، کەسی خەوتوو، تا بەخەبەر دەبێتەوەو، منداڵ تا باڵغ دەبێتو، شێت تا چاك دەبێتەوە، ئەمانە تا ئەو حاڵەتەیان لەسەر لادەچێت، هەر کارێکی نەشیاویان کرد، چاوپۆشیان لێ دەکرێت، ئەمەیش فەرمایشتی شەرعدانەرە، کە خودای مەزنەو لەسەر زاری پێغەمبەر (ﷺ) دەری بڕیوەو، وای داناوە، کە خەوو منداڵیو شێتی کۆمەڵە هۆکارێکن کە تەکلیف لەسەر شانی ئەو ئەنجام دەرەیان لادەبەنو، تا حاڵەتەکەی لەسەر لادەچێت، لە شەرعدا چاوپۆشی لێ کراوە.

**١٨- لە پێناسەی حوکمەوە، لەلای زانایانی ئوصول، دوو بابەت دێنە زانین:**

یەکەم: ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار، کە پەیوەستە بە کەسانی بێ ئەرك (غير مكلف)، ئەمە لەلای زانایانی ئوصولی فیقهـ، بە حوکم ناونەبراوە، وەك ئەو خیتابەی کە تایبەتە بە زاتو سیفاتەکانی خودای مەزن، وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٞ﴾[1]، خودا بە هەموو شتێ ئاگادارو زانایە، یان ئەو فەرمایشتانەی پەروەردگار کە پەیوەستن بەو مادده بێ گیانانەی کە دروستی کردوون وەك دەفەرموێت: ﴿وَٱلشَّمۡسَ وَٱلۡقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتِۭ بِأَمۡرِهِۦٓ﴾.[2] خۆرو مانگو ئەستێرەکان، ملکەچن بۆ فەرمانی خودای مەزن، هەروەها دەفەرموێت: ﴿أَلَمۡ نَجۡعَلِ ٱلۡأَرۡضَ مِهَٰدٗا ۝٦ وَٱلۡجِبَالَ أَوۡتَادٗا ۝٧﴾.[3] ئایا زەویمان نەکردۆتە لانکە بۆتانو، شاخەکانمان نەکردۆتە، مێخی داکوتراو بۆ ڕاگرتنی ئەو زەویە؟!

هەروەها ئەو خیطابو فەرمایشتانەی پەروەردگار کە پەیوەستن بە کارو کردەوەی مرۆڤە بەربارەکان (المكلّف)، بەڵام لەسەر شێوەی داوا (طلب)و سەرپشککردن (التخيير)و (الوضع: دانان) نەهاتوون، ئەمە لە چیرۆکە قورئانیەکاندا بوونی هەیە، وەك دەفەرموێت: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ

---

[1] النور (٣٥).

٢ الأعراف (٥٤).

٣ النبأ (٦-٧).

سِنِينَ ﴾.[1]

که ئەمە چیرۆکو گێڕانەوەی مێژووە، وە یان دەربارەی دروست کردنی دروستکراوەکانی دەفەرموێت: ﴿ وَٱللَّهُ خَلَقَكُمْ وَمَا تَعْمَلُونَ ﴿٩٦﴾ ﴾.[2] خودا دروستکەری خۆتانو ئەو بتانەیشە کە دروستتان کردوون، کە ئەمانە لای زانایانی ئوصول بە حوکم نەهێنراونەتە ئەژمار.

دووەم: خودی خیطابو فەرمایشتەکەی پەروەردگار لەلای زانایانی ئوصول بە حوکم هێنراوەتە ئەژمار، واتە خودی دەقو تێکستە شەرعییەکان حوکمن، بەلاّم لەلای شەرعزانەکان (الفقهاء)، حوکم بریتی یە لە شوێنەوارو جێ دەستەکانی ئەو خیطابەو ئەو مانایانەی کە دەیگرێتە خۆی، جا کە خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾[3]، ئەمە لەلای زانایانی ئوصول حوکمە، بەلاّم لەلای شەرعزانەکان، ئەوەی ئەم دەقە گرتویەتیە خۆی، کە حەرامی داوێن پیسی یە، ئەوە حوکمەکەیە.

## ١٩- بەشەکانی حوکمی شەرعی:

حوکم لەلای زانایانی ئوصولّ، دەکرێتە دوو بەشەوە[4]:

یەکەم: حوکمی تەکلیفی (ئەرکدار)، ئەوەیە کە داواکردنی ئەنجامدانی کارێك، یان دەستهێشتنیو نەکردنی تیادا دەفامرێتەوە، یاخود سەرپشکت دەکات لەنێوان کردن یان نەکردنی کارێکدا.

ئەم جۆرە حوکمەیش، بۆیە بە حوکمی تەکلیفی ناوزەد کراوە، چونکە ئەرکو تۆبزی

---

١ الروم (١-٤).

٢ الصافات (٩٦).

٣ الاسراء (٣٢).

٤ هەندێ لە زانایانی ئوصول حوکم دەکەنە سێ بەش:

أ- حوکمی داواکاردار، واتە داوای کردنی کارێك یان نەکردنی گرتۆتە خۆی.

ب- حوکمی سەرپشك دار: واتە سەرپشکت دەکات، لە نێوان کردن یان نەکردنی کارێکدا.

ت- حوکمی مەرج لەسەر دانراو (وضعی)، کە بریتی یە لەوەی کە شتێك بکرێتە مەرج بۆ کردنی کارێك یان شتێکی تر، و یان بکرێتە هۆکار، یان بکرێتە هۆکاری بەرپێ گرتنو نەکردنی، بروانە (الأمدی ب١/ل١٢٧)، ئەم دابەشکارییە وردترە، و نزیکترە لە پێناسەکەیەوە، بەلاّم ئێمە بۆیە ئەو دابەشکرانە دوانەییەی سەرەوەمان هێنا، چونکە زۆرینەی زانایانی ئوصول لەسەر ئەوەن.

تیادایە بۆ سەر شانی مرۆڤو، بێگومان هەر کارێك داواکرابێت بکرێت، یان نەکرێت، خۆی لە خۆیدا ئەمە ئەرکە، بەڵام ئەوەی کە مانای سەرپشك کردن دەدات، ئەمیش هەر خراوەتە سەر حوکمی تەکلیفی، بەڵام لەو ڕووەوە کە ئەمەیان ڕەهەندی چاو لێ پۆشین (التسامح)و، زاڵکردن (التغلیب) و لایەنی زاراوەیی (الأصطلاح)ـی، تیادا ڕەچاو کراوەو، سەبارەت بە ڕووە ئیصطیلاحییەکەی هیچ گرفتێکی تیادا نییە و بێ خەمە.

یاخود گوتراوە، کە دانانی (مُباح: ڕێگە پێدراو) لە چوارچێوەی بەشەکانی حوکمی تەکلیفیدا بەو پێودانگەیە کە ئەم کارە تایبەتە بە کەسی موکەللەف، واتە، موباح کران، یان سەرپشك کران (التخییر) لەنێوان کردن یان نەکردنی کارێکدا، هەر بۆ کەسێك دەبێت، کە شیاوە بۆ پابەند بوون بە کردن یان نەکردنی کارێکەوە، بۆیە لەم ڕەهەندەوەیە، کە (مُباح) خراوەتە چوارچێوەی حوکمی تەکلیفی، نەوەك ئەوەی کە (مُباح) ئەرك بێتو، لەسەر شانی مرۆڤ قورسی دروست بکات.

دووەم: حوکم لەڕووی دانانەوە (الحکم الوَضعي): ئەمیش ئەوەیە کە شتێك بکاتە فاکتەرو هۆکار، یان مەرج، بۆ کردن یان نەکردنی شتێکی تر.

ئەم حوکمەیش، بۆیە بە (وَضعي) ناوزەدکراوە، چونکە فاکتەر (سبب)و مەرج (شرط)و ڕێگر (مانع)ـی، کردوون، بە نێوەندگیر لەنێوان دوو شتداو، ئەمەش شەرعدانەر، کە پەروەردگارە، یان پێغەمبەرە (ﷺ) کە ئەویش هەر بە فەرمانی پەروەردگار کردوونی، دایناون، واتە، دانەری شەریعەت ئەو هۆکارە، یان ئەو مەرجە، یان ئەو ڕێگرەی دیاری کردووە، چونکە تەنها مافی ئەوەو، پێشتریش نموونەمان بۆ ئەم دوو جۆرە هێنایەوە.

## ٢٠- جیاوازی نێوان حوکمی (تەکلیفی)، و حوکمی (وَضعي):

أ- حوکمی تەکلیفی، ئەو حوکمەیە کە داوای کردنی کارێك، یاخود نەکردنی لێ دەفامرێتەوە، یان دروست بوونی (الأباحة) کردن یان نەکردنی کارێك، بۆ کەسی موکەللەف دەخاتە ڕوو، بەڵام حوکم لە ڕووی دانانەوە (وَضْعي)، ئەو ماناو سوودەی تیادا نی یە، چونکە مەبەست تیایدا ڕوون کردنەوەی ئەو فاکتەرانەیە، یان ئەو مەرجو ڕێگرانەیە، کە شەرعدانەر (الشارع) دایناون، تا کابرای موکەللەف ئەوە بزانێت، کە ئەو حوکمە شەرعیە، کەی دادەمەزرێو، کەی دانامەزرێتو، بەرچاوڕوون بێت، لەم بارەیەوە.

ب- ئەو شتەی کە کراوەتە ئەرکی سەر شان، دەبێت لە توانای کەسی موکەللەفدا

بێت‌و، شتێك بێت، كه كه‌سی موكه‌لله‌ف توانای كردن یان نه‌كردنی ئه‌و كاره‌ی هه‌بێت، چونكه مه‌به‌ست له (ئه‌رك: تكليف)، ئه‌مه‌یه كه كابرای ئه‌ركدار ئه‌و ئه‌ركه جێبه‌جێ بكات، جا كه توانای جێبه‌جێ كردنی نه‌بوو، ئه‌و كاته تووشی سه‌رگه‌ردانیی ده‌بێت‌و، كاری له‌م جۆره‌ش دووره، له زاتی په‌روه‌ردگاره‌وه، كه شه‌رعدانه‌ره‌و، شه‌رع له ئاستێكدا داده‌نێت، كه له توانای مرۆڤدا هه‌بێت، پراكتیزه‌ی بكات، هه‌ربۆیه‌ش یاسای (لا تكليف، إلاّ بمقدور، ئه‌و شته‌ی له توانای مرۆڤدا هه‌یه، ده‌كرێته ئه‌رك)، له شه‌ریعه‌تی ئیسلامدا هاتووه.

به‌لام له حوكمی (وَضعي)دا، له ناوه‌رۆكی بابه‌ته‌كه‌دا ئه‌وه ره‌چاو نه‌كراوه، كه ده‌بێت، له توانای كه‌سی موكه‌لله‌فدا بێت، بۆیه هه‌یه‌تی كه له توانای موكه‌لله‌فدایه‌و، هه‌یه‌تی كه له توانایدا نی یه، به‌لام له‌گه‌ڵ ئه‌مه‌یشدا هه‌ركات ئه‌م حاڵه‌ته‌یان ڕوویدا، هه‌ر حوكمی شه‌رعی تیادا جێبه‌جێ ده‌كرێت، نموونه بۆ ئه‌و حوكمه وه‌ضعی یانه‌ی كه له توانای موكه‌لله‌فدا هه‌ن، وه‌ك، دزی‌و داوێن پیسی‌و تاوانه‌كانی تر، كه شه‌رع ئه‌نجامدانیانی كردووه، به هۆكار بۆ سزادانه‌كانیان، وه‌ك چۆن دزی كراوه‌ته هۆكار، بۆ بڕینی ده‌ستی دزه‌كه‌و، داوێن پیسی كراوه‌ته هۆكار، بۆ جه‌ڵد لێدان، یان به‌رد باران كردنی كه‌سی داوێن پیس‌و، هه‌روه‌ها تاوانه‌كانی تریش‌و، گرێبه‌ست‌و كاروباره‌كانی تریش، هه‌موویان به مه‌رج گیراون، تا حوكمی شه‌رعیان له‌سه‌ر بنیات بنرێت، وه‌ك چۆن فرۆشتن، هۆكاره بۆ ئه‌وه‌ی كه كه‌سی دووه‌م ببێته خاوه‌ن موڵك‌و، نیكاح‌و ماره‌كردن هۆكاره بۆ ئه‌وه‌ی كه ژن‌و پیاو له‌یه‌كتر حه‌ڵاڵ ببن‌و، مافیان به‌سه‌ر یه‌كترییه‌وه بۆ دروست ببێت‌و، ئاماده‌بوونی دوو شایه‌ت، مه‌رجه بۆ دروستی گرێبه‌ستی ماره‌كردن‌و، ده‌ستنوێژ مه‌رجه بۆ دروستی نوێژ‌و، نیكاح به‌بێ شایه‌ت نادروسته‌و، هه‌روه‌ها نوێژ به‌بێ ده‌ستنوێژ به‌تاڵه‌و، كه‌سی میراتبه‌ر كه خاوه‌ن میراتی كوشت، ڕێگره له میرات بردن‌و له میرات بێبه‌ش ده‌بێت‌و، هه‌روه‌ها كابرای وه‌سیه‌ت بۆكراو، كه وه‌سیه‌تكاری كوشت، ده‌بێته ڕێگر، له جێبه‌جێ كردنی وه‌سیه‌ته‌كه. له‌و حوكمه وه‌ضعی یانه‌ی كه له توانای كه‌سی موكه‌لله‌فدا نین، وه‌ك هاتنی مانگی ڕه‌مه‌زان، كه هۆكاره بۆ واجب بوونی ڕۆژوو گرتن‌و، لاربوونه‌وه‌ی خۆر له نیوه‌ی ئاسمان، له كاتی نیوه‌ڕۆدا، هۆكاره بۆ واجب بوونی نوێژ‌و، خزمایه‌تی هۆكاره بۆ میرات بردن‌و، سه‌رجه‌م ئه‌م هۆكارانه‌یش له توانای كه‌سی موكه‌لله‌فدا نین‌و، هه‌روه‌ها باڵغ بوون مه‌رجه بۆ ئه‌وه‌ی كه كه‌سه‌كه بتوانێت خودموختاری وه‌ربگرێت‌و، هه‌روه‌ها گه‌یشتن به سه‌رده‌می ژیری‌و عه‌قڵ شكان مه‌رجه بۆ ئه‌و كه‌سه كه هه‌ندێ هه‌ڵسوكه‌وت هه‌ن، خۆی ئه‌نجامیان بدات‌و، بێگومان باڵغی‌و كرانه‌وه‌ی

عەقڵ لە چوارچێوەی توانای موکەللەفدا نین و، لێی بەدەرن و، هەروەها باوکایەتی ڕێگرە، لەوەی کە بکوژرێتەوە، هەرکات تەنانەت بەتایبەتی کوڕەکەی خۆیشی کوشت و، شێتی ڕێگرە لەوەی کە شێت تەکلیفی بکەوێتە سەر شان و، بۆیە گرێبەستەکانی دانامەزرێن و، هەروەها کەسی وەسیەت بۆکراو، لەبەر ئەوەی کە میراتگرە، ئەمە ڕێگرە لەوەی کە وەسیەتەکەی بۆ جێبەجێ بکرێت. لەسەر ڕای زۆرینەی شەرعزانەکان و، سەرجەم ئەم ڕێگرانەیش لە دەرەوەی چوارچێوەی توانا و دەسەڵاتی کەسی موکەللەفدان.

# ﴿بەشە باسی دووەم﴾

# بەشەکانی حوکمی تەکلیفی

**٢١- زۆرینەی زانایانی ئوصولی فیقهـ[1]، حوکمی تەکلیفی دابەش دەکەن، بۆ پێنج بــەش، کە ئەمانەی لای خوارەوەن:-**

**یەکەم:** واجبێتی (الأیجاب)، ئەوەیە کە شەرع فەرمان دەکات، بە کردنـی ئـەو کـارە، بـە تـۆبزیو پابەندبوونـەوەو، ئـەو شـوێنەوارو کاریگەرییـەی کەلەسـەر هەڵسوکەوتی کەسـە موکەللەفەکە دروستی دەکات، لە کاتی ئەنجامدانیـدا واجـب بوونەکەیـە، (واتـە: کردەوەکـە لەسەر کابرای موکەللەف واجب دەکات)و، ئەو کردەوەیەی کە داواکراوە ئەنجام بدرێت، بەو شێوەیە، ئەوە خودی واجبەکەیە.

**دووەم:** (الندب): ئەو کارەیە کە شەرع داوای کـردووە، بـە شـێوەی فـەرمان نـا... بـەڵکو وای بە باشتر داناوە بکرێت، و کاریگەری ئەوەی هەیە، کە کردەوەکە لەسەر کـابرا (منـدوب) دەکاتو، وای دادەنێ، کە باشترە بکرێت، و کردنی ئەو کارەیش بەو شێوازە، (مندوب)ـە.

**سێیەم:** (التحریم: حـەرام): ئـەو شـتەیە کـە شـەرع داوای کـردووە، ئـەنجام نـەدرێت، بـە داواکردنی تۆبزیو پابەندبوونی ڕەهاو، کارەکە لەسـەر کـابرای موکەللـەف حـەرام دەکـاتو، کاریگەرییەکەی ئەو حەرام کردنەیەو، ئەو کارەی کە داوا کراوە، ئەنجام نـەدرێت، بریتـی یـە لە حەرامەکە، یاخود حەرامکراوەکە.

**چوارەم:** (الکراهة)، ئەوەیە کە شەرع داوای کردووە، ئەنجام نـەدرێت، بـەڵام بـە تـۆبزیو یەکلایی داواکەی نەکردووە، بەڵکو بە باشـتری دانـاوە نـەکرێتو، ئـەم داواکردنـە کردەوەکـە لەسـەر کـابرای موکەللـەف مەکروهـ دەکـات، و کاریگـەری مەکروهـ بـوونی لەسـەر دروسـت دەکاتو، ئەو کارەی کە لەسەر ئەم شێوازە داواکراوە نەکرێت کارە مەکروهەکەیە.

**پێنجەم:** (الأباحة: حەڵاڵیو زەڵاڵی)، ئەو کارەیە کە شەرع کـابرای موکەللـەفی سەرپـشك کردووە، لەنێوان کردنو نەکردنیداو، هیچ کامیانی پێش نەخستووە، بەسەر ئەوی تریاندا، لە ئەنجامدانیداو، کاریگەرییەکەی ئەوەیە، کە ئەو کارە لەسەر کابرای موکەللەف موباحو حەڵاڵ

---

١ حەنەفیەکان دابەشی دەکەن، بۆ حەوت بەش، (الأفراض، الأیجاب، الندب، التحریم، و الکراهة تحریماً، و الکراهة تنزیهاً، الأباحة).

دەكاتو، ئەو كردەوەيەی كە كابرای تيادا سەرپشك كراوە، بريتی يە لە كارە موباحەكە.

لەم ڕووانگەيـەوە بۆمـان دەردەكـەوێت، كـە ئـەو شـتانەی كـە داواكـراوە بكرێـت، دوانـن، (الواجب)و (المندوب)، و ئەوانەی كـە داواكـراوە ئـەنجام نـەدرێن، ديـسان دوانـن، (المحرّم)و (المكروه)، و ئەوەی كە مرۆڤ سەرپشك كراوە، لەنێوان كردنو نەكردنيدا بە دڵی خۆی، يەك جۆرە، كە ئەويش (موباح)ـە، و لەمەودوا لەسـەر هـەموو جـۆرێ لـەم جۆرانـە و بـە گـوێرەی پێويستو سنوری خۆی دەدوێين.

# مەبەستی يەكەم

## باسی ((واجب))

٢٢- واجب، لە ڕووی شەرعەوە، ئەو كارەيە كە خودای مەزن داوای كـردووە، كـە ئـەنجام بدرێتو، داواكردنەكەيشی لەڕووی پابەندبوونی تەواوەيـە، بـەجۆرێك كـە هەركـەس ئـەنجامی نەدات، سەرزەنشت دەكرێتو، سزا دەدرێتو، ئەنجامدەرەكەی ئافەرم دەكرێـت، و پاداشـت دەدرێتەوە لەسەر ئەنجامدانی.[١]

كاری واجب دەبێت، لە ڕووی دڵنياييو پابەندبوونی ڕەهاوە ئەنجام بدرێتو، ئەم مانايەش لـە دەسـتەواژەكەيەوە دەفامرێتـەوە، كـە مانـای فـەرمانكردنی تيادايـە، وەك دەسـتەواژەی ڕووتـی فـەرمانكردن (الأمـر) مانـای واجبـی تيادايـە، يـان كـە ئەنجامنـەدرا، لەسـەری سـزا وەردەگيرێـت، بـۆ نموونـە، كردنـی نوێـژو، چـاكە لەگـەڵ دايـكو باوكـداو، پابەنـدبوون بـە گرێبەستو مامەڵەوەو، هتد... كە سەرجەم ئەمانە كارو كردەوەی واجبنو، شـەرع فـەرمانی دەركردووە، كە دەبێت مرۆڤی موكەللەف پێيانەوە پابەند بێتو ئەنجاميان بداتو، هـەروەها سزای داناوە بۆ ئەو كەسانەی كە جێبەجێيان ناكات.

(واجب)و (فرض) لەلای جەماوەری زانايـان يـەكێكنو، لـە حـوكمو مانـادا جياوازييـان نـی يەو، هەردووكيان مانای ئەمەيان هەيە، كە دەبێت ئەنجام بدرێنو، كەسی ئـەنجام نـەدەريان

---

١ الأحكام، لإبن حزم، ب٣، ل٣٢١.

دەبێت سزا وەربگرێت، لەسەر خەمساردی بەرامبەریان.[1] بەڵام حەنەفەیەکان، جیاوازی دەکەن، لە نێوانیاندا، لە ڕووی ئەو بەڵگەیەوە، کە ئەو فەرزو واجبەی جێگیر کردووە. جا دەڵێن ئەگەر بەڵگەکە (ظني) گوماناوی بوو، و یەکلاکەرەوە (قطعي) نەبوو، ئەوە واجبە، وەك ئەو فەرموودە ئاحادەی، کە قوربانی کردن جێگیر دەکاتو، دەیسەلمێنێت، و ئەگەر بەڵگەکە (قطعي) بوو، و (ظنيّ) نەبوو، وەك دەقەکانی قورئانی پیرۆز، سەبارەت بە پێویستی نوێژ، لەسەر کەسی باڵغ بوو، ئەمەیان کردنی (فرض)ـە، بۆیە حەنەفیەکان، لە ڕوانگەی ئەو بەڵگەیەوە کە کارەکەی واجب کردووە، سەیریان کردووەو، (واجب)و (فرض)یان، ناوزەد کردووە.

بەڵام جەماوەری زانایان، وا سەیری کردەوەکە دەکەن، کە ئەرکە لەسەر شانی کەسی موکەللەف، و سەیری ئەوەیان نەکردووە، کە ئایا بەڵگەکەی (قطعي)یە، یان (ظنيّ)یە، بۆیە جیاوازییان نەخستۆتە نێوان (واجب)و (فرض)و، هەردووکیان وەك ناو بەکارهێناوە، بۆ یەك شتی تاك مانا.

هەر لەبەر ئەمەیشە؛ کە (پاداشتو سزا)، فەرزو واجب لای حەنەفییەکان گۆڕانکاری بەسەردا هاتووەو، وایان داناوە، کە پابەندبوون بە واجبەوە کەمترە، لە پابەندبوون بە فەرزەوەو، هەر بۆیەش سزای پشتگوێخستنی واجب، کەمترە لە سزای ئەنجامنەدانی فەرز، هەروەك چۆن کەسێك نکوڵی لێ بکات، لە فەرزێك، پێی کافر دەبێت، بەڵام کەسێك نکوڵیو ئینکاری واجبێك بکات، پێی کافر نابێت.

بەڵام ئەوەی بۆ ئێمە دەرکەوتووە، ئەوەیە کە ئەم ڕاجیاییە، لە ڕووی دەربڕینەوەیە، نەك لە حەقیقەتدا وابێت، حەنەفیەکان هاوڕان لەگەڵ جەماوەری زانایاندا، لەسەر ئەوەی کە فەرز وەك واجب وایە، هەردووکیان داواکراوە کە ئەنجام بدرێن، بە پێداگیریو دڵنیایی تەواوەوەو، هەروەها ئەنجامنەدەری تووشی سەرزەنشتیو سزای پەروەردگار دەبێت.

هەروەها جەماوەری زانایان، لەگەڵ حەنەفیەکاندا هاوڕان، لەسەر ئەوەی کە ئەو شتەی

---

[1] المسودّة في أصول الفقه، ل٥٠، ئیبن عەقیلی حەنبەلی لە ئیمام ئەحمەدەوە گێڕاویەتیەوە، کە (فرض) ئەوەیە کە قورئان فەرزی کردبێت، و (واجب) ئەوەیە کە فەرموودە واجبی کردبێت، و بەم گێڕانەوەیە بێت، حەنبەلیو حەنەفیەکان زۆر لە یەکتری نزیکن، لە کاتێکدا کە جیاوازی لەم جۆرە بۆ (فرض)و (واجب) لای غەیری ئەوان بوونی نی یە.

که داواکراوه که ئەنجام بدرێت، به پێداگیری تەواوەوە، بۆی هەیە بەڵگەکەی قەطعی بێت‌و، ئاساییشە کە بەڵگەکەی ظەننی بێت،[1] بەڵام ئەوەیان کە بەڵگەکەی قەطعی یە، هەرکەس ئینکاری‌و نکۆڵی لێ بکات، پێی کافر دەبێت.

سەرەڕای ئەمەش جەماوەری زانایان، فەرزو واجب بە هاوشانی یەکتر دەزانن، چونکە هەردووکیان پێویستن لەسەر شانی کەسی موکەللەف‌و، هەروەها سەرزەنشت کردن‌و سزا پێویست دەبێت، لەسەر ئەو کەسەی کە ئەنجامیان نادات‌و، ئەمەش بەسە بۆ ئەوەی کە بسەلمێت، واجب‌و فەرز یەك شتن. بەڵام ڕەچاوکردنی بەڵگەکانیان‌و، قرساندنی ئاستی پابەند کردنیان بۆ ئەو کارەو، توندی سزاکەی‌و، کافر کردنی ئەوانەی کە نکۆڵی یەکێکیان دەکەن، ئەمانە گشتیان باس گەلێکی دوورن لە نێوەڕۆك‌و چییەتی (ماهیة)، و حەقیقەتی ئەو کارەی کە کەسی موکەللەف ڕاسپێردراوە، بە ئەنجامدانی‌و پراکتیزە کردنی، و ناویش نراوە، بە (واجب)، و هەموو لایەکیش کۆکن لەسەر ئەوەی کە ناواخنی ئەو فەرمانەی کە شەرع داویەتی، لە ڕووی دڵنیایی‌و پابەندبوونی تەواوەوەیە، کەواتە ((ئەم ڕاجیاییەی کە لێرەدا هاتۆتە ئارا لە دەربڕین (لفظ)دایە، بۆ بەڵگە تەفصیلییەکە دەگەڕێتەوەو، ئەمەش بابەتێکی فیقهی یەو، ڕاجیایی نێوان زانایانی ئوصولّ نی یەو، هەروەها تەنانەت لەنێوان شەرعزانەکانیشدا ڕاجیاییەکە لابەلایی یەو، حەقیقی نی یە)).[2]

## ٢٣- بەشەکانی واجب:

واجب دەبێتە چەند بەشێکەوەو، هەریەشەو خاوەنی ڕەهەندو تان‌و پۆی خۆیەتی‌و، لێرەدا چەند بەشێکی هەیە، لەوانە:

- دابەشکردنی واجب لە ڕووی کاتی پراکتیزە کردنییەوە.
- دابەشکردنی واجب، لە ڕووی ئەوەوە کە ئەندازەگیری بۆکرابێت، یان بۆی نەکرابێت.
- دابەشکردنی واجب لە ڕووی ئەوەی کە دیاریکراوە، یان دیاری نەکرابێت.
- دابەشکردنی واجب، لە ڕووی ئەوەوە کە مەبەست لە پراکتیزە کردنی چی یەو، چۆنە.

---

١ المستصفى، للأمام الغزالي، ب١، ل٦٦.

٢ سلّم الوصول، للعلاّمة محمّد بخيت المطبعي، ب١، ل٧٦.

لێرەشدا باس لە سەرجەم ئەم بەشانە دەکەین.

## ٢٤- دابەشکردنی واجب، لە ڕووی کاتی جێبەجێ کردنییەوە:

بەم پێودانگیەش بێت، دەبێتە دوو بەشەوە، واجبی ڕەها (المطلق)، و واجبی کۆتو پەیوەندار (المقیًّد).

واجبی ڕەها، ئەوەیە کە شەرع داوای کردووە، ئەنجام بدرێت، بەبێ ئەوەی کە کاتی جێبەجێ کردنەکەی ببەستێتەوە، بە کاتێکی دیاریکراوەوە، بە ڕەهایی داینـاوە، کەسی موکەللەف لەسەریەتی کە ئەنجامی بدات، هەرکات ویستی، و کە ئەنجامیدا و جێبەجێی کرد، ئیتر لەسەر ئەستۆی لادەچێتو، لە دواخستنیدا تاوانبـار نابێـت، بـەڵام پێویستە کە دەسپێشخەری بکات، لە جێبەجێ کردنو ئەنجامدانیدا، چونکە چارەنووس نادیارەو مرۆڤ نازانێت کەی مەرگ یەخەی پێ دەگرێت. نموونەی ئەم جۆرەیش، وەك، گرتنەوەی ڕۆژووی ڕەمەزان، بۆ کەسێك کە ڕۆژووی شکاندبێت، بەهۆی بیانوویەکی شەرعییەوە، جا ئەم کەسە لەسەریەتی کە بیگرێتەوە، هەرکات ویستی، بێ ئەوەی کە بەستبێتیەوە بە ساڵێكو کاتێکی تایبەتیەوە، ئەمەش ڕای گروپێك لە شەرعزانەکانە، وەك حەنەفیەکان، هەرچەند گروپی تر هەن، کە ڕایان بەم جۆرە نی یە.

هەروەها وەك ئەو کەفارەتەی کە واجب بووە، لەسەر کەسێك کە سوێندی کەوتووە، ئەمیش لەسەریەتی کە ڕاستەوخۆ دوای کەوتنی سوێندەکە کەفارەتەکەی بدات، یاخود ماوەیەك دوای ئەوە بیدات.

هەروەها وەك حەجکردن، کە واجبە لەسەر کەسی ساماندار بە شێنەیی، نەك بەپەلەو، ئەتوانێت حەجکردنەکە ئەنجام بدات، لە هەر ساڵێکدا ویستیو، لە هەر تەمەنێکدابوو.

واجبێتی کۆتو بەنددار (المقیًّد)، ئەو واجبەیە کە شەرع داوای کردووە، ئەنجام بدرێتو، جێبەجێ بکرێت، بەڵام بۆ کاتی ئەنجام دانەکەی کاتی دیاریکراوی بۆ داناوە، وەك پێنج نوێژە فەرزەکەو، ڕۆژووی ڕەمەزان، کە بێگومان پێش کاتی دیاریکراوی خۆیان دروست نی یە، ئەنجام بدرێنو، لەگەڵ ئەمەیشدا گەر دوابخرێن، بەبێ بیانووی شەرعی، مرۆڤ سزای لەسەر وەردەگرێت.

ئەمە بزانە کە لە (واجبی موقەیەد)دا، پابەندبوون لەسەر کردنی کارەکەو، جێبەجێ کردنی لە کاتی دیاریکراوی خۆیدا ڕەچاوکراوە، بەڵام لە (واجبی موتڵەق)دا، پابەندبوون

تەنها لەسەر کردنی کارەکە ڕەچاوکراوەو، باسی کاتەکەی نەکراوە.

بۆیە کەسی موکەللەف هەرکات کارێکی واجبی لەکاتی خۆیداو، بە شێوەیەکی دروست ئەنجامدا، کارەکەی بە (أداء) ناوزەدکراوە، واتە جێبەجێ کردنی کامڵو لەکاتی خۆیدا، بەڵام ئەگەر لەکاتی خۆیدا ئەنجامیدا، بەڵام بە هەڵەو پەڵەوەو، بە ناکامڵیو پاشان سەرلەنوێی بە دروستیو کامڵی دووبارەی کردەوە، ئەوا ئەم دووەم جارە، کارەکەی بە (إعادة) ناوزەد کراوە، واتە دووبارە کردنەوەو، ئەگەر کارەکەی نەکردو، لە غەیری کاتی خۆیدا جێبەجێی کرد، ئەوا بە (قضاء) ناوزەدکراوە، واتە، دووبارەکردنەوەی کارێك کە هەر لە بنەڕەتدا نەکرابێتو ئێستا ئەنجامی بدات.[1]

## ٢٥- دابەشکردنی واجب لە ڕووی ئەوەوە، کە ئەندازەگیری بۆ کرابێت، یان بۆی نەکرابێت:

واجب لە ڕووی ئەوەوە کە ئەندازەی ئەوەی تیایدا داواکراوە چەندە، دەبێتە دوو بەشەوە، (واجبی سنوردار)و، واجبی بێ سنور- بێ ئەندازە).

- واجبی سنوردارو، ئەندازە بۆدانراو، بریتی یە لەوەی کە شەرع ئەندازەیەکی دیاریکراوی تیادا داناوە، وەك زەکاتدانو، هەروەها نرخی کڕینو فرۆشتنەکانو، ئەندازەی مافی کوشتنو تاوانەکانی تر (دیة)[2]و، هتد... ئەم جۆرەی واجب، لە ئەستۆدایەو، دروستە بەبێ وەستان لەسەر بڕیاری دادگاو، ڕازی بوونی دوولایەنی پرۆسەکە، ئەنجام بدرێت. چونکە خۆی لەخۆیدا دیاریکراوەو، سنوری بۆ دەستنیشان کراوەو، ئەو کاتەی کە جێبەجێ کرا. جا لە ئەستۆی ئەو کەسە دەکەوێت، کە وەك ئەرك لەسەر شانیەتی کە ئەنجامی بداتو، دەبێت بەو جۆرەیش جێبەجێی بکات، کە شەرع دیاری کردووەو، نەخشەی بۆ داناوە، کە لەسەر ئەستۆی لابچێت.

- واجبی بێ سنورو، ئەندازە نادیار، ئەو واجبەیە کە شەرع ئەندازەکەی دیاری نەکردووەو، سنوری بۆ دانەناوە، وەك بەخشین لە ڕێی خوادا، (جیا لە زەکاتدان)، ئەم جۆرە بەخشینە بێ سنوورەو، ئەندازەکەی دیاری نەکراوە، بەڵکو بەگوێرەی پێداویستی

---

١ تنقيح الأصول، إلى علم الأصول، للعلّامة الحلي، و تسهيل الوصول إلى علم الأصول، للشيخ محمّد عبدالرحمن المحلاوي، ل٢٧٦.

٢ واتە، ئەو پارەیەی کە لەجیاتی تاوانی کوشتنو تاوانەکانی تر وەردەگیرێت.

نەدارانو، توانای کەسی بەخشەرە، بۆیە هەرکەس جێبەجێ کردنی پێداویستییەکانی کەسێکی هەژاری بەسەردا سەپێنرا، ئەوە ئەو واجبەی لەسەر شانە، بەڵام بە دیاریکراوو سنورداری نا... بەڵکو پێویستە لەسەری کە پێدویستیەکانی ئەو نەدارە جێبەجێ بکات، ئەمەندەی کە ئیتر پێداویستی نامێنێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك، هاوکاریکردن لەسەر ئەنجامدانی چاکەکاری، ئەمەش واجبێکی بێ سنورەو، بەڵکو تەنها جۆری ئەو چاکەیەی کە کەسی موکەللەف لەسەر شانیەتی هاوکاری بکات، بۆ جێبەجێ کردنی، سنورەکەی دیاری دەکات. دەنا ڕەهایەو، چوارچێوەیەکی سنورداری بۆ نییە! ئەم جۆرە واجبە، سزا لەسەر ئەستۆی مرۆڤ پێویست ناکات، چونکە ئەو شتەی کە سزا دەخاتە ئەستۆی کەسی ئەنجامدەر، مەرجی ئەوەیە کە ئەو شتە سنوردارو دیاریکراو بێت، بۆیە بژێوی ژن، لەسەر پیاو نی یە، پێش بڕیاری دادگا، یان پێش ڕازی بوونی هەردووکیان لەسەری، لەسەر ڕای هەندێ لە شەرعزانەکان، وەك شەرعزانانی حەنەفی، چونکە پێش بڕیاری دادگا، یان ڕازی بوونی هەردووکیان بڕی ئەو بژێوییە دیاری کراو نی یە، بۆیە ناکەوێتە ئەستۆی پیاوەکەو، بەم هۆیەوە ناتوانرێت، پێش بڕیاری دادگا، یان ڕێکەوتنی هەردوولا داوابکرێتو، پاشان لەلای هەندێ لە شەرعزانەکان، وەك شەرعزانەکانی مەزهەبی ئیمامی شافعیو، هی تریش، لایان وایە کە بژێوی ژن لە ئەستۆی مێردەکەدایە، بەڵام لەو کاتەوەی کە پیاوەکە خۆی لادا، لە کێشانی ئەرکی ئەو بژێوییە، چونکە ئەم بژێوی (نفقة)ەیە لەلای ئەم برە شەرعزانە واجبێکی دیاریکراوەو، بەپێی حاڵو توانای مێردەکە دیاریکراوە، بۆیە ژنەکە دەتوانێت پێش بڕیاری دادگاو، ڕێکەوتنی دوولایەنە داوای ئەو مافەی خۆی بکات، واتە، لەو کاتەوەی کە کابرای مێرد، یاخی بوو، و بژێوی جێبەجێ نەدەکرد، و یاسای باری کەسێتی لە عێراق، ژمارە (٨٨)ـی، ساڵی (١٩٥٩) کاری بەم بڕیارە کردووە.[١]

---

١ برگەی چوارەمی، ماددەی (٢) دەڵێت، بژێوی ژنێك کە نەتۆرابێت لە مێردەکەی، لە ئەستۆی پیاوەکەیدایە، لەو کاتەوەی کە پیاوەکە لە بژێوی کێشانی دەستی هەڵگرتووە.

## ٢٦- واجب له ڕوووى ئەوەوە، كە واجبكراوەكە ديارى كرابێت، يان ديارى نەكراوبێت:

لەم ڕووەيشەوە، واجب دەبێتە دوو بەشەوە، واجبى دياريكراوو، واجبى ديارينەكراو.

واجبى دياريكراو، ئەو واجبەيە كە شەرع بە دياريكراوى داواى جێبەجێ كردنى كردووە، بەبێ ئەوەى كە كەسى موكەللەفى سەرپشك كردبێت، كە لە نێوان چەند جۆرێكيدا، جۆرێكيان هەڵبژێرێت، وەك، نوێژكردنو، ڕۆژووگرتنو، گێڕانەوەى موڵكى دەست بەسەرداگيراو ئەگەر خودى شتەكە مابووو، ئەم جۆرە واجبە، بە ئەنجامدانى خودى واجبەكە، جا لە ئەستۆى مرۆڤ لادەچێت.

- واجبى ديارينەكراو: ئەو واجبەيە كە شەرع داواى كردووە، ئەنجام بدرێت، بەڵام بە ديارى كردنى خودى ئەو شتە نى يە، بەڵكو لەناو چەند بابەتێكى زانراودا، ئاماژەى پێداوەو، كەسى موكەللەف لەسەريەتى كە يەكێك لەو شتە زانراوانە هەڵبژێرێتو، ئەنجامى بدات، وەك ڕاپەڕاندنێكى ئەو واجبەو، جارى وا هەيە، كە ئەو واجبە، لە نێوان دوو شتدايەو، بە كردنى يەكێكيان، ئيتر واجبەكە جێبەجێ كراوە، وەك خواى پەروەردگار دەربارەى ديلى جەنگ دەفەرموێت: ﴿حَتَّىٰٓ إِذَآ أَثۡخَنتُمُوهُمۡ فَشُدُّواْ ٱلۡوَثَاقَ فَإِمَّا مَنَّۢا بَعۡدُ وَإِمَّا فِدَآءً حَتَّىٰ تَضَعَ ٱلۡحَرۡبُ أَوۡزَارَهَاۚ﴾[1] واتە: بجەنگن تا كاتێ لاوازيان دەكەن، بە كوشتار لێكردنێكى زۆرو شكاندنيان، ئينجا ئەوەى ماوە ديلى بكەنو مەحكەم بيانبەستنەوەو، چاودێرييان بكەن، ڕانەكەن، ئەوسا يان بەخۆڕاييو منەت خستنە سەريان ئازاديان بكەن، ئەگەر پێشەواى مسوڵمانان پێى چاك بوو، يان بە فيديەو برێتى دانان، واتە ديل بە ديليان پێ بكەن، يان شتێكيان لێ وەرگرن، بەڵام ئەمە دواى ئەوەيە شەوكەتو پەڕوباڵيان دەشكێتو، دەسەڵاتى جەنگيان نامێنێتو، ئەمەش تا كاتێ جەنگ تەواو دەبێت.

كەواتە پێشەواى مسوڵمانان دەتوانێت، كە ديلەكان بە منەت بەربدات، يان ديل بە ديليان پێ بكات.

ئينجا جارى وا هەيە كە واجبى ديارينەكراو، لەنێوان سێ شتدا دەبێت، وەك، كەفارەتو لەجياتى بۆ سوێندى كەوتوو، كە لەم بابەتەدا لەسەر كەسى سوێند كەوتوو پێويستە كە

---

١ محمد (٤).

یەکێك لەم سێ شتانە ئەنجام بدات، یان خواردن دانی (دە) کەسی کەمدەست، یان جل‌و بەگ پۆشینیان‌و، یان ئازادکردنی بەندەیەك‌و، ئەمەیش بۆ کاتێکە کە توانای دارایی هەبێت، بەڵام کە دارایی نەبوو، واجبەکە دەبێتە واجبی دیاریکراو، کە ئەویش گرتنی سێ ڕۆژ ڕۆژوییەو، هەندێ لە زانایان، ئەم جۆرە واجبەیان، بە واجبی سەرپشك (مخیّر) ناوزەدکردووە، چونکە کابرای موکەللەف سەرپشکە، کامیان ئەنجام بدات.[1]

## ٢٧- واجب بە گوێرەی ڕوانگەی شتە داواکراوەکە:

لەم ڕوانگەیەشەوە، واجب، دەبێتە دوو بەشەوە، واجبی دیاریکراو لەسەر گشت کەسێکی موکەللەف (عَیْني)، و واجبێك، کە بە کردنی لەلای هەندێ کەس، لەسەر تێکڕا لادەچێت، واتە (الکفایة).

- (الواجب العیني): ئەو داواکارییەیە، کەلەسەر هەموو تاکێکی موکەللەف دانراوەو، ئاڕاستەی کراوە، واتە: شەرع لەسەر هەموو کەسێکی موکەللەفی داناوەو پێویستی کردووە، ئەنجامی بداتو، هەستانی کۆمەڵێك کەس بەو ئەرکە، بەس نی یەو، لەسەر شانی کۆمەڵەکەی تری لانابات‌و، کاتێك لەسەر ئەستۆی کەسی موکەللەف لادەچێت، کە خودی خۆی جێبەجێی بکات، چونکە مەبەستی شەرع لەم کارەدا کاتێك دێتە دی کە خودی کەسەکە ئەنجامی دابێت‌و بۆیە هەرکەس ئەنجامی نەدات تاوانبار دەبێت‌و لەسەری سزا وەردەگرێت‌و کە خەڵکی تر جێبەجێی کرد، لەسەر ئەم کەسە لاناچێت.

ڕوانگەی ئەم واجبەو مەبەست تیایدا، خودی کردنی کارەکەو هەروەها خودی بکەرەکەیە، وەك: نوێژکردن‌و ڕۆژووگرتن‌و پابەندبوون بە گرێبەستەکانی مامەڵەو دانی هەموو مافێك وەك خۆی...

- (الواجب الکفائي):[2] ئەو کارەیە کە شەرع داوای کردووە، کە کۆمەڵێك کەسی موکەللەف ئەنجامی بدەن، نەوەك سەرجەمی تاکەکانی ئەو کۆمەڵەیە، چونکە ئامانج‌و مەبەستی شەرع ئەوەیە کە کۆمەڵێك ئەنجامی بدەن، واتە: مەبەست ئەوەیە کە ئەو کارە

---

١ فواتح الرّحموت، شرح مسلّم الثبوت، ب١، ل٦٦.

٢ هەندێ لە زانایان بەشی سێیەمیان بۆ زیادکردووە، کە ئەویش ئەو واجبەیە کە مەبەست تیایدا ئەنجامدانیەتی لەلایەن خودی کەسێکی دیاریکراوەوە، وەك واجبی دیاریکراو لەسەر تەنها خودی پێغەمبەر (ﷺ) وەك: واجب کرانی شەونوێژ لەسەری، المحلاوي، ل٢٦٩.

هەبێتو جێبەجێ بکرێتو، مەبەستی ئەوە نی یە کە تاکەکان واتە ئەوانەی کە موکەللەفن تاقی بکاتەوە،[1] جا کە هەندێ کەس کارەکەیان ئەنجامدا، ئەوا لەسەر هێندەکەی تر لادەچێت،[2] چونکە ئەو جێبەجێ کردنەی لەلایەن کۆمەڵێك کەسەوە، لە جێی کردنی لەلایەن کەسەکانی ترەوە دەبێتو ئەژمار دەکرێتو تەنانەت لەم ڕوانگەیەوە ئەو کەسەیش کە نەیکردووە، هەر بە بکەرو جێبەجێ کار دەهێنرێتە ئەژمار، چونکە بە کردنی لەلایەن کۆمەڵێك کەسەوە ئیتر لەسەر شانی ئەوانی تر کەوتووەو لاچووە، و ئەگەر کەس بە کارەکە هەڵنەستا، ئەوا سەرجەمو هەموو لایەك تاوانبار دەبن، بۆیە داواکردن لەم واجبەدا بەستراوە بە کردنی کارەکەوە، و نەوەك بە کەسێکی دیاریکراوەوە، بەڵام لە واجبی (عەینی: خودی)دا، مەبەست تیایدا کردنی کارەکەیە، لە خودی کەسە موکەللەفەکەوە، نموونەی واجبی کەفائی، وەك: جیهاد لە ڕێی خواداو دادوەریو فەتوادانو لە ئاینو شەرع شارەزا بوونو شایەتی دانو فەرمانکردن بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپەو کردنی کارە پیشەسازییەکانو سەرجەم پیشەکانو ئەو زانستانەی کە گەل پێویستی پێیەتیو هەروەها وەك ئامادەکردنی سەرجەم کەرەستەکانی جەنگو، ئەوەی تر لەو شتانەی تر کە لە بەرژەوەندی گەلدان، چونکە بە شێوەیەکی گشتی مەبەست لە (فەرزی کیفایە)، ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی گشتی گەلەو، هەروەها ئەگەر واجبی کەفائی جێبەجێ نەکرا، ئەوا هەموو لایەك تاوانبار دەبن، چونکە لەسەر جەمی گەل داواکراوە کە ئەنجامی بدەن، بۆیە هەرکەس لە توانایدا هەبوو دەبێت بیکاتو کەسێك کە نەیدەتوانی بیکات دەبێت کەسی توانادار هان بدات بۆ کردنی، بەڵام ئەگەر هەر ئەنجام نەدراو جێبەجێ نەکرا، ئەوە کەمو کوڕییەکە لە هەموو لایەکەوە بووەو لەسەر هەموویانە، واتە: لەسەر کەسی توانادارە، چونکە ئەنجامی نەداوەو هەروەها لەسەر کەسی بێ تواناکەیشە، چونکە کەسی توانادار هان نەداوەو پڕی نەکردووە، تا بچێت جێبەجێی بکات، پێشەوا شافیعی دەربارەی فەرزی کیفائی دەفەرموێت: ئەگەر سەرجەمی خەڵکی خەمسارد بوونو جێبەجێیان نەکرد، ئەوا من لەوە دەترسم، کە سەرجەم خەڵکی تواناداروبێ توانا گوناهبار بن.[3]

---

١ تیسیر التحریر، ب٢،ل٣٦٣-٣٦٤.

٢ المسوَدَّة، ل٣١.

٣ الرِّسالة، للأمام الشافعي، ل٣٦٦.

لەم ڕوانگەیەی واجبەوە دەردەکەوێت، کە پێویستە لەسەر گەل چاودێری حکومەت بکات‌و هانی بدات‌و بیخاتە سەر ڕێگای ئەنجامدانی (واجباتە کەفائیەکان)و، یان ئامرازە پێویستەکان بۆ جێبەجێ کردنی واجب ئامادەو ساز بکات، چونکە حکومەت بریکاری گەلە لە جێبەجێ کردنی بەرژەوەندییە گشتییەکانداو، توانای ئەنجامدانی فەرزە کیفائییەکانی هەیە، جا کە دەوڵەت خەمساردی لە کردنیاندا نواند، ئەوا تێکڕای گەل تاوانبار دەبن، بە دەسەڵاتی جێبەجێ کردنیشەوە، چونکە گەل نەیتوانیوە حکومەت هانبدات، تا ئامرازەکانی جێبەجێ کردنەکە دابین بکات، کە پێویستن بۆ جێبەجێ کردنی فەرزە کیفائییەکان‌و هەروەها حکومەتیش تاوانبارە، چونکە لەگەڵ بوونی توانایدا، کەچی هەڵنەساوە بە جێبەجێ کردنی ئەو فەرزە کیفائییانە.

جاری وا هەیە، کە فەرزی (کیفایە) دەبێتە فەرزی (عەین)، هەروەك لە (جیهادکردندا) ڕوودەدات، ئەمە هەرکات بە کردنی لەلایەن هەندێ کەسەوە، ئامانجەکە نەهاتە دی، ئیتر دەبێتە (فەرزی عەین) لەسەر هەموو کەسێکی موکەللەف، کە توانای بەرەنگار بوونەوەی دوژمنی هەبێت، بە هەر جۆرە چەکێك بێت‌و بە هەر جۆرە ڕووبەڕووبوونەوەیەك بێت.

هەروەها وەك ئەوەی ئەگەر موکەللەفێکی توانادار، خراپەیەکی بینی، بەڵام تەنها خۆی توانای بەرەنگار بوونەوەیی هەبوو، ئەوا بە گوێرەی توانای خۆی لەسەریەتی کە ڕووبەڕووی ئەو خراپەیە ببێتەوەو هەروەها ئەگەر لە گوندێکدا تەنها یەك دکتۆر هەبوو، ئەوا لەسەریەتی کە فریای نەخۆشەکان بکەوێت‌و لەسەری واجبە، بە (واجبی عەینی)و هتد... کە چارەسەریان بۆ ئەنجام بدات.

# مەبەستی دووەم

## (( باسی مەندوب ))

**٢٨- ( الندب )، بە مانای بانگەوازکردن بۆ کارێکی گرنگ هاتووەو ( المندوب ) واتە : شتە بانگەواز بۆکراوەکە، یاخود بانگ کردن بۆ کارێکی شیاوو بایەخدار.**

هەروەك شاعیر گوتویەتی:

**لا يسألون اخاهم، حينَ يندُبهُم      للنائباتِ على ما قالَ بُرهانا**

کاتێك کە براکەیان، بانگیان دەکات لە کاتی دژواریو سەختیدا دەچن بۆ لایو هیچ بەڵگەیەکیان ناوێت، یان هیچ بەڵگەیەك داوا ناکەن بۆ ئەو بانگ کردنە، و ڕاستەوخۆ بەرەو ڕووی دەکشێن!

لە زاراوەدا، ئەو کارەیە کە شەرع داوای کردووە جێبەجێ بکرێت، بەڵام بە تۆبزیو پێداگیری نا...و بکەرەکەی مەدح دەکرێتو لەسەر کردنی پاداشت وەردەگرێت، بەڵام ئەنجام نەدەری سەرزەنشت ناکرێتو سزا وەرناگرێت،[1] بەڵام لەسەر هەندێ لە جۆرەکانی مەندوب، سەرزەنشکاریو سزادان لە ئارادا هەیە.

شێوازی دەستەواژەی داواکردنەکە، کاریگەریو ڕەنگدانەوەی هەیە، لەسەر دیاریکردنی ئەو کارە وەك کارێکی مەندوب، ئەگەر مانای مەندوب بوونی تیادا فامرایەوە، نەك مانای تۆبزی کردنو پێداگیری تەواو (الألزام)و ئیتر چونیەکە ئەو نیشانەیەی کە لە مەندوب بوونەکەدا دەرکەوتووە دەق بێت، یان هەر شتێکی تر، یەکسانە، جا کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيۡنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٖ مُّسَمّٗى فَٱكۡتُبُوهُ﴾،[2] ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، هەرکات قەرزو قۆڵەی ماوەدارتان لەگەڵ یەکتردا کردو یان کڕینو فرۆشتنتان بە قەرز کرد، بۆ ماوەیەکی دیاریکراو بینوسن)، کە ئەم داواکارییە مانای تۆبزیو پێداگیری سەرسەختی تیادا نافامرێتەوە، بەپێی ئەو نیشانەیەی کە لە دەستەواژەی ئەم ئایەتەی تردا دەرکەوتووە، کە دەفەرموێت: ﴿فَإِنۡ أَمِنَ بَعۡضُكُم بَعۡضٗا فَلۡيُؤَدِّ ٱلَّذِي ٱؤۡتُمِنَ

---

١ المسوَدَّة، ل٥٧٦، الأحكام، لأبن حزم، ب١، ل٤٠، ب٣، ل٣٢١.

٢ البقرة (٢٨٢).

﴿أَمَنَتَهُۥ﴾[1] واتە: ئەگەر بڕواتان بەیەکتری هەبووو ئەمین بوونو بارمتەی نەویست، جا با ئەو کەسەی کە بە ئەمین دانراوە، واتە: قەرزدارەکە لە کاتی خۆیدا سپاردەکە (قەرزەکە) بداتەوە بە خاوەنەکەی، کە ئەم دەقە دۆکیۆمێنتە لەسەر ئەوەی کە داواکردنی نووسینی قەرز، داوایەکی مەندوبە، نەوەك بەتۆبزیو پێداگیری، کە ئەمەش لە ڕوانگەی ڕێنوێنی کردنی بەندەکانەوەیە، تا مافەکانیان لە فەوتان بپارێزن، جا کە ئەم ڕێنوێنییەیان ڕەچاو نەکرد، ئەوا خۆیان بەرپرسن لە دەرەنجامی خەمساردییەکەیان.

هەروەها کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَكَاتِبُوهُمْ إِنْ عَلِمْتُمْ فِيهِمْ خَيْرًا﴾،[2] واتە: پسوڵەیان بۆ بنووسنو بیکەنە مانگانە بەسەریانەوە،"بۆ ئەو بەندانەی ئەیانەوێت، خۆ ڕزگار بکەنو لە کۆیلایەتی ئازاد ببن"، ئەم نووسینە بۆ کاتێکە، ئەگەر خێرو چاکەو توانای کارکردنو خۆ ئازادکردنتان لێ ببینن، واتە: ئەتانزانی ئەمانەتو فامیان تیایەو ناوەڕۆکی پسوڵەتان بۆ جێبەجێ دەکەن، دەقی ئەم ئایەتە وا دەردەخات، کە نووسینی ئەو پسوڵەیە واجب نی یە، بەپێی نیشانەی ئەو یاسا شەرعییەی کە دەفەرموێت: (خاوەن موڵك ئازادە، کە چۆن مامەڵە لەگەڵ موڵکی خۆیدا دەکات).

هەروەها وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: ((یا معشر الشباب، من استطاع منکم الباءة،[3] فلیتزوّج)): ئەی کۆمەڵی گەنجان، هەرکامتان توانای هەیە، با ژیانی هاوسەرێتی پێك بهێنێت، کە ئەم فەرمانە، دەلالەت ناکات لەسەر واجب بوونی پێکهێنانی پرۆسەی هاوسەرێتی، لەسەر گشت موکەللەفێك، بەپێی نیشانەی ئەو فەرمایشتانەی کە بە موتەواتیری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراونەتەوە، کە هەموو موکەللەفێکی بە تۆبزی پابەند نەکردووە، ژیانی هاوسەری پێك بهێنێت، سەرەڕای ئەمەیش کە توانای ئەنجامدانی پرۆسەکەی هەبێت.

**٢٩- مەندوب، (سوننەت)و (نافلة)و (موستەحەب)و (تطوّع)و (إحسان)و (الفضیلة)یشی پێ دەگوترێتو ئەم مانایانە هەموویان لەیەکەوە نزیکنو مانای مەندوبیان تیادا دەفامرێتەوە، کە ئەویش ئەوەیە کارەکە ئەنجام بدرێت، بەبێ پابەندبوونی ڕەهاو**

---

[1] البقرة (٢٨٣).

[2] النور (٣٣).

[3] الباءة: واتە: توانابوون بۆ جێبەجێ کردنی پرۆسەی هاوسەرگیری.

## تۆبزی.[1]

– مەندوب تەنها یەك جۆر نی یەو چەند پلەیەکی هەیە:

بالاترین پلەی مەندوبە، ئەوەیان کە پێغەمبەر (ﷺ) بەردەوام خولیای سەری بووەو لەسەری پابەند بووەو زۆر بەدەگمەن، دەنا هەرگیز پشت گوێی نەخستووە، وەك: کردنی دوو ڕکات نوێژی سوننەت پێش نوێژی بەیانی، کە ئەمەش بە (سوننەتی مۆککەدە) ناوزەدکراوە، کە کەسێك خەمسارد بێت، تیایدا سەرزەنشت دەکرێت، بەلام لەسەری سزا نادرێتو هەروەها وەك ئەنجامدانی پرۆسەی هاوسەرگیری لە کاتی خۆیداو لە بارودۆخی ئاساییدا، بۆ کەسێك کە توانادار بێتو هەروەها بانگدان کە لەو دروشمە ئیسلامییانەیە کە پەیوەستە بە بەرژەوەندییەکی ئایینی گشتییەوەو دروست نی یە خەمساردیو سستی تیادا بکرێتو، بۆیە ئەگەر خەڵکی جێگایەك ڕێکەوتن، لەسەر ئەوەی کە نەیکەنو وازی لێ بهێنن، ئەوا دەسەلاتی سەردەم دەبێت بەزۆر پێیان ئەنجام بدات.

دوای ئەم پلەیە، (سوننەتی غەیرە موئەککەدە) دێت، وەك ئەو سوننەتەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەمیشە لەسەری بەردەوام نەبووە، وەك: چوار ڕکاتە سوننەتەکەی پێش نوێژی نیوەڕۆو هەروەها وەك: خێر کردنی زیادە، بۆ کەسێك کە لە توانایدا هەیە ئەنجامی بدات، ئەگەر هەژارو نەدارێکی دەست نەکەوت، کە زۆر حاڵەتی خراپ بوو، کەم دەست بوو، و پێویستی هەبوو، ئەوا بۆ خێرکەرەکە سوننەتەکە لێرەدا، غەیرە موئەککەدە.

دوای ئەم پلەیەی (مەندوب)یش، پلەکانی (الفضیلة)و (الأدب)و (سنة الزوائد) دێن، کە هاومانان، وەك پەیرەوکردنی پێغەمبەر (ﷺ)، لەو کردەوە ئاساییانەدا، کە وەك مرۆڤێك ئەنجامی داون، وەك خواردنو خواردنەوەو خەوتن، جا پەیرەوی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەم کارانەیدا سوننەتەو موستەحەبەو نیشانەی پابەندی ئەو کەسەیە بە پێغەمبەرەوە (ﷺ)و ئەنجام نەدەری سەرزەنشت ناکرێتو سزا نادرێت، چونکە ئەم کارە کارێکی تایبەت بە ئایین نی یەو تەنها لە جوانییەکانی ئاکاری مرۆڤی مسوڵمانەو سەر بە ڕەوگەی پەرستشەکان نی

---

[1] بۆیە ناونراوەتە (مندوب: بانگەواز بۆکراو)، چونکە شەرع بانگەوازی بۆ کردووەو بۆیە بە (مستحب: خۆشەویست) ناوبراوە، چونکە شەرع حەز بە کردنی دەکاتو خۆشیی لێ دێتو بۆیە ناونراوەتە (نفل)، چونکە لە دەرەوەی فەرزەوەیەو خێری کارەکە زیاتر دەکاتو بۆیە (تطوع)یشی پێ دەگوترێت، چونکە بکەرەکەی خۆبەخشانە ئەنجامی دەداتو کەبە (فضیلة)یش، ناوزەدکراوە، لەبەر ئەوەیە کە کردنی باشترە لە نەکردنی، (ردّ المختار) لأبن عابدین، ب١، ل٩١و دواتریش.

بەو بەڵکو زیاتر پەیوەندی بە نەریتەکانەوە هەیە.

**٢٠- لەم بابەتەدا، دوو شت تێبینی دەکرێن:**

یەکەم: بە گشتی مەندوب، وەك پێشەکی بۆ (واجب) دێتە بەرچاوو باسی لێوە دەکرێتو وا لە کەسی موکەللەف دەکرێت، کە بەلایەوە ئاسان بێت ئەنجامی بدات، چونکە کە مرۆڤ ئەو مەندوبانەی ئەنجامداو لەسەریان بەردەوام بوو، ئەوا جێبەجێ کردنی واجبەکانی لەسەر ئاسان دەبێتو خوو دەگرێت پێیانەوەو لەم بارەیەوە ئیمامی شاطبي دەفەرموێت: (ئەگەر بە ڕوانگەیەکی گشتی تر، تەماشای مەندوب بکەیت دەبینیت وەك خزمەتگوزاری واجب وایە، چونکە یان پێشەکییە بۆ واجب، یان بیرخەرەوەی واجبە، ئیتر چونیەکە واجبەکە لە جینسو شێوازی یەکترین، یان نا...).[1]

دووەم: مەندوب، ئەگەر بە لاوەکیو جوزئیش پێویست نەبێت، ئەوا لە ڕووی ڕەهاییو بەگشتی پێویستە، واتە دروست نی یە کە مرۆڤی موکەللەف سەرجەم مەندوبەکان بە گشتی واز لێ بهێنێت، چونکە ئەمە نەنگییە بۆیو شوخت دەخاتە عەدالەتو دادی مرۆڤی مسوڵمانەوەو لەم بارەیەوە ئەدەب دادانو سەرزەنشتکردنی پێویستە، هەربۆیەش پێغەمبەر (ﷺ) بیری لەوە کردۆتەوە، کە ماڵی ئەو کەسانە بسوتێنێت، کە بە بەردەوامی نوێژی جەماعەتیان واز لێهێناوە.

جا بانگدانو نوێژی بە کۆمەڵو خێری خۆبەخشانە (التطوّع)و سوننەتی بەیانیان، ئەمانە هەموو بە لاوەکیو تاكو تەرایی مەندوبن، بەڵام بە گشتیو ڕەهایی ئەنجامدانیان پێویستەو دروست نی یە بە تەواوی وازیان لێ بهێنرێت.

هەروەها وەك: ژنهێنان دروست نی یە کە سەرجەمی گەلی ئیسلام واز لەو پرۆسەیە بهێنن، چونکە کە واز لەو کارە هێنرا، تەواوی گەلی ئیسلام تیادەچێتو ئەم پرۆسەیە بۆ تاکەکان کارێکی مەندوبە، بەڵام بۆ سەرجەم گەلەکە واجبەو وەك فەرزی کیفایە وایەو بۆیە (وازهێنان لە سەرجەم مەندوبەکان، کاریگەری هەیە لەسەر بارودۆخی ئاین، ئەگەر ئەو واز لێهێنانە هەمیشەیی بوو، بەڵام ئەگەر وازلێهێنانەکە لە هەندێ کاتدا بوو، ئەوە کاریگەری نابێت).[2]

---

١ الموافقات، للأمام الشاطبي، ب١، ل١٥١.

٢ الموافقات، للأمام الشاطبي، ب١، ل١٣٢-١٣٣.

# مەبەستی سێیەم

## باسی حەڕام: (یاساغو نەشیاو)

### ٣١- حەرام:

ئـەو كارەیـە كـە شـەرع داوای كـردووە كـە دەسـتی لیٚ هـەڵبگرێت،و نـەكرێت، و داواكردنەكەیش لە ڕووی تـۆبزیو پێداگیری تەواوەیـە، وبۆیـە ئـەو كەسـەی كـە دەسـتی لیٚ هەڵـدەگرێت پاداشـتی لـە سـەر وەردەگرێـت،و بەكەسـێكی گوێڕایـەڵ دێتـە ئـەژمار،و ئەنجامدەریش تاوانبارەو بەسەرپێچی كـار نـاو نـووس دەكرێت، ئیتر لەوەشـیدا چـونیەكە، بەڵگـەی حـەرام كردنەكـە یەكلاكـەرەوە (قطعي)بێـت، وهـیچ گومـانێكی تێـدا نـەبێت، وەك حەرامی داوێن پیسی كردن، یان بەڵگەكەی گوماناوی (ظني) بێت، وەك ئەو شتە حەرامانـەی كە بە فەرموودەی (ئاحاد) حەرام كراون،هەردووشێوازەكە چونیەكنو حەرام كراوەكەیان، بە بەهای حەرامە، بەڵام لای حەنەفیەكان، حەرام بـەوە نـاوزەرد دەكرێـت، كـە بەڵگـەی قطعي بێت، جا ئەگەر بەڵگەكەی (ظني) بوو، ئەوا بە (مەكروهی حەرام) ناوزەدیان كردووە.

حەرام بوونی شتێك لەوەوە دەزانرێت، كە خودی دەربڕینـی (لفـظ)ی، حـەڕام بـۆی بـەكار هاتبێـت، وەك لـەفزی (حـەڕام) یان،یـان لـەفزی (حـەڵاڵ نییـە)، وەك خـوای پـەروەردگار دەفەرمویت ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ ﴾[١] یان پێغەمبەر (ﷺ) كـە دەفـەرمووێت: (لا يحل مال امريء مسلم، إلا بطيب مـن نفـسه) مـاڵی مـسوڵمان بـۆ كەسـێكی تـر حـەڵاڵ نییـە، مەگەر بە ڕازی بـوونی خـۆی نـەبێت)،[٢] هـەروەها حـەڕام بـوون لەوەیـشەوە دەزانـدرێت، كە

---

١ سورة (النساء/٢٣).

٢ با كەس وا گومان نەبات، كە ماڵی پەیماندار (أهل الذمة) كـە ناموسـڵمانە، حەڵاڵـە، چـونكە ناوهێنـانی (موسڵمان: المسلم) لە فەرموودە پیرۆزەكەدا، ئەو ماناو خەیاڵە ناگرێتـەوە، و لـە ڕاسـتیدا، لـە ڕێزگرتنـی ماناو موڵكو هێنانی دارایـیو یـەكتری، بـەڕزی بـوونی خـۆی، و زۆر شـتی تـردا، مـسوڵمان و نامـسوڵمان چونیەكن، چونكە یاسای شەرع دەفەرمووێت: ئەوەی ئێمە هەمانە، هی ئەوانیشە، و چ مـافێكیش لەسـەر ئێمەیـە، لـە سـەر ئەوانیـشە، و پێشەوەوا عـەلی (خـوا لێـی ڕازی بێـت) دەفـەرمووێت: بۆیـە گرێبەسـتی ذیمـەو پەیمانەكەیان وەرگرتووە، تا خوێنیان وەك خوێنی ئێمە پارێزراو بێت، وە هەروەها ماڵو موڵكیشیان، وەك مـاڵو موڵكی خۆمان بپارێزرێت، بڕوانە (بدائع الصنائع) للكاساني،ب٦، ل ١١١، و سنن الدارقطني، ب٢، ل ٣٥٠، و شرح السير الكبير، ب٣، ل٣٥٠.

دەستەواژەی نەهیکردن هاتبێ، کەمانای تۆبزیو پابەندی ڕەهای لیّ بفامرێتەوە، یاخود بە کردنی کارەکە سزادانی لەسەربێت، نمونە بۆ یەکەمیان، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموویت ﴿فَٱجۡتَنِبُواْ ٱلرِّجۡسَ مِنَ ٱلۡأَوۡثَٰنِ وَٱجۡتَنِبُواْ قَوۡلَ ٱلزُّورِ﴾[1] واتە بت پەرستن شتێکی زۆر بێنرخو پیسە. جا کەوایە ئێوەش لە بت پەرستن خۆتان دوور بگرن، چونکە پیسن، و هەروەها لە هەموو گوتارێکی درۆ و نابەجێو هەڵبەستراویش خۆتان بە دوور بگرن، و هەروەها قورئان دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ﴾[2] واتە: ئارەق خواردنو قومار بازی یانسیبو ئەو بەردەی حەیوانی بتەکانی لە سەر سەر دەبڕدرێت، بۆ بتەکان،و فالگرتنەوە. ئەمانە هەموویان پیسنو لە کردەوەی شەیتانن، لە ئەنجامدانیان دوور بکەونەوە.

نموونەیش بۆ دووەم، واتە: ئەوەیان کە سزا بۆکردنی دانراوە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَٱلَّذِينَ يَرۡمُونَ ٱلۡمُحۡصَنَٰتِ ثُمَّ لَمۡ يَأۡتُواْ بِأَرۡبَعَةِ شُهَدَآءَ فَٱجۡلِدُوهُمۡ ثَمَٰنِينَ جَلۡدَةٗ﴾[3]، واتە: ئەو کەسانەی کە ژنان یان پیاوانی داوێن پاك تۆمەت بار دەکەن، بەداوێن پیس کردن، و دواتریش چوار شایەت ناهێنن، بۆ چەسپاندنی داواکەیان، دەبێت ئەوانە هەشتا شەلاقیان لیّ بدەن، تا جارێکی تر بەناڕەوا، ناموسی خەڵکی لە کەدار نەکەن.

هەروەها پەروەردگار دەفەرمویت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ۝١٠﴾[4]، واتە: ئەو کەسانەی کەبە ستەمو ناهەق، ماڵو سامانی هەتیوان دەخۆن، ئەوانە تەنها ئاگردەکەنە سكو ورگیانەوە،و بەزوویيش دەخرێنە ناو ئاگری گەرمی دۆزەخەوە.

---

١ سورة (الحج /٣٠).

٢ سورة (المائدة/ ٩٠).

٣ سورة (النور/٤).

٤ سورة (النساء/ ١٠).

## ٣٢- بەشەکانی حەڕام:

ئەوەی لەکاتی جێگیرکردنی ئەحکامو یاساکانی شەریعەتی ئیسلامدا، بۆ ئێمە چەسپاوەو یەکلایی بۆتەوە، ئەوەیە کە شەرع هەر شتێکی حەڕام کردبێت، بە هۆی ئەوەوە بووە، کە ئەو کارە بەتەواوی خراپە، یان لایەنی خراپەی زیاترە،و بەسەریدا زاڵترە، و ئەم خراپییەیش، یان ئەوەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ خودی شتە حەڕامەکە،و ئەمەیش بە (المحرّم لذاته)، یان (المحرّم لِغيرِه) ناوزەد کراوە، واتە: لە بەر خودی کردەوەکە حەڕام کراوە، ویان بۆ خودی کارەکە ناگەڕێتەوە، بەڵکو بۆ شتێك دەگەڕێتەوە، کە پەیوەندی پێیەوە هەیە، و ئەمەیش بە (المحرّم لِغيرِه) ناوزەد کراوە، واتە: بەهۆی شتی ترەوە، کە کۆنتاکت و پەیوەندی پێیەوە هەیە، بۆیە حەڕام کراوە.

## ٣٣- باسی (المحرم لذاته):

ئەوەیە کەشەرع لە سەرەتاوە حەڕامی کردووە، بەهۆی ئەو خراپەو زیانانەی کە تیایدا هەیە،و قەت لێی جیا نابنەوە، وەك، داوێن پیسی و مارەکردنی ژنانی مەحرەم، و خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، و فرۆشتنی، و هەروەها دزیکردنو کوشتنی بەناهەق، و هتد.... کە ئەم جۆرە کارانە لە خودی خۆیاندا، و بە هۆی خۆیانەوە حەڕامنو حەڕام کراون.

حوکمی ئەم جۆرە حەڕامە، ئەوەیە کە هەر لە بنەڕەتدا ناشەرعییە، و دروست نییە، کە کەسی موکللەف ئەنجامی بدات،و ئەگەر بیکات، ئەوا تووشی سەرزەنشتو سزا دەبێت،و هەروەها ناگونجێت، ببێتە مەرجو ئامراز (سبب)ێکی شەرعی، و ئەحکامی لەسەر بنیات بنرێتو هەر کات بووە هۆی حەلاڵ کارو دروستکاری گرێبەستێك،ئەوا ئەو گرێبەستەش هەڵدەوەشێتەوە،وهیچ شوێنەوارو ڕێو شوێنێکی شەرعی لە سەر ناگرێتە بەر.

جا کە خواردنی مردارەوە بوو، حەڕامە لە سەر کەس موکەللەف، بۆیە دروست نیە، بیکات،و بیخوات،و هەروەها دزی کردن نابیتە مەرجو ئامرازی شەرعی، بۆ ئەوەی کە ئیتر ئەو موڵکە بۆ دزەکە بچەسپێنێت،و هەروەها داوێن پیس کردن، نابێتە هۆکارێکی شەرعی بۆ چەسپاندنی ڕەچەڵەكو میرات بردن،و هەروەها مردارەوە بوو، ئەگەر بوویە مەرج، بۆ دروستی گرێبەستێك، یان شتێکی مردارەوە بوو، تەوەری مامەڵە کەو گرێبەستەکەبوو، ئەوە گرێبەستەکەیش هەڵدەوەشێتەوە، چونکە مەرجەکە ناشەرعی یە، و ئەوەی کە لە

گرێبەستو مامەڵەیەكی شەرعی دروستدا پێویستە، لەم مامەڵە بەتاڵەدا پێوسیت نابێت،و هیچی لە سەر بنیات نانرێت،و هەروەها گرێبەستی هاوسەرێكی ئەگەر لە گەڵ ژنێكی مەحرەم داكراو،و بەمەشیان دەزانی، كە ئەو ژنە مەحرەمە، ئیتر گرێبەستەكە بەتاڵە،و ئەوەی لە گرێبەستێكی هاوسەرگیری شەرعیدا پێویست دەبێت، لە مدا هیچی نایەتە دی،و هیچ لە سەر ئەو گرێبەستە بنیات نانرێت، وەك چەسپاندنی ڕەچەڵەك،و میرات بردنو پابەندی بە مافەكانی هەردوولاوە،و لە یەكتر حەڵاڵ بوونیان،و تەنانەت جووتبونیشیان بە داوێن پیسی (زینا) دەهێنرێتە هەژمار، چونكە بنەمای كارەكە حەڕامە.

## ٣٤- بەڵام هەندێ لەم جۆرە حەڕامە، (المحرّم لذاته)

لە كاتی پێویستدا حەڵاڵ دەبێت، چونكە حەڕام بوونەكەی بە هۆی ئەو خراپەو زیانانەوە بووە، كە لەخودی شتەكەدا هەن،و پێچەوانەن لە گەڵ پاراستنی پێنج شتە پێوستیەكەدا، كە بریتین لە، پاراستنی باوەڕو ئایینو پاراستنی گیان، پاراستنی ژیری،و پاراستنی شەرەف، و پاراستنی ماڵو سامان، بۆیە مردارەو بوو، لە كاتی برسێتیو ترسی مردن لە برساندا، حەڵاڵ دەبێت، و هەروەها ئارەق خواردن، لە كاتی تینوێتی زۆردا، كە ترسی مەرگی هەبوو، خواردنەوەی حەڵاڵ دەبێت، چونكە پاراستنی گیان پێوستیە،و دەبێت ئەگەر بە حەڵاڵ كردنی شتی حەڕامیش بێت، بپارێزرێت (بەڵام بە گوێرەی پێویست).

## ٣٥- باسی (المحرّم لغیره):

ئەو حەڕامەیە، كە لە بنە ڕەتدا دروستەو شەرعییە، چونكە هیچ زیانو خراپەیەكی نییە،و یاخود لایەنی سودەكەی زیاترە، لە لایەنی زیانەكەی، بەلام بەستراوەتەوە بە شتێكەوە، كە حەڕامە،و پەیوەندی پێیەوە هەیە، وەك نوێژكردن لە زەوی داگیركراودا،و مامەڵە كردن لە كاتی نوێژی هەنییدا،و مارەكردنی ژن، بەمەبەستی ئەوەی كە حەڵاڵ بكرێتەوە، بۆ مێردە پێشووەكەی، كە بەتەلاقی سێ بەسێ تەلاقی داوە،و واتە، مارە بەجاش،و هەروەها مارەكردنی ئافرەتێ، كە كەسێكی تر داوای كردبێت، واتە، مامەڵە بەسەر مامەڵەدا،و هەروەها تەلاقی بیدعی، كە تەلاقدانی ژنە لە كاتی نەشیاودا، و یان مامەڵەی چارە نووس نادیار، و هەروەها ئەو مامەڵەیەی سوودارە،و هتد... كە ئەمانە هەموو لە خودی خۆیاندا

حەرام نین بەڵکو بە هۆی کردەوە گەلێکی دەرەوەی خۆیانەوە حەرام بوون،و ئەو حەرام بوونەشیان لە بەر خودی کردەوەکە نیە، چونکە خودی کارەکە زیانو خراپەی تیادا نیە، بەڵکو پەیوەندی بە شتێکەوە هەیە کە ئەو شتە دووەمینە زیانی هەیە،و خراپە.

کە لێرەدا نوێژ، خۆی لەخۆیدا شەرعییەو دروستە،و واجبیشە، بەلأم لە بەر ئەوەی کە پەیوەندی بە شتێکی نادروستەوە هەیە، کە کردنیەتی لە زەوییەکی داگیرکراودا، بۆیە رێگری کراوە، لەلایەن شەرعەوە، بەکردنی نوێژ، لە زەوی داگیرکراودا.

هەروەها مامەڵەکردن، لە خودی خۆیدا حەلاڵە، بەلأم ئەنجامدانی لە کاتی نوێژی هەینیدا، ئەو خراپییە دەهێنێتە ئاراوە، کە کابرا ئیتر ناتوانێت بچێت، بۆ نوێژی جومعە، کە فەرزە لە سەر شانی، بۆیە ئیتر شەرع لەم کاتەدا نەهی کردووە، لە مامەڵە کردن.

هەروەها ژن مارە برین، لە خودی خۆیدا شەرعییە،و موباحو مەندووبیشە، بەلأم ئەنجامدانی لە کاتێکدا کە بچیت ژنێك مارە بکەیت، کەسێکی تر داوای کردووە، و مامەڵە بکەیت بەسەر مامەڵەی کەسێکی تردا، زیانەکەی لێرەدایە کە ئازاردانی خەڵکی تیادایە، و رقو دوژمنایەتی لێ دەکەوێتەوە، بۆیە شەرع نەهی لێکردوە.

یاخود مارەبرینی ژن، بەنیازی (مارە بەجاش)، ئەمە یاری کردنە بەئامرازە شەرعییەکان،و بە کارهێنانیانە لە جێگای نەشیاوی خۆیاندا، بۆیە لە بەر ئەم فاکتەرە شەرع نەهی لێکردوە.

٣٦- حوکمی ئەم جۆرە حەرامە، لە سەر تێروانینی ئێمە وەستاوە، بۆیە (المحرّم لغيره) لە بنەرەتدا و لە خودی خۆدا شەرعییە، بەلأم لەو رووەوە کە پەیوەندی هەبێت، بە شتێکی حەرامەوە لێرەدا حەرامو یاساغ دەبێت.

بۆیە هەندێك لە شەرعزانان (الفقهاء)، رەهەندی شەرعی بوونی ئەو شتەیان لە بنەرەتدا زاڵکردووە بەسەر حەرام بوونەکەیدا، بەهۆی شتی ترەوە،و گوتویانە: دەکرێت بە فاکتەرێکی شەرعی بهێنرێتە هەژمار، و پاداشتو سزای لە سەر دابنرێت، هەر چەندە بە هۆی ئەو شتەوە حەرام بووە، کە پیوەندی پێوە هەیە، بۆیە لەم رووەوە بکەرەکەی تاوانبار دەبێت، واتە، بە هۆی پەیوەندی بوون بە حەرامەکەوە، نەك بە هۆی ئەوەی کە خودی کردەوەکەی ئەنجامداوە.

کەواتە لەم روانگەیەوە، نوێژکردن لە زەوی داگیرکراودا دروستە،و لە سەر شان لادەچێت، بەلأم لەو رووەوە تاوانبارە، کەلە زەوی داگیرکراودا کردوویەتی،و هەروەها مامەڵەکردن لە

کاتی نوێژی هەینیدا دروستە، بەلاّم تاوانیشە، چونکە لەو کاتە نەشیاوەدا کردوویەتی‌و هتد...... لەلایەکی تریشەوە، هەندێك لە شەرعزانەکان، لایەنی خراپەکەیان زاڵ کردووە، کە لە شتی پەیوەندیداردا هەیە، بەسەر لایەنە بنەڕەتیەکەیدا، کە حەلاّڵ بوونیەتی،و کردەوەکەیان بەخراپ ناوزەد کردووە،و پێیان وایە کە هیچ ڕێ‌و شوێنێکی شەرعی نیە،و بکەرەکەشی تاوانی ناگات، چونکە لە بنەڕەتدا کارەکە بەهۆی ئەو پەیوەندی بوونەی بە حەرامەوە، ئیتر حەرام بووە،و بۆیە هیچ ڕێ‌و شوێنێکی شەرعی لەسەر ناگرێتە بەر.

بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە بێت، ئەم گروپەی شەرعزانان پێیان وایە، کە نوێژ لە زەوی داگیرکراودا بەتاڵە،و هەروەها گرێبەستی مارە بڕین، بەمەبەستی مارە بەجاش‌و گرێبەستی تەلاّق، لە کاتی نەشیاودا (الطلاق البدعي) سەرجەمیان بەتاڵن،و هتد....[1]

---

١ إن شاء الله ڕووکردنەوەی زیاتر لەم بارەیەوە لە بەشە باسەکانی (الصحة والفساد)، و (النهي)دا، دێت.

# مەبەسی چوارەم

## ((باسی مەکروهـ))

٣٧- مەکروهـ، ناپەسند، ئەوکارەیە کە نەکردنی باشترە، لە ئەنجامدانو کردنی[١]، یاخود ئەوەیە کە شەرع داوای لە کەسی موکەللەف کردووە، کەوازی لێ بهێنێت، بەلأم بە تۆبزیو سەرسەختیو پێداگیری داواکەی ئاڕاستە نەکردووە، وەك ئەوەی دەستەواژەکە لە خودی خۆیدا ناپەسندی لێ بفامرێتەوە، یاخود بە دەستەواژەی (نەهی) کردن دەربڕدرابێت،و دواتر نیشانەیەك ڕەوتەکەی گۆڕیبێت، لە حەرامێتی بۆ مەکروهـ بوون.

نمونە بۆ یەکەمیان، وەك فەرموودەی: (إن الله يكره لكم قيل، وقال، وكثرة السؤال، و إضاعة المال: خودا واتە وات، و زۆر پرسیارکردن،و ماڵ بە هەدەردانی بە کارێکی ناپەسند هێناوەتەو ئەژمار).

نموونەیش بۆ دووەمیان، وەك ئایەتی: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَسۡـَٔلُواْ عَنۡ أَشۡيَآءَ إِن تُبۡدَ لَكُمۡ تَسُؤۡكُمۡ ﴾[٢] واتە:ی ئەی ئەو کەسانەی کە باوەڕتان هێناوە، لەو شتانە مەپرسنو پرسیار مەکەن، کە ئەگەر بۆتان ڕونبکرێتەوە، غەمبارو ناڕەحەت دەبن،و لێرەدا ئەو نیشانەیەکە ئەم کارە لە حەرامێتی دەگۆڕێت، بۆ مەکروهێتی، ئەو دەقەیە کە لە هەمان ئایەتدا فەرموویەتی: ﴿وَإِن تَسۡـَٔلُواْ عَنۡهَا حِينَ يُنَزَّلُ ٱلۡقُرۡءَانُ تُبۡدَ لَكُمۡ عَفَا ٱللَّهُ عَنۡهَاۗ وَٱللَّهُ غَفُورٌ حَلِيمٞ ﴾[٣] واتە: ئەگەریش پرسیارەکە هەڵگرن، بۆ ئەو کاتەی قورئان بێتە خوارەوە، ئەوسا وەڵامەکەتان بۆ شی بکرێتەوە، لەوانەیە تووشی ناڕەحەتی ببن، کەواتە لەو جۆرە شتانە پرسیار مەکەن، نەوەك لەسەرتان توند بکرێتەوە.

**حوکمی مەکروهـ**: ئەوەیە کە بکەرەکە تاوانبار نابێت،و هەر چەندە سەرزەنشت دەکرێت،و بەلأم ئەو کەسەی نایکاتو و وازی لێ دەهێنێت، ستایش دەکرێتو پاداشتیشی لە سەر وەردەگرێت، ئەگەر لەبەر خاتری خوای پەروەردگار دەستی لێ هەڵگرتبوو.

٣٨- ئەوەی دەربارەی مەکروهـ، باسمان کرد، ئەوەیە کەڕای جەماوەری زانایانی لە

---

١ المحلاوي.ل ٢٥٠.

٢ سورة (المائدة /١٠١).

٣ سورة (المائدة /١٠١).

سەرە،و لە زاراوەی ئەواندا بەکارهێنراوە،و مەکروهـ، لای ئەوان یەك جۆرە،و یەك شتە،و ئەویش ئەوەیە کەباسمان کرد، **بەڵام لە لای زانایانی حەنەفی مەکروهـ، دوو جۆرە:**

**یەکەم:** ئەو مەکروهەی کە حەرامە (مەکروهی تەحریمی)، ئەویش ئەوەیە کە شەرع داوای کردووە، لە کەسی موکەللەف، کە دەبێت وازی لێ بهێنێت،و داواکەیشی مانای تۆبزیو پێداگیری تیادایە،و ئەم جۆرەیش بە بەڵگەی (ظني: گومانـاوی) جێگیر کراوە، نەك بە بەڵگەی (قطعي، یەکلاکەرەوە)، وەك، خوازبێنی کردن، لە کاتێکدا کە کەسێکی تر خوازبێنی ئەو ئافرەتەی کردبێت،و هەروەها مامەڵەکردن بە سەر مامەڵەی تردا، کە ئەم دووانە هەردووکیان بەفەرموودەی (ئاحاد) چەسپاون، و بێگومان فەرموودەی ئاحادیش بەڵگەیەکی ظەننی یە و ئەم جۆرە مەکروهەیش لە لای حەنەفییەکان لە گەڵ واجبدا بەرامبەرە، و لە لای جەماوەری زانایان حوکمی حەرامی هەیە،و واتە: بکەرەکەی سزا وەردەگرێتو هەرچەندە ئەو کەسەی کە نکۆڵی بکات، بە کافر دانانرێت، چونکە بەڵگەکەی ظە ننیەو گوماناوی یە.

**دووەم:** ئەو مەکروهەی کە جوانترەو باشتر وایە نەکرێت،و پارێزی تێدایە، (المكروه التنزيهي)، ئەمەیش ئەوەیە کە شەرع داوای کردووە، دەستی لێ هەڵبگیرێت، بەڵام داواکە، موکەللەف پابەند ناکات پێیەوە، وەك خواردنی گۆشتی ئەسپ، لە کاتی پێویستدا، و لە شەڕدا، و هەروەها دەستنوێژ گرتن بە ئاوی بەرماوەی باڵندە، حوکمی ئەم جۆرە مەکروهە، ئەوەیە کە بکەرەکەی سەرزەنشت ناکرێت، و سزایش لە سەری وەرناگرێت، هەر چەندە نەکردنی کارەکەی باشترە.

ئەم ڕاجیاییەی نێوان حەنەفیەکانو جەماوەری زانایان، وەك ڕا جیاییەکەیان وایە، کە لە نێوان (فەرز)و (واجب)دا هەیانبوو، حەنەفیەکان لە ڕوانگەی بەڵگەکەوە سەیریان کردووە، کە داوای واز هێنانی لەو کارە کردووە، بە تۆبزیو پێداگیری تەواو، ئەگەر بەڵگەی یەکلاکەرەوە (قطعي) بوو، ئەوە لە لایان حەرامە، و ئەگەر بەڵگەکەی گوماناوی (ظني) بوو، ئەوە مەکروهی حەرامە،و ئەگەر وازهێنانەکە لەو کارە، ناپێداگیری لێ دەفامرایەوە، ئەوە ئەو مەکروهەیە، کە واباشترە نەکرێت، و بۆ تەنزیهە.

بەڵام جەماوەری زانایان، لە ڕوانگەی (قطعي) بوونو (ظني) بوونەوە، سەیری بەڵگەکەیان نەکردووە، بەڵکو سەیری سروشتی داواکەیان کردووە، بۆ دەستهێشتنی ئەو کارە، جا ئەگەر داواکەی پێداگیری لێ دەفامرایەوە، ئەوە لەلایەن حەرامەو ئیتر چونیەکە بەڵگەکەی قەطعی بێت یان ظني،و ئەگەر داوای ئەو دەست هەڵگرتنە لەو کارە ناپێداگیری لێ دەفامرایەوە، ئەوە لەلایەن مەکروهەو، ئەم جۆرەیش لە جێی (المكروه تنزيهاً) دایە، لە لای حەنەفییەکان.

# مەبەستی پێنجەم

## ((باسی موباح))

٣٩- موباح: ئەوەیە کە شەرع کەسی موکەللەفی سەرپشك کردووە، لە نێوان کردنو نەکردنیداو، و کردنو نەکردنی هیچ ستایشو سەرزەنشتێکی لە سەر نیە، و هەروەها حەلاڵیشی پێ دەگوترێت.[1]

**مووباح بوون، بە هۆی چەند شێکەوە دەزانرێت، لەوانە:**

أ- دەقێکی شەرع، کە حەلاڵ بوونی ئەو شتە بسەلمێنێت، وەك ئەم دەقەی قورئانی پیرۆز، کە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْيَوْمَ أُحِلَّ لَكُمُ ٱلطَّيِّبَٰتُ وَطَعَامُ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْكِتَٰبَ حِلٌّ لَّكُمْ وَطَعَامُكُمْ حِلٌّ لَّهُمْ﴾[2] واتە: لەمڕۆ بەدواوە، هەموو شتێکی چاكو پاکتان بۆ ڕەوایەو، سەربڕاوی دەست ئەوانەی نامەیان پێدراوە، ڕەوایە بۆتانو دەتوانن بیخۆنو، خواردنو سەربڕاوی دەست ئێوەش بۆ ئەوان حەلاڵەو، ڕێی پێدراوە، کە لەم دەقەدا (حەلاڵ) بوون، دەر بڕدراوە.

ب- دەقێکی شەرعی، کە گوناھـ و تاوان، لە ئەستۆ بوون لە سەر شتێك لا ببات، نمونە بۆ یەکەمیان وەك ئایەتی: ﴿فَمَنِ ٱضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَآ إِثْمَ عَلَيْهِ﴾[3] هەر کەسێ لە بەر ناچاریو بێ ئارەزو، هەر بەئەندازەی پێویست بخواتو، زیادە خۆری نەکات، ئەوا هیچ تاوانو گوناهێکی ناگات لە خواردنی ئەو شتە حەرامانەدا،نموونە بۆ دووەمیان، وەك ئایەتی: ﴿وَلَا جُنَاحَ عَلَيْكُمْ فِيمَا عَرَّضْتُم بِهِۦ مِنْ خِطْبَةِ ٱلنِّسَآءِ أَوْ أَكْنَنتُمْ فِىٓ أَنفُسِكُمْ﴾[4] واتە: هیچ گوناهێکتان لە سەر نییە، لەخواستنی ژنە مێرد مردووەکاندا، (بەکینایەو ئامـاژەدان)و ناڕاستەوخۆ لەماوەی عیددە دا، وەك ئەوەی بڵێیت، ئەگەر خوا بۆم ڕێك بخات، دەمەوێت ئافرەتێکی چاك بخوازم، یان بەدڵ حەزیان لێ بکەن، و بڕیار بدەن، کە مارەیان بکەن، و نەیخەنە ڕوو.

نموونە بۆ سێیەمیان، وەك قورئان دەفەرمووێت: ﴿لَّيْسَ عَلَى ٱلْأَعْمَىٰ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْأَعْرَجِ حَرَجٌ وَلَا عَلَى ٱلْمَرِيضِ حَرَجٌ وَلَا عَلَىٰٓ أَنفُسِكُمْ أَن تَأْكُلُوا۟ مِنۢ بُيُوتِكُمْ أَوْ بُيُوتِ

---

١ الشوكاني. ل٦، الشاطبي ب ١،ل ٤٠.

٢ سورة (المائدة /٥).

٣ سورة (البقرة) /١٧٣.

٤ سورة (البقرة /٢٣٥).

﴿...بَآبِكُمْ﴾[1] واتـه: لـه سـهر كوێرو شـهلو نـهخۆشو خۆیـشتان، هـیچ تاوانێـك نیـه، كـه ماڵەكانی خۆتانو، كوڕەكانتان نان بخۆن، به بێ مۆڵەت.

ج- دەستەواژەكە فەرمانی لێ بفامرێتەوە، بـەلاّم نیـشانەیەك بێتـە ئـاراوە، كـە لـە واجـب بوونەوە، بیگۆڕێت بۆ (موباح) بوون، وەك فەرمایـشتی پـەروەردگار كـە دەفـەرموێت: ﴿وَإِذَا حَلَلْتُمْ فَاصْطَادُوا﴾[2] واتە: هەر كە خۆتان حەلاڵ كردەوە، واتە: ئیحرامتان شكاندو، حـەرەمتان جێهێشت، ڕاوو نێچیر گرتنتان بۆ ڕەوایەو، دەتوانن ڕاو بكەن.

د- هێشتنەوەی موباح بوونە بنەڕەتییەكە، بۆ ئەو شتانە، لە سەر ڕەوگەی ئەوەی كە لە بنەڕەتـدا حـەلاڵ بـوون، هـەر وەك درێـژەی ئـەم باسـە لـە باسـی (أستـصحاب)دا، دێـت، إن شاءالله، كە یەكێكە لە بەڵگەكانی ئەحكام.

لەم ڕوانگەیەوە سەرجەم كارو كردەوەكان، لە گرێبەستو هەڵسو كەوتـەكانی تـرو، شـتە بێ گیانەكانو، ئاژەڵو ڕووەكەكان، سەرجەمیان لە بنەڕەتدا حەلاڵن، لە بـەر ئـەوەی كـە لـە شـەرعدا بەڵگەیـەكی ڕاسـتەو خـۆ نـەهاتووە، بیانخـات بـە لایەكـدا، بۆیـە هـەر بەحـەلاڵی دەمێننەوەو، حەلاڵ بوون هاوڕێو هاوشانو هاودەمیانە، چونكە لە بنەڕەتدا حەلاڵن.

بۆیە حوكمی موباح ئەوەیە، كە نەپاداشتو، نەسزای لە سەر نیە، بەلاّم بـەگوێرەی نیـازو مـەرامی مـرۆڤ پاداشـتی لـە سـەر وەردەگیرێـت، وەك ئـەوەی كـە كەسـێك وەرزشـە جۆراوجۆرەكـان پراكتیـزە بكـات، بـۆ ئـەوەی لاشـەی بـەهێز بكـاتو، بتوانێـت بـەرەنگاری دوژمنان ببێتەوە، ئەمە لە سەر ئەم نیازەی پاداشت وەردەگرێت.

٤٠- ئەوەی پێویستە لێرەدا تێبینی بكرێت، ئەوەیە كە ئەو موباحـەی كـە ئێمـە ڕاڤـەمان كرد، ئەوە لە ڕووی جوزئیاتەوەیە، و بەلاّم لە ڕووی گشتی بـوونو، كولیاتـەوە، ئەوەیـە كـە یـان داوای كردنـی كارەكـە دەكـات، یـان نـەكردنی، و موبـاح بـوون ڕوو بـە جوزئیاتـە، نـەك كوللیاتو، لە ڕووی كاتیشەوە بۆ هەندێ كاتە، نەك بۆ هەموو كاتێك.

وەك چۆن خواردن موباحە، واتە: كەسی موكەللـەف سـەر پـشكە لەوەیـدا كـە چ جۆرێـك خواردنی موباح هەڵدەبژێرێ، چی بوێت، دەیخـواتو، كـامی بوێـت نـایخوات، هـەروەك چـۆن دەتوانێـت، هەنـدێ كـات، هـەر خـواردن واز لـێ بهێنێـت، بـەلاّم بەگـشتی خـواردن، كارێكـە ئەنجامـدانی پێویـست كـراوە، چـونكە پەیوەسـتە بـەژیانی مرۆڤـەوەو، بێگومـان پاراسـتنی

[1] سورة (النور/ ٦١).

[2] المائدة (٢).

ژیانیش کارێکی داواکراوه، له کەسی مرۆڤ، که بیپارێزێت.

هەروەها سود وەرگرتن له شته پاکەکان، هەر له خواردن تا خواردنەوەو، پۆشینو بەرگی پاكو چاك، له ڕووی لاوەکیو جورئیاتەوه داواکراوه، و لـه هەنـدێ حاڵەتدایـه، بۆیـه کەسـی موکللەف دەتواتنێت، که ئەو شته جورئیانه، له شته پاکەکان جێ بەجێ بکات،و دەتوانێـت نەیانکات، ئیتر خواردن بێت، یان خواردنەوه، یان پۆشاك چونیەکه، تەنانەت ئەگـەر هەنـدێ کات، ئەنجامیان نەداتو، به کاریان نەهێنێت، ئەگەر توانی، هیچ گرفتێکی نیه، بـەلاّم ئەگـەر به ڕەهاییو بەگشتی وازی لێ هێنان، ئەوه له ڕووی شەرعەوه کارێکی پێـچەوانەی سـوننەتی ئەنجامداوه، وەك له فەرموودەدا، هاتووه، که پێغەمبـەر (ﷺ) فەرموویـەتی: (إن الله يحب أن يرى أثر نعمته على عبده) واته: خوای پەروەردگار پێـی خۆشـه، کـه بەخشـشێکی دا بـه بەندەکەی خۆی، شوێنەوەاری ئەو بەخششەی تیادا بەدی بکاتو، هـەروەها لـه فـەرموودەدا هاتووه، که دەفەرموێت: (إذا أوسع الله عليكم، فأوسِعوا على أنفسِكم) واته: که خودای مەزن بەخششی ڕشت، بەسەرتانا، ئەوا ئەو بەخششه بۆ خۆیشتان به کار بهێـنن، بۆیـه واز هێنـان له شـته باشـەکان (الطيبـات)، بـه ڕەهـاییو بـه گشتی مەکروهـه و پابەنـد بـوون پێیانـەوه بەگشتی مەندوبه، و سەرپشك بوونیش له جورئیاتەکانیاندا، له ڕوی کردن، یـان نـەکردنیان، یان کردنیان له کاتێکدا، و نەکردنیان له کاتێکی تردا، ئەمه کارێکی موباحو حەلاڵه.

هەروەها گەمەو یاری(دوور لەتاوان کاری)، له باخچەکانداو یاری کردنی موباحو گوێگرتن بۆشتی موباح، و هتد..... ئەمانەیش له ڕووی جورئیاتەوه حەلاڵن، واته: ئەگەر کەسی موکللەف له هەندێ کاتداو له هەندێ له حاڵەتدا بیانکات، هیچ گرفتێکی تیادا نییه، بەلاّم ئەگەر ئەو گەمەو ڕابواردنـەی کرده نەریت بۆ خۆیو، خووی پێوه گرتو، تەواوی کاتەکانی خۆی تیادا بەکار هێناو، پێوەکوشت، ئەمـه پێـچەوانەی خوڕەوشـتو نـەریتی جوانـه، و بۆیـه دواجـار دەبێتـه مەکروهـــ، جـا کەراهـەت بوونەکەی لێرەدا بەستراوه به بەردەوامی بوون له سەر ئەو گاڵتەو گـەپو ڕابـواردنو کـات کوشـتن تیایدا، نەبەستراوه بەخودی کارەکەوه، وەك جورئیات، واتـه: ئـەو کاتـەی کـه جـارو بـار ئـەنجامی بداتو، به بەردەوامی نەبێت، موباحه.

و هەروەها که پیاو سەرجێیی له گەڵ ژنەکەیدا دەکات، کارێکی موباحـه، بـەلاّم وازهێنـان لێـی بـه هەمیـشەییو بـەردەوامی حەڕامـه، چـونکه زیـان دەگـات بەژنەکـەو، ئامانجـەکانی هاوسـەرگیری لـه نـاو دەبـات، بۆیـه موبـاحی کـاری سێکـسکردن بەسـتراوه بـه جورئیـاتو

کاتەکەوە، و حەڕام بوونی بەستراوە بەوەوە کە بەتەواوی وازی لێ بهێنرێت[1].

# مەبەستی شەشەم

# باسی ((العزیمة والرخصة))

٤١- ((العزیمة والرخصة))، سەر بەبەشەکانی حوکمی تەکلیفین، چونکە (العزیمة، نیازی قایمو پتەو)، ناوە بۆ ئەو کارەی کە شەرع داوای کردووە، یاخود بە شێوەیەکی گشتی حەڵاڵی کردووەو، (الرخصة، دەرفەتدان)، ناوە بۆ ئەو شتەی کە شەرع لە کاتی پێوستیدا حەڵاڵی کردووە، وەك ئاسانکارییەك لە سەر شانی کەسانی موکللەفو، لابردنی سەختی لە سەر شانیانو، داواکردنو موباحو حەڵاڵ کردنیش سەر بەبەشەکانی حومکی تەکلیفین.

هەندێ لە زانا وای بۆ چوون، کە (العزیمة والرخصة) سەر بەبەشەکانی حوکمی وەضعیـن، بەو پێودانگەی کە عەزیمەت، بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە شەرع دانەر، کارو بارو حاڵەتە ئاساییەکانی سەرشانی کەسانی موکللەفی کردووەتە هۆکار(سبب)، بۆ ئەوەی کە ئەو حوکمە بمێنێتەوە، و بەر دەوام بێت، و ڕوخسەتیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە شەرع دانەر، حاڵەتە کتوپڕە نائاساییەکانی کردۆتە هۆکار (سبب)، بۆ سوکردنی ئەرکە سەر شانی کەسانی موکللەفو، بێگومان (سبب)یش، سەر بەبەشەکانی حوکمی وەضعی یە.

بەڵام ڕای کۆمەڵی یەکەم، پسپۆڕانەترەو، ئاشکراترەو، ئێمەش لەم کتێبەدا لە سەر ڕای ئەوان ڕۆیشتووینو، عەزیمەتو ڕوخصەت، سەر بەبەشەکانی حوکمی تەکلیفین.

٤٢- (العزیمة) لە زمانی عەرەبیدا، بەمانای نیازو مەبەستە، بە شێوەیەکی پێداگیرو جەخت لە سەر کەرەوە (التأكيد)، هەر بۆیەش پەروەردگار دەفەرموێت:﴿فَنَسِيَ وَلَمْ نَجِدْ لَهُۥ عَزْمًا﴾[2] واتە: ئادەم (سەلامی خوای لە سەر بێت) نیازێکی پێداگیرو مەبەستدارو جەخت کردنەوانەی نەبوو، لە سەر ئەنجامدانی سەر پێچی بۆ فەرمانەکەی پەروەردگاری. بەڵام مانەکەی لە ڕووی زاراوەوە، ئەوەیە کە کەمێك پێش ئێستا باسمان کرد.

هەندێ لەزانایان وا پێناسەیان کردووە، کە ناوە، بۆ ئەو شتەی کە بنە ڕەتو بنەمای

---

[1] الشاطبي ب١،ل١٣٠.

[2] طه: (١١٥).

ئەحكامەكانەو، پەيوەست نييە، بە پێشهاتەكانەوە، ئەمەش بەو مانايە يەكە عەزيمەت بۆ ئەو حوكمە شەرعييانە بە كاردەهێنرێت، كە شەرع دايناون بۆ كەسانى موكللەف بەگشتى، بە بێ ڕەچاوكردنى ئەو پاساوانەى كە لە سەريان پەيدا دەبێت‌و، ئەمانە حوكمى بنەمايى‌و بنەڕەتين لە سەرەتاوە بۆيە دانراون، تا ببنە ياسا بۆ سەرجەم كەسانى موكەللەف، لە كارو بارى ئاساييياندا، ولە كاتى دانانييانداوەك شەرع، بۆ خەڵك، سەيرى زۆرينەو ڕەهايى كراوەو، ڕەچاوىپێويست‌و ئاتاجى زۆرو، كردن بە بيان‌و هتد....نەكراوە وەك نوێژو پەرستشەكانى تر،و ئەمەيش دەبێتە پێكهێنەرى بەشەكانى حوكمى تەكليفى وەك (وجوب) و(ندب) و(كراهة) و(إباحة).

پاشان توێژەرەوانى ئەم بوارە كاتێك (عەزيمەت) بۆ ئەحكامەكان بە كار دەهێنن، كە ڕوخسەتێك لە بەرامبەريدا هەبێت.

٤٣- (الرخصة)، لە زمانى عەرەبيدا، بەماناى ئاسانى‌و ئاسانكارى كردن هاتووەو، لە زاراوەى زانايانى زانستى ئوصوڵيشدا پێشتر باسمان كرد.

هەندێ لە زانايانى ئوصوڵ، واى پێناسە دەكەن كە بريتيە لەو كارەى كە ڕێگاى پێدراوە، بەهۆى بوونى بيانووو، دەستەوستانى تيايدا، هەرچەندە هۆكارى حەڕاميەكەشى تيادا هاتو وەتەدى [1]، يان بريتين لەو حوكمانەى كە بەشەرعى دانراون، بەهۆى بوونى پاساو لە كردنياندا، هەر چەندە حەڕاميشن‌و، ئەگەر ئەو پاساوە نەبوايە، حەڕام دەبوون‌و، بە حەڕاميش دەمێننەوە [2] ماناى ئەمەيش، ئەوەيە كە گوتمان‌و، بۆيە ڕوخصەت ئەو حوكمە شەرعييانەن كە شەرع دايناون، وەك ڕەچاو كردنى بيانووى كەسانى موكەللەف،و ئەگەر ئەو پاساوو بيانووانە نەبوونايە، ئەوا هەر لەسەر حوكمە ئەسڵييەكەى خۆيان دەمانەوە، ئەمە حوكمێكى (ريزپەڕ : إستثناء)يـيە، لە حوكمێكى گشتى (كلي)، و هۆكارى ڕێزپەڕى‌و جياكردنەوەيش ڕەچاوكردنى پێداويستى‌و پاساوەكانە، تا ئەركى قورس و سەخت لە سەر شانى كەسى تەكليف دار لابەن‌و، ئەم بابەتەيش لە زۆربەى كاتەكاندا حوكمى بنەمايى‌و ئەسڵى لەپلەى پابەندى ڕەهاوە، دەگۆڕێت بۆ پلەى موباح بوون، و تەنانەت دەگوترێت بۆ پلەى مەندوب بوون‌و، (واجب) بوونيش، هەروەك لەمەودوايش باسى لێوە دەكەين.

---

١ المستصفى، ١ب،ل٩٨، الآمدي ١ب، ل١٨٨.

٢ التلويح ب٢، ل١٢٧، الآمدي ١ب، ل١٨٨.

## ٤٤- جۆرەکانی ڕوخسەت:

**یەکەم:** حەڵاڵکردنی شتی حەرام، لە کاتی پێویستدا، وەك دەربڕینی ووشەی کوفر، ئەگەر کاتێك مرۆڤ زۆری لێکرا بەڵام لە بەر ناچاری بووەو دڵی پڕ بوو لە باوەڕ، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالْإِيمَانِ﴾[١] کە هەر کەسە بە تۆبزی کوفری پێکراو دڵی پڕ بوو، لە باوەڕداری، ئەوە لە بازنەی ئیمان ناچێتە دەرەوەو، هەروەها وەك، خواردنی گۆشتی مردارەوە بووو، خواردنەوەی ئارەق، چونکە پاراستنی ژیان پێویستە، بۆیە شەریعەت خواردنی مردارەوە بووی حەڵاڵ کردووە، لە کاتی برسێتی زۆردا کە مرۆڤ ترسا لە برساندا بمرێتو، لە ناوبچێتو، هەروەها خواردنەوەی ئارەق دروستە، لە کاتێکدا کە مرۆڤ تینووی بووو دەترسا لە تینواندا بخنکێت، هەروەها لەناوبردنی موڵكو سامانی کەسانی تر، کە زۆرت لێکراو زۆرلێکردنەکە لەو ئاستەدا بوو کە بترسی بکوژرێی، یان ئەندامێکی لەشت لەدەست بدەی ئەوا لەبەر ناچاری ئەو لەناوبردنی موڵکی خەڵکە دروستە.

**دووەم:** دروستی پشتگوێخستنی واجبێك، وەك شکاندنی ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزاندا بۆ کەسی گەشتیارو نەخۆش، تا سەختی لەسەر شانیان لابچێت، هەروەها وەك فەرمان نەکردن بە چاکەو ڕێگەنەگرتن لە خراپە، لە کاتێکدا کە دەتزانی دەسەڵاتداری ئەو کاتو سەردەمە دیکتاتۆرەو ئەگەر فەرمان بە چاکە بکەیتو ڕێ لە خراپە بگریت دەتکوژێت، ئەوا دەستهەڵگرتن لەو واجبە لەو کاتەدا دروستە.

**سێیەم:** ڕاستکردنەوەو هەمووارکردنەوەی ئەو گرێبەستانەی کە خەڵك پێویستی پێیان هەیە، هەرچەندە ئەو هەمووارکردنەوەیە لەسەر یاسا گشتیەکان نەبێتو نەڕوات، وەك کڕینو فرۆشتنی دەخڵو دان (کە هێشتا نەگەیشتووەو چارەنووسی نادیارە)، کە شەرع حەڵاڵی کردووە، هەرچەندە ئەو کڕینو فرۆشتنە چارەنووسی نادیارە، بێگومان مامەڵەی شتی چارەنووس نادیاریش بەتاڵە، بەڵام سەرەڕای ئەمەش شەرع حەڵاڵی کردووەو لە یاسا گشتیەکانی کڕینو فرۆشتندا هەڵاوێری کردووەو جیای کردۆتەوە، تا کار لەسەر شانی خەڵکی ئاسانو سووك بکات، هەروەها وەك ئەو گرێبەستەی کە لەگەڵ کەسێکی دەکەیت تا شتێکت بۆ دروست بکات (عقد الاستصناع)، کە ئەمەیش شەرع حەڵاڵی کردووە، هەرچەندە مامەڵەی شتێکی نادیارە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە خەڵك پێویستی پێیەتی شەرع بە دروستی

---

[١] النحل: (١٠٦).

داناوە، بێگومان لە ڕێگرتن لێی نارەحەتیو سەختی دروست دەکات لەسەر شانی خەڵك، بۆیە ئاسانکاری تیادا کردووەو شەرع ڕێگای پێداوە.

## ٤٥- حوکمی ڕوخسەت:

لە بنەڕەتدا ڕوخسەت کارێکی حەڵاڵەو، بارودۆخی هەر کارێك دەگۆڕێت، لە بنەڕەتەوە کە پابەندی تەواوو بووە، بۆ حاڵەتی سەرپشککردن، کە دەتوانێت بیکاتو دەتوانێت نەیکات، چونکە ڕوخسەت لەسەر بنەمای ڕەچاوکردنی بیانووو پاساوی کەسی موکەللەف وەستاوە، تا سەختی لەسەر مرۆڤەکە لابرێتو، ئەم ئامانجەیش نایەتەدی تا ئەو کارە یاساغکراوە حەڵاڵ نەکرێت،و فەرمان کردنیشی وازی لێ بهێنرێت، وەك شکاندنی ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا بۆ ڕێبوارو نەخۆش،، کە هەردووکیان دەتوانن کار بەم دەرفەتە ڕوخسەتە بکەنو، ڕۆژوو بشکێنن، وە دەیشتوانن بە ڕۆژوو بنو کار بە نیازە قایمەکەی خۆیان (عزیمة) بکەن، ئەگەر ئەو ڕۆژوو شکاندنە زیانی پێ نەدەگەیاندن، ئەم جۆرە ڕوخسەتەیش لای حەنەفیەکان بە ڕوخسەتی ئاسوودەبەخش (رخصة الترفیه) ناوزەدکراوە، چونکە حوکمە بنەڕەتیەکەی هەر ماوەتەوەو لانەچووە، بەڵام دەرفەت دراوە بە کەسی موکەللەف کە دەستی لێ هەڵبگرێت، ئەمەش وەك ئاسودەبەخشین پێیو سووککردنی ئەرکی سەرشانی.

جاری وا هەیە کە کەوتنەشوێن (عەزیمەت) باشترە، هەرچەندە کارکرن بە ڕوخسەتەکەیش بە دروست زانراوەو، ڕێگای پێدراوە، نموونەیش بۆ ئەم جۆرە وەك: دروستی دەربڕینی بێژەی کوفرئامێز لەسەر زمان، لە کاتێکدا کە دڵ پڕ باوەڕ بێت، ئەمەش لە حاڵێکدا کە مرۆڤەکە ترسی کوشتن یان لەدەستدانی ئەندامێکی هەبوو، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش لێرەدا، هەر کارکردن بە عەزیمەتەکە لە پێشترە، چونکە کوفرنەکردنەکە نیشانەی سەربەرزی ئاینو نەلەخشاوی هەقو تووڕەکردنی بێباوەڕانو دەروونشکانیانو بەرزکردنەوەی وورەی باوەڕدارانی تیایە، بەڵگە بۆ ئەمەیش ئەوەیە کە دەگێڕنەوە، هەندێك لە پەیڕەوانی (موسەیلەمەی درۆزن) دوو موسڵمانیان گرتنو بردیانن بۆ لای موسەیلەمەو، پرسیاری لە یەکێکیان کرد دەربارەی موحەممەد دەڵێی چی؟ ئەویش وتی: موحەممەد پێغەمبەری خودایە، وتی: ئەی دەربارەی من دەڵێی چی؟ وتی: هەروەها تۆیش پێغەمبەری خودایت! ئەویش وێڵی کردو، دەستی لێ نەدا، دواتر پرسیاری کرد لە دووەمیان، دەربارەی موحەممەد

(ﷺ)و ئەویش لە وەڵامدا وتی: موحەممەد پێغەمبەری خوایە، وتی: ئەی من؟ ئەویش وتی: من کەڕمو نابیستمو، تا سێ جار لێی دووبارە کردەوە، هەر وای وەڵام دایەوەو، دواجار کوشتی، کە ئەمە گەیشتەوە بە پێغەمبەر (ﷺ)، فەرمووی: یەکەم کەس کاری بەو دەرفەتو ڕوخسەتە کردووە کە خوای پەروەردگار ڕێگای پێداوە، دووەمیشیان هەقی وتو خۆشبەختی بۆ ئەو!

هەروەها (عەمماری کوڕی یاسر) کە کوفریان پێکردو دژی پێغەمبەریش (ﷺ) شتی نەشیاوی پێگوتراو، شتایشی بتی هاوبەشدانەرانی کرد، لە ژێر ئەشکەنجەی بەهێزو دڕندانەیاندا، بەڵام کە پێغەمبەر (ﷺ) گەیشتەوەو بۆی گێڕایەوە، پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: ئەی لەو کاتەدا حاڵی دڵت چۆن بوو؟ عەمماریش وتی: دڵم ئاسوودەو پڕ لە باوەڕ بوو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەگەر دیسان ئەمەت بەسەردا هاتەوەو داوایان لێ کردیتەوە بیڵێیتەوە، بیڵێرەوە!

ئەم گێڕانەوەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە کوفرکردن لە کاتی زۆرداریو ناچاریدا دروستەو، گێڕانەوەی یەکەمیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خۆڕاگرتنو کارکردن بە عەزیمەت باشترو شکۆمەندانەترو لەپێشترە.

هەروەها کارکردن بە عەزیمەتن لە فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە، هەرچەندە تووشی مەرگیش ببیت، هەر ئەم باشترە، تا کارکردن بە ڕوخسەت، هەروەك لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە، کە فەرموویەتی: سەرداری شەهیدان حەمزەی کوڕی عبدولموتەلیبە، لە گەڵ ئەو کابرایەدا کە لەبەردەم دەسەڵات دارێکی دیکتاتۆردا قسەی هەقی کردو ئەویش کوشتی!

کە لێرەدا فەرمان کردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە باشترە لە بێدەنگ بوون لێی سەرەڕای دیکتاتۆریەتی کاربرای دەسەڵاتدار، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرزیو مەزنی پلەی شەهیدیدا کردوویەتییە هاوڕێو هاو پلەی حەمزەی کوڕی عبدلموتەلیب.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگرتن لە خراپە لە کاتی پێویستدا ڕوخستەودەرفەتی ڕێپێدراوە، کە ئەنجام نەدرێتو، ئەگەر ئەو فەرمانو ڕێگەگرتنە ڕووبەڕوی دەسەڵاتدارێکی ستەم کار دەکرایەوە، کە ئەنجام دەری چاکەو بەر گریکاری خراپەی دەکوشت، لێرەدا هەر وەك گوتمان کارکردن بە عەزیمەتەکە باشترە،و بەڵام ئەم حوکمە بەگشتی وانیە،و لە ڕووی (جوزء) وایە، واتە تایبەتە بە تاکێك، نەك بەسەرجەمی

ئوممەت، بۆیە دروست نییە، کە سەر جەمی ئوممەت لە ترسی دەسەڵاتداری ستەمکار دەست هەڵبگرن، لە فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە، چونکە فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگەگرتن لە خراپە فەرزی کیفایەیە، و دەبێت لە ناو گەلدا هەر هەبێت، هەر چەندە باجی دەدرێت و گیان بەخت کردنی دەوێت و، نابێت ئەم باجدانە بکرێتە پاساو بۆنەکردنی.

دەبێت فەرمانکردن بە چاکەو بەرگری کردن لە خراپە، لەلایەن گەلەوە ئەنجام بدرێت، هەرچەندە کوشتن و، گیان لەدەستدانی بەدواوە بێت، کەواتە فەرمانکردن بە چاکە لەم کاتەدا بەشێکە لە بەشەکانی جیهاد، و نابێت کە سەرجەمی ئوممەت دەستی لێ هەڵبگرێت، هەرچەندە ئەنجامدانیشی گیان بەختکردنی کۆمەڵێك کەسی بەدوادا بێت. هەندێ جاریش کاکردن بەڕوخسەت واجبە، وەك خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، لە کاتی پێوستیدا، بە جۆرێك کە ئەگەر ئەو کەسە ناچارە ئەو گۆشتە نەخوات لەبرساندا دەمرێت، جا ئەگەر نەیخوارد، ئەوە تاوانبارە، چونکە هۆکارە، بۆ کوشتنی خۆی، چونکە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوٓاْ أَنفُسَكُمْ﴾[1] وەهەروەها دەفەرموێت﴿وَلَا تُلْقُواْ بِأَيْدِيكُمْ إِلَى ٱلتَّهْلُكَةِ﴾[2] بەدەست خۆتان، خۆتان تووشی دەردە سەری و تیا چوون مەکەن!

فاکتەرو هۆکارەکان لەم نموونە گەلەدا بەم جۆرەن، کە مردارەوە بوو، و جۆرەکانی لە شتە حەرامەکانی وەك، ئارەق وان، و بۆیە حەرام کراون، چونکە دەرون و عەقڵی مرۆڤ دەشێوێنن و، تێکدەدەن، بەڵام کە بوونە هۆکارو ڕێگا چارە بۆ پاراستنی گیان و لابردنی مەینەت لە سەری، ئەوا بەکارهێنانیان دەبێتە واجب، چونکە مرۆڤ مافی ئەوەی نییە، کە گیانی خۆی لە ناوبەرێت، یاخود لە غەیری حاڵەتی شەرعیدا تووشی تیاچوونی بکات، چونکە گیانی مرۆڤ، موڵکی حەقیقی ئەو نییە، بەڵکو موڵکی پەروەردگارە، کە گیانەکەی داوەو، ئەفراندوویەتی و، بە سپاردن لای خاوەنەکەیەتی، کە مرۆڤە، و مرۆڤیش ناتوانێت: بەبێ مۆڵەتی خاوەن سپاردە، دەستکاری سپاردن بکات، ئەم جۆرە ڕوخسەتەیش، کە واجبە پێوەی پابەند بێت، حەنەفییەکان ناویان ناوەتە ڕوخسەتی فڕێدان و لە سەر لاچوون، (رخصة الأسقاط)، چونکە حوکمە بنەڕەتییەکە لەم حاڵەتەدا فڕێدراوەو، لە کار خراوەو، تەنهایەك حوکمی تیادا ماوەتەوە، کە ئەویش کارکردنە بە ڕوخسەتەکە.

---

١ النساء (٢٩).

٢ البقرة (١٥٩).

# ﴿بەشە باسی سێیەم﴾

# بەشەکانی حوکمی وەضعی

## ( مەبەستی یەکەم ) - ( باسی سەبەب : هۆکار- )

٤٦- سەبەب، لە زمانی عەرەبیدا، ئەو شتەیە، کەبە هۆیەوە دەگەیت بە هەرشتێك کە بتەوێت.

لە زاراوەدا، ئەو شتەیە کە شەریعەت کردوویەتییە هۆکاروناسێنەر بۆ حوکمێکی شەرعی، بەجۆرێك کە هەرکات ئەو سەبەبە هەبووو، هاتەدی، حوکمەکەیش دێتە دیو، هەر کات سەبەبەکە نەما، حوکمە کەیش دەپێچرێتەوە[1].لەم ڕوانگەیەوە، دەکرێت پێناسەی سەبەب، لە زاراوەی زانستی ئوصولّدا بەم شێوازە بکەین، کە بریتییە لە هەر کارێك، کە شەرع کردبێتییە نیشان، لە سەربوونی ئەو حوکمە شەرعییە، و هەروەها نەبوونی ئەو سەبەبەی کردبێتە نیشانە بۆ نەبوونی حوکمەکە، وەك، داوێن پیسی کردن، کە هۆکارە بۆ واجب بوونی شەلاق لێدانی بکەرەکەیو، هەوەها شێت هۆکارە، بۆ ئەوەی کە واجبە، چاودێری لەسەر موڵکەکەی (حجز)ـی، بخرێتە سەر و هەوەها داگیرکردنی ماڵی خەڵك، هۆکارە بۆ واجبێتی گێڕانەوەی شتە داگیرکراوەکە، ئەگەر مابوو، یان قرساندنیو، نرخەکەی چەندە بۆ خاوەنەکەی بگێڕدرێتەوە، ئەگەر شتەکە خۆی لەلای نەمابوو، جا ئەگەر داوێن پیسیو شێتیو، داگیرکاری لەم بارودۆخانەدا نەبوون، کەواتە سزای شەلاق لێدانو چاودێری خستنە سەر، گێڕانەوەو، لە ئەستۆ گرتن موڵکی داگیرکراویش نامێنێ.

## ٤٧- بەشەکانی سەبەب:

سەبەب، لە ڕوانگەی ئەوەوە کە خودی سەبەبەکە دەسکرداری کابرای موکللەفو ئەنجامدەر بێت، یان دەسکرداری خۆی نەبێتو خۆ ڕسك بێت، **دەبێتە دوو بەشەوە:**

**بەشی یەکەم:** سەبەبەکە کارو دەسکرداری موکللەف نەبێتو، تەنانەت لە تواناشی دا نەبێتو، سەرە ڕای ئەمەش هەر کات ئەم سەبەبە هەبوو، حوکمەکەیش دەبێت، چونکە

---

[1] المستصفى، للأمام الغزالي، ب١،ل٩٣-٩٤، الآمدي،ب١،ل١١، و دوای ئەو.

شەرع حوكمەكەی بەستۆتەوە، بەو سەبەبەوە، بە بوون یان نەبوون‌و، هەر ئەو سەبەبەش هاندەری بوونی حوكمەكەیەو، نیشانەی بەرپابوونیەتی، وەك، لادانی خۆر لە نیوەی ئاسمان لە نیوەڕۆدا سەبەبە بۆ واجبی نوێژی نیوەڕۆو، هاتنی مانگی ڕەمەزان، هۆكارە بۆ واجبی ڕۆژووگرتن‌و، ناچاری سەبەبە بۆ حەلاڵی خواردنی گۆشتی مردارەوە بوو، و شێتی‌و منداڵی هۆكارن بۆ ئەوەی كە واجبە چاودێری بخرێتە سەر ماڵ‌و موڵكیدا، تا نەزانان بە هەدەری نەدات.

**بەشی دووەم:** سەبەبەكە دەسكرداری خودی موكەللفەكە بێت‌و، لە توانایدا هەبێت. بیكات. وەك، گەشت كردن كە هۆكارە بۆ دروستی ڕۆژوو نەگرتن‌و، كوشتنی دەست ئەنقەست، هۆكارە بۆ واجبی تۆڵە كردنەوە،و كوشتنەوەو، گرێبەست‌و مامەڵە جۆراو جۆرەكانی تر هۆكارن، بۆ ئەوەی كە سەرجەم ڕێ‌و شوێنە شەرعی‌و یاساییەكانیان لە سەر بنیات بنرێت، وەك ئەو كڕین‌و فرۆشتنەی كە ماڵی فرۆشراو دەبێتە موڵكی كابرای كڕیارو، دروستە بۆی سوود وەرگرتن لێی.

**ئەم بەشەی سەبەب، كە دەستكرداری خودی موكەللەفەكەیە، لە دوو ڕوانگەوە تەماشای دەكەین:**

**یەكەم:** بەو پێوەدانگەی كە كرداری خودی كەسەكەیە، كەموكەللەفە و تەكلیفی شەرعی لەسەرە، بۆیە سەبەبەكە دەچێتە چوار چێوەی تەكلیفەكەوەو سەرجەم حوكمەكانی بەسەردا جێ بەجێ دەبن‌و، كردن‌و نەكردنی كارەكەو، سەر پشك بوون لە نێوان كردن‌و نەكردنیدا، دەبێتە كارێكی داواكراو و دەبێت بكرێت.

**دووەم:** بەو پێوەدنگەی كە شەریعەت، ئەحكامی تری لە سەر ئەو سەبەبە بنیات نابێت‌و، لەم ڕوانگەیەوە دەبێتە بەشێك لە بەشەكانی حوكمی وەضعی[1].

بۆیە ژن هێنان لە كاتی ترسان لە كەوتنە ناو تاوانداو، لە كاتی بوونی توانای دارایی ئەنجامدانیدا، واجبە، و واجب بوونیش حوكمێكی تەكلیفیەو، سەبەبە بۆیە سەرجەم ڕێ‌و شوێنە شەرعییەكانی لە سەر بنیات دەنرێت، لە مارەیی و ئەركی ژیان كێشان‌و میرات بردن‌و هتد.... و دەبێت ئەمانەی بۆ جێ بەجێ بكرێت‌و، بێگومان (سەبەب)یەتیش، حوكمێكی وەضعي یە.

---

[1] الشاطبي، ب١، ل١٨٨.

هەروەها مامەڵەی کڕین و فرۆشتن، کارێکی حەڵاڵەو، ئەمەیش حوکمێکی تەکلیفیەو، سەبەبە بۆ چەسپاندنی نرخەکەی بۆ فرۆشیارو، چەسپاندنی موڵکیەتی شتەکە، بۆ کڕیار، کە ئەمەیش حوکمێکی وەضعی یە.

٤٨- سەبەب، لە ڕوانگەی ئەو پێودانگەوە کە حوکمە شەرعییەکانی لە سەر بنیات دەنرێت، دیسان دەبێتە دوو بەشەوە:

یەکەم: سەبەب بێت بۆ حوکمێکی، تەکلیفی،وەك گەشت کردن، کە سەبەبە، بۆ دروستی ڕۆژوو شکاندن و، گەیشتنە ئاستی زەکاتدان، سەبەبە بۆ واجبی زەکات لەو ئاستەدا.

دووەم: سەبەب بێت، بۆ حوکمێك، کە ئەو حوکمە کاردانەوەی کاری کەسێکی موکەللەف بێت، و ڕێ و شوێنی شەرعی لە سەر بگرێتە بەر، وەك مامەڵە کردن بە ماڵە فرۆشراوەکەوە لەدوای گرێبەستەکەوە، و بوونە موڵکی ماڵی فرۆشراو، بۆ کابرای کڕیار، و هەروەها وەك ئەوەی کە (وەقف) سەبەبە بۆ لابردنی خاوەنێتی، بەسەر کەسی وەقف کارەوە، و مارە کردن سەبەبە بۆ حەڵاڵ بوونی ژن و مێرد لە یەکتری، و تەڵاق سەبەبە بۆ لابردنی ئەو حەڵاڵیەتە لە نێوانیاندا. ١

٤٩- بەستنەوەی هۆکارەکان (سەبەب و سەبەبکار) بەیەکترییەوە: سەبەب کارەکان لە سەر ڕێ و شوێنی سەبەبەکان دادەمەزرێن، ئەگەر سەبەبەکان (هۆکارەکان) هاتنەدی و شەرعییانە جێ بەجێ بوون، ئەمەیش تا ئەحکامەکانیان لەسەر بنیات بنرێت، بۆ نموونە، خزمایەتی هۆکارە بۆ میرات بردن و، مەرجەکەی، مردنی خاوەن میراتە کەیەو، دەبێت لە ڕووی حەقیقەت، یان حوکمەوە میرات بەر لە ژیاندا بێت و، ڕێگر لە میرات بردن بریتییە لە کوشتنی بە دەست ئەنقەست، یان بێ باوەڕبوون، جا کە سەبەبەکە هاتە دی و، مەرجەکان جێ بەجێ بوون و چەسپان و، ڕێگرەکان لە ئارادا نەبوون، ئەوکاتە ڕێ و شوێنی شەرعی لە سەردا دەمەزرێت و، بنیات دەنرێت، کە بریتیە لە میرات بردن و، هەرکات مەرجەکان (شرط) نەمان، یان ڕێگر پەیدا بوو، ئەوکاتە ئەو سەبەبە، بەسەبەبێك نایەتە ئەژمار، کەڕێ و شوێنی لە سەر دابمەزرێت و، لە سەر بنیات بنرێت و، ئیتر هیچ پێگەیەکی نابێت.

دامەزراندن و بنیاتنانی سەبەبکارەکان، لە سەر ڕەوتی سەبەبە شەرعییەکان، بەپێی حوکمی شەرع دەبێت و، لێرەدا پەیوەندی نابێت، بە ڕازی بوون، یان ڕازی نەبوونی کەسەکەوە، و شەرع خۆی تەنها بڕیار دەرەکە سەبەبە کەی کردووەتە وابەستەی سەبەبکارەکە ئیتر موکەللەف ئەمەی ویستبێت،یان نا ...چونیەکە، و لە سەری ڕازی

بوویێت، یان ڕازی نەبوویێت، هەر چۆنیەکە، بۆ نموونە، کوڕ میرات لە باوکی دەبات، چونکە کوڕایەتی بەبڕیاردانانی شەرع میرات بەرە، هەر چەندە میرات بەر ئەمەی لانەگەیشتبیّ یان نەیویستبیّ، یاخود میرات دەر نەیدابێتیّ، یاخود کەسێك ژن مارە بکاتو، مارەیی‌و دابین کردنی ژیانو، میرات بردن لە یەکتری لیّ زەوت بکات، ئەمانە مەرجی بەتاڵنو، بیّ نرخن، چونکە شەرع ئەم حوکمانەی داناوە، کە لە سەر مارەیی بنیات دەنرێن، و دادەمەزرێنو مەرجی ئەملاو ئەولا لەم بوارەدا جگە لە مەرجی شەرع بیّ نرخنو، بۆیە مارەیی ژنو دابین کردنی ژیانی‌و میرات بردن لە یەکتری شەرع چەسپاندوونی، هەروەها سەبەبەکانی تریش، کە سەرجەم ئەو ڕیّو شوێنانەی شەرع لە سەری دیاری کردوون، بۆیان جیّ بەجیّ دەکرێتو، هەرچەندە کەسە موکەللەفەکەیش نەچێتە ژێر باریانەوەو نەیەوێت.

## ٥٠- باسی سەبەب و عیللەت:

سەبەب (فاکتەر، هۆکار)و، عیللەت (بۆنە)، ئەوانەن کە شەرع کردوونی بە نیشانە بۆ بوون یان نەبوونی هەر حوکمێك، و جاری وا هەیە، کە ئەم نیشانەیە دەر دەکەوێتو، بوونی پەیوەندی لە نێوان سەبەبو حوکمەکەدا هەست پیّ دەکرێت و جاری واهەیە، کە پەیوەندی‌و کۆنتاکتی لە گەڵ حوکمەکەدا شاراوەیەو، عەقڵو ژیری پەی پیّ نابات، جائەگەر دیارو ئاشکرابوو، ئەوا بە (سەبەب)و (عیللەت)یش، ناو زەد دەکرێت، و ئەگەر پەیوەندییەکە دیار نەبوو، ئەوا تەنها بە (سەبەب)ناوزەد دەکرێت، و بە عیللەت ناو نابرێتو، ئەمەش ڕای گروپێکە لە زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقه.

نموونە بۆ یەکەمیان وەك، گەشتکردن کە هۆکارو سەبەبە بۆ ڕۆژوو نەگرتنو، سەرخۆشی هۆکارە بۆ حەرام بوونی ئارەقو، منداڵی هۆکارە بۆ ئەوەی کە منداڵ سانسۆرو چاودێری بخرێتە سەر، لە ڕایی کردنی کارەکانیدا، کە لەم نموونە گەلەدا عەقڵ پەی دەبات، پەیوەندی‌و گونجانی نێوان سەبەبو حوکمەکە لە گەڵ یەکتریدا، کە سەفەرو گەشت کردن چاوەڕێی سەختی تیادا دەکرێت، بۆیە ڕیّ شل کراوە، بۆ هاوکاری کردنو ڕۆژوو نەگرتن تیایدا، و هەروەها سەرخۆش بوون عەقڵ تێك دەداتو ئەمەش هۆکارێکی گونجاوەو، فاکتەرە بۆ حەرام کردنی ئارەق، تا عەقڵ بپارێزرێت لە تێکچوونو شپرزەیی، و هەروەها منداڵی هۆکارە بۆ ئەوەی کە منداڵ نەزانێت چۆن هەڵسوکەوت بکاتو، سود وەربگرێتو لە

مامەڵە کردنەکانیدا، بۆیە ئەو حوکمە زۆر گونجاوە، بۆ ئەوەی کەسانسۆرو چاودێری بخرێتە سەر تا ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی ئەو منداڵە بکرێتو، زیانی لێ دوور بخرێتەوە.

لەم دۆز و پرسانەدا، هەر یەکە لە سەفەرو سەرخۆشیو منداڵی، هۆکارو عیللەتن، بۆ ئەو حوکمانەی کە پەیوەندییان پێیانەوە هەیە.

ئینجا سەبارەت بەو حوکمانەی، کە پەیوەندی نێوان سەبەبو حوکمەکە نازانرێت، وەك بینینی مانگی ڕەمەزان، کە هۆکارە بۆ واجب بوونی ڕۆژوو گرتن، کە لێرەدا عەقڵ پەی بەوە نابات، کە ڕەهەندی گونجانو پەیوەندی لە نێوان، سەبەبەکەدا کە بینینی مانگەو، حوکمەکەدا، کە واجبی ڕۆژوو گرتنە چییە؟! و هەروەها ئاوا بوونی خۆر، هۆکارە بۆ واجبی نوێژی مەغریب، بەڵام ڕووی ئەو پەیوەندییەی نێوان هۆکارەکە، (ئاوا بوونی خۆر)و، حوکمە کە( واجبی نوێژی مەغریب) نازانرێت!

بۆیە لەم سۆنگەیەوە، هەر یەکە لە بینینی مانگو ئاوابوونی خۆر، تەنها بە (سەبەب) ناوزەرد دەکرێنو، بە (عیللەت) ناو نابرێنو، هەموو عیللەتێك سەبەبەو، بەڵام هەموو سەبەبێك، عیللەت نییە.

گروپێکی تر لە زانایانی ئوصول پێیان وایە، کە عیللەت تەنها بۆئەوانە بەکار دێت، کە هۆکاری نێوان عیللەتو حوکمەکە زانراوەو، سەبەبیش بۆ ئەوانە بە کار دێت، کە پەیوەندی نێوان سەبەبو حوکمەکە نادیارەو شاراوەیە، بۆیە بەڕای ئەم گروپە (سەبەب)و (عیللەت) جیاوازن، و هەرگیز سەبەب بۆ عیللەت و بە پێچەوانەوە بە کارنایەت. لە ڕاستیدا، ئەم ڕا جیاییە ئاسانە، گروپی یەکەم، کە دەڵێن عیللەت جارو بار مانای سەبەب وەردەگرێت، ئەوە کۆیان دەکەنەوە پێکەوە، بەو مانایەی کە هەردووکیان نیشانەن بۆ بەرپابوونی حوکمەکە، بەڵام لە ڕووی گونجان و پەیوەندی بە حوکمەکەوە جیای دەکەنەوە، و ئەوەی کە گونجان و پەیودندی دیارە، و گونجاوە بە عیللەت ناوی دەبەن، و ئەوەیشی کە نادیارو نەگونجاوە، بە عیللەت ناو زەدی ناکەن، و ئەگەر چی هەردوو ناوەکە مانای سەبەب تیایاندا حەشار دراوەو، هەیە.

## (( مەبەستی دووەم ))

## باسی شەرط ( مەرج )

٥١– (شەرط) لە زمانی عەرەبیدا، ئەو نیشانەیە کە پابەندی هەیە بە شتێکی ترەوەو، هەردەم پێوەیەتی.

لە زاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا، ئەو شتەیە کە بوونی شتێکی تری پێوە بەستراوە، و لە سەر ئەم وەستاوە، و لە دەرەوەی پێکهات و حەقیقەتی ئەم شتەیشدا، و کەچی هەر پێوەی بەستراوەو، کاتێك ئەو مەرجە هەبوو، هۆکاری تەواو نییە، بۆ بوونی حوکمەکە، کە دەبێت ببێت، بەلاَم هەر کات ئەو مەرجە نەبوو، ئیتر بێ دوو دڵی حوکمەکیش نابێت.[1]

مەبەست لە بوونی شتە کە (وجود الشيء) بوونێکە لە چوار چێوەی شەرعدا، کە ڕێ‌و شوێنی شەرعی لەسەر بگیرێتە بەر، وەك دەستنوێژ، کە مەرجە بۆ دروست بوونی نوێژو، مەرج بوونی دوو شایەت، مەرجە بۆ دروستی گرێبەستی هاوسەرێتی، جا دەستنوێژ مەرجە، بۆ دروستی نوێژێك، کە لە ڕووی شەرعەوە وەرگیراو بێت، و ڕێ‌و شوێنی شەرعیی لە سەر دیار بێت، و دروست بێت، و لە سەر ئەستۆو سەر شانی مرۆڤ، وەك ئەرك لا بچێت، بەلاَم دەست نوێژ لە دەرەوەی پێکهات‌و حەقیقەتی نوێژیشدایە، و بەشێك نییە لە حەقیقەتەکەی‌و ناواخنەکەی، و جاری وا هەیە، کە دەست نوێژ هەیە، و نوێژیش لە ئارادا نییە.

هەروەها ئامادە بوون‌و دوو شایەت لە گرێبەستی هاوسەریدا مەرجە، بۆ دروست بوونی ئەو گرێبەستە، لە ڕوانگەی شەرعەوەو، سەرجەم ڕێو شوێنە شەرعییەکان، لە سەر ئەو گرێبەستە شەرعییە دەگیرێتە بەر، بەلاَم لە گەڵ ئەمەشیدا ئامادە بوونی دوو شایەت، بەشێك نین لە حەقیقەت‌و چییەتی (ماهیەت)ی، گرێبەستی هاوسەرێتی‌و، جاری وایش هەیە کە دوو شایەت ئامادەن‌و کەچی گرێبەستی هاوسەرێتیش لە گۆڕێدا نییە.

### ٥٢– باسی ( الشرط: مەرج )و ( الركن: پایە ):

لەو ڕوانگەیەوە کە (شەرت)و (ڕوکن) هەردووکیان، بوونی شتێکیان، لە ڕووی شەرعەوە لە سەر دەوەستێت، لە یەکتر دەچن‌و لە وەشیدا جیاوازن، کە(شەرط) لە دەرەوەی پێکهات‌و حەقیقەت‌و ماهیەتی ئەو شتەوەیە، بەلاَم (ڕوکن) بەشێکە لە حەقیقەت‌و چییەتی

---

[1] المحلاوي، ل٢٥٦.

ماهیەت)ـی، ئەو شتە، وەك، چەمانەوە (ڕکوع) لە نوێژدا، کە ڕوکنێکە لە نوێژدا، و بەشێکە ـە حەقیقەتی نوێژەکە، و بە بێ ڕکوع، نوێژ بوونی شەرعییانەی خۆی وەر ناگرێت، و هەروەها دەست نوێژ گرتن مەرجە (شەرط) بۆ دروستی نوێژ، چونکە بەبێ دەست نوێژ، نوێژ هیچ بوون‌و پێگەیەکی نییە، بەلام لە گەڵ ئەوەشیدا لە دەرەوەی حەقیقەت‌و ماهیەتی نوێژدایەو، جیایە لێی، هەروەها ڕازی بوونی هەردوولا (الأیجاب والقبول) لە گرێبەستی پرۆسەی هاوسەر گیریدا، کە هەردووکیان، وەلاّم‌و ڕازی بوون، ڕوکنن لە پرۆسەکەداو، هەروەها بەشێکیشن لە حەقیقەتی کارەکە، و هەروەها ئامادە بوونی دوو شایەت شەرت)ـن، بۆ دروستی گرێبەستەکە، بەلام لە ئەمیا لە دەرەوەی حەقیقەت‌و ماهیەتی پرۆسەو کارەکەدایە.

## ٥٣- باسی ( شەرط )و ( سەبەب ):

شەرت (مەرج)و سەبەب (هۆکار)، لە وەدا لە یەکتری دەچن، کە هەدووکیان بەستراون بەشتێکی ترەوە، بە جۆرێك ئەو شتەی تر بەبێ هاتنەدی یەکێك لەم دووانە نایەتە دی‌و، بەر پا نابێت‌و، هیچ کامیشیان بە شێك نین لە حەقیقەتی ئەو شتە.

لەوەشیدا، لە یەکتری جیاوازن کە بوون‌و هاتنەدی (سەبەب: هۆکار: فاکتەر)، نیشانە و پێویستکاری شتەکەی تر (سەبەب کارەکەیە)، مەگەر ڕێگرێك پەیدا ببێت‌و، لە بەر پابوونی بخات‌و، (سەبەب) شەریعەت دەیکاتە بیانوو، بۆ هاتنەدی سەبەبکار، بەلام لە (شرط)دا، مەرج نییە کە شەرطەکە، شتەکەی تر کە (مەرجدار: مشروط فیە)یەکەیە، بێتەدی، واتە، دەکرێت، (شرط) هەبێت‌و،کەچی شتەکەی تر کە پەیوەستە پێیەوە نەبێت.

## ٥٤- بەشەکانی شەرط

شەرت، لەو ڕووەوە کە پەیوەندی بە (سەبەب)ـەوە، هەیە، یاخود پەیوەندی بە (سەبەبکار: المسبب) هەیە، دەبێتە دوو بەشەوە، جارێکیان (شەرتە بۆ سەبەبەکە)، و جارێکی تریان، (شەرتە بۆ سەبەبکارەکە: مسبّب)ـە کە:

یەکەم: شەرتی سەبەب، ئەوەیە کە تەواو کاری سەبەبەکەیەو مانای سەبەبیەت تیایدا بەهێز دەکات‌و، ئیتر ڕێ‌و شوێنی شەرعیەتی تیادا ڕەچاو دەکات‌و، لە سەری بەرپا دەکات، وەك چۆن کوشتنی بەتایبەتی‌و ئەنقەست شەرتە بۆ کوشتنەوەی بکوژەکە، کە ئەمەش سەبەب بووە، بۆ واجبی تۆڵە سەندنەوەو کوشتنەوەی‌و، هەروەها بەمەرج گیراوە، بۆ

ئەوەی کارێك بەدزی ناوزەد بکرێت، دەبێت ئەو موڵكو سامانە لە جێگایەکی قایمو پارێزراودا هەڵگیرابێتو، هەر ئەم قایم پاراستنەی سەبەب بۆ واجب بوونی سزادانی شەرعییانەی دزەکە، یاخود تێپەڕ بوونی ساڵێك بەسەر موڵكو ساماندا، بۆ ئەوەی بگاتە ئاستی زەکاتدان، ئەمە شەرتە بۆ گەیشتن بەو ئاستەو، گەیشتن بەو ئاستەیش سەبەبی زەکاتدانەکەیەو، هەروەها شایەتیدان لە پرۆسەی گرێبستی هاوسەرێتیدا، شەرتە بۆ ئەو گرێبستە، تا ببێتە گرێبەستێك کە هەموو ڕێو شوێنێکی شەرعی لە سەر بگیرێتە بەرو بە مامەڵەو گرێبەستێکی شەرعی تەماشا بکرێت.

ئینجا دەربارە بە باسی ئەو شەرتەی کە پەیوەندی بە سەبەبکار (مسبب) هەیە، وەك مردنی خاوەن میرات، ئیتر مردنێکی حەقیقی بێت، یان حوکمیو، ژیانو زیندوێتی میراتگر لە کاتی مردنی خاوەن میراتدا، ئەمانە دوو شەرتن بۆ میرات گرتن، کە هۆکاری ئەم میرات بردنەیش خزمایەتی یان ژنو مێردایەتیو، یان خزمایەتییە بەپشت (العصبة).

٥٥- شەرط، لە ڕوانگەی سەرچاوەی بەشەرت گرتنیەوە دەبێتە دوو جۆر، شەرتی شەرعی، و شەرتی دروستکراو (جعلي):

- **شەرطی شەرعی**: ئەو شەرتەیە، کە شەرع سەرچاوەی بە شەرت گرتنیەتی، واتە: شەرع دایناوە، بە مەرج بۆ هاتنەدی ئەو حوکمە، یان ئەو شتە، وەك گەیشتنی منداڵ بە پلەی ژیریو لێزانی، شەرتە بۆ ئەوەی کە ئیتر ماڵەکەی بدرێتەوە دەست خۆیو سانسۆری لەسەر لابرێت، هەروەها سەرجەم ئەو شەرتانەی کە شەریعەت بە مەرجو شەرتی گرتوون، لە گرێبەستو مامەڵەو هەڵسوکەوتو پەرستشو سزادانو بوارەکانی تردا.

- **شەرتی دروستکراو (جَعْلي)**: ئەو شەرتەیە کە ویستی کەسەکە خۆی (إرادة المكلّف) دروستی کردووەو لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، وەك ئەو شەرتانەی کە هەندێ خەڵك بە مەرجی دەگرن بەسەر یەکتریەوە لە هەندێ گرێبەستو مامەڵەی نێوانیاندا، یاخود ئەو شەرتەیە کە کەسی موکەللەف بە شەرتی دەگرێت، لە هەڵسوکەوتیدا، بە تایبەت ئەو هەڵسوکەوتەی کە بە تاكو تەنیا خۆی پێی هەڵدەستێت، وەك (وەقف کردن)، و **ئەم جۆرە شەرتەش دەبێتە دوو جۆر:**

**جۆری یەکەم**: ئەو شەرتەیە کە بوونی گرێبەستەکەی لەسەر وەستاوە، واتە کەسی موکەللەف هاتنەدی گرێبەستەکە دەبەستێت بە هاتنەدی ئەو شەرتەوە کە بە شەرتی گرتووە لە کارەکەدا، لێرەوە وەك شەرتی سەبەبەکە تەماشا دەکرێت و سەر بەو شەرتەیە،

..ەك بەستنەوەو هەڵپەساردنی گەرەنتی کەسێك (كفالـة) كردنی، بۆیە ئەمە دەكرێت، تا قـەرزار بـە هـۆی ئـەو کەفیلـەوە پابەنـد بێـت، بـە كـاتی قەرزدانەوەكـەی، یـاخود وەك هەڵپەساردنی تەلاق بە شتێکەوە، وەك ئەوەی کە پیاو بە ژنەكەی خۆی بڵێت: ئەگـەر دزیـت كرد تـەلاقت كـەوتبێت، ئـەم جۆرە شـەرتەیش بـە مـەرجی هەڵپەسێردراو (الـشرط المعلَـق) ناوزەد كـراوە، هـەروەها گرێبەسـتەكەیش نـاونراوە بـە گرێبەسـتی هەڵپەسێردراو (العقـد المعلَق).

ئینجا ئەوەش بزانە کە مـەرج نییـە سـەرجەم گرێبەسـتو مامەڵـەكان هەڵپەسـاردنیان بـۆ بکرێت، بۆیە هەیانە کە دروست نیە، ببەسترێت بە شەرتێکەوە کە ئـەویش ئـەو گرێبەسـتانە دەگرێتـەوە کـە تایبـەتن بـە موڵکایـەتی، کـە کـابرای خـاوەنی سـوود لـە خـودی شـتەکە وەردەگرێت، یاخود سوودەكەی لە بەرامبـەر شـتێکدا وەردەگرێـت، یـان جـاری وا هەیـە بێ بەرامبەرە، و هەروەها گرێبەستی هاوسەرگیریو پرسی (خولع)یش، دەگرێتەوە.[1]

هەروەها هەندێ گرێبەستو مامەڵە هەن کە هەڵپەساردن تیایانـدا دروسـتە، بـەڵام دەبێـت ئەو هەڵپەساردنە لەسەر شەرتێکی گونجاو کرابێت، وەك گەرەنتی کردنی نرخ، کە شەرتە بـۆ جێبەجێ بوونی مامەڵەكە.

هەروەها گرێبەستی تر هـەن، کـە دروسـتە بـە هـەر شـەرتێك بێـت، تەنانـەت نـەگونجاوو نەشـیاویش بێـت، هـەر دروسـتە هەڵپەسـاردنی بـۆ بکرێـت، وەك بریکـارێتی (الوکالـة)و (وەسیەتکردن).

**جۆری دووەم:** ئەو شەرتەی کە بەستراوە بە گرێبەستەكەوە وەك: مارەكردنی ئافرەتێك بە مەرجی ئەوەی کە لە شارەكەی خۆیدا نیشتەجێ بکرێتو نەبرێتـە دەرەوە، یـاخود بـەو مەرجەی کە مـافی ئـەوەی بـدرێتی داوای تـەلاق بکـات، یـاخود کـڕینو فرۆشـتن بـە مـەرجی ئەوەی کە کڕیار کەفیلێك لە جیاتی نرخەكە دابنێت، یاخود بە مەرجی ئەوەی کە فرۆشیار لە خانووە فرۆشراوەكەدا بۆ ماوەی ساڵێك بمێنێتەوە.

---

[1] ئەوەی من دەیبینم (د. عبدالكريم زيدان)، ئەوەیـە کـە شـەرتی تـەعلیقی هەڵپەسێردراو لـە گرێبەستەكانی موڵکایەتیشدا هەر دروستە، ئەگەر پێویست بوو، یاخود بەرژەوەندی تیـادا بـوو، بڕوانە: (إعلام الموقعين)ی ئیبن قەییمی جەوزی، ب٣، ل٢٨٨، هەروەها بەڵگـەی تـریش لەسـەر ئەم قسەیەی ئێمە هەیە، بڕوانە: (نيل الأوطار)، ب٦، ل ١٠٠.

شەرعزانەکان جیاوازن لەوەیدا، کە تا چەند دروستە، کە شەرت ببەسرێت بە گرێبەستەکانەوە، گروپێك لەو شەرع زانانە، لەم حاڵەتەدا تەنگە تاونو، ڕێگرن لێی‌و گروپێکیان فراوان بیر دەکەنەوە تیایداو، گروپی سێیەمیش میا نەڕەون، لە نێوان هەردوو گرەپەکەدا ناوەندیان گرتووە.

ئەو گروپانەی کە بیرتەسکانە لە پرسەکە دەڕوانن‌و، ویستو ئیرادەی کەسی مومکەللەف ڕەت دەکەنەوەو، لەبەر چاوی ناگرن‌و، تەنها تەماشای ئەسڵی حەرامی شتەکە دەکەن، لە سەرجەم گرێبەستو شەرتەکانداو، هەر لەسەر حەڕامی سوورن، تا کاتێك دەقێکی شەرعی دێتەئاراوەو، لە حەرامی لادەداتو، حەلاڵی دەکاتو، ئەمەش ڕای ظاهیرییەکان‌و پەیڕەوانیانە.

ئەو گروپەی کە بیریان فراوانە لەم بابەتەدا، ویستو ئیرادەی کەسی موکەللەف بە ڕەهایی دەکەنە پێودانگی پرسەکە، و هەر ویستو ئیرادەکە بە یەکلاکەرەوەی مەزن، دادەنێن، لە سەرجەمی گرێبەستو شەتەکاندا، چونکە ئەسڵ لای ئەم گروپە، حەلاڵی سەرجەم شەرتو گرێبەستەکانە، مەگەر دەقێکی شەرعی پەیدا ببێت، کە حەڕامی بکاتو، ئەمەش ڕای حەنبەلییەکان‌و، پەیڕەوانییانەو، لەناو حەنبەلییەکانیش شێخ الأسلام ئیبن تەیمییە، لە هەموویان زیاتر لەم پرسەدا فراوانتر بیر دەکاتەوە.

ئێرە جێگای باسکردنی درێژو ڕاڤەی فراوانی بەڵگەی ئەو گروپانە نییەو، ئەوەندە بەسە کە سەرپێییانە بڵێین، کە ڕای دروستر ڕای ئەو گروپەیە هزریان فراوانترەو پانو پۆڕتر بیردەکەنەوە لەم پرسەدا، لەوانەی کە تەسك بیرن[1].

---

١ بڕوانە (فتاوی) شیخ الأسلام، ئیبن تەیمییە، ب٣،ل٣٣٢، و دواتر و هەروەها تەماشای (نظریة العقد)، بکە ل١٤و دواتر، کە هەر دانراوی ئیبن تەیمییە و حەنەفیەکان (شرط) دەکەنە سێ بەشەوە، شەرتی دروست (الصحیح) ئەویش ئەوەیە هاوڕێکی ناوەخنی گرێبەستەکەیەو، جەخت کەرەوەیە لە سەر ئەو ناوەخنە، یاخود شەرتی دروست ئەوەیە کە شەرع ڕێگای پێداوەو، یاخود عورف لە سەری دەڕواتو، کارێکی عورفو عادەتیەو، دووەمیان شەرتی خراپ (فاسد)، ئەوەیش ئەوەیە کە سودی تێدایە بۆ یەکێك لە دوو لایەنی گرێبەستەکە،یان بۆ لایەنی دەرەوەی ئەو دووانەو، سەر بەجۆری دروست (صحیح) نییە،و شەرعی بەتاڵ (باطل) ئەو شەرتەیە کە مانای دروست (صحیح)و خراپ (فاسد)ی، تیادا بەرجەستە نەبوبێت، وەك ئەوەی کە کەسێك خانووەکەی بفرۆشێت، بەو مەرجەی کە کەسی تێدا نیشتە جێ نەبێت،

# مەبەستی سێیەم

## باسی ((الـمانع: ڕێگر))

٥٦- المانع: ئەوەیە کە لە کاتی بوونو دەرکەوتنیدا، شەرع بوونی حوکمەکە ناهێڵێتو، حوکمە کە بەرپا ناکاتو، سەبەبەکەیش هەر بەهۆی دەرکەوتنی ئەو ڕێگرەوە، بە تاڵ دەکاتەوەو کاریگەری ناهێڵێتو، مانعیش دوو جۆرە، یان ڕێگرە لە حوکمە کەو بەر پابوونیو یان ڕێگر لە سەبەبەکەو کاریگەرییەکانی[1].

یەکەم: ڕێگر لە بەرپا بوونی حوکمەکە (مانع الحکم) ئەوەیە کە بە دەرکەوتنی، ئیتر حوکمەکە نامێنێت، و بەرپا نابێت، هەرچەندە سەبەبە کەیش هاتووە، و مەرجەکانیش تیایدا هاتوونەتەدی، بەڵام هەر حوکمەکە بەرپا نابێت، ئەو ڕێگرە، هۆکارە بۆ نەبوونی حوکمەکە، و بەربەستە لە بەردەمیدا چونکە مانایەکی تیادایە، کە لە گەڵ هونەریو حیکمەتی حوکمەکەدا نایەتەوەو ناگونجێت، واتە: ئامانجو مەبەستەکەی حوکمەکە تیایدا نایەتە دی، وەك چۆن باوکایەتی ڕێگرە لەوەی کە هەر کات باوك بکوژ بوو، ئیتر ناکوژرێتەوە چونکە باوکە، بۆیە هەرکات باوك کوڕەکەی خۆی بەتایبەتو دەست ئەنقەست کوشت ناکوژرێتەوە، هەرچەندە دییەو برێتی هەر لە سەرە، چونکە هونەرو حیکمەتی تۆڵە سەندنەوەو کوشتنەوە، سزاو سەر زەنشتی کردنەو، لە باوکایەتیشدا ئەوەندە سۆوو میهر هەیە، بۆ کوڕەکەی، ئەو داخەی بەسە کە چووە بەدڵیداو، ئیتر کوشتنەوەی پێویست نییە، بۆیە پێویست کردنی کوشتنەوەی باوك لە سەر کوڕەکەی ئامانجو مەبەستی کوشتنەوە (قصاص) ناهێنێتە دی، کە سزادانو زەجر چەشتنە، چونکە باوك بە تایبەتیو دەست ئەنقەست دەستی ناچێتە کوشتنیکوڕەکەی، مەگەر لە حاڵەت گەلێکی ڕێزپەڕ (شاذ)دا، کە ئەویش نابێتە فاکتەرو داکۆکیکار بۆ تۆڵە لێکردنەوەو لە جیاتی کوشتنەوەی بەڵکو دەبێت ئەم یاسای لێ هەڵاوێر (إستثناء) بکرێت[2] هەر وەك لە گەڵ ئەوەشیدا کە باوك هۆکاری ژیانە بۆ

---

جا شەرتی (فاسد) گرێبەستەکە تێك دەداتو خراپی دەکات، و شەرتی بەتاڵ گرێبەستەکە سوك دەکاتو ڕۆتینی پێ دەبەخشێت، بەڵام هەر گرێبەستەکە دروستە.

١ الآمدي، ب١، ل١٨٥.

[2] ئەمە ڕای جەماوەری زانایانەو، بەڵگەشیان ئەم فەرموودەیە کە دەفەرموێت(لا یقتل والد بولده)، باوك لە جیاتی کوشتنی کوڕەکەی ناکوژرێتەوە.

کوڕەکەی‌و ئەو ئامرازی بەدیهێنانی بووە، بۆیە نابێت بە پێچەوانەوە کوڕ بێتە هۆکاری ژیان لێسەندنەوەی باوك.[1]

دووەم: ڕێگر لە هۆکارەکە (مانع السبب)، ئەو ڕێگرەیە کە کاریگەری لـە سـەر سـەبەبەکە هەیەو، لە کـارکردنی دەخـات، و کاریگـەری ناهێڵێـت، لـە سـەر سەبەبکار (مـسبب)ـە کـە، چونکە لەو ڕێگرەدا مانایـەك هەیـە، کـە پێـچەوانەی هونـەر و حیکمـەتی سـەبەبەکەیە، وەك ئەوەی کە کەسێك بە هۆی قەرزارییەوە ماڵەکـەی ناگاتـە پلـەو ئاسـتی زەکاتـدان، کـە هـۆی گەیشتنە ئاستی زەکاتدان، سەبەبە بۆ واجب بـوونی زەکـات، چـونکە گەیـشتنی موڵـك بـەو ڕێژەیـەی کـە زەکـاتی تیـادا دەکـەوێت، مانـای دەوڵەمەنـدی دەدات، بەخاوەنەکـەی‌و دەوڵەمەندیش توانای جێ بەجێ کردنی نەداری هەژارانی هەیە، بەڵام قـەرزاری هـیچ مانایـەك بۆ دەوڵەمەندی ناهێڵێتەوە، لە ئاسـتی زەکاتـدا بـەر جەسـتە دەبێـتو، مانـای دەوڵەمەنـدی دەڕوخێنێتو دەسڕێتەوە، چونکە ئەوەنـدەی قەرزارییەکـە لـەو موڵکەیـدا کـە ئـەو کابرایـە هەیەتی، ئەوە بەموڵکی حـەقیقی ئـەو نایەتـە ئـەژمارو چـیتر ئـەو ئاسـتەی کـە ئـەم کەسـە قـەرزارە بڕیویـەتی‌و ئـەوبڕە پارەیـەی کـە هەیـەتی،و زەکـاتی تیـادا واجـب بـووە، مانـا ڕەسەنەکەی خـۆی وەر ناگرێتـەوەو، نابێتـە سـەبەب بـۆ زەکاتـدانو، ڕێ بـۆ سـەبەبکارەکە خۆش ناکات، تا جێ بەجێ بکرێت، کە واجب بوونی زەکاتە.

هەروەها وەك، کوشتنی خاوەن میرات، لە لایەن میراتگرەوە، کە ڕێگرە لە سـەبەبەکە کـە نزیك‌و خزمایەتی‌و ئەوانەیە ئـەم کوشـتنە وای کـردووە کـابرا مـیرات نـەباتو، سـەبەبکارەکە کـەمیرات بردنـە پراکتیـزە ناکرێـت: چـونکە لـەم ڕێگـرەدا مانایـەك هەیـە، کـە ئـەو بنەمایـە دەڕوخێنێت، کە میرات بردنی لە سەر بنیات نراوە، کە ئەویش میرات بردنە بە هـۆی ئـەوەوە کـە میراتگـر وەچـەی خـاوەن میراتـە، و خـاوەن مـیرات پـشتیەتی‌و لـە نێوانـە هـەردوو لادا هاوکاری یەکتر و یەکتـرویستی لە ئارادا هەیە، بۆیە ئەم مانایە لە گـەڵ ئـەو کردەوەدزێـوەدا یەك ناگرێتەوە، کە کوشتنەوەو، دواجار سەرجەم ئەم مانا جوانە لەو نێوەندەدا تیا دەچـن، هەروەها جیاوازی ئاینو ماڵی خاوەن میراتو میراتگر، لـەم نێوەنـدەدا مـیرات بـردن یاسـاغ

---

[1] ئەم بەڵگەیە ڕەخنەی ئـەوەی لێ گـیراوە کـە هۆکـاری کوشـتنەوەی بـاوك، کردەوەکەیـەتی بۆیەئـەو هۆکارەی کە باسمان کرد، بەدروست دەمێنێتەوەو دروستە.

دەكاتو، ئەمانە هەموو ڕێگرن لە هاتنەدی سەبەبەکە[1].

ڕێگر (المانع)، وەك پێکهاتی ڕێگر بوون، ناچێتە چوارچێوەی بێژە(خطاب)ـی، تەکلیفەوە، کە شەرع فەرمووبەتی:و شەرع لە بوونی ئەو ڕێگرەو، نەبوونیدا دەستی بووەو، مەبەستی نەبووە، کە هەبێت، بەڵکو شەرع مەبەستی ئەمە بووە، کە پلەی حوکمی ئەو سەبەبە ڕوون بکاتەوە، یاخود بەتاڵی سەبەبکار (مسبب)ڕاڤە بکات، هەر کات ڕێگر پەیدا بوو، بۆیە داوا نەکراوە لە کەسی موکەللەف کە ئەو قەرزە لە سەر خۆی بهێڵێتەوە، کاتێك کە سامانەکەی گەیشتبوویە ئاستی زەکاتدان، تا زەکاتی لە سەر واجب ببێت، هەر وەك چۆن ئەو کەسەی کە سامانەکەی گەیشتووەتە ئاستی زەکاتدان، لە سەری قەدەغە نەکراوە، کە قەرز وەربگرێت، تا زەکات نەدات، بەلآم دروست نییە، کە کەسی موکەلەف، کە بچێت بە تایبەتی ڕێگر (مانع) دروست بکات، تا لە ژێر باری حوکمە شەرعییەکان ڕا بکات، ئەمە فێڵ تەڵەکەیەو، لە شەریعەتی ئیسلامدا قەدەغەیەو، بکەرەکەی تاوانبارە، وەك ئەمەی کە کەسێك بچێت هەندێك لە سامانەکەی دەدات، بەژنەکەی خۆی، تا نەگاتە پلەی زەکاتدانو، پێش هاتنەوەی ساڵ بەسەریداو، دواتر لە ژنەکەی وەر دەگرێتەوە، تا زەکات نەداتو، لە ژێر باری ئەم فەرمانە شەرعییە دەر بچێت.[2]

---

[1] کوشتنی خاوەن میرات، لەلایەن میراتگرەوە، و جیاوازی ئایینو ماڵیان کە لە ڕێگرەکانی میرات بردنن لە نێوانیاندا، ئەمەڕای هەندێ لە زانایانەو، هەندێکی تر پێیان وایە کە ئەم ڕێگرانە، ڕێگرن لە بەردەم حوکمەکەدا، نەك لە بەردەم سەبەبەکەدا، بەلآم ئەو ڕایە جوانترە، کە بەوەیان دادەنرێت کە ڕێگرن لە بەردەم سەبەبدا، و ئێمەیش لەم کتێبەدا ئەم ڕایەمان هەڵبژاردووە.

[2] الشاطبي، ب١، ل٢٨٨-٢٨٩.

# مەبەستی چوارەم

## باسی دروستیو پڕو پوچی ( الصحة والبطلان )

٥٧- مانای (الصحة)و(البطلان) کە کارو کردەوەی کەسانی موکەللف ئەگەر سەرجەم پایەو مەرجەکانیان تیادا هاتە ی، ئەوا شەرع بەدروست (صحیح) ناوزەدیان دەکات، و ئەگەر نا... ئەوا بە پوچو نادروست (البطلان) دەیانهێنێتە ئەژمار.

مانای صەحیح بوونیشیان ئەوەیە کە ڕێو شوێنی شەرعییان لە سەر دەگرێتە بەرو، ئەگەر لە پەرستشەکان بوون، ئەوا لە سەر ئەستۆی ئەنجامدەرەکەیان لا دەچن، وەك ئەو نوێژەی کە سەر جەم ئەرکانو شەرتەکانی نوێژی تیادا ئەنجام دراوە، یاخود نموونەی تر صەحیحەکان، وەك ئەو نەریتو عادەتانەی کە هەن، وەك مامەڵەو گرێبەستەکانی کڕینو فرۆشتنو، بەکرێدانو، پرۆسەی هاوسەرگیری، کە سەرجەمیان ئەو ڕێو شوێنانەیان لە سەر دەگیرێتە بەر، کە شەرع بۆی ڕەچاو کردوون.

مانای بەتاڵو پوچ بونیش (البطلان) ئەوەیە کە ڕێو شوێنی شەرعی لە سەر ناگیرێتە بەر، چونکە ڕێو شوێنی شەرعی لە سەر شتێ دەگیرێتە بەر، کە سەر جەم ئەو بنەما شەرعییانەی تیادا هاتبێتە دی، کە شەرع دیاری کردوون، کە ئەگەر ئەمجارەیان ئەم کارە سەر بەپەرستشەکان بوو، ئەوا لە سەر ئەستۆی کەسی موکەللەف لاناچن، چونکە بەتاڵەو، هەروەها ئەگەر سەر بەمامەڵەو هەڵسوکەوتەکان بوو، ئەو ڕێو شوێنە شەرعییانەی کە لە سەر صحیحەکە دەگیرایە بەر، لەسەر ئەم ناگیرێتە بەر.[1]

## ٥٨- ( الصحة )و( البطلان ) لە بەشەکانی حوکمی وەضعین:

هەندێ لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ، پێیان وایە کە ناوبردنی هەر کارێك بە دروست (الصحة) یان پوچو بەتاڵ (البطلان) سەر بەبابەتی حوکمی تەکلیفی یە، بەبەڵگەی ئەوەی کە

---

[1] لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە لەفزی (صحة) بۆ ئەو کاروکردەوانەیش بە کار دێت، کە پاداشتی قیامەتیان لە سەرەو، لەفزی (بطلان) بۆ ئەو کردەوانە بەکاردێت، کە لە قیامەتدا سزایان لە سەرە، ئیتر چونیەکە ئەو کردەوەیە پەرستش بێت، یان مامەڵەو،بەتەما بوونی پاداشت، یان بەتەما نەبوونی پاداشت لە سەری، بەستراوە بەنیازو مەبەستی کەسی موکەللەفەوە، جا ئەگەر مەبەستی لەو کردنی پەرستشە یان نەکردنی، جێ بەجێ کردنی فەرمانی شەرع بوو، ئەوە پاداشت وەردەگرێت، هەروەها لە پرسی سەر پشك کردندا، ئەگەر کەسی سەر پشك کار، وای زانی کە بەکردن یان نەکردنی پاداشت وەردەگرێت، ئەوە وایەو، وەری دەگرێت، الشاطبي ب١، ل٢٩١-٢٩٩.

ـروستی (الـصحة)، دەگەڕێتـەوە بـۆ ئـەوەی شـەرع حـەلاڵی کـردووە، کـە سـوود لـەو شـتـە وەربگرێت، بۆیە بەصەحیح ناوی بردووەو، پوچو بەتاڵی (الـبطلان)، بـۆ ئـەوە دەگەڕێتـەوە، کە شەرع حەرامی کردووە، کە سوود لەو شتە وەربگرێت، وەك لە مامەڵەی دروستدا، حەلاڵە کابرای کڕیار، سوود لەو شتە وەر بگرێت، کە کڕیویەتیو مامەڵـەی کـردووە، و لـە مامەڵـەی بەتاڵدا، حەرامـە سـوود لـەو شـتە وەربگرێـت، ئـەم رایـەش بـەوە بەرپـەرچ دراوەتـەوە کـە، فرۆشتن بە مەرجی پەشیمانی، لە لای فرۆشیار، لە سـەر رای جـەماوەری زانایـان دروسـتەو، دروست نییە، کـە کڕیـار لـە مـاوەی دیـاری کـراوی ئـەو پەشـیمان بوونەوەیەیدا سـوود لـەو شمەکە وەربگرێت[1].

ژمارەیەکی تر لە زانایان رایان وایە کە (الصحة)و(البطلان) سـەر بـە ئـەحکامی وەضـعین، چونکە شەرع حوکمی داوە بـە صـەحیحی ئـەو کردەوانـەی کـە پایـەو مەرجـەکانی صـەحیح بوونیان پێوەیەو، هەروەها حوکمی داوە بە بەتاڵی ئەو کردەوانەی پایەو مەرجەکان(الأرکان والشروط) یان تیادا هاتۆتە دی [2].

ئێمە رای دووەم پێش دەخەینو هەڵدەبژێرین، چونکە لە بابـەتی (الـصحة)و(الـبطلان) دا، کردنو نەکردنو سەر پشك بوون (الفعل والترك التخيير) باسکردنیان لە گۆڕێدا نییە، و بەڵکو شەرع ئەو کردەوانەی کە پایەکانو مەرجەکانی دروستیان تیادایـەو ڕێو شـوێنی دروسـتیان لە شەرعدا لە سەر بنیات نراوە، بە دروست (صحيح) ناوزەدی کردوون، و ئەو کردەوانەی کە ئەرکانو شـەرتەکانیان تیـادا نییـەو، ڕێو شـوێنیان لـە شـەرعدا لـە سـەر نەگیراوەتـە بـەر، بەبەتاڵ ناوی بردوون، و ئەم مانایانەش سەرجەمیان دەچـنە چـوار چـێوەی بابـەتی(وضـع)، چونکە مانای سەبەبیان تیـادا بـەر جەسـتەیەو، سـەبەبیش بەشـێکە لـە بەشـەکانی حـوکمی وەضعي.

## ٥٩- باسی (البطلان)و (الفساد):

ئەم دوو زاراوەیە، لە لای جەماوەری زانایان یەك مانایان هەی، بـەو پێناسـەیەی کـە هـەر پەرستش، یان گرێبەست، یان هەڵسوکەوتێك، کە هەندێ لە پایە (أركان)، یان هەنـدێ مـەرج (شرط)ـی، تیادا نەهاتبووەدی، ئەوە بەتاڵە، یان گەنـەو، هیچ ڕشیو شـوێنێکی شـەرعی لـە

---

١ الآمدي ب١،ل١٨٦–١٨٧.

٢ التلويح، ب٢، ل ١٢٣.

سەر بنیات نانرێتو، ناگیرێتە بەر.

بۆ نموونە،مامەڵەی شێت، بەتاڵە، چونکە لە یەکێك لە پایەکاندا، کە کابرای خاوەن مامەڵە _ گرێبەستکار )ـە، گرفتی تێدایە، و شێتە، یاخود مامەڵەی شتی نادیار، یان مردارەوە بوو بەتاڵە، چونکە لە یەکێك لە ڕوکنەکانیدا، کە ئەو شتەیە مامەڵەکەی لە سەر کراوە گرفتی تیادایە.

هەر بۆیەش مامەڵەی شێت و مردارەوبوو، بە مامەڵەی بەتاڵ ناوزەد کراوون، و هەروەها بەمامەڵەی خراپ (فاسد) ناوبراوە، و هەروەها مامەڵە بە نرخێکی نادیار، یان بە نرخێك کە دیاری نەکرابێت، و لە ئایندەدا بدرێت، ئەمەیش دیسان بە مامەڵەی بەتاڵو خراپ ناو نراوە، هەر چەندە گرفتەکە لە هەندێ لە مەرجەکانی مامەڵەکەدا هەیە، و لە ڕوخسارو شێوازدایە، نەك لە ڕوکنەکاندا.

**حەنەفییەکان درێژەی ئەم باسەیان بەم جۆرە خستۆتە ڕوو:**

أ- لە پەرستشەکاندا، هەر کات ڕوکنێك لە ئەرکانەکانی تیادا نەهاتە دی، وەك نوێژکردن، بەبێ ڕکوع بردن، یاخود هەندی لە شەرتەکانی تیادا نەبوو، وەك نوێژکردن بە بێ دەست نوێژ،ئەوا ئەمە لە هەردوو حاڵەتەکەدا، بە بەتاڵو، خراپ (فاسد) ناو دەبرێتو، هیچ بنەمایەکیان لە شەرعدا بۆ دانانرێت، و ڕێو شوێنی شەرعییان لە سەر ناگیرێتەبەر، و (باطل)و (فاسد) لە لایان، و لە پەرستشەکاندا یەك مانای هەیە.

ب- لە مامەڵەدا، کە مەبەست گرێبەستو هەڵسووکەوتەکانە کە پەیوەندی دارن بە مامەڵە کردنەوە، کە هەرکات ڕوکنێك لە ئەرکانەکانیان تیادا نەهاتەدی، ئەوەبەتاڵنو، هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعییان لە سەر ناگیرێتە بەر، هەر وەك لە مامەڵەی شێت، یان فرۆشتنی مردارەوەبوو، یان مارەکردنی ئافرەتانی مەحرەم(کەبزانێت مەحرەمێتی))، هەموویان بەتاڵن، جا ئەگەر سەرجەم ئەرکانەکانیان تیادا هاتەدی، بەڵام هەندێ مەرج (شرط) یان، تیادا نەهاتە دی، واتە: ڕوخساری دەرەوەیان گرفتی تیادابوو، ئەمەیش هەر بەخراپ (فاسد) ناوزەرد دەکرێتو، ئەگەر کەسی گرێبەستکار، هەستا بە جێ بەجێ کردنی گرێبەستەکە، ئەوا هەندێك لە ڕێو شوێنە شەرعییەکانی بۆ دەگرێتە بەر، هەروەك لە مامەڵەکردندا بەنرخێکی نادیار، یان بە نرخێکی دواخراو بۆ کاتێکی نادیار، یاخود مەرجی خراپ (فاسد)ـی، خرابێتە سەر، یاخود ئافرەتێ مارە کرابێت، بە بێ شایەت، لەم حاڵەت گەلەداو، لە کڕینو فرۆشتنەکەدا، ئەوا موڵکەکە دەچەسپێت بۆ کڕیارو دەبێتە خاوەنی، ئەگەر

فرۆشیار لە سەری ڕازی بوو، لە مارەکردنی بێ شایەتدا، ئەگەر کابرا ژنەکەی گواستبوویە، ئەوا مارەیی هاو شێوەی خوشكو کەسەکانی ئەو ژنە کە شوویان کردووە، چەندە، دەبێت ئەوەندە بۆ ئەمیش بکات، (مهر المثل)و، لە کاتی جیابونەوەشیدا ژنەکە عیددەی لە سەرە، دەبێت بە تەواکردنی عیددە وە پابەندبێتو، ڕەچەڵکیش تیایدا دیاری دەکرێت،و ئەگەر منداڵی بوو، ئەو پیاوە بە باوکی دیاری دەکرێت، تا مافی منداڵەکە ڕەچاو بکرێت. لەم نموونانەوە ڕوون دەبێتەوە، کە گرێبەستی قەڵب (فاسد) لە خودی خۆیدا هیچ ڕێو شوێنیکی شەرعی لە سەر ناگیرێتە بەر، و ئەو ڕێو شوێنانەی کە باسکران، بۆی بەر پا دەکرێت، لە ڕووی جێ بەجێ کردنی گرێبەستەکەیەوە، چونکە جێ بەجێ کردنەکە، لای شەرع ڕەچاو دەکرێت، ئەو دۆخە تەمومژاوییەی کە بەهۆی ئەو گرێبەستە نادروستەوە ئەنجام دراوە، برەوێنرێتەوەو، پاشان ڕێو شوێنی شەرعی لە سەر دەگیرێتە بەر، و واتە: دوای لاچوونی شوبهەکان لە سەری، و (الباطل) لای حەنەفییەکان، ئەوەیە کە گرفتەکەی بگەڕێتەوە بۆ ڕوکنەکانی گرێبەستەکە، واتە، بۆ شێوازی گرێبەستەکەو دوولایەنی گرێبەستەکەو جێگای ئەو گرێبەست کردنە.

-(الفاسِد)، ئەوەیە کە گرفتەکە بگەڕێتەوە بۆ ڕوکەش و چۆنیەتی (أوصاف)ی، گرێبەستەکە، نەك بۆ ڕوکنەکانی لێرەدا ڕوکنەکانی تەواون، بەڵام گرفت لە هەندێ شێوازو چونیەتییەکەیدایە، وەك، (نادیاربوونی نرخی شتی فرۆشراو ).

بۆیە حەنەفییەکان دەڵێن، (فاسد) ئەوەیە کە لە بنەڕەتدا، و لە ڕوکنەکاندا شەرعییە، و گرفت لە چونییەتیەکەیدایە، و (باطل) ئەوەیە کە نەلە بنەڕەتداو نەلە چۆنیەتیدا شەرعی نەبووە، و نییە.[1]

**٦٠- کانگای ڕاجیایی نێوان جەماوەری زانایانو حەنەفییەکان لەم گێرەو کێشەیەیاندا، لە سەر دوو پرس وەستاوە:**

**پرسی یەکەم:** ئایا ڕێگرتنی شەرع لەو گرێبەستە، مانای ئەوەیە کە لە ئەحکامە دنیاییەکاندا کاری پێ نەکرێتو، هەر کەسیش هەر کاری پێ بکات، لە ڕۆژی پەسڵاندا لە سەری تاوانبارە، یان ئەوەیە کە لە هەندێ لە ئەحکامە دنیاییەکاندا کار پێکراوە، و کاری

---

[1] تیسیر التحریر، ب٢، ل ٣٩١و دواتر، الآمدي ب١، ل١٨٧، و هەروەها بڕوانە (کشاف القناع)، ب٢، ل٥و دواتر، (السرح الکبیر)، للدردیر ب٣، ل٦٠، بدائع الصنائع، للکساني، ب٥،ل٢٩٩و دواتر، حاشیة البجیرمي، ب٢، ل٢٢٢و دواتر، (الکنز) للزیلعي، ب٤،ل٦٠-٦١، و مقدمات إبن رشد، ب٢، ل٢١٣و دواتر.

لەسەر ڕایی دەکرێت، و سەرەڕای ئەوەی کە بکەرەکەی تاوانبارە، لە ڕۆژی دوایدا؟

پرسی دووەم: ئایا ئەو ڕێگرتنە لەو گرێبەستە لە بەر ئەوەیە کە لە ئەسڵدا گرفتی تیادایە، وەك ڕێگرتن لە هەر گرێبەستێك لە بەر ئەوەی کە گرفت لە چۆنیەتی (أوضاع)ـەکانیدا هەیە، نەك لە پایە (أركان)ـەکانیدا، بەو مانایەی کە ئەو ڕێگرتنە لە هەدوو حاڵەتەکەدا چونیەکەو، هیچ کامیان هیچڕێو شوێنێکی شەرعییان لە سەر ناگیرێتە بەر؟ یاخود لە نێوانیاندا جیاوازی هەیە؟

بەلاَم جەماوەری زانایان، دەربارەی پرسی یەکەم دەڵێن: کە ڕێگری کردنی شەرع لە هەر گرێبەستێك مانای ئەوەیە کە هەر کات هاتە ڕوودان، بەشەرعی ناژمێردرێت، و هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعی لە سەر ناگیرێتە بەر، و بکەرەکەشی لە ڕۆژی دواییدا توشی سزای پەروەردگار دەبێتەوە، و دەربارەی پرسی دووەم دەڵێن، ئەو ڕێگرتنە (نهي) کردنە لە هەردوو حاڵەتەکەدا چونیەکە، ئەو نەهی کردنو ڕێگرتنەی کە پەیوەندی بە گرێبەستەکەوە هەیە، لە بەر ئەوەی کە گرفت لە ئەسڵو ئەرکانی گرێبەستەکەدا هەیە، یان لە بەر ئەوەی کە نەهی یەکەی گرفت لە وەصفو چۆنیەتییەکەیدا هەیە، جیاوازیان نیەو، لە هەردوو حاڵەتەکەدا گرێبەستەکە بەڕێ لێگیراو ئەژمار دەکرێتو، هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعی لە سەر ناگیرێتە بەر.

بەلاَم حەنەفییەکان، دەربارەی پرسی یەکەم دەڵێن، ئەو نەهی کردنە ڕێو شوێنی شەرعیی لە سەرەو، کردنی تاوانە بەلاَم بە هەمیشەیی گرێبەستەکەی بە بەتاڵ ناهێنرێتە ئەژمار.

و دەربارەی پرسی دووەم دەڵێن: ئەگەر ئەو نەهی کردنو ڕێگرتنە بۆ گرفتێکی وا بگەڕێتەوە، کە پەیوەندی بە ڕوکنەکانی گرێبەستەکەوە هەبێت، ئەوە مانای ئەوەیە کە گرێبەستەکە بەتاڵەو ، هەر کات پراکتیزە کرا، هیچ گرینگییەکی پێ نادرێتو، ئیعتیباری نییە، وەك، فرۆشتنی مردارەوە بوو، و مامەڵەی کەسی شێتو، ئەگەر ئەو نەهی کردنە پەیوەندی بەگرفتێکەوە بوو، کە لە چۆنیەتی (أوصاف)ـی، گرێبەستەکەدا هەبوو، ئەوە ئەو گرێبەستە گەنو پەنە (فاسد)ـە، و هەڵناوەشێتەوە، و هەندێ ڕێو شوێنی شەرعیی لە سەر دەگیرێتە بەر، بەلاَم گەندەڵی تیادا بەکار هێنراوە.[1]

---

[1] بڕوانە (المستصفى)ـی، ئیمامی غەزالی، ب١، ل٦٠-٦١،و ب٢، ل٩و دوای ئەویش.

## ﴿بەشی دووەم﴾

## باسی (الحاكم: یاسادانەر)

٦١- لە پێناسەی(حوکم)دا، ئەوەمان درکاند، کە بریتی یە لەو کاروکردەوانەی کە حیتابی خوای پەروەرگار داوای دەکاتو، پەیوەندی هەیە، بەکارو کردەوەی ئەوانەی کە گەیشتوونەتە سنوری تەکلیفی شەرعی (مکلف) ئیتر لە ڕووی داواکردن (طلب) بێت، یان لە ڕووی سەرپشکردن (تخییر)، یان لە ڕووی دانان (وضع)ـەوە، بێت.

ئەم پێناسەیەش ئامـاژە بـەوە دەکـات، کـە سەرچـاوەی ئەحکامـەکان لـە شـەریعەتی ئیسلامدا، تەنها خودی زاتی پەروەردگار خۆیەتی، کەواتە لە سەر ئەم بنەمایە، تـەنها خـوای پـەروەردگار ، سەرچـاوەو چـاوگی حـوکمو یاسـاکانە، حـوکمو شـەرع تـەنها ئـەو حـوکمو شـەرعەیەکە خودا دایناییێت، و ئەمەش بەڵگەی قورئانی لە سەرەو کۆڕایی ئەهلی ئیسلامی لە سـەرە، وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿إِنِ ٱلۡحُكۡمُ إِلَّا لِلَّهِ﴾[1]، یاسـاو ڕێـسا دانـان، تـەنها هـی پەروەردگارەو بەس، و هەروەها دەفەرموێت:﴿أَلَا لَهُ ٱلۡحُكۡمُ﴾[2]، حوکم بـەس بـۆ خودایـە، و ئەو سەرچاوەی تاقو تەنهای دەرکردنیەتی، و لە سەر ئەم بنەمایـە، حـوکم کـردن بەغـەیری ئەمەی پەروەردگار ناردوویەتی، کە قورئانە، کوفرە، چـونکە بـەس پـەروەردگار مـافی یاسـا دەرکردنی هەیـە، و غـەیری ئـەو یاسـا بـۆ دانـراوە، و یاسـادانەر نییـە، وەك خـوای گـەورە دەفـەرموێت: ﴿وَمَن لَّمۡ يَحۡكُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ فَأُوْلَـٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡكَـٰفِرُونَ﴾[3]، هـەر کـەس حـوکم بەوە نەکات، کە خودا ناردوویەتی کـە قورئـانی پـیرۆزە، ئـەوا کـافرەو لـە ئیـسلام چـووەتە دەرێو، تەنانـەت ئـەرکی سـەر شـانی پێغەمبـەرانیش، تـەنها گەیانـدنو بلاوکردنـەوەی پەیامـەکانی پـەروەردگارەو، کـارو ئـەرکی سەرشـانی موجتەهیـدەکانیش ناسـاندنی ئـەو ئەحکامانەیەو، ڕوونکردنەوەو دەرخستنیانە، لە ڕێی ئەو پەیڕەو ڕێسا گەلـەوە کـە زانـستی ئوصولی فیقه داییناون.

٦٢- کە کۆڕایی (إجماع)ێکی، پێکهێنراوو بەستراو هەیە، لە سەر ئەوەی کە تـەنها (یاسـا دانەر: حاکم) خوای گەورەیە، بەڵام لێرەدا زانایان لە پرسێکدا ڕاجیاییان هەیە، کە دەتـوانین

---

١ الأنعام: (٥٧)، یوسف: (٤٠، ٦٧).

٢ الأنعام: (٦٢).

٣ سورة المائدة: (٤٤).

به دوو ڕەهەند دەری ببڕین:

یەکەم: ئایا حوکمو یاساکانی پەروەردگار، تەنها لە ڕێی پەیامبەرانەوە دەناسرێنو دەزانرێن؟ یاخود عەقڵ تەنها خۆیو بەسەر بە خۆیی دەتوانێت پەی ببات پێیان؟و ئەم پرسە لە سەر چ بنەمایەکە؟

دووەم: ئەگەر عەقڵ بۆی دەکرێت، کە بەبێ پەیامبەران پەی بە حوکمو یاساکانی خوای گەورە ببات، ئایا ئەو هەستکردنو پەی پێ بردنە چوار چێوە و شێوازی تەکلیف تیایدا بەر جەستە دەبێت؟و بەکردنی لە لایەن بکەرەکەوە، ئەو کەسە تووشی ستایش یان سەر زەنشت کردن دەبێت لە دنیادا؟ و پاداشت یان سزا وەردەگرێت، لە ڕۆژی قیامەتدا بە هۆی کردن یان ئەنجام نەدانییەوە؟ زانایان لەم دوو پرسەدا ڕاجیاییان هەیەو، ئێمە بەم شێوازەی لای خوارەوە، قسەو ڕاکانییان کورتو پوخت دەکەینەوە، و دوای ئەوەیش ڕای ڕاستر لەم بارەیەوە دەهێنینو دەخەینە ڕوو[1]:

٦٣- گفتی یەکەم: کە هی مەزهەبی موعتەزیلەو گروپێکە لە زانایانی مەزهەبی جەعفەری:-

پوختەکەی ئەوەیە کە کارو کردەوە، لە خودو زاتی خۆیدا چاکیو خراپی تیادایەو، عەقڵ دەتوانێت بەسەر بەخۆیی، هەست بە چاکەو خراپەی زۆر لە کارو کردەوەکان بکات، لە ڕوانگەی صیفاتەکانی ئەو کارو کردەوانەوە، و لە ڕوانگەی دەرهاویشتە سودمەند و زیانەدەکانیەوە پەی پێ دەبات، کە تا چەند بەرژەوەندی تیادایەو، تا چەند خراپەی لێ دەکەوێتەوەو، ئەم هەست کردنو پەی پێ بردنە لە سەر ئەمە گەیاندنو بڵاوکردنەوەی پەیامبەران نەوەستاوەو عەقڵ خۆی دەیزانێت، چاکەو خراپە زانین دوو شتن کە پەیوەندیان بە عەقڵەوە هەیە نەك بەشەرعەوە، واتە: ئەو زانینو هەستکردنو پەی پێ بردنانە لە سەر شەرع نەوەستاون، و بەڵکو لە سەر عەقڵو ژێری وەستاونو، حوکمی خوای پەروەردگاریش

---

[1] دەربارەی ئەم باسە بڕوانە ئەم کتێب گەلە، (مرقاة الوصول، و حاشية الأزميري ب١،ل٢٦٧و دواتر (مسلم الثبوت و شرحه فواتح الرحمت)ب١، ل٢٥و دواتر (المستصفى)ـی، ئیمامی غەزالی ب١،ل٥٥و (إرشاد الفحول)ـی، ئیمامی شەوکانی ل٦و دواتر (التوضيع وشرحه التلويح)، ب١، ل١٧٢و دواتر،و لە کتێبەکانی مەزهەبی جەعفەری بڕوانن کتێبی (القوانين)ـی، ئەبو قاسمی گەیلانی، و (الفصول في الأصول)ـی، الشيخ محمدحسين رجيم والتقريرات التائيني، ب٢، ل٣٤و دواتر، و(الأرائك)ـی، شیخ مەهدی ل ١٣ و دواتر .

ـوریێكو موافقی ئەو شتانەیە كە عەقڵ پەی بردووە یان پەی دەبات پێیان، لە ڕووی چاكیو
خراپەوە،و ئەوەی عەقڵ بەچاكی زانی، ئەوە لەلای خوای گەورەیش چاكەو، لە سەر مرۆڤ
پێویستە ئەنجامی بداتو، بە كردنیشی ستایشو پاداشت وەر دەگرێتو، كە ئەنجامیش
نەدا، شایستەی سەر زەنشت كردنو سزایەو، ئەوەی كە عەقڵ بەزانستو خراپی دانا، ئەوە
لای خوای پەروەردگاریش خراپەو ناشرینەو، لە سەر مرۆڤ پێویستە كە وازی لێ بهێنێت، و
لێی دوور بكەوێتەوە، و كە ئەنجامیشی نەدا، شایستەی ستایشو پاداشتەو كە ئەنجامیشی
دا، شایستەی سەر زەنشتكردنو سزای خوایە.

بۆیە ئەحكامەكانی شەرع لە ڕوانگەی خاوەنی ئەم بیرو ڕاگەلەوە ئەوەیە كە ئەو ئەحكامە
شەرعییانە كاتێك بەرپا دەبنو دێن، كە هاوڕێكو گونجاو بن، لە گەڵ ئەوەیدا كە عەقڵ
هەستی پێكردووەو پەی پێ بردووە، لە ڕووی چاكیو خراپییەوەو، ئەوەی كە ئەقڵ بە
چاكی داناوە، ئەوا شەرعیش داوای كردووە كە ئەنجام بدرێتو، داوای نەكردووە كە ئەنجام
نەدرێتو، داوای ئەنجام دانیشی نەكردووەو، ئەوەی كە عەقڵ پەی نەبردووە، بە چاك
بوون، یان خراپ بوونو، بۆی یەكلایی نەبۆتەوە، وەك لە هەندێ لە پەرستشەكانداو
چۆنیەتی ئەنجامدانیاندا هەیە، ئەوا فەرمانكردن یان فەرمان نەكردنی شەرع تیایاندا، ڕووی
چاكی یان خراپی ئەم كردەوە نادیارانە دەر دەخات، لە سەر ئەم بنەمایە، ئەوەیان بەرپا
كردووە، كە مرۆڤی خاوەن تەكلیفو ئەرك لە سەر شان، پێش ناردنی پەیامبەرانو، یان
پێش ئەوەی بانگەوازی بگاتە لا، ئەوە لە سەریەتیو لە سەری بووە، كە ئەو شتانەی عەقڵ
بەباشی زانیوە، ئەنجامی بدات، دەبێت ئەنجامی دابێتو، ئەوەی لەلای عەقڵ خراپ بووە،
دەبێت، وازی لێ هێنابێت، چونكە ئەوە خۆی حوكمی خوای پەروەردگارەو، تەكلیفی بەر
پرسیارێتیو موحاسەبەو، پاداشتو سزای لە سەر ئەوكارانە بۆ دێتە ئەژمار.

٦٤- **گفتی دووەم:** ڕای ئەشعەرییەكانی لە سەرە، واتە: پەیڕەوانی ئیمام ئەبولحەسەنی
عەلی كوڕی ئیسماعیلی ئەشعەریو، ئەو شەرعزانانەی كە لە ڕای ئەمان بوونو، هەروەها ئەم
گفتە بیرو ڕای جەماوەری زانایانی ئوصولی فیقهیشی لە سەرە.

پوختەی ئەم ڕایە ئەوەیە كە عەقڵ بە تەنها خۆی توانای هەستكردن بە حوكمی خوای
نییەو، ناتوانێت بەسەر خۆی پەی پێ ببات، بەڵكو هەر دەبێت بە هۆی پەیامی پەیامبەرانو
ڕاگەیاندنی ئەوان بیزانێت و هەستی پێ بكات، چونكە كارو كردەوەكان لە خودو زاتی
خۆیاندا چاكەیەكی سروشتییان تیادا نییە، تا پەروەردگار فەرمان بكات بە كردنیو دان

بنێت بە چاکەی ئەو کارەدا، هەروەك چۆن کارو کردەوەکان لە خودی خۆیانداو، لە زاتیانـدا خراپ نین، تـا پـەروەردگاردا وا بکـات، دەسـتیان لێ هـەڵبگیرێت، و ئـیرادەو ویـستی خـوای گەورە ڕەهایە (مطلق)ـە، و هـیچ شـتێك نییـە، مەرجـدارو سـنوردارو کۆت و پەیوەنـدداری بکات، بۆیە کارو کردەوەی چاکە، ئەوەیە کە شـەرع داوای کـردووە، ئـەنجام بـدرێتو، کـارو کردەوەی خراپیش ئەوەیە کە شەرع داوای کردووە، نەکرێتو، لێی دوورە پەرێز بینو، کـارو کردوە پێش فەرمان کردنو بەرگرتن (أمرو نهی) شەرع، نە چـاك بـووەو، نـە خـراپو، کـارو کردەوەکە بەچاك دانرا، لە بەر ئەوەیە کە شەرع بە چـاکی دانـاوەو، نـەك لـە خـودی خۆیـدا چاك بێتو، کە شەرعیش نەهی لێکرد، ئیتر ئەو کارە دەبێتە خراپ، نەك لە بـەر ئـەوەی کـە لە خودی خۆیدا خـراپ بێـتو، کاروکردەوەکـان بالأنـسی چـاکیو خراپـی خۆیـان لـە شـەرع وەرذەگرن، نەك لە خودی خۆیان.

لە ڕوانگەی ئـەم بنەماگەلـەی سـەرەوە، دەزانرێـت، کـە پـێش نـاردنی پەیامبـەران خـوای گەورە حوکمی چاکیو خراپی بەسـەر کـارو کردەوەکانـدا نـەداوە، بۆیـە کـە پەیامبـەرێك نـە هاتبێت، کە حوکمو یاساکانی خودا بەخەڵك بگەیەنێت، بۆیە هیچ حوکمێك نەبـە چـاك، نەبـە خراپ، بەسەر کردەوەکانیاندا نادرێتو، هیچیان لە سەر پێویست (واجب) نابێـتو، هـەروەها هیچ کارێکیان لە سەر حەڕام نابێتو، حوکمیش لەسەر شتەکان نەدراو، یەکلایی نەبوویـەوە، تەکلیفیش لە سەریان دانانرێتو، کە تەکلیفیش نەبوو، لێپرسینەوەیان لـە گـەڵ ناکرێـت، لـە سەریو هیچ ستایش یان پاداشتو سەرزەنشتو سزایەك وەرناگرن.

٦٥- **گفتی سێیەم**: کە ئەمەیشیان ڕای ئەبو مەنـصور موحەممـەدی کـوڕی موحەممـەدی ماتوریدییەو، لێکۆڵەرانی مەزهەبی حەنەفیو، هەندێ لە زانایانی ئوصولیش بەلای ئەم ڕایەدا چوونو، هەروەها گروپێك لە جەعفەرییەکانو خەڵکی تریش هەر ئەم ڕایەیان هەڵبژاردووە.

پوختەی ئەم ڕایەش ئەوەیە کە کارو کردەوەکان چاکیشیان هەیەو خراپیشیان هەیەو، لە زۆربەی کارەکانداو، لە ڕوانگـەی سـیفەتو چـونیەتی ئـەو کـارەوەو، هـەروەها لـە ڕوانگـەی لایەنە چاکەو خراپەکانی ئەو کارانەوە دەتوانرێت عەقڵ هەست بە زۆریان بکاتو، پەی ببـات پێیان، کە چاکن یان خراپن، بەڵام ئەمە ناکاتە ئەوەی کە عەقڵ شتێکی بە چاك زانـی، ئـیتر شەرعیش فەرمان بکات، بەچاکبوونی ئەو شـتەو بڕیـاری لـە سـەر بـدات، و هـەروەها ناکاتـە ئەوەی کە فلان کار بەعەقڵ خراپە، ئیتر شەرعیش بە خراپی بزانێت، چونکە عەقڵـەکان هـەر چەندە تێرو پێگەیشتووبن، هەر لە کورتی دەدەنو، هەرچەندە فراوان بن، هـەر ناتـەواون، و

ئەو کارەی سەرەوەیان پێ هەڵناسوڕێ، و لەم ڕوانگەیەوە ئەوە لەم بارەیەوە دەتوانرێت بگوترێت کە ئەوەیە کە ئەوەی کە لە کارێکدا عەقڵ پەی پێ بکات کە چاکە، ئەو پەی پێ بردنە وا لەو کارە دەکات، کە گونجاو بێت، بۆ ئەوەی کە شەرع بە چاکی بزانێت، و هەروەها ئەوەی کە عەقڵ ئاشکرای دەکات، لە کارێکدا کە فلان لایەن خراپە، ئەم زانین و ئاشکرا کردنەیش وا لەو کارە دەکات، کە ئیتر شەرع بڕیار لە سەر خراپەی ئەو کارە بدات و ناگوترێت و نابێت بگوترێت، کە چاکەو خراپە (الحسن والقبح)، خۆیان پێویستیاکاری ئەوەن، کە دەبێت بۆ هەر کارێك لە ڕوانگەی ئەوانەوە حوکمی (ئەمر)و (نەهی) پەروەردگار لە سەریان دەربکرێت، (ئەمە وانییە، و حوکمی خودا مەرج و پەیوەندی قبوڵ ناکات، و خودا خۆی حاکمی موتڵەقە).

لەم ڕوانگەیەوە بێت، حوکمی خوای گەورە تەنها لە ڕێی پەیامبەران و پەیامەکانیاوە دەزانرێت، و بێ ئەوان هەستی پێ ناکرێت و،بۆیە پێش ناردنی پێغەمبەران و پێش گەیاندنی بانگەوازەکەیان خودا فەرمانی داناوە. بەسەر کارو کردەوەی مرۆڤەکانەوە، کە حوکمیش نە بووو، دیاری نەکرابوو، ئیتر تەکلیفیش لە ئارادا نابێت و، کە تەکلیفیش بوونی نەبوو، بۆیە پاداشت و سزایش لە سەر ئەو کارو کردەوانە دانانرێت.

## گفت و ڕای هەڵبژێردراو:

گفتی سێیەم، گفتی هەڵبژێردراو باشترە (أرجح)ـە، بەپێی بەڵگەی قورئان و، بەڵگەی عەقڵ، جا سەبارەت بە بەڵگەی قەرئان، ئایەتی زۆر هەن، کە بەڵگەی لە سەر ئەوەی کە خوای گەورە فەرمان بەو شتانە دەکات، کە باشن و چاکن و، ڕێ دەگرێت، لەو شتانەی کە خراپن و، پێش ئەمرۆ نەهی کردن لە کارو کردەوەکان، خودی کارو کردەوەکان چاك و خراپەیان تیادا جێگیر بووە، وەك خوای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱللَّهَ يَأۡمُرُ بِٱلۡعَدۡلِ وَٱلۡإِحۡسَٰنِ وَإِيتَآيِٕ ذِي ٱلۡقُرۡبَىٰ وَيَنۡهَىٰ عَنِ ٱلۡفَحۡشَآءِ وَٱلۡمُنكَرِ وَٱلۡبَغۡيِۚ﴾[1]، واتە: خودای پەروەردگار فەرمان دەکات، بە دادگەری و چاکە کردن و سیلەی ڕەحم و چاکە لە گەڵ خزم و کەس و کارو، ڕێ دەگرێت لە هەموو کارێکی خراپە و دزێو ستەم و لە سنوور دەرچوون، هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَأۡمُرُهُم بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَىٰهُمۡ عَنِ ٱلۡمُنكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾[2]. واتە: فەرمانیان بە چاکە پێ

---

١ النحل (٩٠).

٢ الاعراف (١٥٧).

دەكاتو، لە شتی خراپو ناپەسند ڕێیان لێ دەگرێت، و هەموو شتێكی پاكو خاوێنیان بۆ حەلاڵ دەكات، و هەموو شتێكی پیسو زیان بەخشیان لێ یاساغ دەكات.

بۆیە ئەوەی كە شەرع فەرمانی كردووە، بە ئەنجامدانی لەبەر دادگەریو، چاكو پاكو جوان بوونیەتی، و ئەوەی كە شەرع ڕێی گرتووە لە كردنی، لەبەر خراپیو ناپەسندیو لە سنوور دەرچوونیەتیو، ئەوەی لە شتی پاك بۆی حەلاڵ كردوونو لە شتی خراپ كە حەرامی كردووە، سەرجەم ئەم سیفەتو خەسڵەتە جوانو خراپانە، لە خودی كردەوەكاندا جێگیر بوون، پێش هاتنی دەقی شەرعیی لە سەریانو، ئەمەیش بەڵگەو دۆكیۆمێنتە لە سەر ئەوەی كە كارو كردەوەكان لە خودی خۆیاندا (ذاتیاً) چاكن، یاخود خراپن.

لەم نێوەندەداو بەپێی پێویست عەقڵیش هەست دەكات بە چاكەی هەندێ كردەوەو خراپەی هەندێ كردەوەی تر وەك زانینو هەستكردن بەوەی كە دادگەریو ڕاستگۆیی دووكاری جوانن، و ستەمو درۆكردن دوو كردەوەی خراپن، بەلام حوكمی خودای مەزن لە سەر ئەمانە تەنها لە ڕێی پێغەمبەرانەوە دەزانرێت، بۆیە هەر كارێك كە پێغەمبەرێك پەیامی خوای لە سەر دەر نەبڕیبێت، كە حوكمەكەی چییە؟ بە كارو كردەوەو هەستی خەڵك حەلاڵیو حەرامی ئەو كارە ناچەسپێت، وەك پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّىٰ نَبْعَثَ رَسُولًا﴾[1] واتە: ئێمە تۆڵەو سزای هیچ خەڵكێكمان نەداوە، هەتا پەیامبەرێكمان بۆ نەناردبن، تا ڕێیان بۆ ڕۆشن بكاتەوە، كەواتە پێش ناردنی پێغەمبەرانو، پێش گەیشتنی بانگەوازەكە، سزادان لە سەر كردەوە نییەو، كە سزایش نەبوو، تەكلیفیش نییەو، كە تەكلیفیش نەبوو، ئەوا حوكمدانی خودای مەزن بە سەر چاكیو خراپی كردەوەكاندا نابێتو، داوای كردن یان نەكردن یان سەر پشك بوون لە نێوان كردنو نەكردندا ناكات، ئەم وتەیەی ئیمامی شەوكانی چەند جوانە؟ كە لەم بارەیەوە دەفەرموێت: نكۆڵی كردنی ئەو پرسەی كە ڕای وای تیادایە، كە تەنها عەقڵ دەتوانێت چاكەو خراپەی كردەوەكان هەست پێ بكاتو، یەكلایی بكاتەوە، نەوەك دەرەنجامی كارەكان، ئەمە قسەیەكی بێ بەڵگە و دەماراویو نكۆڵیكار و بێ بنچینەیە و هەروەها ناتوانرێت ئەوەیش پەسەند بكرێت، كە گوایە عەقڵ دەتوانێت، هەست بەوە بكاتو، پەی بەوە ببات، كە فلان كردەوەی چاك پاداشت دەرەو، فلان كردەوەی خراپە سزادەرەو، دواجار ئەوەی كە عەقڵ پەی دەبات پێی ئەوەیە كە فلان كاری چاك بكەرەكەی ستایش دەكرێتو،فلان كاری خراپ

---

[1] الأسراء (١٥).

ئەنجامدەرەکەی سەر زەنشت دەکرێت‌و، لە نێوان ئەم پرسەو ئەم پاداشت‌و سزادارییەی کردەوەکاندا هیچ پەیوەندی‌و پێکەوە بەسترانێك بوونی نیە.

### ٦٧- بەرهەم‌و دەرەنجامی ئەم ڕاجیاییە:

لە دەرەنجامی ئەم ڕاجیاییە لە سەر بەچاك دانان، یان بەخراپ دانانی کردەوە،ئەم دوو بەرهەم‌و دەرەنجامەی خوارەوەمان دەست دەکەوێت:

یەکەم: هەرکەسێ بانگەوازی ئیسلام، یاخود بانگەوازی پێغەمبەرانی نەگەشتبێتەلا، بەشێوەیەکی گشتی، ئەوە لە لای گروپی موعتەزیلە لە سەر کارو کردەوەکانی لێپرسینەوەو مەلۆیستەی لە سەر دەکرێت، چونکە لێی داوا کراوە، کە هەر شتێ عەقڵ بەچاکی زانی، دەبێت بیکات،و هەر شتێ عەقڵ بەخراپی زانی دەبێت دەستی لێ هەڵبگرێت‌و ئەمەش حوکم‌و یاسای خوای پەروەردگارە.

لەلای ئەشعەرییەکان‌و ماتۆریدییەکان‌و هاوڕاکانییان ئەوەیە کە هەر کەسێ بانگەوازی نەگەیشتبێتە لا، نە لێپرسینەوەو نەسزای لە سەر نییە.

دووەم: لە دوای هاتنی شەریعەتی ئیسلام، هیچ ڕاجیایی نییە لە نێوان زانایاندا، لە وەیدا کە حوکمی خودای مەزن، بە هۆی ئەو یاساو ڕێساو شت گەلەوەدەزانرێت‌و، دەفامرێت، کە خودا لە کتێبەکەیدا باسی کردووەو، هێناویەتی، یاخود لە ناو سوننەت‌و فەرموودەی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووەو، هەردووکیشیان، واتە قورئان‌و سوننەت، لە لایەن پێغەمبەرەوە(ﷺ) بلاو کراونەتەوەو، گەیەندراون.

بەلام ئەگەر لە پرسێکدا حوکمی شەرع نەهاتبوو، ئەوا بەڕای گروپی یەکەم (ئەوانەی کە دەبێژن عەقڵ چاك‌و خراپەکان لێك جوێ دەکاتەوە)، ئەمانە دەڵێن، عەقڵ سەرچاوەی ئەحکامەکانە، واتە ئەو پرسەی کە لە شەرعدا حوکمی لە سەر دیاری نەکراوەو نەهاتووە، ئەگەر عەقڵ بەچاکی زانی ئەوە واجبە جێ بەجێ بکرێت، و ئەگەر عەقڵ بە خراپ زانی، ئەوە کردنی حەڕامە، چونکە حوکمی خوای پەروەردگار لە کارو کردەوەکاندا لە سەر بنەمای (چاك: حسن)و (خراپ: قبح)ـی، ئەو کردەوانە وەستاوە، و هەرکات‌و لە هەر پرسێکدا حوکمی شەرعی لە سەر نەهاتبوو، ئەوە مانای ئەوەیە کە شەرع مۆڵەتی داوە پێمان، کە بگەڕێنیەوە بۆ لای عەقڵ، تا ئەو لە سەر بنەمای چاکی‌و خراپی کارەکە بڕیارمان بۆ بدات‌و، لە سەر ڕای گروپی دووەم‌و سێیەم، عەقڵ سەرچاوەی حوکمەکان نییەو، بەڵك‌و حوکم لە سەرچاوە جێگیرەکانی فیقهەوە وەردەگیرێت، کە بێگومان، عەقڵ لە نێو ئەو سەرچاوانەدا وەك سەرچاوەی هەڵهێنجانی حوکم دیاری نەکراوە و نەهاتووە.

# بەشی سێیەم

## (باسی المحكوم فيه: حوكم لە سەر دراو)

٦٨- المحكوم فيه: ئەو شتەیەكە بڕیارو خیتابەكەی شەرع لە سەری هاتووەو، پێوەی پەیوەستە، و ئەگەر ئەو خیتابەی شەرع لە حوكمێكی تەكلیفیدا بوو، ئەوە ئەوشتە حوكمی لە سەر دراوە، كردەوەیەكی پراكتیكی (فیعل)ـە، بەلام ئەگەر حوكمەكە (وەضعی) بوو، تەكلیفی نەبوو، ئەوەبۆی هەیە، شتە حوكم لە سەر دراوەكە (فیعل: كردەوە) بێت، لە سەر شانی كەسی موكەللەف، وەك لە گرێبەستو، تاوانەكاندا هەیە، و جاری وایش هەیە، كە كارو فیعل نییە، لە سەر شانی موكللەفو، بەڵكو بۆ فیعلەكە دەگەڕێتەوەو بەس فیعل نییە، وەك بینینی مانگ لە ڕەمەزاندا، كە شەرع كردوویەتیە هۆكارو سەبەب بۆ گرتنی ڕۆژووی ڕەمەزان، و ڕۆژو ویش كاری سەر شانی كەسی موكەللەفە، و كردەوەیەكە كە ئەنجامی دەدات، جا (مَحكوُم فیه) هەروەها (مَحكوُم به)یشی، پێ دەگوترێت، بەلام ناونانی یەكەم بالاترو لە پێشترە[1].

لەم فەرمایشتەی پەروەردگاردا كە دەفەرموێت: ﴿وأتوا الزكاة﴾ ئەو واجبی بوونی زەكاتەی كە لەم حوكمەوە دەستمان كەوتووەو، بەهۆی ئەم حوكمەو فەرمانەوە زانیومانە كە زەكاتدان واجبە پەیوەستە بە كاری سەر شانی كەسی موكەللەفەوە، كە دانی زەكات، و ئەم پەیوەست بوونە دانەكەیشی واجب كردووە.

كە خوا دەفەرموێت: ﴿ وَلَا تَقْرَبُوا۟ ٱلزِّنَىٰٓ ﴾[2]، ئەو حەرام بوونەی كە لەم حوكمەوە دەستمان كەوتووە پەیوەستە بە كارو فیعلی موكەللەفەكەوە، كە كاری داوێن پیسی یەو، ئەم پەیوەستیشە كارەكەی حەرام كردووە.

هەروەها كە پەروەردگار دەفەرموێت ﴿إِذَا تَدَايَنتُم بِدَيْنٍ إِلَىٰٓ أَجَلٍ مُّسَمًّى فَٱكْتُبُوهُ ﴾[3]، ئەو مەندوب و باشییەی كە لەم حوكمەوە دەستمان دەكەوێت، پەیوەستە بەكارو فیعلی موكەللەفەوە، كە نووسینو یاداشتكردنی قەرزە، و ئەو پەیوەستییە ئەم كارەی كردۆتە

---

١ تیسیر التحریر، ب٢، ل ٣٢٨.

٢ الأسراء (٣٢).

٣ البقرة (٢٨٢).

مەندوب، و هەروەها کە قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَيَمَّمُواْ ٱلۡخَبِيثَ مِنۡهُ تُنفِقُونَ﴾[1]، ئەو کەراهەتو خراپییەی کە لەم حوکمەوە وەرمان گرتووەو، دەستمان کەوتووە، پەیوەستە بەکاری موکەللەفەوە، کە بەخشین شتی پیسو خراپەو، ئەم پەیوەستیە کارەکەی مەکروە کردوون، هەروەها خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿ فَإِذَا قُضِيَتِ ٱلصَّلَوٰةُ فَٱنتَشِرُواْ فِي ٱلۡأَرۡضِ﴾[2].
ئەو حەلاڵ بوونەی کە لەم حوکمەو دەقەوە دەستمان کەوتووە، پەیوەستە بەکارو کردەوە، و فیعلی کەسی موکەللەفەوە، کە بڵاوبوونەوەیە بەسەر زەویدا، و ڕۆشتنی هەموو کەسێکە بەدەم کاری خۆیەوە، و ئەم پەیوەست بوونەیە، کە کارەکەی حەلاڵ کردووە.
زانایانی ئوصولی فیقهـ، سەبارەت بەو کردەوەو فیعلانەی کە تەکلیفەکە پەیوەستە پێیانە، لە دوو ڕەهەندەوە قسەیان لە سەر کردووە.

- ڕەهەندی یەکەم: لە ڕووی مەرجەکانی ئاستی دروستی ئەو تەکلیف کردنەوە.
- ڕەهەندی دووەم: لە ڕووی ئەو لایەنەوە کە ئەو فیعلو کردەوانەی خراوەتەلا.

و ئێمە لەم کتێبەدا، لە سەر سەرجەم ئەو ڕەهەندانە و هەر یەکە لە بەشە باسی خۆیدا لە سەری دەدوێین.

## ﴿بەشە باسی یەکەم﴾

## مەرجەکانی ئاستی دروستی ئەو تەکلیفەی، کە کراوە بۆ ئەنجامدانی کارێك، یاخود مەرجەکانی حوکم لە سەر دراو.

٦٩- لە کردەوەکەدا چەند شتێك بەمەرج گیراون، تا ئەو تەکلیفە لە جێگای خۆیدا بێتو، دروست بێت، کە ئەو مەرجانەیش بریتین لە:-

یەکەم: دەبێت ئەو کارو کردەوەیە، لە لایەن کەسی موکەللەفەوە زانراوبێتو، زانیاری تەواوی لە سەری هەبێتو، ئەو ئاستی زانینو زانیارییە دەبێت، ئەوەندەزۆر بێت، کەهانی بدات، لە سەر ئەنجامدانو جێ بەجێ کردنی، بەو شێوازەی کە داوای لێکراوە بیکات، بۆیە تەکلیف خستنە سەر شانی مرۆڤ بەکردنی کارێك کە نایزانێت، دروست نییە، بۆیە ئەو

---

١ البقرة (٢٦٧).

٢ الجمعة (١٠).

تەكليفانەی كە قورئان بە گشتی (مجمل)ـی، باسی كردووە، وەك نوێژ كردنو زەكاتدان، پێغەمبەر (ﷺ)بە جۆرێك ڕوونی كردوونەتەوە، كە ئەو نادیاریو كورتبڕی و گشتی بوون (مجمل)بیەی، لە سەر لابردوون، چونكە ئەمە كاری پێغەمبەرە(ﷺ) كە ڕاڤەو ڕونكردنەوەیە لە سەر ئەحكامە شەرعییەكان، هەروەك قورئانی پیرۆز دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[1].واتە: قورئانمان ناردۆتە سەرت ئەی موحەممەد، تا بۆیانی ڕاڤەو شی بكەیتەوە، مەبەستیش لە زانیاری (علم)، كە لە سەرەوە باسمان كرد، كە دەبێت، موكەللەف هەیبێت، بەشتەكان، ئەوەیە كە دەبێت لە خودی خۆیدا ئەو زانیارییەی هەبێت، یاخود بتوانێت بە دەستی بهێنێت، و توانای هەبێت، بۆ خۆی یان بە هۆی شتو ئامرازێكی ترەوە، زانیاری پەیدا بكات، لە سەر ئەو شتە كە تەكلیف كراوە، بیكات، وەك ئەوەی كە پرسیار لە زانایان بكات، لە سەر ئەو شتەو لە سەر ئەو تەكلیفە، تا شارەزابێت لە سەری، یاخود نیشانەو ئامراز هەبن، لە سەر ئەوەی كە ئەو كەسە توانای ئەوەی هەیە شارەزایی لە سەر ئەو شتە تەكلیف لە سەر كراوە پەیدا بكات، وەك ئەوەی كە كابرا نیشتە جێی (دار الأسلام) بێت، چونكە ئەو جێگاو ژینگەی (دار الأسلام)ـە، جێگای زانینی ئەحكامەكانی شەریعەتە، چونكە ئەحكامەكانی شەریعەت لە (دار الأسلام)دا، بلاون و زۆرن، و مرۆڤ دەتوانێت پەی بە زانینیان ببات، و بلاویو زۆریش نیشانەی زانینو زانیاری پەیدا كردنە بەهەر شتێك كە زۆربێت، بۆیە شەرعزانەكان فەرموویانە: زانیاریو زانست بوون، بەشتەكان، لە سەر كەسێك كە دانیشتووی (دار الأسلام) بێت، پێویستەو، بە پێویستو فەرز لە سەری دادەنرێت، (واتە: بیانووی نەزانینی نییە).

ئینجا ئەو قاعیدەو بنەمایەی كە دەڵێت: (لا يصح الدفع بالجهل بالأحكام في دار الأسلام)، واتە بیانووی نەزانینی حوكمی شەرعی لە سەر شتەكان، بۆ كەسێك لە (دار الأسلام)دا بژی بەبیانوو بۆی حساب ناكرێت، ئەم یاسایە لە بەر ڕۆشنایی ئەو دەقانەی سەرەوەدا گوتراوەو، ئەمەش سەبارەت بە غەیری (دار الأسلام)و خەڵكی نیشتە جێی (دار الحرب) ڕاجیایی نێوان زانایانی دروست كردووە، چونكە بەو پێیە بێت، زانینی حوكمە شەرعییەكان بۆ ئەوان بە پێویست لە سەریان (بە هەمیشەییو هەموو كەسێك) نەزانراوەو، بیانووی نەزانینیان لێ وەردەگیرێتو، بە پاساو بۆیان دێتە ئەژمار بۆیە هەركەسە لە غەیری (دار الأسلام) مسوڵمان بوو، و نەیزانی كە نوێژ كردن واجبە، هەر كات ئەو زانیارییەی دواتر زانیو

---

[1] النحل: (٤٤).

دەستی کەوت، ئەوا قەزاکردنەوەی ئەو نوێژانەی لە سەر نییە، کە لە کاتی مسوڵمانیدا، بەلام بە نەزانینی واجبی نوێژ نەیکردوون، یاخود ئارەقی خوارد، بەلام نەیدەزانی حەرامە، کە گەڕایەوەو سەردانی (دار الأسلام)ـی، کرد، سزا نادرێت، چونکە زانیاری لە سەر ئەو حوکمە نەبووە.

یاساو قاعیدەی ئەم پرسە، لە یاسا مرۆڤ کردەکانو، شەریعەتی ئیسلامیدا چونیەکە، هەر یاسایەك بە ڕێگای یاسایی بلاو کرایەوە، ئیتر ئەوەیە زانراوو و زانیاریدار دێتە ئەژمار، لە سەر کەسی موکەللەف، بۆ نموونە وەك ئەوەی کە لە ڕۆژنامەیەکی فەرمیدا بلاو بکرێتەوەو، مەرج نییە ڕاستەوخۆ کەسی موکەللەف بیبینێت و بیزانێت، بەلام بلاوکردنەوەی ئیتر لە سەر شانی موکەللەف حسابەو بە زانین لە سەر شانی حساب دەکرێت.

٧٠- دووەم: دەبێت ئەو کارەی کە تەکلیف کراوە ئەنجام بدرێت، لە توانای کەسە موکەللەفەکەدا هەبێت، کە ئەنجامی بداتوجێ بەجێی بکات، یان نەیکات، چونکە مەبەست لە تەکلیف، گوێڕایەڵی کردنی فەرمانی پەروەردگارە، کە کارەکە لە دەرەوەی سنوری تواناو ورەی موکەلەفدا بوو، ئەو کاتە بەگوێڕایەڵی نایەتە ئەژمارو بە ڵکو بەبێ هودە (عبث) حساب دەکرێتو، خودای مەزنو شەریعەتیش دوورن، لە کاری بێهودە و لە ڕوانگەی ئەم مەرجەی سەرەوە، ئەم دوو شتەمان بۆ ڕوون دەبنەوە:

یەکەم: تەکلیف خستنە سەر شان، لە شەرعدا بۆ کارێکی نەگونجاوو دوورو نابەجێ (مستحیل) بوونی نییە، ئیتر چونیەکە ئەو کارە لە خودی خۆیدا موستەحیل بێت، وەك کۆکردنەوەی دووشتی دژ بەیەك، یاخود بەهۆی شتی ترەوە بووبێتە موستەحیل، وەك ئەوەی کە لە عادەتی دنیادا ڕوودانی نەبێتو، نامسۆگەر بێت، هەر چەندە عەقڵیش ڕێگای پێ بدات، وەك فڕین بەبێ ئامرازێك وەك فڕۆکە، یان باڵ، کە سوننەتی کەونی (نەریتی بوون)، بوونی شتێکی لەو جۆرە کارە بەوە زانیوە، کە بۆی هەیە، ڕوو بدات، بەلام دواجار تەکلیف کردن بەشتی نامسۆگەر (مستحیل)، بە هەردوو جۆرەکەیەوە کە باسمان کرد، تەکلیفەکە لە دەرەوەی سنوری توانای مرۆڤەوەیەو، بۆیە شەرع داوای نەکردووە، شتی موستەحیل ئەنجام بدرێتو، خۆی لە تەکلیفی نابەجێ بە دوور گرتووە.

دووەم: تەکلیف لەو شتانەدا ناکرێت، کە لە دەرەوەی ویستو ئیرادەی مرۆڤەوەن، وەك ئەوەی کە تەکلیف بخرێتە سەرشان، کە کارێکی دیارینەکراو بکات، چونکە کارەکە دیاری نەکرا، لە دەرەوەی ویستو توانای مرۆڤەوەیەو، ئەوەی کە مرۆڤ دەتوانێت بیکات، ئەوەیە

کە فەرمان بکات، بە کارێکی دیاری کراوو ناسراو، یاخود فەرمان بکات بە کەسانی تر، کە کارێکی دیاریکراو ئەنجام بدەن.

هەروەها شتی تری لەم بابەتەیش هەن، وەك تەکلیف کردنە سەر کۆمەڵێك شتی پەیوەست بە ویژدانو دڵەوە کە تەواوی دەرونی مرۆڤ کۆنترۆڵ دەکەنو، کردوویانە و مرۆڤ ناتوانێت زاڵ ببێت، بەسەریاندا، و ناخی لە سەریان ڕاهاتووە، و شتەکە پەیوەندی بە ناخو دەرونیانەوە هەیە، هەر بۆیە دەربارەی مانەوەی شەوانە لەلای کەسێك کە زیاد لە ژنێکی هەیە، لە فەرموودەی پیرۆزدا، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووە، کە فەرموویەتی: (اللهم هذا قسمي فيما أملك، فلا تؤاخذني فيما تملك، و لا أملك) واتە: پەروەردگارا ئەوەی لە توانای مندایە، لە بەشی شەوانەی هەریەکە لە ژنەکانمدا، ئەوەتا بە داد پەروەرانە جێ بەجێم کردووەو، مافی کەسێکم نەداوە، بە کەسێکی تر، بەلاّ سەبارەت بەو شتانەی کە پەیوەندییان بە دەرونو مەیلی دڵەوە هەیە، خودایە لێم نەگری، چونکە ئەوەی لە توانای مندا نییەو، تەنها دەسەلاّتی تۆیە! واتە: لەو مەیلە دڵیو حەزەی کە لە دڵەوە هەیبووە، بۆ هەندێ لە ژنەکانیو بۆ هەندێکی تریان کەمتر بووە، بەلاّم هەرگیز ئەم مەیلەی لە مەیدانی واقیعدا پراکتیزە نەکردووەو، لە نێوانیاندا داد پەروەر بوو.

هەروەها کە لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: (لا تغضب: توورە مەبە)، کە مەبەست لێی نەهی کردن نییە، لە خودی توورەیی، ئەگەر هاتوو هاتەدیو بەهۆی شتێکی تورەکەرەوە کە مایەی تورەیی بوو، ڕوویداو، کابرا توورە بوو، بەڵکو مەبەست ئەوەیە کە ئەو کەسە با درێژدادڕی نەکات، لە تورەییدا، و ئەوەندە زیاد توورە بێت، کە گوفتارو کردارگەلێکی لە دەست دەربچێت، کە نا دروست بن، بەڵکو پێویستە لە سەر بێدەنگ ببێت، تا ئارام دەبێتەوەو، ئەو پشکۆی تورەییە لە دەرونیدا دەکوژێتەوە، هەروەك لە سەر مرۆڤیش پێویستە لەو شتانە دوور بکەوێتەوە، کە تورەیی ئەوکەسە دەوروژێنن، و ئیتر ناتوانێت خۆی کۆنترۆڵ بکات، بۆیە سەرجەمی ئەم کارە پەیوەندیدارانەی کە دەتوانێت بیانکات، لە سەری پێویستە کە بیانکات، تا نەکەوێتە ناو ئەو کارە نادروستانەی کە لە ئەنجامی تورە بوونەوە ڕوودەدەن.

لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین، کە مەیلی دڵ، هەرچەندە ناچێتە ناو چوارچێوەی تەکلیفەوە، وەك ئەوەی کەسێك لە ناو ژنەکانیدا یەکێکیانی زیاتر خۆش بوێت، یاخود وەك ئەوەی کە کەسێك لە ناو منداڵەکانی خۆیدا یەکێکیانی زۆرتر خۆش بوێت، بەلاّم سەرەڕای

ئەوەیش هەر پێویستە دادپەروەری بکات لە نێوانیاندا، چ لە نێوان کوڕەکان‌و چ لە نێوان ژنەکانیداو مافی هەموویان‌و هەریەکەیان وەك خۆی بداتو، بۆیە دروست نییە کە باوك بەهۆی ئەوەی یەکێك یان بەشێك لە منداڵەکانی خۆی زیاتر خۆش دەوێت، مافی زیاتریان بداتێو، بەوانی تری نەدات، چونکە ئەم کارە پەراوێز خستنی کەسانی تری تیادایەو، چاندنی دوژمنایەتییە لە نێوان براکانداو، بۆیە نەهی لێکراوە[1].ئینجا سەبارەت بەو مەیلەی دڵ کە پەیوەستە بە بیرو باوەڕەوە.

وەك خۆشویستنی خواو پێغەمبەری خوا(ﷺ)، ئەمانە واجبن لە سەر کەسی موکەللەفو، لە سەری داواکراوە، کە ئەو خۆشویستنەی هەبێت، لە دڵداو، ئەو فاکتەرانەی کە دەبنە هۆی ئەو خۆشەویستیە ئەنجامیان بدات، تا خۆشی بوێن‌و، ئەگەر خۆشی نەوێن، پاساوی نییە، یاخود لە مەیلی دلیدا دژایەتی خواو پێغەمبەری خوا (ﷺ) هەبێت، ئەمەیش هەر بێ پاساوە چونکە بە نەبوونی خۆشەویسی لە دڵیدا، یان بە بوونی دوژمنایەتی لە دڵیدا، بۆ خوداو پێغەبەر(ﷺ)، ئەمانە بەڵگەن لە سەر بێ باوەڕی ئەو کەسە، چونکە ئیمان پەیوەستە بە خۆشەویستی خواو پێغەمبەری(ﷺ)خواوەو، لە یەکتری جیانابنەوە، کە جیابوونەوە، ئەمە بەڵگەیە، لە سەر نەبوونی ئیمان.

٧١- سەختی‌و نارەحەتی لە ئەنجامدانی کردەوە (عمل)دا:

گوتمان: لە کردەوە (فیعل‌و عەمەل)دا، بە مەرج گیراوە، کە دەبێت لە ئاستی توانای کەسی موکەللەفدا بێت، بەڵام ئایا بەمەرج گیراوە، کە دەبێت سەختو نارەحەتیش نەبێت؟ لە ڕاستیدا هیچ کردەوەیەك نییە، کە بەشێك لە نارەحەتی تیادا نەبێتو، نارەحەتی لەو شتانەیە کە لەو کردەوانەدا هەیە، کە داوا کراوەو تەکلیف کراوە ئەنجام بدرێت، بەڵام ئەگەر ئەو نارەحەتییە کە تیایدایە، نارەحەتییەکی ئاسایی بوو، و مرۆڤ دەیتوانی بیکات، ئەمە کێشە نییەو ئاساییەو، نابێتە بەربەست لە بەر دەم ئەنجام دانیدا، و دەبێت ئەنجام بدرێت، و نارەحەتییەکە نەکرێتە پاساو بۆ ئەنجام نەدانی، بەڵام سەبارەت بەو نارەحەتییە نائاساییەی کە لە توانای مرۆڤدا نییەو، بەڵکو دەبێت زۆر لە خۆ بکاتو خۆی بخاتە ناو

---

١ لە فەرموودەی صەحیحی پێغەمبەردا (ﷺ) هاتووە کە نوعمانی کوڕی بەشیر مافو موڵکی دایە، یەکێك لە منداڵەکانی خۆی‌و، لەم بارەیەوە پرسیاری لە پێغەمبەر (ﷺ) کردو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئایا ئەو مافەت بە سەرجەم منداڵەکانت داوە؟ ووتی: نەخێر، پێغەبەریش (ﷺ) فەرمووی: لە خوا بترسەو لە نێوانیاندا دادپەروەر بە ریاض الصالحین، ل٢٦٦-٢٦٧.

گرفــتو چــەرمە ســەرییەکی زۆرەوە تــا ئــەنجامی دەدات، حــوکمی ئەمــەیان جیایــەو بــەم شێوازەی لای خوارەوەیە:

یەکەم: ناڕەحــەتی نائاسـایی، جـاری وا هەیـە کـە توشـی کردەوەیـەك دەبێـت، بـە هـۆی بارودۆخێکی تایبەتی کەسە موکەللەفەکەوە، وەك ڕۆژوو گرتن لە سەفەرو کـاتی نەخۆشـیدا، یاخود وەك زۆر کردن لە کەسێك بە کردنی کوفر، یاخود وەك فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگـرتن لە خراپە، کە ئەگەر مرۆڤ بیانکات، تووشی مەرگ لە ناچوون دەبێتەوە، لەم جۆرە دۆخانـەدا شەرع ئەم ناڕەحەتیانەی لابردووە، و کۆمەڵێك دەرفەت (رخصة)ـی، داناوە، کە بەهۆیانـەوە کەسی موکەللەف دەتوانێت ئەوکردەوە واجبانە ئەنجام نەدات، و کارە حەڕامکراوەکە بکـات تا تووشی ناڕەحەتی نەبێت، و دژواری لە سەر لابیات.

بەلاّم سـەرەڕای ئەمـەش شـەرع داوای پـشودرێژیو دان بـەخۆداگرتنی کـردووە، لـە سـەر هەندێ لەو ناڕەحەتیانەی نائاساییانەی کە لە هەندێ کردەوەدا هەنو، کردنیانی بە مەنـدوب داناوە، وەك ئەو کەسەی کـە بـەزۆر داوای لێـدەکرێت کـوفر بکـات، کـە دەرفـەتی هەیـە، لـە شەرعدا، کە ئەو کوفرە بکاتو، گوناهباریش نییە، بەلاّم مەنـدوبو هەڵبـژێردراو ئەوەیـە کـە خۆڕاگری بکات، لە سەر ئەو ناڕەحەتییە، و کوفرەکـە نـەکات، هـەر چـەندە تیـایش بـچێت، یاخود وەك ئەو کەسەی کە هەڵدەستێت بە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە کە دەتوانێـت نـەیکاتو لێـی بێـدەنگ ببێـتو، خـۆی ڕو بـەڕووی دەسـەلاّتدارانی سـتەمکار نەکاتەوەو، فەرمان نەکات بەچاکەو ڕێ نەگرێت لە خراپە، ئەمە دەرفەتەو ڕوخسەتەو شەرع پێیداوە، بەلاّم لە گەڵ ئەوەیشدا مەندوبو ڕای هەڵبژێردراو بـۆ ئـەو کەسـە ئەوەیـە کـە هـەر چەندە تیایش بچێت، بەلاّم هەڵسێت بە فەرمانکردن بە چاکەو ڕێ گـرتن لـە خراپـە، چونکە خۆڕاگری لەم هەڵوێستەو هەڵوێستەکەی تریشدا شکۆمەندی بە ئیسلام دەبەخـشێتو، گـەلی ئیسلامی پێ بە هێز دەبێتو، ستەمکارانو باتڵ لاواز دەکات.

دووەم: ناڕەحەتییەکـە نائاسـاییە، بـەلاّم دەبێـت هـەر خـۆڕاگر بێـت لـە سـەری، چونکە هەستان بە فەرزی کیفایە کارێکی پێویستەو، هەر چەندە سەخی تێدایە، بـەلاّم هـەر دەبێـت بکرێت، وەك جیهاد کردن، کە فەرزی کیفایەیە، هەرچەندە کوشتنو گیان دەرچوونو دژواری جەستەیی و خـۆڕاگری لەسـەر بـەلاّ و ناڕەحـەتی تیادایـە، و هـەروەها چـەندەها ناڕەحـەتی نائاسایتر، چونکە جیهاد کردن دەبێت بکرێت، تا ولاّت لـە دوژمنـان بپارێزێـتو، لـە ڕاسـتیدا ئەم بەشەی تەکلیف لەفەرزە کیفائیەکاندا هەیە، وەك نموونەمان بۆ هێنایـەوە، نـەك فـەرزی

عەیندا، و هەروەها فەرمانکردن بەچاکەو ڕێگرتن لە خراپە، بەشێکە لە بەشەکانی جیهاد، و دەبێت لە ناو گەلی ئیسلامدا هەبێت، و بەر پابکرێت، چونکە فەرزی کیفایەیەو، هەر چەندە لە دەرەنجامدا بکەرەکەی تووشی ناڕەحەتی زۆر گەورە ببێتەوەو، ئەو فەرمانکردن بەچاکەیەی کە بکەرەکەی تووشی سەختیو دژواری دەبێتەو، بە نیسبەت کەسێکی دیاریکراوەو، لەسەر ئاستی جوزئیات، کارێکی مەندووبە، بەڵام لەسەر ئاستی گشتی واجبەو، سەرجەم گەلی ئیسلام دەبێت، بەم کارە هەڵسێت، هەرچەندە تووشی دژواری ببێتەوە، چونکە فەرزی کیفایەیەو، دەبێت هەر گروپێك هەبن لەناو ئەم گەلەدا کە بەم کارە هەڵسن.

سێیەم: ئەو ناڕەحەتیە نائاساییەی کە بەهۆی خودی کارەکەو سروشتی کارەکەوە دروست نەبووەو، بەهۆی خودی کەسی موکەللەفەوە هاتووەتەدی کە ئەو کەسە کۆمەڵێك کاری لەسەر خۆی پێویست کردووە، کە شەرع داوای نەکردوونو، ئەم جۆرە کردەوانەیش دروست نین، وەك دەگێڕنەوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) کابرایەکی بینی، لە بەرخۆر وەستابوو، جا پرسیاری کرد، ئەو کابرایە بۆ لەبەر ئەو هەتاوە گەرمە وەستاوە، وەڵامیان دایەوەو گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەو کابرایە نەزری کردووەو، پەیمانی ئەوەی لەسەر خۆی پێویست کردووە، کە لەبەر خۆر ڕاوەستێتودانەنیشێتو نەچێتە سێبەرو، قسە نەکاتو، بەڕۆژوو بێت، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: بڕۆن پێی بڵێن، با قسە بکاتو، دانیشێتو، ڕۆژووەکەیشی لەسەری بەردەوام بێت[1].هەروەها کاتێکیش کە هەندێ لە هاوەڵان شەو نوێژیان بەدرێژایی شەو لەسەر خۆیان پێویست کردو، هەندێکیشیان بڕیاریاندا بەردەوام بەڕۆژوو بنو، ڕۆژوو نەشکێننو، هەندێکیان بڕیاریاندا دوور لە ژن بنو هەرگیز پرۆسەی هاوسەرگیری ئەنجام نەدەن، پێغەمبەر (ﷺ) لەم بارەیەوەو، سەبارەت بەم گروپانە فەرمووی: (أمّا والله إني لأخشاكم له، وأتقاكم له، لكنّي أصوم وأفطر، وأصلي وأرقد، وأتزوّج النّساء، فمن رغب عن سُنّتي، فليس منّي) واتە: دەی سوێند بەخوا، من لەوانە لە خواترسترو پارێزگارترم و بەڕۆژیش دەبم، و دەیشی شکێنم، و شەونوێژیش دەکەمو دەشخەوم، و ژنیش دەهێنم، بۆیە هەر کەس لە سوننەتو ڕەوگەی من لابدات. لەمن نییە،[2] حیکمەتو هونەر لە گشت ئەم پرسانەدا ئەوەیە کە، سزادانی لاشەو تووشی ناڕەحەتی کردنی بەبێ

---

١ رواه البخاري بڕوانە (رياض الصالحين)ی، ئیمامی نەواوی ل٩٢.

٢ رياض الصالحين، ل٨٦.

ئامانجێکی شەرعیو بەبێ بەرژەوەندییەکی دروست، کارێکی بێ هودەو سەرشێتانەیەو شەرع هیچ بەرژەوەندییەکی لەوەدانیە، کە جەستەی مرۆڤ توشی سەختیو نارەحەتی بکات، بەڵکو بەرژەوەندی لەوەدایە کە جەستە بپارێزێتو چاو دێریت بکات، تا کەسی موکەللەف بتوانێت، بەکارو کردەوەی چاکە هەڵبسێتو ئەنجامیان بداتو، هەرکاتیش لەو کردەوانەیدا کە داوای کردووە، بکرێت، نارەحەتیو دژواری هەبووو، داوای کردبوو، خۆراگری بکرێت لەسەر ئەو نارەحەتیانە، تا بەرژەوەندییەك بەدی بێت، یان مەبەستو ئامانجێکی دروست پراکتیزە بکرێت، ئەمە حەڵاڵەو، یاخود مەندوبە بۆ کەسی موکەللەف کە بیکات، یاخود هەر واجبە لەسەری کە جێ بەجێی بکات، و خۆراگریو دان بەخۆ داگرتنی هەبێت، لەسەر ئەو سەختیو دژواریانەی لە کاتی کردنی کارەکەدا تووشی دەبن.

لەسەر ئەم بنەمایە پێویستە ئەوە بزانینو لەوە تێبگەین کە ئەوەی گێردراوەتەوە لە پیاوچاکانی پێشوومان، بەوەی کە دەروونی خۆیان لە سەختیو تاڵاوی ژیاندا هێشتووەتەوەو جلوبەرگو خواردنی سادەیان کردووەو خواردووە، وەك پێشەوا عومەری کوڕی خەطابو پێشەوا عەلی کوڕی ئەبوتالیبو عومەری کوڕی عەبدولعەزیزو هاوڕێنەکانیان، بۆیە دەروونی خۆیان لەگەڵ دژواریو زبری ڕاهێناوە، چونکە ئەوانە کاربەدەستی وڵات بوونو لە پێگەی ڕەهبەرایەتیو پێشەوایەتی گەلی ئیسلامدا بوون، بۆیە ئەم جۆرە هەڵسوکەوتانەیان پێوە جوان بووەو، سوپاسیان کراوە لەسەری، چونکە ئامانجیان لەو کارە، ئامانجێکی دروستو چاك بووە.

وە هەروەهاو هەر بەم شێوازەیش خۆنەویست لە دەروندا، هەرچەندە بکەرەکەی تووشی سەختیو دژواری ژیان بکاتەوە، ستایش کراوە، چونکە لە خۆنەویستیدا، هاوکاری نەدارانو دەروون پاراستنیان دەکەوێتەوە، هەروەها کەسێك ئەگەر دوور بکەوێتەوە لە دەرگای ستەمکارانو هاوکاریان نەکات لەسەر ئەم کارەی ستایش دەکرێت، هەرچەندە تووشی کەم ڕزقیو زبری ژیان ببێتەوە.

نارەحەتیو سەختی ژیان لەم جۆرە بارودۆخانەدا ستایش کراوەو، ئەم ستایش کردنە لەبەر خودی سەختیو نارەحەتیەکە نییە، بەڵکو لەبەر ئەوەیە کە بە هۆی ئامانجێکی شەرعییەوەو مەبەستێکی گەورە تووشی کەسی موکەللەف بوون، بەڵام لە غەیری ئەم دۆخانەدا هیچ ستایشو سوپاسێك نیە، بۆ ئەو کەسانەی کە دەروونو گیانی خۆیان تووشی گرفتو سەختیو دژواری دەکەنەوە.

## ﴿بەشەباسی دووەم﴾

## باسی ( محکوم فیه : حوکم لەسەر دراو ) لە ڕوانگەی ئەو ئاستەوەی کە دراوەتە پاڵی:

٧٢- ئەو کارو کردەوانەی کەسانی موکەللەف، کە پەیوەستن بە ئەحکامە شەرعیەکانەوە، یان مەبەست لێیان بەرژەوەندییەکی گشتییە، یان بەرژەوەندییەکی تایبەتە، ئەگەر ئامانو مەبەست لێیان بەرژەوەندی کۆمەڵگە بوو بە گشتی ئەوە ئەو کردەوەیە مافی خودای پەروەردگارەو، ئەگەر مەبەست لێی بەرژەوەندییەکی تایبەت بوو، ئەوە مافی کەسەکەیەو، مافی خەڵکە، جاری واش هەیە کە لە کردەوەیەکدا مافی خوداو مافی بەندەی خودا پێکەوە کۆدەبنەوەو، جاری وایش هەیە، کە لە کاتی ئەو کۆبوونەوەیەی مافی خوداو بەندەدا پێکەوە، مافی خودا تیایدا زاڵترە لە مافی بەندەو هەروەها بە پێچەوانەیشەوە، لەسەر هەموو جۆرێك لەم جۆرانە بە پێی پێویستو سنووری خۆی دەدوێینو بەم شێوازەی لای خوارەوە:

## ٧٣ــ مافی خودای مەزن:

مافی خودا (حقّ الله)، بریتیە لە مافی کۆمەڵگە، بۆیە وا پێناسەیان کردووە، کە بریتیە لەو مافەی کە بەرژەوەندیو سوودی گشتی پێوەی پەیوەستە، بەبێ ئەوەی تایبەت بێت بە کەسێکی دیاریکراوەوە، بۆیە دراوەتە پاڵ خوای جیهانیانو خەڵك بەگشتی، لەبەر گرنگیو گشتگیری سوودەکەی،[1] نەدانی ئەم مافە نادروستە و کەس بۆی نیە، لێی خۆش بێت، و خۆی لێ لا بداتو لە لای یاساناسان وەك سیستەمی گشتی وایە.

بەپێی ئەزموون ئەوە جێگیر بووە کە مافی تەواوی خودای مەزن بەم جۆرەی لای خوارەوەیە:[2]

یەکەم: ئەو کردەوانەی کە تەنهاوتەنها پەرستشی خودان، وەك بڕواهێنانو نوێژکردنو زەکاتدانو ڕۆژووگرتنو حەجو جیهادکردنو، هتد.... بۆیە باوەڕو ئەوەی لەسەری بنیات دەنرێت، مەبەست لێی هێنانەدی ئەوەیە کە پێویستە، کە ئاینداریيەو، ئایینیش شتێکی

---

١ التلويح على التوضيح، ب٢، ل ١٥١.

٢ تيسير التحرير، ب٢، ل٣٦ و دواتر.

پێویستە، بۆیە بەرپاکردنی کۆمەڵگەو سیستەمەکەی‌و، پەرستشەکانیش هەموویان بۆ شەرع دایناون، وەك ڕەچاوکردنی کۆمەڵێك بەرژەوەندی، کە سوودی گشتیان هەیە، بۆ کۆمەڵگە.

دووەم: ئەو پەرستشانەی کە مانای قووت‌و دابینکردنی تفاقیان لێ دەفامرێتەوە، وەك سەرفیترە، کە پەرستشە، چونکە مرۆڤ بە هۆی ئەو خێرەوە کە دەیکات بە هەژارێك لە خودا نزیك دەبێتەوە، بۆیە مانای قووت‌و تفاقی تیایە، چونکە واجب بووە لەسەر کەسی موکەللەف، بەهۆی غەیری خۆیەوە، هەروەك دابینکردنی قووت بۆ خۆیشی تەنانەت لەسەر خۆی واجبە بیکات، بە پێچەوانەی ئەو پەرستشانەی کە بەس بۆ خوداوەند دەکرێت، چونکە ئەم پەرستشە تەنها بۆ خودایە، بە هۆی خەڵکی ترەوە واجب نەکراون.

سێیەم: ئەو باجەی کە وەك دەیەك لەسەر زەوی‌و زار دانراوە، و زانایانی ئوصولْ ناویان ناوەتە: (ئەو تفاقەی کە مانای پەرستشیشی تیادایە)، بۆیە بە قوت‌و تفاق ناوبراوە، چونکە باجەو لەسەر زەوی‌و زار دانراوەو، ئەم باجەیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە ئەو زەوی‌و زارە هەر بە دەست خاوەنەکەیەوە بمێنێتەوە، و کەس بۆی نییە، زیادەڕەوی بکات بەسەریدا، و بۆیە مانای پەرستشیشی تیادایە، چونکە ئەو دەیەکەی کە وەر دەگیرێت، ئەوە زەکاتی ئەو بەرهەمەیە کە زەوییەکە هەیبووەو لە بانك‌و سەنتەرەکانی زەکاتدا سەرف دەکرێت‌و، ئەمەیش بەرژەوەندنی گشتی تیادایە.

چوارەم: ئەو باج‌و خەراجەی کە لەسەر ئەو زەویانە وەر دەگیرێت کە (خەراج)یان، لەسەر دانراوە، کە ئەو زەوییانە دەگرێتەوە کە دەدرێتەوە بە خاوەنەناموسڵمانەکانیان، دوای فەتح کردن‌و دەست بەسەر داگرتنیان لە لایەن مسوڵمانەوەو، ئیدی باجێکی دیاریکراویان لەسەر دادەنرێت تابیدەن، هەروەك ئەم خەراجە لەسەر زەوی‌و زارەکانی عێراق‌و شام دانراوە، کە پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب دانیەوە بەدەست خەڵکەکەوە، و دوای ڕاوێژ کردن بە هاوەڵان‌و ڕازی بوونیان خەراج‌و باجی لەسەر دانان‌و، ئەو باج‌و بەرهەمەیش لە بەرژەوەندییە گشتییەکانی دەوڵەتی ئیسلامیدا بەکار دەهێنرا.

پێنجەم: ئەو سزا تەواوانەی، کە تەنهاو تەنها مانای سزادانیان تیادایە، کە ئەویش بە (حدود) ناو نراون، واتە: ئەو سزا دیاریکراوو ئەندازە دارەی کە شەرع لە بەر ڕەچاو کردنی بەرژەوەندی گشتی داینانون، و هەر لەبەر ئەو بەرژەوەندییە گشتییەیش بە مافی خودا (حق الله) دانراون، وەك، شەلاقدان لەسەر داوێن پیسی و شەلاقدان لە بەر ئارەق خواردن‌و، بڕینی دەست لەبەر دزیکرن‌و، هەڵواسینی ڕێگران، سەرجەم ئەم سزایانە لە بەر بەرژەوەندی

ـێمەڵگە شەرع دایناوەو، کەس بۆی نییە، لایان ببات و لە کاریان بخات و، بۆیە کاتێك کە
ـفرەتێك سەر بە خێڵی بەنی مەخزوم دزی کرد، و ئوسامەی کوڕی زەید(خوا لێی ڕازی بێت)
ـستی، داوای لێخۆش بوونی بۆ بکات، لەلای پێغەمبەر (ﷺ) پێغەمبەر (ﷺ) توڕە بوو،
ـەو بارەیەوە وتاری بۆ خەڵکی دا و تیایدا فەرمووی: (إِنَّمَا أَهْلَكَ الَّذِينَ قَبْلَكُمْ، أَنَّهُمْ كَانُوا إِذَا
ـرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذَا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقَامُوا عَلَيْهِ الحَدَّ، وَايْمُ اللَّهِ لَوْ أَنَّ فَاطِمَةَ
ـنْتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)، واتە: خودا بۆیە گەلانی پێش ئێوەی لە ناو برد، لەبەر
ـەوەی کە ئەگەر کەسی دەست ڕۆیشتوو، لە ناویاندا دزی بکردایە، چاویان لێ دەپۆشی و
ـەگەر خەڵکانی لاواز و بێ دەسەڵات دزییان بکردایە، ئەوا سزایان دەدان، دەی سوێند بەخوا
ـەگەر فاتیمەی کچم دزی بکات، دەستی دەبڕم.[1]

شەشەم: ئەو سزایانەی کە مرۆڤ لە هەندێ ماف بێ بەش دەکەن، وەك ئەوەی کە بکوژ
ـە میرات بردن بێ بەش دەبێت و، بۆیە بە سزای بێ بەشکردن (عقوبة قاصرة) ناوزەد کراون،
ـە بەر ئەوەیە کە ئازاری جەستەیی نین، یاخود سنوردار کاری ئازادییەکانی تاوانبارەکە نین،
بەڵکو هۆکارن بۆ ئەوەی کە ئەوە بچەسپێنێت، کە ئیتر ئەو کەسە نابێتە خاوەن موڵکی نوێ
لەو ڕێگایەوەو، ئەمەش سزایەکی نێگەتیڤە.

حەوتەم: ئەو سزایانەی کە مانای پەرستشیان تیادایە، کە ئەویش کەفارەتەکانن وەك
کەفارەتی کەوتنی سوێندو، کەفارەتی ڕۆژوو نەبوون، بەدەستی ئەنقەست لە ڕەمەزانداو، کە
فارەتی کوشتنی هەڵە، ئەم کارانە بە سزا دادەنرێن، لەبەر ئەوەیە کە لە جیاتی سەر پێچی
کردن دەدرێن و دانراون و، بۆیە مانای پەرستشیان تیادایە، چونکە خودی کەفارەتەکانیش
پەرستشە وەك گرتنەوەی ڕۆژوو، یان خێر کردن، یان ئازادکردنی بەندە، کە ئەمانە هەموو
لە خۆیاندا پەرستشن.

هەشتەم: ئەو مافەی کە خۆڕسکە و پەیوەندی نییە، بە پەیمانێکەوە کە لە ئەستۆی
کەسی موکەللەفدا بێت، تا ئەنجامی بدات و، بە هۆیەوە گوێڕایەڵی خودا بکات، و بەڵکو ئەم
مافە خۆی لە خۆیدا واجب بووە، و لە سەرەتاوە پەروەردگار خۆی داناوە، وەك پێنجیەك
لەسەر دەسکەوتی جەنگ (غنيمة)دا، و هەروەها دانی ئەو بڕە لە کاتی دەرهێنانی کانزاکانی
ژێر زەوی.

---

[1] تيسير الوصول إلى جامع الأصول من حديث الرسول، ب٢، ل١٤.

## ٧٤- مافی بەندە ( حق العبد ):

مافی تەواو تایبەتی بەندە ئەو بەرژەوەندییە تایبەتەیە کە دانراوە بۆ کەسێك بە تایبەتی، وەك مافە داراییەکانی هەموو تاکێك، وەك بـژاردنی شتێك کـە خراپـی دەکـەیت، و دانـەوەی قەرزو دانی خوێنی کوشتن، و هتد... ئەم جۆرە مافانە لە چەسپاندنیدا خودی کەسەکە سەر پشکە، لەوەیدا کە دەتوانێت جێ بەجێی بکات، و دەیشتوانێت، نـەیکات، چـونکە مـرۆڤ لـە مافی ڕوتو تەواوو یەکلایەنەی خۆیدا، ئازادە چۆن مامەڵە دەکات تیایدا.

٧٥- ئەو کارەی کە هەردوو مافی خوداو بەندەی تیادایە، بەڵام مافی خودا تیایدا زاڵترە، وەك ئەو سزایەی کە بۆ بوختانکار دانراوە،[1] جا بوختانکردن تاوانێکە، کـە شـەرەف لەکـەدار دەکـات، و خراپـەکاری لـەناو کۆمەڵگـەدا بـڵاو دەکاتـەوەو، لـە دانـانی ئـەم سـزایەدا، بەرژەوەندییەکی گشتی ڕەچاو کراوە، چونکە سەرکوتکردنی تاوانبارانو پاراسـتنی ناموسـی خەڵكو پاککردنەوەی کۆمەڵگەیە لە خراپەکاری، و بەم مانایـەیان ئـەم سزایە مـافی خـودای پەروەردگارە.

لە ڕەهەندێکی ترەوە، ئەم سزایە بەرژەوەندییەکی تایبەتی تیادایە، بۆ کەسی بوختان بـۆ کراو، چونکە شەرەفـو ناموسی لە تۆمەت پاك دەکاتەوەو، عەیبەی لەسەر لادەبـاتو، بۆیـە لەم سزایەداو، لەم ڕوانگەیەوە مافی بەندەی تیادایە، بەڵام مافی خوای گەورەتیایـدا زاڵترە، بۆیە بۆ کەسی بوختان کراو نییە، کـە ئـەم سـزایە لاببـات، بەسـەر بوختـان کـارەوە چـونکە مافی خودا، بەدەست بەندە لاناچێت، هەرچەندە هەرتەنها مـافی خـودای گـەورە نیـەو هـی مرۆڤیشی تێکەڵە، هەر وەك لە عیددەدا، بەتەها بڕیـاری پیـاو لاناچـێت، هـەر چـەندە تیایـدا مافی پیاوەکە هەیە، چونکە مافی حودایش تێکەڵە[2].

ئەو کارەی کە هەردوو مافی خوداو بەندەی تیادایە، بەلام مافی بەندە تیایدا زاڵترە، وەك کوشـتنەوەی کەسـێك کـە بەتایبـەت کەسـێکی تـری کوشـتبێت، چـونکە لـە کوشـتنەوەدا پاراستنی ئاسایشی گیانی خـەڵکی تیادایـە، و هـەروەها دەبێتـە هـۆی پاراسـتنی ئاسـایشو

---

١ القذف: بوختان، تۆمەتبار کردنی پیاو یـان ژنێکـە، بـەوەی کـە داوێـن پیـسی کردبێـت، وەك ئەوەی کە بەژنێك بڵێت، داوێن پیس.

[2] هەندێکی تر ڕایان وایە، کە لەپرسی بوختان کردندا مافی بەنـدە زیـاتر زاڵـەو، زۆر تـرەو ئـەوەی لـە کرۆکی ئەم باسەدا باسمان کرد، ئەوەیە کە ئێمەیش لە سەری دەڕۆینو هەڵمان بژاردووە.

بڵاوکردنەوەی ئاسودەیی‌و هێمنایەتی‌و، ئەمانەیش هەموو بەرژەوەندی گشتین‌و، بۆیە بە هۆی بەرژەوەندی گشتی بوونیانەوە، مافی خوای پەروەردگارن.

لە لایەکی ترەوە کوشتنەوە، بەرژەوەندییەکی تایبەتی بۆ تاکە کەسی تیادایە، کە دڵدانەوەی کەس‌و کاری کوژراوەکەیەو، لابردنی تورەیی‌و قینیانە لە بکوژەکە، و لەم ڕوانگەیشەوە مافی بەندەیە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم تاوانە زیاتر دەسبردنە بەتایبەتی بۆ کوژراوو کەسوکارەکەی تا بۆ کۆمەڵگە بە گشتی، بۆیە مافی بەندە تیایدا زاڵترە لە تۆڵە سەندنەوەکەدا، بۆیە خاوەن کوژراو مافی ئەوەی هەیە، کە لە بکوژ خۆش ببێت، یاخود بەیکوژێتەوەو، خوێنی لێ بسێنێت‌و، تەنانەت ئەگەر حوکمیش بدرێت، بەسەر بکوژدا، کە بکوژرێتەوە، ئەوا خاوەن (وەلی) کوژراوەکە دەتوانێت، بیبەخشێت‌و، جێ بەجێ کردنی سزاکە ڕابگرێت.

جا لەبەر ئەوەی کە لە کوشتنەوەدا مافی خودای مەزنیش تیایدا هەیە، کاتێک کە بکوژ بەهۆی لێخۆش بوونی خاوەن کوژراو ڕزگاری بوو، لە تۆڵە سەندنەوە، ئەوا دەوڵەت بۆی هەیە، کە سزای تەمێ کردنی لەسەر جێ بەجێ بکات [1].

ڕەوگەی شەریعەت، لە پرسی تاوانی کوشتندا لە ڕەوگەی یاسا مرۆڤکردەکان جودایە، چونکە یاسا مرۆڤکردەکان کوشتنەوەی بکوژیان، بە مافێکی تەواوی کۆمەڵگە زانیوەو، بۆیە پێیان وایە. کە بەرزکردنەوەی داوا، لەم پرسەدا کاری داواکاری گشتی یەو، باوک یان کەسی یەکەمی کوژراو (ولي) بۆی نییە، لە تاوانبارەکە خۆش ببێت، بەڵکو لێخۆشبون دراوەتە دەست دەسەڵاتداری وەخت.

هەروەک ڕەوگەی شەریعەت، لە پرسی تاوانی داوێن پیسیدا جیایە لە ڕەوگەی یاسا مرۆڤکردەکان لەم پرسەدا، چونکە داوێن پیس لەلای یاسا مرۆڤ کردەکان (القوانین الوضعيّة)، تاوان نییە، مەگەر بەزۆر ئەنجام بدرێت، یاخود داوێن پیسی لە گەڵ کراو ناتەواو بێت، یان بکەرەکە لە کەسانی نزیک‌و پشتی تاوان لە گەڵکراو بێت، بۆیە داوێن پیسی لە یاسای وەضعیدا، و لە خودی خۆیدا بە تاوان دانەنراوە، تەنها لە کاتێکدا نەبێت، کە

---

١ سزای تەمێ کردن، وەک مالیکی یەکان وتویانە، ئەوەیە کە ئەگەر خاوەنی‌و کەسی یەکەمی کوژراو لە بکوژ خۆش بوون،ئەوا دەسەڵاتداری سەردەم سەد شەلاقی لێ دەدات‌و، ساڵێکیش زیندانی دەکات، (تبصرة الحكام)، لأبن فرحون المالكي، ب٢، ل٢٥٩.

بەسترابێت بە شتی ترەوە، بەڵام داوێن پیسی کردنی ژنی مێردداری لەم یاسا دەستکردانەدا بەتاوان دانراوە، چونکە مافی پیاوی تیادا زەوت کراوە، و بۆیە سزادان تیایدا، سەر بەمافی تایبەتو تاکە کەسە کە مێردەکەیە، بۆیە تەنها لەلای مێردەکەیەوە دەکرێت، کە داوای لەسەر تۆمار بکرێتو، هەر کاتیش حوکمەکە لەسەر ژنەکە دەرچوو، هەر مێردەکە دەتوانێت جێ بەجێ کرنی ڕا بگرێت[1].

بەڵام لەم پرسەدا شەریعەتی ئیسلام ڕەوگەیەکی تری گرتۆتە بەرو سزای داوێن پیسی بە مافێکی تەواو ڕونو یەکلایی خوای پەروەردگار زانیوە، واتە مافی کۆمەڵگەیەو، مافی تایبەتی تیادا نییە بۆیە مافی زیناو، سزاکەی بە کەس لاناچێت، هەروەك بەڵێ بەرزکردنەوەی سکاڵاو داوا لەم پرسەدا، لە لایەن داواکاری گشتی یەوە دەبێت، بەڵام هەمووتاکە کە سێك دەتوانێت، لە سەر ئەم تاوانە داوا لە دادگادا تۆمار بکات، چونکە ئەم تاوانە، سەر بەو پرسە پەیوەندیدارانەیە کە پەیوەندی و کۆنتاکتی بەسودی گشتی کۆمەڵگەو خەڵکەوە هەیە.

---

١ سەیری ماددەکانی (٢٣٢-٢٤٠) لە یاساکانی سزادانی کۆنی بەغداد بکەو، هەروەها یاسای سزادانی نوێی عێراقی، ژمارە (١١١)،ی ساڵی (١٩٦٩) هەمان شتی دوبارە کردۆتەوە.

# ﴿بەشی چوارەم﴾

## ( حوکم بەسەردا دراو: الـمحکوم علیه )

٧٧- المحکوم علیه: ئەو کەسەیە، کە فەرمایشتی شەرع ڕوو بەڕووی کردەوەی ئەو کەسە کراوەتەوە، و زانایانی زانستی ئوصوڵی فیقهـ بە (المکلف) ناو زەدیان کردووە[١].

٧٨- مەرجەکانی دروستی ئەو تەکلیفەی کە دەخرێتە سەرشان:

چەند شتێك بە مەرج گیراون کە دەبێت لەو مرۆڤەدا هەبن، کە تەکلیفەکەی خراوەتە سەرشان، لە لایەن شەرعەوە، یەکێك لەو مەرجانە ئەوەیە کە دەبێت، (بە خۆی یان بەهۆی ئامرازو هۆیەکەوە) لە توانایدا هەبێت، کە لەو تەکلیفە تێ بگات، کە ئاڕاستەی کراوەو، ماناکەیی لا وێنا ببێت، بە گوێرەی ئەو ئەندازەیەی کە داوای لێکراوە، پێوەی پابەند بێتو، گوێڕایەڵی پەروەردگاری مەزنی تیادا بکات، چونکە مەبەست لە تەکلیف کردن بە کردنی هەر کارێك، گوێڕایەڵی کردن و پابەندبوونە بە فەرمانەکانی پەروەردگاری مەزنەوە، و بۆیە هەرکەس توانای تێگەیشتنی نەبێت، بێگومان توانای گوێڕایەڵیشی نابێت.

توانای تێگەیشتن بە هۆی عەقڵەوە دەبێت، و دەبێت فەرمایشتەکەی شەرعیش بە جۆرێك بێت، کە لێ تێگەیشتنی ئاسان بێتو بزانرێت مەبەستی چییە؟ و لەبەر ئەوەی کە عەقڵ شتێکی ناوەکیو نادیارەو، بەهەست پەی نابرێت پێیو، سنورو چوارچێوەی نییەو، لە ژێر کۆنترۆڵدا نییە و لە مرۆڤێکەوە بۆ مرۆڤێکی تر جیاوازە، بۆیە شەرع تەمەنو ئاستی باڵغ بوونی کردۆتە مەرج بۆ تەکلیف کردن، چونکە باڵغ بوون ئاشکرایەو، سنوروو چوار چێوەی هەیەو، تا ئاستێك عەقڵ کۆنترۆڵ دەکاتو، عەقڵ دوای باڵغ بوون زیاتر میوانەو، هەیە بۆیە شەرع باڵغ بوونی مرۆڤی کردۆتە مەرجی تەکلیف، چونکە عەقڵ دەرکەوتووەو، پێش ئەو تەمەنە، لە بەر ئەوەی کە کەم عەقڵە، تەکلیفی لەسەر دانەناوە، بەڵگەیش لەسەر ئەمە ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەرە(ﷺ)، کە دەفەرموێت: (رفع القلم عن ثلاثة، عن النائم حتى يستيقظ وعن الصبي حتى يحتلم، وعن المجنون حتى يفيق) واتە: خودا تەکیلفی لەسەر سێ حاڵەتو گروپ لابردووە، لەسەر خەوتوو، تا بەخەبەر دێتو، لەسەر منداڵ تا باڵغ دەبێتو،

---

١ تیسر التحریر، ب٢، ل٣٩٥، لێرەدا مانای (مکلف) ڕوون دەبێتەوە، کە زۆر جار نەمکردۆتە کوردی، چونکە زیاتر بەمانای عەرەبییەکەی دەفامرێتەوە، کە مەبەست پێی کەسێکە ئەرکی شەرعی کەوتبێتە سەر.

لەسەر شێت تـا چـاك دەبێتـەوە، و لـە گێڕانەوەیـەكی تـردا هـاتووە، (حتـی یعقـل)[1]، واتـە: تەكلیفی لەسەر منداڵ دانەناوە، تا عەقڵ پەیدا دەكات، جـا كـەمرۆڤ گەیـشتە قۆنـاغی بـاڵغ بوونو، گوفتارو كرداری ئاسایی بوونەوەو، ژیرانە لە ناو خەڵكدا مامەڵەی كرد، ئەمە بەڵگەیە لەسەر تەندروستی عەقڵی ئەو كەسە، بۆیە حوكم دەدرێت بەسـەریدا كـە تـەكلیفی لەسـەرە، چونكە یەكێك لە مەرجـەكانی تـەكلیف، كـە بـوونی عەقڵـە تیایـدا هاتۆتـەدی كەواتـە كەسـی موكەللەف، ئەو كەسەیە كە عەقڵی پەیدا كردووە.[2] و منداڵی عاقـڵ، یـان بـاڵغی غـەیرە عاقـڵ ناگرێتەوە.

لەم ڕوانگەیەوە شێتو منداڵ تەكلیفیان لەسەر نییە، چونیەكە شت بزانن و لەیەكتری جیـا بكەنەوە، یان نا... بەڵام ئەوەی كەڕای جەماوەری زانایـانی لەسـەرە ئەوەیـە كـە لەسـامانو موڵكی شێتو منداڵ زەكات دەكەوێت، و ئـەوەیش كـە سـەرجەمی شـەرعزانەكانی لەسـەرە، ئەوەیە كە واجبە لەو موڵكـەی منـداڵو شـێت كـە هەیـەتی، پێداویـستییەكانی ژیـانی كەسـە نزیكەكانیانو ژنەكانیان، و هەروەها ئەو شتانەی كە بە دەستی ئەوان خراپ دەكرێتو لە ناو دەبرێت، دابین بكرێت، و ئەمەیش تەكلیف نییـە لەسـەر شـانی ئـەو منداڵـە یـان ئـەو شـێتە، بەڵكو تەكلیفە لەسەر شانی وەلیو چاودێرەكانیان كە لەسـامانەكەیان ئـەو مافانـە بدەنـەوەو سەرف بكەن[3]،و ئەم مافانەیش بۆیـە لەسـەریان واجـب كـراوە، چـونكە شـیاوی (أهلیـة) لـەو كەسە چاودێرانەدا هەیە تا ئەو مافەیان لەسەر واجـب كـراوە، هـەروەك دواتـر لـەم بارەیـەوە ڕوونكردنەوە دێت.

## ٧٩- ڕەخنەیەك لە مەرجی تەكلیف دانان:

گوتمان، مەرجی تەكلیف دانان لەسەر مـرۆڤ ئەوەیـە كـە ئـەو كەسـە توانـای تێگەیـشتنی هەبێت، لـەو فەرمایـشتە شـەرعییە، و ئـەو فەرمایـشتە شـایانی تێگەیـشتنو لێ حـاڵی بـوون بێتو، لە سەر ئەم مەرجە، ئەم ڕەخنە گەلە هەن:

**ڕەخنـەی یەكـەم:** تـەكلیف كـردن لـەو كەسـەی كـە لـە خیطـابـی شـەرعی تێناگـات، لـە شەریعەتی ئیسلامیدا هاتووە، وەك خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا

---

١ الأمدي ب١، ل٢١٦،و (إرشاد الفحول)ـی، شەوكانی، ل١١.

[2] باڵغ بوون بەهۆی نیشانەو خەسڵەتەكانییەوە دەردەكەوێت، بۆیە ئەگەر نیشانەكانی تیادا نـەبوون، ئـەوا بەتەمەن دیاری دەكرێت، كە زۆرینەی شەرعزانان بە (١٥)ساڵی بۆ كوڕو كچ دایان ناوە.

[3] الأمدي ب١، ل٢١٧ و (المستصفی)ـی، ئیمامی غەزالـی، ب١، ل٥٤.

﴿تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ﴾[1].واته: ئەی باوەڕداران بەسەر خۆشی نوێژ مەکەن، با بزانن لە نوێژەکەدا چی دەبێژن! مانای ئەم ئایەتە پیرۆزە ئەوەیە کە کاتێك سەر خۆش بوون نزیکی نوێژ مەکەونەوە، واتە مەیکەن، بۆیە سەرخۆش لە کاتی سەرخۆشیدا موکەللەفن بەوەی کە دەست لە نوێژ هەڵبگرن، چونکە لەو کاتو حاڵەدا لە خیطابەکەی شەرع تێناگەن، دەی ئیتر چۆن دەگوترێت کە مەرجی تەکلیف کردن ئەوەیە کە توانای تێگەیشتنو حاڵی بوونی لە خیطابی شەرع هەبێت؟! وەڵاممان لەسەر ئەمە ئەوەیە کە ئەم خیطابە لەم ئایەتەدا ڕووبەڕووی سەرخۆشەکان نەکراوە، لەکاتی سەرخۆشیدا بەڵکو ڕووبەڕووی موسڵمانان کراوەتەوە، لە کاتی ئاسایی خۆیاندا، کە لە کاتی نزیکی کاتی نوێژەکاندا ئارەق نەخۆنەوە، تا نوێژەکەیان بە سەرخۆشی نەکەنو، تا بتوانن نوێژ وەك خۆیو وەك پێویست ئەنجام بدەن.[2]

شایەنی باسە کە ئەم ئایەتە پێش حەرامبوونی ئارەق هاتۆتە خوارەوە، واتە پێش ئەم ئایەتە کە بە تەواوی حەرامی کرد، کە دەفەرمووێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ٩٠﴾.[3]

**ڕەخنەی دووەم:** شەریعەتی ئیسلام، بۆ سەرجەمی مرۆڤایەتیە بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا﴾[4]، واتە: تۆ ئەی موحەممەد بڵێ: بە خەڵکی، کە من نێردراوی خودام، بۆ هەمووتانو هەروەها دەفەرمووێت: ﴿وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا﴾[5] واتە: موحەممەدمان (ﷺ) بە موژدەدەرو ترسێنەر ناردووە، بۆ سەرجەمی خەڵکی، هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: ((كان النبي يبعث الى قومه خاصة، وبعثت الى الناس عامة)) واتە: پەیامبەری وا هەبووە کە تایبەت بۆ هۆزەکەی خۆی نێردراوە، بەڵام من بۆ سەرجەمی خەڵکی ڕەوانە کراومو، بێگومان لەناو خەڵکدا کەسانی غەیرە عەرەب هەن، کە لە زمانی عەرەبی تێناگەن، کە زمانی قورئان، و بەمەیش بێت، لە خیطابی شەرع، تێناگەن، چونکە قورئان فەرمایشت و خیطابی شەرعە،

---

١ النساء (٤٣).

٢ تيسير الحرير، ب٢، ل٤٠١ــ٤٠٣، فوادع الرحموت بشرح مسلم الثبوت، ب١، ل ١٤٥ــ١٤٦، إرشاد الفحول، ل ١٠.

٣ المائدة (٩٠).

٤ الاعراف (١٥٨).

٥ سبأ (٢٨).

دەی ئیتر کەواتە چۆن خیطابی شەرع بەزمانی عەرەبی ئاراستەی کە سانێك دەکرێت، کە لێی تێناگەن‌و، موکەللەفیشن لێی‌و، بەر پرسیارن لە سەری؟و ئایا ئەمە دژو پێکدادانە لە گەڵ مەرجی تەکلیف؟ کە توانا بوونە لەسەر تێگەیشتنی خیطابی شەرع؟!

وەڵامی ئەمەیش ئەوەیە کە بێگومان توانا بوون بە تێگەیشتنی فەرمایشتی شەرع مەرجێکی حاشا هەڵنەگرە، بۆ دروستی ئەو تەکلیفەی دانراوەو، کامڵ کردنی، بۆیە ئەوانەی کە عەرەبی نازانن، بەپێی شەرع نابێت تەکلیفیان بخرێتە سەر، تا کاتێك کە توانای تێگەیشتنیان دەبێت لەو خیطابو فەرمایشتەی شەرعە، و ئەمەیش یان بەفێربوونی قورئان دەبێت، یان بەوەرگێڕان‌و ماناکردنی دەقە شەرعییەکان دەبێت، بۆ زمانەکەیان، یاخود بە فێرکردنی مسوڵمانانە بەزمانەکانی تری غەیرە عەرەبی‌و، دواتر هەڵسانیان بە بڵاو کردنەوەی زانیاری‌و یاساکانی ئیسلام لە ناو ئەو خەڵکە غەیرە عەرەبانەداو، بەزمانە بیانییەکەی خۆیان.

ڕێگای کۆتایی‌و، شیاو ترو باشتر لەم بارەیەوە ئەوەیە کە واجبی کیفایەیە لەسەر مسوڵمانان، واتە: هەندێکیان دەبێت پێی هەڵسن، ئەوەیە کە گروپێك لە مسوڵمانان خۆیان فێری زمانی گەلانی غەیری عەرەب بکەن‌و، هەستن بە بڵاوکردنەوەی شەریعەتی ئیسلام تیایانداو، هەر بەو زمانەی ئەوان قسەی پێ دەکەن، ئەحکامەکانی شەریعەتیان پێ ڕابگەیەنن، ئەگەر مسوڵمانان لەم واجبەدا خەمساردی بکەن، ئەوا هەموویان تاوان بار دەبن، هەروەك لەسەر جەم فەرزە کیفایەکاندا وایەو، خەمساردی هەموویان، تاوانبارکردنی هەموویانی لە دوایەو، بەڵگەیش لەسەر واجبی ئەم ئەرکە لەسەر مسوڵمانان ئەمانەی لای خوارەوەن:

أ- ئایەتی ﴿وَلۡتَكُن مِّنكُمۡ أُمَّةٞ يَدۡعُونَ إِلَى ٱلۡخَيۡرِ وَيَأۡمُرُونَ بِٱلۡمَعۡرُوفِ وَيَنۡهَوۡنَ عَنِ ٱلۡمُنكَرِۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُفۡلِحُونَ ١٠٤﴾[1] واتە: با گروپێك لە مسوڵمانان، هەڵسن بە ئەرکی بانگکردنی خەڵکی بۆ چاکەکاری و پرۆسەی فەرمانکردن بە چاکەو ڕێگری کردن لە خراپە، و هەر ئەوانەیش سەرفرازن، ئەم ئایەتە هەڵگری ئەو مانایەیە کە فەرمانکردن بە ڕاگەیاندنی ئەحکامەکانی شەریعەت لە لایەن گروپو دەستەیەکی مسوڵمانانەوە فەرمانی پێکراوەو، ئەو ڕاگەیاندنانەیش بە هەند وەر ناگیرێت، تا کاتێك کە بە جۆرێك بێت، کە ئەو خەڵکە لێی تێبگەن، واتە: بەوزمانە بێت، کە پێی دەدوێن‌و ئاخافتن دەکەن.

---

[1] آل عمران (١٠٤).

ب- لە فەرموودەدا جێگیر بووە، کە پێغەمبەر (ﷺ) چەندەها نامەی بۆ کیسراو قەیسەرو، نەجاشیو موقەوقیسو هی تریش ناردووەو، داوای مسوڵمانبوونی لێکردوونو، ئەم نامەیەی بەکەسانێکدا بۆ ناردوون، کە زمانی ئەوانەیان زانیوە.

ج- پێغەمبەر (ﷺ) لە وتاری حەجی ماڵ ئاواییدا فەرمووی: (ألا هل بلغت؟ أللهم فاشهد، فليبلغ الشاهد منكم الغائب، فرُبَّ مبلِّغ أوعى من سامع) واتە: ئایا ئەم پەیامەم نەگەیاند؟ خودایە تۆ ئاگادار بە کە گەیاندم! و با ئەو کەسەی لێرە شایەتە بیگەیەنێت بەو کەسەی کە لێرە نییە، جا هەندێ پێ ڕاگەیەنراو هەیە، لە گوێگر وریاترەو تێگەیشتوترەو، لەم فەرمودەیەدا مەبەست لە (شاهد: شایەت) ئەو کەسەیە کە ئیسلامی ناسیوەو، لە یاساو کرۆکیو ئەحکامەکانی تێگەیشتووەو، (غائب: نەهاتوو)یش، ئەو کەسەیە کە زمانی عەرەبی نازانێتو لێی حاڵی نابێت، و هەروەها ئەو کەسەیشە کە عەرەبی دەزانێت، بەڵام هێشتا پەیامی ئیسلامی پێ نەگەیشتووە.

لەم ڕوانگەیەوە، ئەگەر کەسێك هەرمایەوە، کە زمانی عەرەبی نەدەزانیو، لە قورئان نەدەگەیشتو، دەقەکانی شەریعەت بەزمانی خۆی بۆ وەرنەدەگێڕدراو، مسوڵمانان هەڵ نەدەسان بەوەی کە ڕێو شوێنی تەکلیفی شەرعی بە زمانەکەی خۆی بۆ ڕوون بکەنەوەو، فێری بکەن، ئەوە ئەو کەسە بە پێی شەرع تەکلیفی لەسەر شان نییە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا يُكَلِّفُ ٱللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا﴾[1] واتە: خودا بەپێی توانا تەکلیف دەخاتە سەر شانی مرۆڤ.

**ڕەخنەی سێیەم:** لە قورئانی پیرۆزدا شت گەلێك هەن، کە تێگەیشتنیان بۆ نییە، کە ئەوەیش ئەو پیتە پچڕ پچڕانەن کە لە سەرەتای هەندێ لە سورەتەکانەوە هەن، دەی ئیتر چۆن دەگوترێت؟ لە قورئانو سوننەتدا شتی وا نییە، کە لێی تێنەگەین؟

لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین: ئەم پیتانە بەشێك نین لەو خیطابانەی کە تەکلیف دەخەنە سەر شانی مرۆڤ و بۆیە پرسی تەکلیف لە سەر ئەم پیتانە نەوەستاوە، ئەمە لە لایەکەوە و لە لایەکی تریشەوە، ئەم پیتانە مانایەکی ڕوون و دیارو ئاشکرایان هەیە، وەك پیتێك کە خۆی لەخۆیدا دەلالەتی لێ دەکاتو، بۆیە لە سەرەتای سورەتەکانەوە هێناویەتی، تا بیکاتە بەڵگە لەسەر ئەوانەی کە نکوڵی کارن، لە ئیعجازی ئەو قورئانەی کە لەو پیتانە پێکهاتووە!

---

١ البقرة: (٢٨٦).

## ﴿بەشی پێنجەم﴾
## ( الأهلية وعوارضها )

شیاوی مرۆڤ، بۆ ئەوەی کە تاچەند دەگونجێت، تەکلیفی بخرێتە سەر شانو، بەربەستو لەم پەرەکانی بەردەم ئەو شیابوونە

٨٠- ڕێخۆشکردن:

پێشتر باسمان کرد، مەرجی دروستی تەکلیف دانان لەسەر کەسێك ئەوەیە کە ئەوکەسە شیاوبێت. بۆ ئەوەی ئەو تەکلیفەی بخرێتە سەر شانو، شیاو بوونیش بە چەند شتێك دەچەسپێت، لە وانە گەیشتن بە پلەی عاقلی، بەلام زانایانی ئوصولٚ باس لە شیاوی (أهلية)و بەربەستەکانی بەردەمی (عوارضها) بە شێوەیەکی گشتی دەکەنو، ئێمەیش لێرەدا لەسەر ئەو ڕەوتەی ئەوان دەڕۆینو، یەکەم جار باس لە (أهلية: شیاوی) دەکەینو، دووەم جار دەچینە سەر باسی (عوارض: بەربەستەکانی بەردەمی)و ئەم باسەیشمان لە دوو بەشە باسی یەك لەدوای یەکدا هێناوە، یەکەم: باسی ئەهلیەتو شیاویو، دووەم: بەربەستەکانی بەردەم ئەهلیەت.

## ﴿بەشە باسی یەکەم﴾
## باسی ( الأهلية : شیاوی )

٨١- پێناسەی (الأهلية: شیاوی):

لە زمانی عەرەبیدا، بەمانای (الصلاحية : گونجان) هاتووە، کە دەگوترێت: فلان کەس شیاوو گونجاوە، بۆ فلان ئیش، ئەمە کاتێکە کە ئەو کەسە شیاوبێت، بۆ کردنی ئەو ئیشو کارە، و بگونجێت لە گەلێدا.

و لەزاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا، (الأهلية) دەبێتە دوو بەشەوە:-

١- أهلية الوجوب.

٢- أهلية الأداء.

٨٢- أهلية الوجوب: بریتییە لە گونجانو شیاوی مرۆڤ بۆ ئەوەی کە مافە شەرعیەکانی بۆ واجب بێتو، هەوەها مافە شەرعییەکانی بەسەردا واجب بکرێتو، جێ بەجێ بکرێت،[1]

---

١ شرح المنار، لأبن ملك و حاشية الرهاوي، ل٩٣٦.

واتە: گونجان‌و شیاوی مرۆڤ بۆ ئەوەی کە بتوانرێت مافەکانی بۆ بچەسپێنرێت‌و، هەروەها ئەو شتانەی کە واجبن بیانکات، جێ بەجێ کردنیانی بەسەر دا واجب بکرێت‌و، ئەم ئەهلیەتەیش بە (الذمة: پەیمانداری) دەبێت، واتە: ئەو ئەهلیەتە بۆ مرۆڤ دەچەسپێت، لەسەر بنەمای چەسپاندنی (الذمة) بۆی.

(الذمـة) لـە زمـانی عەرەبیـدا، بـەمانای (العهـد: پـەیمان) هـاتووە، وەك پـەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ لَا يَرْقُبُونَ فِي مُؤْمِنٍ إِلًّا وَلَا ذِمَّةً ﴾[1] واتە: لەگـەڵ هـیچ مـسوڵمانێکدا ڕەچـاوی خزمایەتی‌و هاوپەیمانی ناکەن‌و، ئەو نامسوڵمانانەی کە لـە (دار الأسـلام)دا، بـە بـەردەوامی نیشتەجێن، بە (أهلی ذیممە) ناوزەد کراون، بەهۆی ئەو پەیمانەی کە لە نێوان ئێمەو ئەواندا هەیە، و ئەهلی (الذمة)یش، واتـە: هاوپـەیمان، و (الذمـة) لـە زاراوەدا، وەصـفێکە کـە شـەرع دایناوە، بۆ تاکە کەس، تا بەهۆی ئەو وەصفەوە ببێتە شیاوو بگونجێت‌و ئەهل بێت، بۆ ئـەو کافانەی کە هەنی‌و بۆ ئەو مافانەی کە لە سەریەتی،[2] و بەم مانا زاراوەیش بێت، ئەم پەیامە بۆ هەموو مرۆڤێك چەسپاوە چونکە هەرکەسێك لـە دایك دەبێـت، پەیمانـدارەو، ئەهلیـەتی ئـەوەی هەیـە، تامافـەکانی بـۆ واجـب بکـرێن، و هـەروەها هەنـدێ مافیـشی لـە سـەر واجـب بکرێت[3].

لەسەر ئەم بنەمایە دەکرێت بگوترێت، کە بنەڕەتی چەسپاندنی ئەهلیـەت‌و شـیاوی واجـب بوونی مافەکان بۆ مرۆڤ بریتیە لە (ژیان)، چونکە بە هاتنە ژیانی مرۆڤ (الذمـة)و پـەیمانی بـۆ دەچەسپێت، و هەر لەسەربناغەی ژیان ئەهلیـەت‌و شـیاوی تاکـە کـەس بـۆ مافـە واجبـەکان دەچەسپێت‌و، هەر بۆیەش ئەهلیەت بۆ کۆرپەلـەیش چەسـپاوە، هەرچـەندە کـەم ئەنـدامیش بێت، چونکە ژیانی هەیەو، لە ژیاندایە و جـا لەبـەر ئـەوەی کـە ژیـانی مـرۆڤ بناغـەی جـێگیر بوون‌و چەسپاندنی ئەهلیەتە، تا مافەکانی بۆ واجب ببێت‌و، هەروەها لەسەری واجـب ببێـت، بۆیە ئەو پەیمانەی لە گەڵیدایە بەدرێژایی ژیان‌و، مردن لێی جیا نابێتەوە.[4]

---

١ التوبة (١٠).

٢ التوضیح، ب٢، ل١٦١.

٣ أصول البزدوي. ب٢، ل٢٥٧،و شرح النار، ل٩٣٨.

[4] هەندێ لە شەرعزانان پێیان وایە کە (ذمة)و پەیمانی مرۆڤـ، بە جۆرێك لە جۆرەکـانی دوای مـردنیش هەر بەردەوامە، هەروەك دواتر باسی لێوە دەکەین.

جا ئەهلیەتو واجب بوونی مافەکان، بەو مانایەی کە باسمان کرد، لە زاراوەی زانایانی ئوصولّدا، لە لای یاساناسان بە (الشخصية القانونية:کەسایەتی یاسایی) پێناسە کراوە، واتە: ئەو کەسە یاسا مافی کەسایەتی تەواوی تیادا دانابێت، و ئەم کەسایەتیو مافەیش لای یاساناسان بۆ هەموو مرۆڤێك چەسپاوەو، وا پێناسەیان کردووە، کە بریتییە لە گونجانی مرۆڤ بۆ ئەوەی کە ماف گەلێکی هەبنو، واجب گەلێکیشی لەسەر پێویست ببێت،[1] و ئەم پێناسەیەی یاساناسانیش هاوشێوەی پێناسەی زانایانی ئوصولّە بۆ ئەهلیەتی تاکەکەس، لە چەسپاندنی مافەکانیدا.

٨٣- أهلية الأداء: بریتین لە گونجانی مرۆڤ بۆ ئەوەی داوای جیّ بەجیّ کردن (أداء)ـی، واجباتەکانی لیّ بکرێت، و هەروەها شیاو بێت، بۆ ئەوەی کە گوفتارو کردارەکانی حسابیان بۆ بکرێتو، هەموو ڕێو شوێنێکی شەرعییان لەسەر بگیرێتە بەر، بە جۆرێك کە هەرکات هەڵسو کەوتێکی ئەنجامدا، لە ڕووی شەرعەوە بە ئەنجامدەر بۆی بێتە ئەژمارو، ڕێو شوێنی شەرعی بگیرێتە بەر لەسەریو هەرکات پەرستشێکی جیّ بەجیّ کرد، دەبێت ئەو جیّ بەجیّ کردنە دەردخواردوو بێتو، واجبەکەی لەسەر لاببات و، هەرکات تاوانی ئەنجامدا دژی خەڵکی تر، تۆڵەی تەواوی لە بەرامبەردا لیّ بکرێتەوەو لێی وەربگیرێتەوەو، لە ڕووی جەستەییو داراییەوە سزابدرێت،[2] و بنەماو بنەڕەتی ئەم ئەهلیەتو گونجاویو شیاوییە، بریتی یە لە قۆناغی ژیریو جیاکردنەوەی چاكو خراپ لە یەکتر (التمييز)، نەك ژیان و ڕوح لە لاشەدا بوون.

٨٤- شیاوی تەواوو ناتەواو، (الأهلية الكاملة والناقصة):

هەر یەکە لە ئەهلیەتی (واجب)و، ئەهلیەتی (أداء) کە باسمان کردن ناتەواونو، جاری وایش هەیە کە تەواون، بە ڕەچاو کردنی ئەو قۆناغەی کە مرۆڤ لە ژیانیدا پێیاندا تێپەڕ دەبێت، هەر لە دروست بوونیەوە، تا کامڵ بوونی عەقڵیو، تامردنیشو، ئەم قۆناغانەیش بریتین لە:

یەکەم: قۆناغی کۆرپەلە.

دووەم: قۆناغی هاتنە دنیا، تا کرانەوەی عەقڵیو، جیاکردنەوەی چاكو خراپ لە یەکتر.

---

[1] المدخل للقانون الخاص، للدكتور البدراوي، ل٥٨.

[2] شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٣٤، وأصول الفقه، للشيخ عبدالوهاب خلاف، ل١٥٠ .

**سێیەم: قۆناغی جیاکردنەوەی چاکو خراپ، تا باڵغ بوون.**

**چوارەم: قۆناغی دوای باڵغ بوون.**

**لە مەودوا دەربارەی ئەو جۆرە ئەهلیەتە قسە دەکەین، کە بۆ مرۆڤ دەچەسپێت، لە هەر لەو قۆناغانەیدا کە ئەژمارمان کردن.**

### ٨٥- قۆناغی یەکەم، قۆناغی کۆرپەلەیی:

کۆرپەلە لە سکی دایکیدا، وەك بەشێك لە دایکی سەیری دەکەین، کە دایك دانیشت، ئەویش دانیشتووە، کە دایکی جوڵا لە جێگایەکەوە بۆ جێگایەکی تر، ئەویش هەروەها دەجوڵێت، بۆیە حوکم دەدەین، بەوەی کە هێشتا (ذمة: پەیمان) ی بۆ نەچەسپاوەو، هەر بۆیەش ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکانیشی لەسەر نییەو، جاری واهەیە کە لەو ڕووەوە سەیری کۆرپەلە دەکەین، کە گیاندارێکی سەر بەخۆیەو، ژیانی جیایە، لە ژیانی دایکیو، هاکا لێی جودا بوویەوە، و بەدنیا هات، و بوویە مرۆڤێکی سەر بەخۆ و لەسەر پێی خۆی وەستا، و ئیتر لێرەدا حوکم دەدەین، بە چەسپاندنی (ذمة: پەیمان) بۆیو لێرە بەدواوە ئەهلیەتی واجب بوونی مافە کانیشی بۆ دەچەسپێنین.

ئەگەر سەرنجی ئەم دوو ئاراستەیە بدرێت، تێبینی ئەوە دەکرێت کە هێشتا هاوپەیمانی تەواو (الذمة کاملة)ی بۆ نەچەسپاوە، هەوەك بە موتڵەقیو ڕەهاییش ذیممەو پەیمانی لەسەر لانەچووەو، بەڵکو پەیمانی ناتەواو (ذمة ناقصة)ـی، بۆ چەسپاوە، کە دەتوانێت بە هۆی ئەو پەیمانە ناتەواوە هەندێ لە مافەکانی دەستە بەر بکاتو تەواو! بۆیە کۆرپەلە لە ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکانی هەیە، بەڵام بە ناتەواوی، کە هەندێ مافی هەن، دەبێت بۆی جێ بەجێ بکرێت، بەڵام مافی بە سەرەوە نین، بۆیە ئەو مافانەی بۆ جێگیر دەکرێن، کە لە چەسپاندنیاندا پێویستی بە ڕاوەرگرتنی ئەو ، (قبولـکردنیان) نییە، وەك میرات بردنو، وەسیەت جێ بەجێ کردن بۆیو، دانی مافەکانی لە پرسی وەقفدا کە جێگیرکردنی ئەو مافانە پێویستی بە قەبووڵکردن نییە، بەڵام ئەو مافانەی کە پێویستی بە (قبول)کردنی ئەو هەیە، وەك دیارییو خەڵات کردن، ئەمەیان جاریێ ناچەسپێت بۆی، هەرچەندە سودێکی تێرو تەواویشی هەبێت بۆی، چونکە ئەو خاوەنی ڕاو لێزانین نییە لەو قۆناغەداو، هەروەها سەر

پەرشتیارو بریکاریشی نییە، کە لەجیاتی ئەو(قبول) کردنە کە ئەنجام بدات[1]و، هیچ مافێکی لەسەر نییە، چونکە ئەهلیەتی ناتەواوە، وەك گوتمانو، هێشتا تەواو نەبووەو، دەبێت لێرەدا تێبینی ئەوە بکرێت، کە ئەهلیەتو شیاوی واجب بوونی مافەکان بۆ کۆرپەلە، بەو مەرجە دێتە دی، کە ئەو کۆرپەلەیە بەزندوویی بێتە دنیاوە.

بەڵام سەبارەت بە ئەهلیەتو شیاوی لە جێ بەجێ کردنی (أداء)ی واجبەکاندا، ئەمە بۆ کۆرپەلە نییە، چونکە بەهۆی نەتوانینو دەستەوسانیو بچوکییەوە چاوەڕێ ی ئەوەی لێ ناکرێت، کە هیچ جۆرە هەڵسو کەوتێك ئەنجام بدات، کە بێگومان بناغەو بنەڕەتی ئەهلیەت لەم قۆناغەدا، عەقڵەو، بێگومان هیچ جۆرە جیاکردنەوەیەکی نێوان چاكو خراپ، کە ئامرازەکەی عەقڵە لە لای کۆرپەلە بوونی نییە!

**٨٦- قۆناغی دووەم: قۆناغی جیابوونەوەی کۆرپەلە لە دایکیو، هاتنە دنیای، تا عەقڵ کردنەوەی:**

کۆرپەلە هەرکات بە زیندوویی لە دایکی جیابوو یەوەو بە دنیا هات، ئەوا پەیمان (ذمة)ی، تەواوی بۆ دەچەسپێت، بۆیە ئەهلیەتو شیاوی تەواویشی لەسەر واجب دەبێتو سەر جەم مافەکانی دەستە بەر دەبنو، مافیشی لەسەرنو، پێویستە سەرجەمی مافەکانی بەسەردا بچەسپێنرێن، هەروەك چۆن ئەو مافانەی بەسەر کەسێکی باڵغدا دەچەسپێن، چونکە ئەو کەسە باڵغە خاوەنی پەیمانی تەواو (الذمة الكاملة)و چەسپاندنی ئەهلیەتی تەواوە بۆیە بۆ منداڵەکەیش هەروایە، بەڵام واجب بوونی مافەکان بۆ هەرکەسێكو، مرۆڤێك، لەبەر خودی واجبەکە نییە، بەڵکو مەبەست لەو واجب بوونە، حوکمەکەیەتی، کە بریتییە لە جێ بەجێ کردنەکەی (الأداء)، جا هەر مافێك کە بۆ منداڵ بگونجێت، بیکات، ئەوا لە سەریەتی کە

[1] ئەوەی کە جەماوەری شەرعزانانی لەسەرە، ئەوەیە کە کۆرپەلە نە سەرپەرشتیاری هەیەو، نە بریکار (وصي)و، تەنها ئەوە دروستە کە ئەمینداڕێکی بۆ دابنرێت، کە سامانەکەی بپارێزێتو، ئەو یاسایەی کە ئێستا لە وڵاتی میسر کاری پێدەکرێت، ئەوەیە کە کۆرپەلە لە بریکاری (وصي) هەیەو، هەر سەرپەرشتیارێك بەسەر منداڵانەوە چ مافێکی هەبێت، ئەم وەصیەی ئەمیش ئەو مافەی هەیەو، لە یاسای سەرپەرشتیاریماڵیدا ژمارە ١١٩ی ساڵی ١٩٥٢هاتووە، کە دەڵێت: ماددەی ٢٨: دروستە بۆ باوك، کە بریکارێك دابنێت بۆ منداڵ کەم ئەندامەکەی یان بۆ ئافرەتێکی سکپڕی لا نەواز ، ماددەی ٢٩: ئەگەر ئەو منداڵە کەم ئەندامە، یان ئەو ژنە سکپڕە لانەوازە وەصیو بریکاری بۆ دانەنرا، ئەوا دادگا بریکاری بۆ دیاری دەکات.

بیکاتو ئەنجامی بدات، بەڵام ئەوەی کە لە توانایدا نییە، بیکات، ئەوا لە سەری واجب نیە، وەك لەم درێژە باسەی خوارەوەدا شی دەکەینەوە:

یەکەم: مافی بەندەکان، ئەوانەی کە مافی دارایین، وەك بژاردنی شتێك کە خراپی دەکەیت، یاخود دانی مافی کرێکار، یان پڕکردنەوەی پێداویستیکانی ژنو کەسە نزیکەکانو هتد.... ئەم مافانە واجبن لەسەر منداڵیش، چونکە مەبەستو ئامانج تیایاندا موڵكو سامانەکەیەو، دەکرێت کەسێك وەك بریکاری ئەو منداڵە کارەکەو بەخشینەکە جێ بەجێ بکاتو، بەڵام ئەو مافانەی بەندەکان کە پەیوەستن بەسزاکانەوە، وەك کوشتنەوە، ئەمە لەسەر منداڵ واجب نییە، چونکە ناگونجێتو شیاو نییە بۆ ئەو حوکمە، کە سزادانییەتی چونکە کارو کردەوەی منداڵ، بە کەم کورتی وەصف ناکرێتو نایەتە ئەژمارو، بۆیە نابێتە فاکتەر بۆ سزادانی، چونکە مانای تاوان لە کردەوەی منداڵدا بەر جەستە نابێت، هەروەك ئەم مافە لە لایەن بریکارەوە ناکرێت جێ بەجێ بکرێت، بۆیە دروست نییە، کە سەرپەرشتیار (ولي) سزا بدرێت لە جیاتی بڕیاردەری بریکارە کە (وەصي)و ئەمە بەپێچەوانەی خوێن دانەکەیە، چونکە ئەم پارە دانە واجبە، چونکە پاراستنی پرۆسەکەی تێدایە، و منداڵ بوون لە گەڵ پاراستنی گیانی خەڵك پێچەوانە و دژ نین، و مەبەست لە واجبی دانی ئەو خوێنە، بڕە پارەکەیە، یان موڵکێکەو دەکرێت موڵكو پارەیش بریکار هەڵسێت بە دانو جێ بەجێ کردنی.

دووەم: مافی خوای پەروەردگار، هەیانە کە بناغەی پەرستشەکانە، کە ئەویش باوەڕ (إيمان)ـە، و هەیانە پەرستشی پوختو تەواوەو، ئەمەیش یان پەرستشی لاشەیی یە، و بەس، وەك، نوێژ کردن، یان پەرستشی داراییو بەس، وەك زەکاتدان یاخود هاوبەشە لە نێوان پەرستشی جەستەییوماڵی، وەك حەج کردن، ئەمانە هیچ کام لەسەر منداڵ واجب نین، هەر چەندە کە هۆکاری ئەم مافانەیش هاتبێتەدیو، هەروەها کاتو جێگای ڕەخساندن هەبێتو، پەیمانێکی گونجاو لەسەر ئەو منداڵە هەبێت، چونکە حوکمی واجب بوون لەم مافانەدا، بریتی یە لە جێ بەجێ کردنیان ڕاستەو خۆو بە پراکتیکی لە لایەن ئەو کەسەوە کە کارەکەی لەسەر واجبەو، دەبێت خۆی بیکات، بەئازادیو سەرپشکی تەواو نەك بریکارەکەی بە تۆبزی بۆی بکات، تامانای تاقیکردنەوەی ئەو مرۆڤە لەم پرۆسەیەدا بفامرێتەوەو جێ بەجێ ببێتو، بەخۆی تاقی بکرێتەوە و لەسەر کارەکەیشی پاداشت

وەربگرێتو، بێگومان منداڵ شیاو نییە، بۆ ئەم حاڵەی کە باسکرا[1] ، وە مافی خوای مەزن هەن، کە پەیوەندیدارن، بەسزاکانەوە، وەك ئەو سزایانە (حدود) کە دانراون بۆ تاوانەکان و بێگومان لەسەر منداڵ جێ بە جێ ناکرێن، هەر وەك ئەو سزایانەیش نایگرێتەوە، کە وەك سزا لەسەر پێشێل کردنی مافەکانی بەندەکان کردوویەتی، وەك کوشتنەوە، چونکە حوکمە کە نایگرێتەوە، کە سزادانیەتیو، لەم کارەیشدا دیسان بریکار ناتوانێت لە جیاتی ئەو سزاکە وەربگرێت[2]، بەڵام سەبارەت بە شیاوی ئەهلیەتی کەسێك بۆ جێ بەجێ کردن (أداء)ـی. مافەکان، ئەمەیان سەبارەت بەمنداڵ هیچ جۆرێك لە ئارادا نییە، چونکە قۆناغەکەی نەشیاوو نەگەنجاوە، بۆ ئەم کارەو، چاكو خراپ لێك جیا ناکاتەوەو، بۆیە ناتوانێت خۆی مافەکان جێ بەجێ (أداء) بکات، و بێگومان عەقڵ کرانەوەو جودا کردنەوەی چاكو خراپ لە یەکتری، وەك گوتمان بناغەی ئەهلیەتو گونجاوی تاکە کەسە بۆ توانابوونی بە جێ بەجێ کردن (أداء)ـی، مافە کان، بۆیە داوا لە منداڵ نەکراوە، کە خۆی بەخۆی هەرشتێك جێ بەجێ بکاتو، ئەوەی کە لەسەری واجب بووە، لە مافەکان بەهۆی ئەوەوە کە ئەهلیەتو شیاوی واجب بوونی لە سەرە، ئەمەیان سەرپەرشتیارەکەی بۆی دەکات، لە هەر شتێکدا کە بگونجێت، سەر پەرشتیار لە جیاتی خۆی بۆ بکات، نەك خۆی!

لە بەر ئەوەی کە منداڵ ئەهلیەتی (أداء)ـی، نییە، بۆیە هیچ ڕێو شوێنێکی لەسەر قسەو هەڵسو کەوتەکانی ناگیرێتە بەر، بۆیە گرێبەستو هەڵسو کەوتە زارەکییەکانی بەتاڵنو. کاریان پێ ناکرێتو، هەر ئەمەیش یاسای مەدەنی عێراقیو میسری چەسپاندوویەتیو، دانی

---

[1] التلويح على التوضيح، ب٢، ل١٦٣و، دەربارەی واجبی زەکات لەسەر منداڵ، لە نێوان شەرع زانانـدا جیایی هەیەو، ئەوانەیان کە بە واجبیان زانیوە، بەو پێودانگە دایانناوە، کەمافێکی پێویستیە لەسەر دەوڵەمەندەکان کە دەبێت بیدەن بە هەژارەکانو، ئەم مانایەش پەیوەندی بە منداڵ بوون، یان باڵغ بوونەوە نییەو، ئەو گروپەی کە دانی زەکاتەکە یان بە واجب نەزانیوە، بەو پێودانگە بووە، کە وەك پەرستشی وەك نوێژو ڕۆژو ئەژماریان کردووەو، بێگومان لە پەرستشدا بەمەرج گیراوە کە دەبێت باڵغ بوبێت، چونکە پەرستش تاقیکردنەوەیەو، بێگومان منداڵیش بۆ تاقیکردنەوە ناشێت، لەبەر کەم عەقڵییەکەی، بڕوانە بداية المجتهد.ب١، ل٢٢٠.

[2] كشف الأسرار، ب٤، ل١٣٦٢.

بوون.[1]

٨٧– قۆناغی سێیەم: قۆناغی جیاکردنەوەی چاك‌و خراپ لە یەکتری، تا قۆناغی باڵغ بوون:

ئەم قۆناغە بەگەیشتنی منداڵ بە تەمەنی حەوت ساڵان دەست پێدەکات‌و، بە قۆناغی باڵغ بوون کۆتایی دێت، لەم قۆناغەدا ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکان بە تەواوی لەسەر مرۆڤ دەچەسپێت، چونکە بۆ منداڵی جیاکەرەوەی چاك‌و خراپ لە یەکتر (ممیّز) زۆر باشتر دەچەسپێت، بۆیە مافەکانی جێگیر دەبن، هەروەها مافیشی لەسەر جێبەجێ دەکرێت، بەو شێوازەی کە بە درێژی باسمان کرد، سەبارەت بە منداڵی بچووکی جیانەکەرەوەی چاك‌و خراپ، کاتێك کە باسی قۆناغی دووەممان کرد، واتە قۆناغی لەدایك بوون تا قۆناغی ژیری‌و جیاکردنەوەی چاك‌و خراپ لە یەکتری. بەڵام سەبارەت بە شیاوی‌و ئەهلیەتی تاکە کەس، بۆ جێبەجێ کردن (أداء)ـی، مافەکان، ئەمەیان بۆ منداڵی لەم قۆناغەدا دەچەسپێت، بەڵام بە تەواوی، چونکە عەقڵیشی ناتەواوە‌و لەم قۆناغی ئەهلیەتی ناتەواوەدا، هەر کات هەندی شتی جێبەجێ کرد، ئەوا بۆی دروستە‌و لێی وەردەگیرێت، بەڵام لەسەری واجب نیە، وەك ئیمان‌و پەرستشە جەستەییەکانی تر، چونکە لەمانەدا سودی تێرو تەواوی تیادایە، بۆ خودی منداڵەکە.

بەڵام سەبارەت بە مامەڵە داراییەکانی، ئەم درێژەباسەی خوارەوە ڕاڤەی پرسەکە دەکات:

١ـ ئەو مامەڵانەی کە سوودی تەواویان بۆ منداڵەکە هەیە، وەك وەرگرتنی دیاری‌و خێرو شتی وەسیەت‌و، ئەم مامەڵە‌و هەڵسوکەوتانە بۆ منداڵ دروستە‌و، پێویست بە سەرپەرشتیار یان منداڵەکە خۆی ناکات، چونکە دروستی ئەم جۆرە مامەڵانە، ئەگەر منداڵ کردنی، دەگونجێت، چونکە ئەهلیەتی ناتەواوی لەم قۆناغەدا هەر هەیە، لە دروستیشدا بەرژەوەندییەکی ئاشکرا هەیە‌و، ئێمەش فەرمانمان پێکراوە کە ڕەچاوی بەرژەوەندی

[1] ماددەی ٩٦ی یاسای مەدەنی عێرقی، ژمارە ٤٠ی ساڵی ١٩٥١ دەڵێت، هەڵسووکەوت‌و مامەڵەی منداڵی ناژیرو جیانەکەرەوەی چاك‌و خراپ لە یەکتر بەتاڵە، هەر چەندە سەرپەرشتیارەکەیشی مۆڵەتی پێدا بێت، و ماددەی ١١٠ لە یاسای مەدەنی میسری ژمارە ١٣١ی ساڵی ١٩٤٨ دەڵێت: منداڵی بچوکی جیانەکەرەوەی چاك‌و خراپ مافی ئەوەی نییە کە مامەڵە بە دارایی خۆیەوە بکات، و هەموو هەڵسوکەوت‌و مامەڵەیەکی بەتاڵە.

منداڵەکە بکەین، هەر کات توانیمان، بۆیە لێرەدا کە دەتوانین، کەواتە دروستە ڕەچاوی بکەین.

٢ـ ئەو مامەڵانەی کە زیانی تەواو بە منداڵەکە دەگەیەنن، ئەویش وەك ئەو مامەڵانەی کە بەشێك لە دارایی منداڵەکە بێ بەرامبەر خەرج بکرێت، وەك ئەوەی کە بکرێت بە دیاری، یان بکرێك بە وەقفو هتد... ئەم هەڵسوکەوتو مامەڵانە بۆ منداڵ دروست نین‌و، بەڵکو هەر ناگیرسێن‌و بەتاڵن، تەنانەت سەرپەرشتیارو ڕاسپێردراو بۆیان نیە، کە بە بیانووی مۆڵەت وەرگرتن، بە دروستی دابنێن، چونکە ئەوان لە ڕاستیدا خاوەنی موڵکەکە نین، بۆیە مافی مۆڵەتیشیان لەم بوارەدا نیە، چونکە سەرپەرشتیاری (الولاية) لەسەر ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی منداڵەکە وەستاوەو، دەبێت وەك منداڵ تەماشا بکرێت، ئەو هەڵسوکەوتانەی کە زیانی پێ دەگەیەنن، ئەمە چاودێری کردن نیە، ئەگەر منداڵەکەیش مۆڵەت بدات، هەر ناکرێت، چونکە زیانی وی تیادایە.

٣ـ ئەو مامەڵەو هەڵسوکەوتانەی کە ڕەهەندی چاك‌و خراپیشیان هەیە، بەپێی بنەڕەتی دانانەکەیان، وەك کڕین‌و فرۆشتن‌و بەکرێدان‌و، دیکەی ماڵگۆڕکێکانی تر،[١] ئەم هەڵسوکەوت‌و مامەڵانە بۆیان هەیە، قازانج بکەن، هەروەها دەگونجێت زیانیش بکەن، بۆیە ئەگەر منداڵی ژیر توخنیان کەوت دروستە، لەسەر بنەمای ئەوەی کە ئەهلیەتی جێبەجێ کردن (أداء)ـی، هەیە، بەڵام لە لایەکی ترەوە لەسەر، مۆڵەتی سەرپەرشتیار (إجازة الولي) وەستاوە، چونکە ئەهلیەتەکەی ناتەواوەو نوقسانە، بۆیە کە سەرپەرشتیار مۆڵەتی پێدا، ئیتر ئەم مۆڵەتدانە، ئەو ناتەواویە پڕ دەکاتەوە، مامەڵەکەی وەك مامەڵەی کەسێکی خاوەن ئەهلییەتی کامڵ تەماشا دەکرێت.

ئەم حوکمانەی کە باسمان کردن، سەبارەت بە مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانی منداڵ‌و، ئاستی

---

١ لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت کە ئەوەی ڕەچاوکراوە، لەم هەڵسوکەوتەیدا کە ڕەهەندی سودو زیانیشی هەیە، ئەوەیە کە شێوازی هەڵسوکەوتەکەو سروشتەکەی دیاری دەکات، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی کە ئایا ئەو کردەوەیەی کە منداڵەکە کردوویەتی لە ڕاستیدا بۆی سودمەندە؟ یان نا! بۆیە ئەگەر منداڵێك شتێکی فرۆشت. بە زیاتر لە نرخەکەی خۆی، ئەوا ئەو کاتە ئەم مامەڵەیەی لەسەر مۆڵەتی سەرپەرشتیارەکەی وەستاوەو حساب بۆ قازانجی منداڵەکە ناکرێت، لەم مامەڵەیەیدا، چونکە بێگومان هەر سروشتی مامەڵە وایە، کە یان زیان دەکاتن یان سوودو قازانجی هەیە.

ـروستو نادروستیانن یاسای مەدەنی عێراقیش[1] دانی پیادا ناون و هەروەها یاسای مەدەنی میصری سەبارەت بە مەمەڵەی قازانجدار و زیانمەند یاسای دەرکردوون، بەڵام ئەو مامەڵانەی کە دیوی قازانجو زیان هەردووکیانی تیادایە، بۆ ئەمەیان وای داناوە، کە دروستە بەتاڵ کرێنەوە، وەك ڕەچاوکردنێك بۆ بەرژەوەندی منداڵەکە و هەر کات سەرپەرشتیار مۆڵەتی دا، یان منداڵەکە دوای باڵ بوون و تەمەنی پێگەیشتن لەسەر مامەڵەکە ڕازی بوو، ئەوا دەتوانێت مەڵی نەوەشێنێتەوە.[2]

## ٨٨ــ منداڵی مۆڵەتدراو:

دروستە بۆ سەرپەرشتیار، کە مۆڵەت بە منداڵ بدات، کە کاری بازرگانی بکات، هەر کات هەستی کرد توانای هەیە، لەم حاڵەتەدا هەڵسوکەوتو مامەڵە بازرگانییەکانی منداڵ، هەروەها گشت ئەو مامەڵانەی کە پەیوەندیدارن بە بازرگانییەکەیەوە، بە هەڵسوکەوتو مامەڵەی دروستو سەرکەوتوو دێنە ئەژمارو کارپێکراون، چونکە ئەو مۆڵەتە پێش وەختە، بۆ مامەڵەکردن، هاوشانە لەگەڵ مۆڵەتی دواتردا و وەك یەکن و هەر ئەمەیش لە لایەن یاسای مەدەنی عێراقیو میصریەوە چەسپاوە.[3]

## ٨٩ــ قۆناغی چوارەم: قۆناقی دوای باڵغ بوون:

کە مرۆڤ عەقڵی پێگەیشت، ئیتر ئەهلیەتی تەواوی جێبەجێ کردن (أداء)ی هەیە، شیاوە بۆ ئەوەی کە خیطابی شەرعی ڕووبەڕوو بکرێتەوەو گشت تەکلیفێکی شەرعی بخرێتە سەر شانیو، سەرجەم گرێبەستو مامەڵەکانی دروستن، بەبێ گەڕانەوە بۆ پرسکردن بە هیچ کەس، ئەگەر گێژو کەم عەقڵ (سَفیه) نەبێت، وەك دواتریش باسی دەکەین.

---

١ بڕوانە ماددەی ٩٧، لە یاسای مەدەنی عێراقی.

٢ بڕوانە ماددەی ١١١ لە یاسای مەدەنی میصری.

٣ بڕوانە ماددەکانی ٩١ــ١٠١ لە یاسای مەدەنی عێراقیو ماددەکانی ٥٤و ٥٥و ٥٦، ١١٢ لە یاسای مەدەنی میصری.

## ﴿بەشەباسی دووەم﴾

## بەربەستەکانی بەردەم شیاوی مرۆڤ بۆ ئەنجامدان و جێبەجێ کردنی مافەکان ( عوارض الأهلية ):

### ٩٠ـــ ڕێخۆشکردن:

پێشتر زانیمان، کە ئەهلیەت و شیاوی مرۆڤ، بۆ پێویست بوونی مافەکان لە قۆناغی کۆرپەلەییدا بە ناتەواوی (ناقصة)یی، بۆی دەچەسپێت و دواتر دوای لە دایکبوونی بۆی کامڵ دەبێت و، هەتا لە ژیاندا بێت هەر ئەهلیەتی تەواوی هەیە.

بەڵام شیاوی و ئەهلیەتی جێبەجێ کردن (أداء) لە لایەن خودی خۆیەوە ئەمەیان بۆ مرۆڤ لە قۆناغی کۆرپەلەییدا ناچەسپێت، هەروەها بۆ منداڵێك کە چاك و خراپ لێك جیاناکاتەوە، دیسان ناچەسپێت، بەڵام ئەهلیەتی ناتەواو (ناقصة) بۆ منداڵێ دەچەسپێت، کە چاك و خراپ لە یەکتری جیا بکاتەوە و، دواتر کە عەقڵی گرت، ئیتر ئەهلیەتی کامڵی بۆ دێتەجێ، جا بنەڕەتی ئەهلیەتی جێبەجی کردن (الأداء) بریتییە لە عەقڵ، جا کە عەقڵ نەبوو ئەهلیەتی ئەدائیش نابێت و خاوەن کەموکوڕی دەبێت و هەر کات عەقڵی کامڵ بوو، ئیتر ئەهلیەتی جێبەجێ کردنیش کامڵ دەبێت، عەقڵ کورت و نا کامڵ بریتییە لە عەقڵی منداڵێ کە چاك و خراپ لە یەکتر جیابکاتەوە، هەروەها ئەوانەی لەم ئاستەدان، و عەقڵی کامڵ بریتیە لە عەقڵی کەسێکی پێگەیشتوو (بالغ)، کە شێت و شێتۆکە (معتوه) نەبێت،[1] بەڵام جاری وا هەیە، کە مرۆڤ تەنانەت دوای ئەوەی کە بووە خاوەنی ئەهلیەتی کامڵ، تووشی کۆمەڵە گرفتێك دەبێت، کە ئەو ئەهلیەتە لا دەبەن، یان کەمی دەکەنەوە، یاخود لە ڕووی لابردن و کەمکردنەوە کاریگەری تێناکەن، بەڵام هەندێ حوکمی ئەو کەسە تووش بووە دەگۆڕن، ئەمەش ئەوەیە کە ناو نراوە بەربەستەکانی بەردەم ئەهلیەت (عوارض الأهلية).[2]

---

[1] التوضيح، ب٢، ل ١٦٤.

[2] (العوارض: بەربەستەکان) بەوە پێناسە کراون کە بریتین لەو حاڵەتانەی کە هەمیشە لەگەڵ مرۆڤـ نین، بەڵام دژی ئەهلیەتن و کاری تێدەکەن.

## ٩١ــ جۆرەکانی لەمپەڕەکان ( عوارض ):

ئەم لەمپەڕو بەربەستانە دەبنە دوو بەشەوە:

یەکەم: بەربەستی خودایی: (عوارض سماوية).

دووەم: بەربەستی مرۆڤکرد (عوارض مکتسبة).

– لەمپەڕە خوداکردەکان (العوارض السّماوية)، بریتین لەو بەربەستانەی بەبێ دەسەڵاتی مرۆڤو ڕازی بوونی تاکەکەس لە لایەن خاوەن شەرعەوە کە خودای مەزنە جێگیر کراونو چەسپاون، بۆیە بە بەربەستی ئاسمانی (عوارض سماوية) ناوزەدکراون، چونکە لە تواناو بژاردەی مرۆڤدا نییە، لە دەرەوەی سنووری دەسەڵاتی مرۆڤدایە، وەك شێتیو شێتۆکەییو نەخۆشیو مردن.

– بەڵام لەمپەڕە مرۆڤکردەکان بریتین لەو بەربەستانەی کە لە سنووری دەسەڵاتو هەڵبژاردەی مرۆڤدانو خۆی بە دەستیان دەهێنێتو ئەم لەمپەڕانەش دوو جۆرن:

یەکەم: ئەوانەی کە دەرهاویشتەی دەروونی خودی مرۆڤن، وەك: نەزانین (جهل)و سەرخۆشیو گاڵتەجاڕی.

دووەم: ئەو بەربەستانەی کە لەلایەن غەیری خودی مرۆڤەوە تووشی دەکرێت، کە ئەمەشیان (زۆرلێکردن: الأكراه)ـە.

لەمەودوا لەسەر هەندێ لە بەربەستە خوداکردو مرۆڤکردەکان دەدوێین:

## مەبەستی یەکەم:

## بەربەستە خوداکردەکان ( العوارض السّماوية )

### یەکەم: شێتی:

٩٢ـ هەندێ لە زانایانی فیقهـ، شێتی یان وا پێناسە کردووە، کە بریتییە لە تێك چوونی عەقڵ، بە جۆرێك کە بەر بگرێت، لە ڕەوت وەرگرتنی کردارو گوفتاری کەسی تووش بوو، لەسەر ڕەوتێکی عاقڵانەو ژیرا، مەگەر زۆر بە دەگمەن [1].

ئەمەیش دوو جۆرە: (زگماکی: أصلي)، و (کتوپڕ: طارئي).

– زگماکییەکەی ئەوەیە کە مرۆڤ هەر بەشێتی لە دایك ببێت، و زگماك بێت، و قەت ساغ نەبووبێت.

---

[1] التوضيح ب٢، ل١٦٧.

- کتوپڕ (طارئي)ـەکەی، ئەوەیە کە عەقڵی هەبوبێتو ژیر بووبێت، بەڵام دواتر بە کتوپڕی شێت بووبێت، هەردووکی ئەم دوو حاڵەتەیش، یان هەمیشەیین، یان ناهەمیشەییو کاتین، هەردوو جۆرەکەی شێتی کارناکەنە سەر ئەصڵیەتی واجب بوونی مافەکانی کەسی تووش بوو، چونکە ئەم مافانە بە (ذمة: پەیمان) چەسپاون‌و، شێتی دژی (ذمة) نییەو، شێتیش پەیماندارە، چونکە ذیممەدار بوون، بە بوونی ژیان دەچەسپێتو، بێگومان شێتیش ژیانی هەیەو، ژیاندارەو، بەسەری دەبات، بەڵام ئەم شێتییە کار لە ئەهلیەتی جێ بەجێ کردن (أداء) دەکاتو، ئەم مافەی لەسەر ناهێڵێت، چونکە جێ بەجێ کردنی (أداء) بەستراوە بەعەقڵ‌و بە جیاکردنەوەی چاكو خراپ لە یەکترو ئەم دووانەیش لە شێتدا بوونیان نییە، بۆیە حوکمی شێت، وەك حوکمی منداڵی جیانەکەرەوەی چاكو خراپ لە یەکتر وایە لە مامەڵەو هەڵس‌و کەتو کردارەکانیدا.

بەڵام لە پەرستشەکاندا، ئەگەر شێتی ئەوکەسە بەردەوامو هەمیشەیی بوو،[1] ئەوە پەرستشەکانی لەسەر شان لادەچن، واتە بە تەواوەتی واجب بوونیانی لەسەر لادەچێت، چونکە لەو کاتەدا توانای جێ بەجێ کردن (أداء)ـی، لە دەستداوە، بەهۆی شێتییەوە، و هەروەها لە دوای چاکبوونیش سەختە لەسەری کە وەك قەزاکردنەوە بیگرێتەوە، جا هەر کات نەتوانرا (أداء: جێ بەجێ) بکرێت، لە کاتی خۆیداو، نەدەکرا لە بەر سەختی قەزا بکرێتەوە، بۆیە (واجب) بوونیشی لەسەر شان لادەچێت، چونکە (واجب) بوونی هەرشتێك بە بێ (أداء) سودی نییە، بەلام ئەگەر حاڵەتی شێت بوونەکە نا هەمیشەیی بوو، ئەوا (جێ بەجێ کردن: أداء)، هەر چەندە لە حاڵەتی شێتیەکەیدا ناکرێت، بەڵام لە دوای چاکبونەوەی، بەبێ نارەحەتی بتوانێت قەزای بکاتەوە، ئەوا لەم کاتەدا لە بەر ئەوەی کە (أداء)ـەکەی جێگیرە و بە گریمانەیی چەسپاوە، بۆیە (واجب) بوونی هەر لەسەر دەمێنێتەوە[2].

---

[1] بەردەوامیو هەمیشەیی لە شێتیدا ئەوەیە کە سنوری نییەو، ئەم حاڵەتەیش بە پێی جۆری پەرستشەکان دەگۆڕدرێت، بۆ نموونە لە ڕۆژووی ڕەمەزاندا ئەگەر کەسەکە لە تەواوی مانگەکەدا شێت بوو، ئیتر ئەوە بە شێتی هەمیشەییو بەردەوام بۆ (ئەو مانگە) دێتە ئەژمارو، ئەگەر هەندێکی شێت بووو، لە کەمێکی تری مانگەکەدا چاك بوویەوە، ئەوە بە شێتی ناهەمیشەیی دیتە ئەژمار.

[2] ئەمە بۆ حاڵەتێکە کە شێتی ناهەمیشەیی و کتوپڕی بێت، بەڵام ئەگەر شێتی ئەسڵی و زگماکی بوو، لە لای هەندێ لە زانایان، وەك (أبو یوسف) هەر هەمان حوکمی هەیە، و لە لای هەندێکی تر لە زانایان، وەك

**٩٣- سانسۆر دانان لە سەر شێت و، ماوەی دەس بەکاربوونی سانسۆرەکە:**

شێتی هۆکارە بۆ سانسۆر(حِجْر) خستنە سەر،و سانسۆر لە شەرعدا بریتییە لە بەر گرتن بە مامەڵەی زارەکی نەك کرداری، بەو مانایە کە ئەو مامەڵە زارەکییانە ناچەسپێن، و دروست نین،و، لە شێتیشدا هەر دروست نین و ناگیرسێن، هەر چەندە بەتەواوی سود مەندیشبن بۆ کەسە شێتەکە، هەروەك ئەم حوکمە لە منداڵی جیانەکەرەوەی چاك و خراپ لە یەکتر (غیر ممیز) شیدا هەروایە، چونکە دروستی گوفتارو، کارپێکردنیان، دەبێت لە ڕووی عەقڵ و تەمیزەوە بن و، بەبێ عەقڵ و تەمیز دەرد خواردوو نین و کاریان پێ ناکرێت، تەنانەت ئەگەر سەرپەریشتاریش مۆڵەتی دابێت، چونکە کارەکە هەر لەبنەڕەتەوە بەتاڵەو، مۆڵەتی پەیوەختیش بۆ شتی بەتاڵ سودی نییەو، دروستی پێ نابەخشێت،[1] و ئەو شێتەی کە (محجور لذاته)یە، واتە هەر کات شێتی تووشی مرۆڤەکە بوو، ئەوە ڕاستەوخۆ هۆکارە بۆ ئەوەی کە سانسۆری بخرێتە سەر، بەبێ گەڕانەوە بۆ بڕیاری دادگا، بۆیە قسەی شێت لە کاتی شێتیدا کاری پێ ناکرێت، بەڵام ئەگەر حاڵەتی شێتیەکەی پچڕ پچڕ بوو، بەجۆرێك کە هەندێ کات چاك دەبوویەوە، ئەوە مامەڵەو هەڵس و کەوتەکانی ئەو کەسە شێتە، لە کاتی ساغیدا، وەك مامەڵەی کەسی عاقڵ ئەژمار دەکرێت، و یاسای مەدەنی عێراقیش هەر لە چوارچێوەی ئەم ئەحکام گەلەی فیقهی ئیسلامیدا لەم بارەیەوە بڕیاری داوەو، بەدەق ئەوەی چەسپاندووە کە حوکمی شێت وەك حوکمی منداڵی جیانەکەرەوەی چاك و خراپ (غیر لممیز) وایەو، یەکسەر لە گەڵ سەر هەڵدانی حاڵەتەکە تیایدا، بە سانسۆردار دێتە ئەژمار، و دواتر مامەڵەکانی لە کاتی ساغیداو، ئەگەر شێتیەکەی پەڕاندبوو، ئەوا وەك مامەڵەی کەسی عاقڵ تەماشا دەکرێن.[2]

بەڵام یاسای مەدەنی میصری، لە هەندێ بەندیدا چووەتە دەرەوەی ئەحکامەکانی فیقهی

---

(پێشەوا موحەممەد) ڕایان وایە کە پەرستشەکانی لەسەر شان لاناچن، بڕوانە (التلويح على التوضيح)، ب٢،ل١٦٧.

١ شرح مرقاة الوصول. ب٢، ل٤٣٩.

٢ لە ماددەی ٩٤دا هاتووە، کە منداڵ و شێت و، شێتۆکە، لە خودی خۆیاندا سانسۆریان لە سەرە و، لە ماددەی ١٠٨دا، داهاتووە، کە شێتی پەتەڕی وەك منداڵی جیانەکەرەوەی چاك و خراپ یەك حوکمیان هەیە، بەڵام شێتی پلە دوو، و ناپەتەڕی مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانی لە کاتی ساغیدا وەك مامەڵەی ساغ و عاقڵ کاریان پێدەکرێت.

ئیسلامیو، ئەگەر چی ئەوەی دركاندووە، كە شێت وەك منداڵی، جیانەكەرەوەی چاك و خراپ وایە، و ئەهلیەتی تیادا نییە، بەڵام بەسانسۆردار ئەژماری نەكردووەو، گوتوویەتی دەبێت دادگا ئەو بڕیارە بداتو، هەروەها ئەوەی دەر بڕیوە كە هەر بەبڕیاری دادگایش سانسۆری لەسەر لادەچێتو سەر جەم مامەڵەكانی پێش تۆماركردنی بڕیاری سانسۆركردن لەسەر بەدروست دادەنرێن و بەتاڵ نین، تەنها بەو مەرجە نەبێت، كە حاڵەتی شێتیەكەی زۆر بێت، لە كاتی گرێبەستەكەدا، یاخود لایەنی بەرامبەر بزانێت كە شێتە، بەڵام سەرجەم مامەڵەو هەڵسو كەوتەكانی لە دوای تۆماركردنی بڕیاری سانسۆرەكە بە تەواوی بەتاڵن، ئیتر چونیەكە ئەو مامەڵانە لە كاتی ساغیدا كرابن، كە جارجار چاك دەبێتەوەو شێتیەكەی لادەچێت، یاخود هەر لە كاتی شێتیەكەیدا ئەنجامی دابن، هەر چونیەكەو، تەنانەت ئەگەر لە دوای عەقڵ گرتنەوەو چاك بوونەوەیش ئەنجامی دابن، هەر بەتاڵن، مادام هێشتا بڕیاری لاچونی سانسۆری لەسەر نەدرابێت[1] !

**دووەم: شێتۆكەو بیركۆڵو گێلیو گەمژەییو كەودەنی (العتە):**

٩٤- (العتە: گێلی) بریتییە لە تێكچوونی عەقڵ، بە جۆرێك كە مرۆڤ كە حاڵەتی فامكردنی شتەكانی كەم ببێتەوە و قسە تێكەڵ بكاتو، نەزانێت كارەكانی بەڕێوە بباتو، ساز بكات، بۆیە بەم هۆیەوە هەستكردنو جیاكردنەوەی چاكو خراپ لە دەست دەداتو پەی بەكارە باشەكان نابات، ئەمەیش دوو جۆرە:

یەكەم: ئەو كەودەنییەی ڕێژەكەی هێندە زۆرە، كە هیچ هەستو جیاكردنەوەی چاكەو

---

١ ماددەی ٤٥ی یاسای میصری دەڵێت، هەر كەس لەبەر منداڵیو كەم تەمەنی یان شێتۆكەیی، و شێتی جیاكردنەوەی چاكو خراپی لە دەست دابێت، ئەوە ئەهلیەتی ئەوەی نییە، كە تەوخنی مافە مەدەنیەكانی بكەوێت.

هەروەها ماددەی ١١٣یش دەڵێت: كەسی شێتو شێتۆكەو بیركۆڵو گێژو حۆل دادگا بڕیاری سانسۆر دەدات لەسەریانو، هەر دەبێت دادگایش بڕیارەكە لە سەریان لاببات.

هەروەها ماددەی ١١٤ دەڵێت: یەكەم: هەڵسوكەوتو مامەڵەی شێتو شێتۆكە ئەگەر لە دوای بڕیاری تۆماركردنی سانسۆر لەسەری ئەنجامی دابوو، بەبەتاڵ دێتە ئەژمار. دووەم: بەڵام ئەگەر مامەڵەو هەڵسوكەوتەكەی لە پێش تۆماركردنی بڕیاری سانسۆرەكە ئەنجامی دابوو، بەبەتاڵ نایەتە ئەژمار، مە گەر كاتێك كە ئەو حاڵەتی شێتیە تیایدا زۆر ڕەنگی دابێتەوە، یان لایەنی بەرامبەری گرێبەستەكە پێی زانی بێت، كە شێتە، ئیتر بەتاڵە.

خراپەیەك لە خاوەنەکەیدا ناهێڵێتەوەو، وەك شێتی لێ دێتو، وای لێ دەکات، کە ئەهلیـەتی جێ بەجێ کـردن (أداء) تیایـدا نامێنێـت، بـەڵام ئەهلیـەتی واجـب بـونی مافـەکان بـۆی هـەر بەردەوامە لەسەری، و لە حوکمە شەرعییەکاندا، حوکمی شێتی هەیە.

دووەم: ئەو گێلیو کەودەنییەی هەستی هەیەو، توانـای جیاکردنـەوەی چـاکیو خراپـی هەیە، بەڵام لە ئاستێکی کەمدایەو، وەك هەستو توانای کەسی عاقـڵ نییـەو، مرۆڤـی گێـلو گەمژەی لەم جۆرە لە حوکمی شەرعیدا ئەو مرۆڤە باڵغە، وەك منداڵێکی جیاکەرەوەی چاكو خراپ وایە.

و ئەهلیەتی (جێ بەجێ کردن: أداء) ی هەیە، بەڵام بەناتەواوی (ناقصة)، بەڵام ئەهلیـەتی واجب بوونی مافەکان بە تەواوی بۆی ئەنجام دەدرێت، و بە کـامڵی ئـەم ئەهلیەتـەی هەیـەو، لەم ڕوانگەیەوە پەرستشەکانی لەسەر نییە، بەڵام ئەگەر ئـەنجامیان بـدات، بـۆی دروسـتە، و هـەروەها سـزای لەسـەر جـێ بـەجێ ناکرێـت، و ئـەو مافـە ماڵیانـەی خـەڵك کـە دەسـتی لـە خراپکردنیانـــدا هەیـــە، پێـــی دەبـــژێردرێت، و دروســـتە ئـــەم بژاردنـــە لـــە لایـــەن سەرپەرشتیارەکەیەوە بۆی جێ بەجێ بکرێت، وەك بژاردنی شتێك کە بەدەستی ئـەم خـراپ بووبێتو، هەر مامەڵەو هەڵسو کەوتێك ئەنجام بدات، کە سوودی تەواوی هەبێت بـۆی، ئـەوا دروسـتەو، ئەگـەر زیـانی تـەواوی هـەبوو بـۆی، ئـەوا نادروسـتە، و ئەگـەر مامەڵـەو هـەڵسو کەوتەکەی دوو لایەنەبوو، واتە چاوەڕێ دەکرا، سودی هەبێت بۆیو، چـاوەڕێش دەکـرا، کـە زیانی لـێ بکات، لەم کاتەدا لەسەر مۆڵەتی سـەر پەرشـتیارەکەی وەسـتاوە، ئەگـەر ڕێگـەی پێدابوو، ئەوە مامەڵەکەی دروستە، و بە پێچەوانەوە دروست نییە، بزانە کە کەسی گێل، لـە ڕووی ئەوەوە کە لە خودی خۆیدا سانسۆری لەسەرە (محجور لذاتـه)یـە، لـەم حوکمـەدا وەك شێت وایە.

**٩٥- حوکمی کەسی گێل، لە یاسای مەدەنیدا:**

یاسای مەدەنی عێراقی بەمەرجی نەگرتووە، کە سانسۆر خستنەسەر کەسی گێـل دەبێـت لە دادگاوە بێتو، بەڵکو هەر خۆکردە و خۆی لـە خۆیـدا کـە گێـل بـووە، بەسانـسۆر لەسـەر ئـەژماری کـردووەو، لـە فیقهـی ئیسلامیـشدا هەروایـەو، لـە لایـەکی تـرەوە وەك منـداڵی جیاکەرەوەی چاكو خراپ دایناوە. لە حوکمەکاندا، بـەبێ جیـاوازی کـردن لـە نێـوان جـۆری

کەسە کەودەنەکاندا،[1] بەڵام یاسای مەدەنی کۆماری عەرەبی میسر پێی وایە، کە کەسی گێل وەك شێت وایە، بەبێ جیاوازی لە نێوان جۆری کەسە کەودەن‌و گەمژەکانداو لە ڕووی سانسۆر لەسەر دانانییەوە، یاساکانی شێتی بەسەردا جێ بەجێ کردووەو، بە پێویستی زانیوە کە ئەو سانسۆردانانە لەسەری بەپێی بڕیاری تایبەتی دادگابێت‌و، سەرجەم هەڵس‌و کەوتەکانی پێش تۆمارکردنی بڕیاری سانسۆرەکە بەبەتاڵ دانراوە ئەگەر ئەو حاڵەتی گێلی‌و کەودەنییە لە کاتی گرێبەستەکەدا پێوەی دیار بوبێت‌و، یاخود لایەنی بەرامبەر زانیبێتی کە داماوو گێلەو کەچی هەر مامەڵەی لە گەڵدا کردبێت‌و، هەروەها پێش هەڵوەشاندنەوەی بڕیاری سانسۆرەکە، هەڵسوکەوت‌و مامەڵەکانی هەر بە بەتاڵ دەمێننەوە.[2]

ئەوەی کە یاسای مەدەنی میصری دایناوە، بەگشتی پێچەوانەی ئەو ئەحکامانەیە کە شەریعەتی ئیسلامی جێگیری کردوون، بە تایبەتی لەوەیدا کە گێلی وەك شێت داناوە، لە کاتێکدا کە کەسی گێل لەسەر جەم حاڵەتەکانیدا وەك شێت نییە!

## سێیەم: بیرچوونەوە:

٩٦- (النسیان: بیرچوونەوە)، بارودۆخێکی تایبەتیە کە بەسەر مرۆڤدا دێت‌و، وای لێدەکات، کە ئەوەی تەکلیف کراوە، کە ئەنجامی بدات، بیری دەچێتەوەو، بەڵام ئەم حاڵەتە ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکان بۆی‌و ئەهلیەتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکان (أداء) لەسەری لا نابات، چونکە بەعەقڵێکی تەواوو توانایەکی تەواوەوە ماوەتەوە[3]، و بیرچونەوە نابێتە پاساو، لە مافی بەندەکاندا،چونکە ئەمە ڕێزەبۆ پێداویستیەکانیانی خەڵك‌و تاقی کردنەوە نییەو، بەلەبیرچوونەوەیش ئەو ڕێزە لە دەست ناچێت، بۆیە ئەگەر کەسێك ماڵی کەسێکی تری بە لە بیرچوونەوە لە ناوبرد، یان خراپی کرد، ئەوا بژاردنی لەسەرە،[4] بەڵام لە مافەکانی خوای پەروەردگاردا، لە بیرچونەوە پاساوە بۆ کردنی تاوانێك، بۆیە کەسێك شتی لە بیر چووبوویەوەو، تاوانێکی ئەنجامدا، ئەوە تاوانی لەسەر نییە، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت:

---

١ لە ماددەکانی ٤٩و ١٠٧ لە یاسای مەدنی عێراقیدا هاتووە، کە کەسی گێل حوکمی، وەك حوکمی منداڵی جیاکەرەوەی چاك‌و خراپ وایە.

٢ ماددەکانی ٤٥و ١١٣و١١٤ی یاسانی مەدەنی میصری‌و، پێشتریش مەبەست‌و بێژەکانیانمان باسکرد.

٣ شرح مرقاة الوصول، ب٢،ل٤٤٠.

٤ أصول البزدوي، وشرحه، ب٤، ل١٣٩٦.

(إن الله وضع عن أمتي الخطأ والنسيان وما استكرهوا عليه) واتە: خوای پەروەردگار کاری هەڵە و تاوانی کاتی لە بیرچوونەوەو، تاوانی کاتی زۆرداری ئەژمار نەکردووە بەتاوان، بەڵام لە حوکمە دنیایەکاندا، دیسان لە بیرچونەوە پاساوێکی شەرعیو وەرگیراوە، و پەرستشەکان بەتاڵ ناکاتەوە، وەك ئەوەی کەسێکی ڕۆژووەوان بە لە بیرچونەوە شت بخوات، بێگومان ڕۆژوەکەی بەتاڵ نابێتەوە.

## چوارەم: خەوو بوورانەوە:

٩٧- خەوو بوورانەوە، ئەهلیەتی جێ بەجێ کردن (الأداء) لەسەر مرۆڤ دەسڕنەوە، بەڵام ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکان هەردەمینێ [١]، جا لەبەر ئەوەی مرۆڤ خەوتووبوو، یان بوورابوویەوە، ئەوا لەو کاتانەدا ئەهلیەتی جێبەجێ کردنی ئەرکەکانی نییە، چونکە ئەهلیەتی جێ بەجێ کردن (أداء) لەسەر بنەمای عەقڵ وەستاوەو، بێگومان مرۆڤیش لە هەردوو حاڵەتی خەوتنو بوورانەوەدا عەقڵی لە لا میوان نییە، بۆیە هیچ حسابێك بۆ قسەکانی بە هیچ جۆرێك ناکرێتو، لەسەر کردەوەکانیشی لەو دوو حاڵەتەدا، سزای جەستەیی وەرناگرێتو، تەنانەت کە ئەگەر بکەوێت بە سەر مرۆڤێکداو بیکوژێت، ئەوا بەجەستە سزای لێ وەرناگیرێت، واتە ناکوژرێتەوە، چونکە بەتایبەت ئەو کارەی نەکردووەو، لەو حاڵەتەدا بێ ئاگا بووەو، چاكو خراپی لێك جیا نەکردۆتەوەو، ئەو کارە بژاردەی دەستی خۆی نەبووە، بەڵام لە ڕووی داراییەوە سزای لێ وەردەگیرێتەوەو، خوێن دانی بە موڵكو سامان، لەسەرەو، هەر وەك هەرشتێکی کەسێکی تر خراپ بکات، لەو دوو حاڵەتەدا، ئەوا لەسەریەتی بۆی ببژێرێتەوەو، بژاردنو سزای کوشتنو ماڵی خەڵك خراپ کردنی بۆیە لەسەرە، چونکە ئەو کارانە بەهەستەوەری (حسّ) کراون، و کەس بۆی نییە، دەستیان بۆ ببات، ئەو پاراستنەشەرعییە هەرگیز بە پاساوو بیانوو ناسڕدرێتەوە.

بەڵام سەبارەت بە پەرستشەکان و جێ بەجێ کردنیان لە کاتی خۆیاندا، لەسەر کەسی خەوتوو، بووراوە، لابراوە، چونکە خەوتنو بوورانەوە دواخستنی فەرمایشتی شەرع بۆ جێ بەجێ کردنی ئەرکەکان دوادەخات، بۆ ئەو کاتەی کە کابرا لە خەو هەڵدەستێت، یان دێتەوە بە خۆیدا، دوای بوورانەوەکەی، چونکە لەو دووحاڵەتەدا هۆشی لەسەر خۆی نییەو، ناتوانێت ئەرکەکان جێ بەجێ بکات، بەڵام واجبی ئەو پەرستشە لەسەری لاناچێت، چونکە بۆی هەیە،

---

١ کشف الأسرار، ب٤، ل١٣٨٢.

که له دوای له خەو هەڵسان، یان هاتنەوە بەخۆیدا کاتی ئەو پەرستشە مابێتو، لەو کاتەدا بە حەقیقی جێ بەجێی بکات، یاخود بۆی هەیە کە لەدوای کاتەکەوە بێتە سەرخۆیو، قەزایان بکاتەوە، چونکە ئەو کەسەی کە لە کاتی دیاریکراوی پەرستشەکەدا دەستەوستانەو ناتوانێت پەرستشەکە ئەنجام بدات، لە بەر ئەوەی کە دەتوانێتو، بێ گرفت بۆی دەکرێت، کە قەزای بکاتەوە، بۆیە ئەسڵی واجب بوونەکەی کەلەسەر شانیەتی لەسەری لا ناچێتو، لە بەر ئەوەی کە عادەتەن خەو کاتی هەیەو، درێژ نییە، هیچ گرفت نییە، لەوەدا کە قەزای ئەو پەرستشانە بکرێتەوە، کە بەهۆی خەوەوە لە دەست دەرچوونو، بەڵام خەو نابێتە بیانووو پاساو هۆکار بۆ لادانی واجبەکە لەسەر شانی هەرکەسێکو، هەروەها بورانەوە ئەگەر درێژخایەن نەبوو، هەروایە، بەڵام ئەگەر درێژخایەن بوو، ئیتر ئەوە واجب بوونی ئەرکەکانی لەسەر لادەچێت، چونکە بە هۆی بوورانەوەوە توانای حەقیقی جێ بەجێ کردنی ئەرکەکانی تیادا نامێنیو، وایش دانراوەو، ئەندازە گیری کراوە، کە بە قەزاکردنەوەیان لە دوای چاك بوونی لە بوورانەوەکەی، ئەمە کارێکی دژوارو سەختەو، جا کە جێ بەجێ کردن (أداء)ـی، لەسەر نەما، ئیتر واجب بوونیشی لەسەر نامینێت، چونکە مانەوەکەی هیچ سودێکی نییە[1].

## پێنجەم: نەخۆشی

٩٨- مەبەست لە نەخۆشی لێرەدا، شێتیو بوورانەوە نییە، بۆیە ئەم جۆرە نەخۆشیە، نە ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکان،و نە ئەهلیەتی جێ بەجێ کردن (أداء) لەسەر کەسە نەخۆشەکە لانابات، کەسی نەخۆش هەر دوو جۆرە ئەهلیەتەکەی بەتەواوی (الأهلیة کاملة)ـی، تیادایە، بۆیە مافەکانی بۆ پێویستن و لەسەریشی پێویستن، بەڵام ئەوە هەیە کە نەخۆشی کاردەکاتە سەر هەندێ لە حوکمە شەرعییەکان، بۆ کەسی نەخۆش، هەرچەندە ئەهلیەتی کامڵیشی هەیە! لەوانە، هەندێ مامەڵەو هەڵسو کەوتی ئەژمار ناکرێتو ناگیرسێن، درێژەی ئەم پرسە بەم شێوازەیە: بردنی موڵکی میراتی کەسێك لە لایەن میراتبەرەوە، بەمردنی میراتدەر دەبێت، و ئەمە شەرع بە تۆبزی بڕیاری لەسەر داوە، هەروەك چۆن پەیوەستی کەسی قەرز دەر هەر بەردەوامە، بەو قەرزەوە کە داویەتی بە کەسێکو، ئەو کەسە قەرزارەیش مردووەو، بەڵام لە بەر ئەوەی نەخۆشی هۆکاری مردنەکەی بووە، بۆیە پەیوەستی میرات بەرو قەرزدەر بەو موڵکەوە، هەر لە کاتی سەر هەڵدانی

---

[1] کشف الأسرار، ب٤، ل١٣٩٨و ١٤٠٠.

نەخۆشـیەکەوە دەبێـتو، لـەو کاتـەوە بۆیـان ئـەژمار دەکرێـت، چـونکە حوکمەکـەی دەبەسترێتەوە، بەسەرەتای هۆکار (سەبەب)ـی، ڕوودوادەکەوە[1].

هـەروەها بـۆ پاراسـتنی مـافی میراتبـەرو قـەرزدەر، سانـسۆر لەسـەر کەسـی نـەخۆش دادەنرێت، بە ئەندازەی ئەوەندەی کە ئەو مافەی تیادا دەپارێزرێتو بەس! کە بۆ میرات بەر ئەندازەکەی دووسێ یەکیو، واتـە: نـەخۆش لـە دوو سێیەکی ماڵەکەیدا حیجـزی دەخرێتـە سەر، بۆ قەرز دەریش ئەندازەکە تەواوی موڵکەکەیە، ئەگەر قەرزەکە بەقەدەر تـەواوی مـاڵی کابرا بوو، واتە: هەر ئەوەندەی هەبوو، کە بیداتەوە بەقـەرز یـاخود بەئەنـدازەی قەرزەکەیـە ئەگەر قەرزەکە کەمتر بوو، لە تەواوی موڵکەکە[2].

ئـەم سانـسۆر دانانـە، هـەر لەسـەرەتای ئـەو نەخۆشـییەی کـە نەخۆشـی مـەرگی بـووە، دەچەسپێت، چونکە هۆکاری سانسۆر دانانەکە، ئەو نەخۆشییە بووە، کـە کوشـتویەتیو کـە لەدوای نەخۆشیەکە ڕاستەو خۆ مەرگی بە شوێنداهات، ئیتر ئەو نەخۆشیە هەر لە سەرەتاوە بە نەخۆشی مەرگ پێناسەو ئەژمار دەکرێت، بەڵام لە بەر ئەوەی کە نازانرێت، کام نەخۆشی نەخۆشی مەرگـە! تـا بەتـەواویو ڕاسـتەوخۆییو مـەرگی بەشـوێندا نەیـەت، بۆیـە سانـسۆر لەسەر دانان بە گومان ناچەسپێت، بۆیە ڕێو شوێنو شوێنەواری سانـسۆر (حجـر) لـە پـێش مردنیەوە دیار نییەو کاری پێ ناکرێـت، بۆیـە مامەڵـەی نەخۆشـی کـاتی مـەرگ دروسـتە[3]. و میرات بەرو قەرزدەریش بۆیان نییە، کە ڕەخنەی لێ بگرن لەسەری، لە کاتی زینـدوو بونیـداو بەڵکو مافی ئەمان لە دوای مردنـی دەچەسـپێت، ئەگـەر ئـەو مامەڵـەو هەڵـسوکەوتەی کـابرا زیانمەند بوو، بە مافەکانی ئەوان، وەك بەدیاری دانی موڵکەکەی یان ئـەوەی کـە بەمامەڵـەی (محاباة) ناونراوە[4].

٩٩- ژن هێنـانی نـەخۆش! ژنهێنـانی نـەخۆش، کـە نەخۆشـی مـەرگی بێـت، لـە لای جەماوەری زانایان دروستە، چونکە کەسێکی خاوەن ئەهلیـەتو شـیاو ئـەنجامی داوەو، ئـەو

---

[1] شرح المنار، ل٦٩١- ٦٩٢.

[2] شرح المنار، ٦٩٢و شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٤٦، لەو شتانەیدا کە لە پێویستیەکانی نەخۆش، وەك کێشانی بژێوی،و کرێو پارەدانی دەرمانەکانی سانسۆر نییە، بۆ ئەم جۆرە شتانە.

[3] نەخۆشی مەرگ (مرض الموت) ئەو نەخۆشییەیە، کە والەمرۆڤ دەکات، نـەتوانێت لـە دەرەوەی ماڵـەوە کارو بەرژەوەندیەکانی ڕاپەڕێنێتو، بەزۆری ئەو نەخۆشیە توش بووەکەی دەمرێنێت.

[4] شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٤٦ والتلویح علی التوضیح، ب٢، ل١١٧.

ژن‌و مێردەیش میرات لە یەکتری دەبەن‌و، لەسەر ڕای هەندێ لە زانایانی وەك پێشەوا ئەحمەدو ظاهرییەکان، واجبە لەسەر کابرا کە ئەو مارەییەی بدات بەژنەکەی کە بەڵێنی پێداوەو، بۆی دیاری کردووەو، لەسەر ڕای هەندێکی تر لە زانایانی وەك، ئیمامی شافعی‌و هی تریش... دەبێت مارەیی هاوێنەی خزمەکانی (مهر المثل)ـی، پێ بدات، ئەمەش وەك ڕەچاوکردنی مافی میرات بەران‌و قەرزدەرەکان‌و، ئەمەیش بۆ کاتێك کە ئەو مارەییەی کە براندویانەتەوەو دیارییان کردووە، لە سێ یەك نەدرێت‌و، نەدرابێت‌و، میرات بەران‌و خاوەن قەرزەکان بەو پێدانە ڕازی نەبووبن.

لە لای پێشەوا ئەوزاعی، مارەکردنەکە دروستە، و بەڵام ئەو ژن‌و مێردە میرات لە یەکتری نابەن، و لە لای پێشەوا مالیك مارەکردنەکە بەتاڵە و میراتی پێ نابرێت، و بەڵکو هەندێ لە هاوەڵانی پێشەوا مالیك دەڵێن، تەنانەت مارەکردنی ئەو ئافرەتەی کە پەیماندار و ئەهلی ذیممەیە، بەتاڵە، کە میرات نابات، لەبەر ئەوەی کە نەبادا مسوڵمان ببێت، و میرات ببات‌و زیان بە میراتبەرانی تر بگەیەنێت.

لەسەر ڕای ئیمام مالیك ئەگەر ژن پێش ئەوەی پیاوەکەی بچێتە لای‌و بیگوزێتەوە لە مێردەکەی جیابوویەوە، میرات نابات‌و، ئەگەر گواستبوویەوەو چووبویە لای ئەوا مارەیی هاوێنەی خزمەکانی خۆی (مهر المثل)ـی، بۆ هەیە، و ئەویش لە سێ یەکی ماڵەکەی دەدرێت‌و، بەڵگەی پێشەوا مالیکیش بۆ ئەم قسەیەی ئەوەیە کە نەخۆشەکە تۆمەتبارە بەوەی کە بەتایبەت ویستویەتی زیان بە میراتبەرەکانی بگەیەنێت، لەڕێی مارەکردنەکەوە. کە میراتبەری تری تێکەڵ کردووە پێیان،[1] ئەوەی لای ئێمە پەسنترە، ئەوەیە کەسی نەخۆش ئەگەر ژنی مارە کرد، دروستە، و میراتیش لە یەکتری دەبەن‌و، ئەو مارەییەی کە بۆی دیاری کردووە، پێویستە لەسەری بۆی بکات، ئەگەر کەمتر بوو، لە (مهر المثل)، و ئەگەر زیاتر بوو، ئەوا ئەوەی کە زیادەکەیە، دەبەسترێت بە مۆڵەت دانی میراتبەران‌و. خاوەن قەرزەکانەوە ئەگەر مۆڵەتیان دا دەدرێت‌و، بە پێچەوانەوە نادرێت، ئەمەیش بۆ کاتێکە کە مافەکانی ئەوان بخاتە مەترسیەوە، و بەڵام ئەو قسەیەی کە دەڵێت، مارەکردنەکە کە بەڕەهایی بەتاڵە، ئەمە ڕاو قسەیەکی لاوازەیە، چونکە ژنهێنان لە پێداویستییە

---

١ الأم، للأمام الشافعي، ب٣، ل٣١-٣٢، المغني، لأبن قدامة، ب٢، ل٣٢٦، المدونة الكبرى. للأمام مالك، ب٢، ل١٣٣، المحلى، ب١، ل٢٥-٢٦.

ژن‌و مێردەیش میرات لە یەکتری دەبەن‌و، لەسەر ڕای هەندێ لە زانایانی وەك پێشەو ئەحمەدو ظاهرییەکان، واجبە لەسەر کابرا کە ئەو مارەییەی بدات بەژنەکەی کە بەڵێنی پێداوەو، بۆی دیاری کردووەو، لەسەر ڕای هەندێکی تر لە زانایانی وەك، ئیمامی شافعی‌و هی تریش... دەبێت مارەیی هاوێنەی خزمەکانی (مهر المثل)ـی، پێ بدات، ئەمەش وەك ڕەچاوکردنی مافی میرات بەران‌و قەرزدەرەکان‌و، ئەمەیش بۆ کاتێك کە ئەو مارەییەی کە براندویانەتەوەو دیارییان کردووە، لە سێ یەك نەدرێت‌و، نەدرابێت‌و، میرات بەران‌و خاوەن قەرزەکان بەو پێدانە ڕازی نەبووبن.

لە لای پێشەوا ئەوزاعی، مارەکردنەکە دروستە، و بەڵام ئەو ژن‌و مێردە میرات لە یەکتری نابەن، و لە لای پێشەوا مالیك مارەکردنەکە بەتاڵە و میراتی پێ نابڕێت، و بەڵکو هەندێ لە هاوەڵانی پێشەوا مالیك دەڵێن، تەنانەت مارەکردنی ئەو ئافرەتەی کە پەیماندار و ئەهلی ذیممەیە، بەتاڵە، کە میرات نابات، لەبەر ئەوەی کە نەبادا مسوڵمان ببێت، و میرات ببات‌و زیان بە میراتبەرانی تر بگەیەنێت.

لەسەر ڕای ئیمام مالیك ئەگەر ژن پێش ئەوەی پیاوەکەی بچێتە لای‌و بیگوزێتەوە لە مێردەکەی جیابوویەوە، میرات نابات‌و، ئەگەر گواستبوویەوەو چووبویە لای ئەوا مارەیی هاوێنەی خزمەکانی خۆی (مهر المثل)ـی، بۆ هەیە، و ئەویش لە سێ یەکی ماڵەکەی دەدرێت‌و، بەڵگەی پێشەوا مالیکیش بۆ ئەم قسەیەی ئەوەیە کە نەخۆشەکە تۆمەتبارە بەوەی کە بەتایبەت ویستویەتی زیان بە میراتبەرەکانی بگەیەنێت، لەڕێی مارەکردنەکەوە. کە میراتبەری تری تێکەڵ کردووە پێیان،[1] ئەوەی لای ئێمە پەسنترە، ئەوەیە کەسی نەخۆش ئەگەر ژنی مارە کرد، دروستە، و میراتیش لە یەکتری دەبەن‌و، ئەو مارەییەی کە بۆی دیاری کردووە، پێویستە لەسەری بۆی بکات، ئەگەر کەمتر بوو، لە (مهر المثل)، و ئەگەر زیاتر بوو، ئەوا ئەوەی کە زیادەکەیە، دەبەسترێت بە مۆڵەت دانی میراتبەران‌و، خاوەن قەرزەکانەوە ئەگەر مۆڵەتیان دا دەدرێت‌و، بە پێچەوانەوە نادرێت، ئەمەیش بۆ کاتێکە کە مافەکانی ئەوان بخاتە مەترسیەوە، و بەڵام ئەو قسەیەی کە دەڵێت، مارەکردنەکە کە بەڕەهایی بەتاڵە، ئەمە ڕاو قسەیەکی لاوازەیە، چونکە ژنهێنان لە پێداویستییە

---

١ الأم، للأمام الشافعي، ب٣، ل٣١-٣٢، المغني، لأبن قدامة، ب٢، ل٣٢٦، المدونة الكبرى، للأمام مالك، ب٢، ل١٣٣، المحلى، ب١، ل٢٥-٢٦.

بنەڕەتیەکانی مرۆڤە، و هەرگیزیش سانسۆر لە پێداویستی بنەڕەتی مرۆڤ ناکرێت، دابنرێت، وەك مارەکردنی ژن بەمارەیی هاو وێنەی خزمانی (مهر المثل) بەڵام کە ئەو ە چەسپا، کە مەبەستی ئەو کەسە نەخۆشە لە مارەکردنەکە ئەوەیە کە زیان بە میراتبەرەکانی بگەیەنێت، لێرەدا دەکرێت، کە بگوترێت، کە میرات نابەن، بەهۆی ئەو مەبەستە خراپەوە کە کابرای نەخۆش هەیبووە، لە ئەنجامدانی ئەو پرۆسەیەدا.

## ١٠٠- ژن تەڵاقدانی کەسی نەخۆش:

ئەگەر ئەو کەسە نەخۆشەی کە لە نەخۆشی مەرگدایە، ژنەکەی خۆیی تەڵاقدا، کە گواستبوویەوە، و چووبوویە لای، بە تەڵاقدانێکی ئاشکراو یەکلاکەرەوە (بائن) بە بێ ڕازی بوونی ژنەکە، ئەوا ئەو تەڵاقە لای شەرعزانان دەکەوێت، بەڵام سەبارەت بە بردنو نەبردنی میرات ڕاجیاییان هەیە، جا جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە لە بەر ئەوەی کە مێردەکە نیازی خراپ بووەو، بۆیە تەڵاقی داوە کە میرات نەبات، لەبەر ئەم هۆکاری نیاز خراپییە، هەر میرات دەباتو، پێشەوا شافیعیو زانایانی ظاهیری پێیان وایە کە میرات نابات، چونکە تەڵاقی جیاکەرەوەو ئاشکرا (بائن) میرات بردن ناهێڵێت، و حساب بۆ نیازی دەرونی مرۆڤ ناکرێت، چونکە حوکمی شەرعی لەسەر شتی دیار (ظاهر) بنیات دەنرێتو، شتی نهێنی تەنها خوای پەروەردگار پێی ئاگادارە، لە گەڵ ئەمەشیدا جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە ئافرەتی تەڵاقدراو بەتەڵاقی (بائن)[1] میرات دەبات، بەڵام لەسەر ماوەی مافی ژنەکە لە میرات بردندا ڕاجیاییان هەیە حەنەفیەکان پێیان وایە، کە مادام ماوەی عیددەکەی مابێتو هێشتا بەسەر نەچوبێ بۆیە میرات دەبات، بەڵام حەنبەلیەکان لەسەر ئەو ڕایەن، کە هەرچەندە عیددەکەی بەسەر چوبێت، هەر میرات دەبات، بەڵام بەو مەرجەی کە شووی نەکردبێتەوە، بەڵام پێشەوا مالیك پێی وایە، کە عیددەی مابێتو نەمابێت چونیەکە، و هەر میرات دەبات ئیتر شوی کردبێتەوە، یان نا... و جەعفەرییەکانیش ڕایان وایە کە لە ماوەی ساڵێ یەکەمی تەڵاقدانەکە، ئەگەر شوی نەکردەوە، ئەوا میرات دەبات بەڵام ئەگەر تەڵاقدانەکە (بائن) بوو، پێش گواستنەوەیو چوونە لای، ئەوا ئەو ژنە میرات دەباتو، ئیمام مالیکیش هەر ئەم ڕایەی هەیە، بەڵام لەسەر ڕای حەنەفیو حەنبەلیەکان میرات ناباتو، گروپێك لە زانایانی مەزهەبی

---

[1] بۆ زیاتر حاڵی بوون لە زاراوەی (بائن) سەیری کتێبە فیقهی یەکان بکەو، لێرەدا ماوەی توێژینەوەیمان نییە، چونکە پەیوەندیدار نییە، بەبابەتەکەوە. (وەرگێڕ).

حەنبەلی لەسەر ئەو رایەن، کە میرات دەباتو، ئەم گوتەیەیان هەڵبژاردووەو، کە ئەوەش ڕای ئاشکرای جەعفەرییەکانەو، زانای ئەو مەزهەبە (الأمام الطوسی)، لە کتێبی (الخلاف)دا، ئاماژەی پێداوە[1].

١٠١– تەڵاقدانی ژن لەلایەن کەسی نەخۆشەوە، بەنەخۆشی مەرگ، لەیاسای مەدەنی عێراقیدا:

یاسای باری کەسێتی عێراقی، ژمارە ١٨٨ی، ساڵی ١٩٥٩ ئەوەی دان پیادانـاوە، کـە ئـەو ژنەی کە لەلایەن مێردەکەیەوە، لە نەخۆشی سەرەمەرگدا تەڵاقی داوە، میرات لە پیاوەکـەی دەبات، بەڵام حوکمێکی سەیرو نامۆی لێرەدا هێنـاوە، کـە دەڵێـت، تەڵاقـدانی ژن لەلایـەن کەسی نەخۆشەوە، بەنەخۆشی سەرە مەرگ ناکەوێت![2]

ئەمـەش ڕاجیاییـەکی زۆرو ناسـراوی تیـادا هەیـە، لـە فیقهـی ئیـسلامیدا کـە ئـەو تەڵاقـە دەکـەوێت، چـونکە لـە کەسـێکەوە تەڵاقەکـە خـراوە، کـە ئەهلیـەتی هەیـەو، ژنەکەیـشی هەرگونجاوە، بۆ ئـەوەی کـە تـەلاقی لـە پیاوەکـەی بکـەوێتو، ئەهلیـەتی تـەڵاق، بەسـاغیو نەخۆشی نییە، و ئەهلییەت پەیوەنـدی بـەو دووحاڵەتـەوە نییـە، و مرۆڤـ لـەو دووحاڵەتـەدا ئەهلیەتی تەڵاقدانی هەیە، و نەمزانیوە کە یەکێك لە شەرعزانان هەبێت، کـە ڕای وابێـت، کە تـەڵاقی کەسـی نـەخۆش ناکـەوێت، و بـەڵکو شـەرعزانان لـەوەدا ڕاجیاییـان هەیـە، کـە ژنـی تەڵاقدراو بە تەڵاقی (بائن)، ئەگەر مێردەکەی لە نەخۆشی مەرگدا تەڵاقیـدا، مـیرات دەبـات، یان نا...و باسی ڕاجیاییەکەیشیان کردمانو، پوختەی ڕاکانمان دەربارەی بەم پرسە هێنا.

بەڵام یاسای میصری، بە دەق هێناویەتی، کە ئەو ژنەی بە تـەڵاقی (بـائن) تەڵاقـدراوە، و لە کاتی نەخۆشی مەرگی کابرای مێردیدا، ئەوە وەك ئەو ژنـە وایـە کـە بـەبێ پـرس پێکـردن تەڵاق درابێتو، ئەگەر مێردەکەی مێردەکەی مردو ئەم هێشتا لە عیددە دا بـوو، ئـەوا مـیرات لە مێردە مردووەکەی دەبات، و[3] ئەم ڕایەشیان لە مەزهەبی حەنەفی وەرگرتووە.

---

١ الخلاف للطوسي، ب٢، ل٤٥٦ و الأم، للأمـام الـشافعي، ب٥، ل٣٢٩– ٣٣٢ والهدايـة وفـتح القدير، ب٣، ل١٥٠– ١٥٣، والمغني، ب٣، ل ٣٢٩– ٣٣٢ والقواعد، لأبن رجب، ل ٢٣٠، والمدونـة الكبرى ، ب٢، ل١٣٢.

٢ لە ماددەی ٣٥ داهاتووە، کە دەڵێت: تەڵاقی ئەو پیاوانە ناکەوێت، کە لە نەخۆشی مەرگدان، ئەگەر لەو نەخۆشییەدا مرد، و ژنەکەی میراتی لێ دەبات!

٣ ماددەی ١١ لە یاسای میراتبردنی میصر، ژمارە ٧٧ی ساڵی ١٩٤٣ دەڵێت: کە حوکمی ژنی تەڵاقدراو بە تەڵاقی یەکلاکەرەوە (بائن)، لە نەخۆشی مەرگدا، وەك حوکمی ژنی تەڵاقـدراو وایـە، کـە بـەبێ ڕازی

## شەشەم: مردن

١٠٢- (الموت: مردن)، کۆتـا بەربەستە، لـەو بـەر بەسـتو لـە مپەڕانـەی کـە ئاسمانین‌و، خـودای مـەزن فاکتـەری سـەرەکییە تیایانـداو، مـرۆڤ لـە بـەر دەمیانـدا دەستەوسـتانە، ـەتەواوەتی، و ئیتر بەم هۆیەوەولە بەر بوونی ئەم لەمپەڕە مرۆڤ هیچ ئەهلیەتێکی جێ بەجێ کـردن (أداء)ـی، لەسـەر نامینێـت، و سـەرجەمی تەکلیفـە شـەرعییەکانی لێـرەو ڕا لەسـەر ،دەچێت، چونکە مەبەست لە تەکلیفی شەرعی ئەوەیە کە ئـەو مرۆڤـە بەسەرپـشکی خۆیو حەزی خۆی بیکات، و بژاردەی دەستو دەرونی خۆی بێت، و هەروەها دەبێـت، جـێ بـەجێ کردنی تەکلیفی شەرعی، لەتوانای ئەو مرۆڤە جێ بەجێ کارەدا هـەبێت، بـەڵام بێگومـان کـە مرۆڤـ مرد، لە گشت توانایەك دەکەوێت، چونکە بە تەواوی ئیتر دەستەوەستاوو کۆڵەوارە.

بۆیە هەندێ لـە زانایـانی حەنـەفی گوتویانـە، کـە هـەر کەسـێ لـە ژیانـدا زەکـاتی لەسـەر بوویێتو نەیدابێت، ئیتر ئەوە نابێت، لەسـەر میراتەکـەی بـۆی بـدرێت، چـونکە مەبەسـت لـە ـانی زەکات، ئەوەیە کە ئەو کەسە خۆی ئەوکارە بکاتو، ئەمـە ئامـانجی خودایـە، تـا کـابرا ئاقی بکاتەوەو، کە مردووە، تازە ئەو مافەی لە دەست داوەو، دەبێت سزای بچێژێتو، تازە بە بریکاری بۆی جێ بەجێ ناکرێت!

لەلای هەندێ لە زانایـانی مەزهـەبی ئیمـامی شـافیعی ڕایـان وایـە، کـە زەکاتـدان بـەمردن ئەسـەر مرۆڤەکـە لا ناچێت، چـونکە بـە ڕای ئـەمان ماڵەکـەو سـامانەکە ئامانجەکەیـە، نـەك کـردەوەی خـودی زەکاتدەرەکـەو، دەکرێـت، ئـەو بەشـە زەکاتـە لـە میراتەکـە جیاکرێـتو بدرێتو، بۆیە کابرا بەمردن ئەو جێ بەجێ کردن (أداء)ـەی، لەسەر لاناچێتو، دەبێـت دوای مەرگ بۆی بدرێت.

بەڵام سەبارەت بە ئەهلیەتی واجب بوونی مافەکان بۆ مردوو، ئەمە پێشتر وتمان، ئەمەیان پەیوەنـدی دارە، بـە (پـەیمان: ذمـة)ـەوە، و جیـاوازیش نییـە، لـە نێـوان شـەرعزانانـدا کـە بێگومان ذیممە لەدوای مەرگ ئیتر نامێنێت، بەڵام سەبارەت بەو نەمانی ذیممەیـە ڕاسـتەوخۆ لە دوای مـەرگ، ئەمـە ڕاگـەلێکی شـەرعزانانی لەسـەرە[1]، کـە بـەم شـێوازەی لای خـوارەوە،

---

بوون تەڵاقدرابێتو، کابرای تەڵاقدراوی مێردی لەو نەخۆشی مەرگەیدا مردبێت، و هێشتا ژنەکـەی لـە عیددەدا بووبێت.

١ بڕوانە (الحق والذمة)، للشيخ علي الخفيف، ل٨٤-٩٥، أصول البزدوي وكشف الأسرار ، ب٤، ل١٤٣٣-١٤٣٧، (المغني)، ب٤، ل٣٨٥، و ب٦ ل٤٤٢ و (القواعد) لأبن رجب، ل١٩٣.

پوخت دەکەینەوە:

١٠٣- **گفتی یەکەم:** ڕایان وایەو، دەڵێن کە ذیمەلە دوای مردن ڕاستەوخۆ نامێنێتو لا دەچێت، چونکە بنەڕەتی ذیمە ژیانەو، بەمەرگیش مرۆڤ ژیان لە دەست دەدات، بۆیە ذیمەیش لا دەچێتو، هیچ ئەهلیەتێکی واجبێتی نە کامڵو، نە ناتەواوی بۆ نامێنێتەوە، و لە دەست دەدات، بەڵام سەبارەت بە قەرزەکانی سەرشانی مردوو ئەگەر ئەو مردووە میراتی بەجێنەهێشتبووو، هیچی نەبوو، ئیتر ئەوە دانەوەی لەسەر نامێنێتو، ئەگەر میراتی هەبوو، لە دوای خۆی، ئەوا هەر لەسەر شانیەتیو، دەبێت لەو میراتە بۆی بدرێتەوە، چونکە ئەو قەرزە پەیوەندی و کۆنتاکتی بە میراتەوە هەیە، کە لە دوای مردووەکە بە جێماوە، ئەم ڕایەش هەندێ لە زانایانی حەنبەلیش لەسەرینیو هاوڕان لەسەری.

١٠٤- **گفتی دووەم:** دەڵێن: پەیمانو ذیمەی مردوو لا ناچێت بەڵام لاوازیو وێرانی بەسەردا دێت، و لە کاتی لاوازبوونی ئەم ذیمەیەدا بە شێوەیەکی گشتی ئەهلییەتی واجب بوونی مافەکانی بۆ دەمێنێتەوە، بەڵام ئەم لاوازییەی ذیمەیەی کە مەرگ هێناویەتیە ڕێی توانای لە ئەستۆ گرتنی قەرزەکانی نییە، ئەگەر فاکتەرێك نەیەتە پێش بەهێزی بکات، بۆ وێنە ئەو میراتەی کە جێی هێشتووە، لەو بۆی بداتەوە یاخود کەسێك گەرەنتی (كفيل)بوو بێت لە پێشتردا کە ئەو قەرز بداتەوە بە قەرزدەر، بۆیە ئەم ڕێگایە چارەیەو ئەوەی پێشتر، ئەگەر هیچ کامیان لە ئارادا نەبوون، ئەوا قەرزەکەی لەسەر دەکەوێتو، لەسەر شانی نامێنێتەوەو، دەچێتە بازاڕی خودای مەزن. لە ڕوانگەی ئەم قسەیەوە بێت، دروست نییە، حساب بۆ ئەو کەفالەتە بکرێت، کە کەسێك ببێتە کەفیلوگەرەنتی قەرزارێك، کە بە موفلیسیو لەسەر ساجی عەلی مردبێتو، بەڵگەیش لەسەر لاچوونی قەرز لەسەر شانی قەرزار لەم حاڵەتەدا ئەوەیە کە داوای هیچی تری لێ ناکرێت، بۆیە داوای قەرزیشی لێ ناکرێت، بۆیە قەرز بەوە پێناسە کراوە، کە بریتیە لەو پێوەدانگو حاڵەتە شەرعییەی کە لەسەر بنەمای داواکردنەوەو داواکاری ڕێو شوێنی لەسەر گیراوەتە بەر و بێگومان داواکردن (المطالبة)یش، بە مردن دەسرێتەوە، و بۆیە قەرزیش کە لەم چوارچێوەیەدایە، ئەوەش لە کار دەکەوێتو لە سەری نامێنێت.

بەڵام گەرەنتی (کەفالەت) شتێکی ترەو، دروست نییە، کەفالەت بۆ کەسێکی موفلیسو نەبووی تەواو وەربگیرێت، چونکە کەفالەت بۆ شەرع داینەوە، کە کەسی یەکەم داوای ئەو مافەی لێ بکرێتەوە، نەك ئامانج تیایدا ئەسڵی زەکاتەکەبێت، بەبەڵگەی ئەوەی کە قەرز لەسەر شانی کەسی یەکەم هەر دەمێنێتەوە، تەنانەت دوای کەفیل دانیشو هەروەها

..كردنەوەیش لە كەسی یەكەم، بەمردنی ئەو كەسە لەسەری لا دەچێت، بۆیە دروست ـیـ. دوای لاچوونی ئەو مافە لەسەری بەهۆی مردنەوە هەر لێی داوا بكرێت، بۆیە مانای ئە.منتی (كەفالەت) لەم پرسەدا نافامرێتەوەو، پراكتیزە نابێت، كە خۆی كەفالەت بریتیە لە ـكردنی ذیممەی كەسێكو پەیمانەكەی بۆ سەر شانی كەسێكی تر، و داوا كردنی مافەكانی .. بۆیە كە مافەكە نەما، ئیتر گەرەنتی چی ؟ لەبەر ئەمەیە كەفالەت لەم دۆزەدا رێگا ـە.راوە.

ـۆیە كە قەرزی مردوو درانەوە و میراتەكەی پاك كرا، ئیتر ذیممەو پەیمانی لەسەر .مێنێت و، لا دەچێت، چونكە گرنگی مانەوەی ذیممە بۆ دانەوەی مافەكانو پاكلەمەی ..تەكەیە، و ئەم پێویستییەیش لە دوای ئەو حاڵەتانە نامێنێ، بۆیە كە پێویستیەكە نەما، ـ ذیممەیش بەتەواوی دەپێچرێتەوە و ئەمەیش راستییەكەو هەر دەبێت وا بێت.

ـ:١٠- **گفتی سێیەم:** ئەمانەیان رایان وایە كە ذیممەی مردوو دەمێنێتو لا ناچێت، و ـتر وا بەستەیە بە قەرزەكانی سەر شانیەوە و نەریتەكان وا دەخوازن، كە دەبێت ئەو ـ..انە لە میراتی مردووەكە بدرێتەوە، بە پێی ئەم رایە، دروستە كە گەرەنتیو كەفیل لە ـووی تەنانەت موفلیسیش وەربگیرێتو، تەنانەت ئەگەر كەسیش نەبێتە كەفیلی هەر ـ..ەكەی لەسەر شان لا ناچێتو، بەڵگەشییان بۆ ئەم رایەیان ئەوەیە كە كەسێك خۆی ـەخش بكاتو، بێت قەرزی ئەو كابرا موفلیسە بداتەوە، كە تەنانەت كەس نەبۆتە كەفیلی .ـەوەی قەرزەكانی، ئەمە كارێكی شەرعیو دروستەو، كەسی قەرزدەر مافی ئەوەی هەیە، ـە ئەو مافەی خۆی لە كەسی خۆ بەخش بەتەواوی وەربگرێتەوەو، داوای بكاتەوەو، ئەم ـەیش لە داواكردنەوەكە باڵاترەو، ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە قەرزەكەی لەسەر ـن هەر ماوەو لا نەچووەو، هەروەها بوونە كەفیلی كەسی قەرزاری موفلیس تەنانەت ـ..ندویش دروستە، هەرچەندە داواكردنەوەی بەتەواوی هێشتا لەسەر كەفیلەكە نییە جونكە خودی قەرزارەكە زیندووە، بۆیە كەواتە بوونە كەفیلی مردووی موفلیسیش هەر ـوستەو، ئەوەی كە پێغەمبەر (ﷺ) رێگای داوە، كە لە دوای مردن دەتوانرێت كەسێك ـێتە كەفیلی قەرزی قەرزار، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەو قسەیەی پێشوو، بۆیە كە قەرزەكانی مردوو درانەوە، و میراتەكەی دابەشكراو پاك كرایەوە، ئیتر ذیممەی ئەو كەسە لا دەچێتو ـەسڕێتەوەو، ئیتر هیچ ئەهلیەتێكی واجب بوونی شتەكان لەسەری نامێنێت.

## مەبەستی دووەم

## ( بەربەستە خۆکردەکان و بەدەستهاتووەکان: العوارض المکتسبة )

**یەکەم: (الجهل: نەزانین):**

١٠٦- نەزانین دژی ئەهلیەت (شیاوی) نییە، و پێچەوانەی نییە، لە گەڵێ، بەڵام لە هەندێ کاتدا، وەك بیانوو و پاساو وەردەگیرێت، ئیتر ئەم حاڵەتە یان لە (دار الأسلام)، پێگەی دەسەڵاتی موسوڵماناندا ڕوو دەدات، یان لە (دار الحرب)، واتە:، پێگەی دەسەڵاتی غەیرە مسوڵماناندا هەیەو ڕوودەدات.

**١٠٧- نەزانین لە (دار الأسلام)دا:**

پاسای بنەڕەتی وایە، کە نەزانین نابێتە پاساو لە (دار الأسلام)دا، چونکە نەزانین‌و هەوڵدان بۆی لەسەر گشت کەسێکی نیشتەجێی ئەوێ پێویستە، بۆیە کەسی مسوڵمان پاساوی لێ وەر ناگیرێت، بە بیانووی ئەوەی کە ئەو ئەحکامە گشتییە ئاشکرایانەی نەزانیوە، کە ڕێگە بە هیچ مسوڵمانێك نەدراوە، کە نەیانزانێت‌و، خۆی لێیان گێل بکات‌و، ئەم قسەیەش بە بەڵگەی قورئان‌و فەرموودەی موتەواتیرو ناسراو چەسپاوە، و هەروەها بە کۆڕا (إجماع) سەری گرتووەو چەسپاوە، وەك واجبی نوێژو، ڕۆژوو، حەرامی داوێن پیسی‌و ئارەق خۆری‌و کوشتنی بەناهەق‌و حەرام خواردنی ماڵی خەڵکی‌و، هتد.... و لەم یاسا گەلەدا تەنانەت کەسی (پەیماندار: ذمي) لێی ناچێتەدەرەوەو، لەسەر ئەویش چەسپاون‌و، نەزانین نابێتە پاساو بۆی، بۆ ئەوەی کە حوکمەکانی شەرعی بەسەردا جێ بەجێ نەکرێت، وەك کوشتنەوە، لە جیاتی قەتڵ‌و، سزادانی لەسەر داوێن پیسی‌و دزیکردن‌و، ئەمانەی لەسەر جێ بەجێ دەکرێن، چونکە نیشتە جێی (دار الأسلام)ـە، و زانین لە (دار الأسلام) فەرزە لەسەر هەموو تاکێك، بۆیە کە پەیمانکار مسوڵمانبووو، دواتر ئارەقی خواردەوە، ئەوا سزای لەسەرە، چونکە حەرامی ئارەق خواردن شتێکی بڵاو زانراوو ئاشکرایە لە (دار الأسلام)دا، و کەس ئەوەی بە پاساو بۆ ناهێنرێتە ئەژمار، کە گوایا نەیزانیوە! هەروەها کەسێك کە بەڕای تایبەتی خۆی، بچێت کارێك بکات، کە پێچەوانەی دەقی ئاشکرای قورئان‌و فەرموودەی مەشهور بێت، ئەمەش هەر وەك پێشوو وایە، لە وەیدا کە نەزانین ناکرێتە پاساو بۆی، نموونە بۆ یەکەم: واتە ئەوەی کە پێچەوانەی دەقی قورئانە، وەك ئەوەی کە پێی وابێت، ئەو سەر بڕاوەی کە بەتایبەتی (بسم الله)ـی، لەسەر نەکراوە، حەڵاڵە، ئەمە بەقیاسی ئەوەی کە

ئەگەر کەسێك بە هەڵە (بسم الله)ـی، نەکرد، و بیری چوو، سەربڕاوەکەی حەڵاڵە، واتە ئەمانەی قیاسی یەکتر کردن‌و، بۆیە حاڵەتی یەکەی حەلاڵ کرد، ئەمە پێچەوانەی ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا مِمَّا لَمْ يُذْكَرِ اسْمُ اللَّهِ عَلَيْهِ﴾[1] واتە: ئەوەی کە ناوی خودای لەسەر نەهێنراوە، مەیخۆن‌و، لە حاڵەتی دووەمدا واتە: ئەوەی کە پێچەوانەی سوننەتی مەشهوری پێغەمبەرە(ﷺ)، وەك درکاندنی حەلاڵی ژن، لە دوای ئەوەی مێردەکەی بە تەلاقی سێ بەسێ تەلاقی دابێت‌و، دواتر شووی بە کەسێکی تر کردبێت، یاخود کردبێتی‌و نەچووبێتە لای، حەلاڵی بکەیتەوە بۆ پیاوی یەکەمی، ئەمەیش پێچەوانەی سوننەتی مەشهوری پێغەمبەرە(ﷺ)[2].

بەلام نەزانین (جهل) دەبێتە پاساو، لەو ئیجتیهادو راگەلەدا کە پێچەوانەی قورئان‌و سوننەتی ناسراوو کۆڕای زانایان (إجماع) نین، وەك ئەوەی کە یەکێك لە سەرپەرشتیار (ولي)یەکانی، کەسی کوژراو، لە بکوژ خۆش ببن‌و، یەکێکیان بلێ، من نایکوژمەوە[3]، یاخود وەك مارەکردنی ژن بە بێ شایەت‌و، تەنها ڕایی کردنی بە ئاشکرا کردنی مارە کردنەکەو ڕاگەیاندنی[4].

---

[1] سورة (الأنعام ١٢١).

[2] ئەو ژنەی کە بە تەلاقی سێ بەسێ تەلاق درابێت، نابێت ببێتەوە بەژنی یەکەمی ، تا شوو بەپیاوێکی تر نەکات‌و، ئەویش سەر جێیی لە گەڵدا بکات‌و، دواتر لێی جیا ببێتەوە، ئیتر بەهۆی تەلاقدانەوە بێت، یان بەهۆی مەرحاڵەتێکی ترەوەو، دواتر عیددەی تەواو ببێت ئەو کاتە جا بۆ مێردی یەکەمی حەلاڵ دەبێتەوەو، دروستە مارەی بکاتەوە، بە گرێبەستێکی نوێ، جا مەرجی حەلاڵبونەوەکە ئەوەیە کە پیاوی دووەم سەرجێی لە گەڵدا بکات‌و سواری ببێت‌و، ئەمە ئەوەیە کە سوننەتی مەشهووری پێغەمبەر (ﷺ) درکاندویەتی،‌و کۆ ڕای شەرعزانانی لەسەرە، بەس ئەوەندە هەیە کە لە (سەعیدی کوڕی موسەیەب) گێڕدراوەتەوە، کە لەم پرسەدا ڕای پێچەوانەی ئەوە بووە، کە نوسیمان، بۆیە بڕیاردان‌و دەربڕین ئەوەی کە تەنها بە گرێبەستی لە گەڵ مێردی دووەم، ئیتر لە مێردی یەکەم بە بێ کاری سێکسی حەلاڵ دەبێتەوە، ئەمە قسەیەکی نادروستەو، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە نەزانین بەحوکمی دروست لەم بارەیەوە نابێتە بەڵگەو پاساو بۆ هیچ کەسێ، تا بچێت پێچەوانەکەی ئەنجام بدات.

[3] ئەگەر یەکێك لە سەر پەرشتیارەکان (ولی) یەکانی کوژراو لە بکوژ خۆش بووو، دواتر سەر پەرشتیارێکی تریان ڕۆیشت کابرای هەر کوشتەوە،‌و وای زانی کە هەموو یە کێکیان مافی تەواوی ئەوەی هەیە، کە بکوژ بکوژرێتەوەو تۆڵەی لێ بکاتەوە، لەم حاڵەتەدا ئەم کەسە کوشتنەوەی لەسەر نییە، چونکە جێگاکە هی ئیجتیهاد کردنە. (شرح مرقاه الوصول، ب٢، ل٤٥٢).

[4] بوونی شایەت، مەرجە بۆ دروستی ژن مارەکردن، بە بەڵگەی فەرموودەی (لانكاح. بلا شهود) مارە کردن بێ شایەت، دانامەزرێت، بۆیە هەرکەس ژنێکی بەبێ شایەت مارە کردو، تەنها ڕاگەیاندنی پرۆسەکەی بە

لێرەدا ئەوە تێبینی دەكرێت، كە سەرپەرشتیار (ولي الأمر)، كە دەسەڵاتی گشتی دەگرێتەوە، ئەگەر یەكێك لەو ڕا ئیجتیهادییانەی هەڵبژاردو فەرمانی كرد بەوەی كە خەڵكی شوێنی بكەونو، بە ڕاگەیاندنێكی ڕەهاو بەر بڵاو پرو پاگەندەو ڕیكلامی بۆ كردو ڕایگەیاندو خەڵك زانی، ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەم ڕا ئیجتیهادییە هەڵبـژێردراوە، وەك ئەحكام چەسپاوە گشتییەكانی تری لێ دێتو، كەس پاساوی ئەوەی لێ وەرناگیرێت، كە گوایا نەیزانیوە و هەروەها كار بەو ئیجتیهادە ناكرێت كە پێچەوانەی ئەم بێت، و ئینجا ئەو كەسەی كە ئاگادار نییە بە پێشهاتو ڕووداوەكانو، نایانزانێ ئەم زانینە پاساوە بۆیو، لێی وەردەگیرێت، وەك ئەوەی كە كەسێك ژنێك مارە بكات، كە شیریان پێكەوە خواردبێت، بەڵام نەیزانیبێت كە هۆی ئەو شیر خواردنەوە لەسەری حەڕام بووە، یاخود وەك ئەوەی كە كەسێك شەربەتی ترێ بخوات، نەیزانیبێت كە بۆتە ئارەق، ئەوە لەم دوو حاڵەتەدا تاوانی لەسەر نییەو، سزایش نادرێت، لەسەر ئەم كردەوانەی.

هەروەها وەك ئەوەی كە كەسێك موڵكەكەی خۆی بفرۆشێتو، دراوسێكەی ئاگادار نەكات، كە دەبێت ئاگاداری بكاتو، بەو دراوسێ شیاوترە بیكڕێت، كە ئەمە لە شەرعدا بە (شفعة) ناوزەد كراوە، یاخود كەسێك كە شەریكی هەیە، موڵكە شەراكەتەكەی بفرۆشێ بە بێ خەبەری شەریكەكەی، كە دەبێت ئاگاداری بكاتەوە، كێ دەڵێت: ئەو لێی ناكڕێتەوەو، بێگومان بەویش شیاوترە، بفرۆشرێت، ئەم نەزانینە بۆ كابرای ئەنجامدەر، لەم شوفعەیەدا پاساوە بۆیە كە مامەڵەكە ئاشكرابوو، حەقی شوفعەی بۆ هەیە.

هەروەها وەك، ئەوەی كە كەسێك لەلایەن كەسێكی ترەوە بەبریكار (وكیل) دابنرێت، و دواتر لە بریكاری بخات، بۆیە پێش ئەوەی كە بە لەكار خستنەكە بزانێت، هەڵسوكەوتو مامەڵەكانی دروستن[1]، چونكە هێشتا لە زانینەوە كردوونی.

---

بەس زانی بە بەڵگەی ئەم ڕێچكەیە دەڵێت: (أعلنوا النكاح و لو بالدف) ئەگەر بە دەف لێدانیش بوبێت، پرۆسەی مارە كردن ڕابگەیەنن، ئەوا ئەم زانینە لێرەدا قبوڵەو مارەكردنەكە دروستە، بەڵام لێرەدا ئەوە تێبینی دەكرێت، كە (طوسي) كە یەكێكە لە شەرعزانەكانی مەزهەبی جەعفەری گوتویەتی: لە لای شیعەكان، دروستی نیكاح نەبەستراوە، بەشایەتەوە! بڕوانە كتێبی (الخلاف)ی، طوسي، ب٢، ٣٦٣.

[1] شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٥٢.

## ١٠٨- ڕێ‌و ڕەسمی ئەم ڕێسا گەلە، لە یاسا دەسکردەکاندا:

ڕێسای یاسا مرۆڤکردەکان، لەم پرسەدا وایە، کە هەرکات ئەوزانیارییە بەو شێوازەی کە ئاواکراوەو دانراوە، بڵاو کرایەوەو، وەك ئەوەی کە لە ڕۆژ نامەیەکی فەرمیدا بڵاو کرایەوە، ئەوە زانینی پێویست دەبێت، لەسەر گشت لایەك‌و، کەس نەزانین نابێت بەپاساو بۆی، بۆیە یاسای جێگیرو چەسپاو لەم بارەیەوە ئەمەیە: بیانوی نەزانین لە یاسادا، وەرناگیرێت.

و ئەم ڕێسایە لە یاسا دەسکردەکاندا چەسپاوە، ئیتر یاسای مەدەنی بن، یان یاسای ناسەرەکی (جزئي) چونیەکە، و ئەم یاسایە هەڵاوێر (إستثناء) کردنی، زۆر کەسی تیادایە، وەك ئەمەی کە یاسای سزادانی میصری چەسپاندویەتی، کە دەڵێت: فەرمانبەری گشتی، ئەگەر تووشی کارێکی نایاسایی بوویەوە، سزانادرێت‌و، ئەگەر کارەکە لە چوارچێوەی فەرمانبەرایەتییەکەدا بوو، و فەرمانبەرەکە وایزانیبوو، یاساییە، بۆیە کردبووی![1]

بۆیە زانایانی یاسای تاوان، شێوە کۆڕاییەکیان لەسەر ئەوە هەیە کە نەزانینی یاسا پاساوە، ئەگەر نەیدەتوانی لە ئەرزی واقیعدا فێری ببێت‌و بیزانێت، وەك ئەوەی لە کاتی گەمارۆی جەنگدا لەسەر شارێك لە شارەکانی وڵات، یاسایەك دەربچێت، و بەڵام نەزانینی حاڵ‌و باڵی پێش هاتی یاساکان، ئەمیش دەکرێت، بکرێتە بیانوی لابردنی سزا لەسەر بکەری کارەکان.

- لەبەر ڕۆشنایی یاسای گشتیدا: وەك ئەوەی کە کەسێك پارەی تەزویر بەکار بهێنێت، و وا بزانێت کە یاساییە[2]!

## ١٠٩- نەزانین لە (دار الحرب)دا:

یاسای بنەڕەتی ئەوەیە، کە فەرز نییە، هەموو کەسێ زانیاری هەبێت، بە ئەحکامەکان، لەو جێگایەیدا کە غەیری مسوڵمان باڵادەستە، کە بە (دار الحرب) ناوزەد کراوە، چونکە ژینگەکەی ژینگەی ئەوە نییە کە مرۆڤ فێری ئەحکامی شەرعی ببێت، بەڵکو ژینگەی نەزانینی ئەحکامی شەرعە. بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر کەسێك لە (دار الحرب) مسوڵمان بووو، بەتەواوی ڕاستێتی واجب بوونی پەرستشەکانی لەسەری نەدەزانی، وەك نوێژو هتد....و ئەنجامی نەدەدان هەر کات زانی‌و فێر بوو، قەزاکردنەوەیانی لەسەر نییەو،

---

[1] ماددەی ٣ لە یاسای سزادانی میصری، ژمارە ٥٨ی ساڵی ١٩٣٧.

[2] شرح قانون العقوبات العراق- القسم العام- د. مصطفى كامل، ل١٩٥- ١٩٦.

هەروەها ئەگەر ئارەقی خواردوو نەیزانی بوو، کە حەرامە، ئەوە نەگوناهی لەسەرەو، نەسزا دەدریٚ، چونکە سزادان‌و تەکلیف کردن بە مەرجێك دەچەسپێن، کە دەبێت بە تەواوی‌و حەقیقی ئەو پەیامە گەیشتبێتە لای ئەوکەسە، یاخود بە تەقدیری‌و ئەندازە گیری بزانرێت، کە لەو ژینگەیەی ئەودا ئەو زانیارییە بڵاوە، و خەڵك دەیزانێت، و ئەوەیش هەیە، کە (دار الحرب) ئەو جێگایە نییە، کە ئەحکامی شەرع تیایدا بڵاوو ناسراوو زانراو بن![1]

## دووەم: هەڵە کردن((الخطأ)):

هەڵە دژی دروستی (الصواب)ـە، مەبەست پێی ئەو شتەیە کە لەبەرامبەر کاری دەست ئەنقەست (عمد) بەکار دەهێنرێت، و ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش (ﷺ)لە مەوەیە هاتووە، کە دەفەرموێت: (إن الله وضع عن أمتي الخطأ والنيسان و ما استكرهوا عليه)، واتە: خودای مەزن، لە سێ شتدا چاو پۆشی لە ئوممەتی موحەممەد (ﷺ) کردووەو، سزایان نادات، ئەگەر لەو سێ حاڵەتەدا کاری تاوانیان ئەنجامدا، کە ئەو سێ حاڵەتەش بریتین لە، بەهەڵە ئەنجامدانی ئەو کارە، یان بە لە بیرچوون بیکەن، یان بەزۆر تاوانیان پێ بکەن‌و، لە توێژینەوەی بەر بەستیەکانی ئەهلیەتی تاکە کەس، بۆ کەوتنە سەرشانی ئەرکەکان، توێژینەوەو ڕاڤەی ئەم مانایە، ئامانجە تیایداو، دەکرێت بەوە پێناسە بکرێت، کە بریتیە لە ڕوودانی گوفتار یان کرداری مرۆڤ بە پێچەوانەی ئەوەوە کە دەیەوێت‌و، ئەمەش پێچەوانەی هیچ کام لە دوو شێوازەکەی ئەهلیەت نییە، چونکە عەقڵ شیاوو لە بارە بۆ هەڵە کردن، بەڵام لە گەڵ ئەوەشدا دەکرێت، کە هەڵەکردن ببێتە پاساو بۆ ئەوەی کە هەندێ مافی خودایی هەن، لەسەر شانی هەڵەکارەکە لابچن‌و لە سەریان سزا نەخوات، وەك، هەڵەکردنی موفتی، یاخود ئەو هەڵەیەی کە دەبێتە هۆی لێشێوانی ڕووگە لە کەسێك، بە هۆی ئیجتیهادی تایبەتی خۆیەوە،و هەروەها دەکرێت کە هەڵەکردن ببێتە دەلاقەیەکی گومان ئامێز (شبهة) بۆ لابردنی سزا لە هەڵە کارەکە، ئەگەر ئەو سزایە سەر بەمافی خودایی بوو، وەك، سزاکانی تاوانەکان، وەك سزای داوێن پیسی.

هەروەها لە مافەکانی بەندەکانیشدا، ئەگەر مافەکە سزادان بوو، وەك کوشتنەوە، لە جیاتی قەتڵ کردن، دەکرێت، هەڵە ببێتە هۆکار بۆ لادانی سزاکە، بۆیە کوشتن ئەگەر بە

---

[1] التلويح، ب٢، ل١٨٤– ١٨٥.

هەڵە بوو، ئیتر کوشتنەوەی لەسەر واجب نییە، چونکە کوشتنەوە (قصاص) سزایەکی تەواوە، و سزای تەواویش لەسەر کەسێ کە بەهەڵە کارێکی کردبێت، واجب نابێت، چونکە پاساوی هەیەو، بەڵکو لە کوشتنی هەڵەدا، خوێن دان بەماڵو موڵك (دیة) واجب دەبێت، چونکە جێگرەوەی جێگا خراپ بووەکەیەو، لەسەر کەسوکاری بکوژ پێویستە کە لە ماوەی سێ ساڵدا ئەو پارەیە کۆ بکەنەوە، چونکە کوشتنی بە هەڵە شیاوی ئەوەیە کە ئاسانکاری تیادا بکرێت، و ئەوانەی کە پەیوەندی خزمایەتیو ماف خەڵات دانیان هەیە، بە کەسە کە کردەوەکەی ئەنجام داوە، دەبێت هاوکاری بکەنو خوێنەکەی بدەنو خوێندانیش لە لایەن کەسوکارەوە، سەر بە بابەتی خزمایەتیو دۆستایەتیو ئەوانەیە، و دەبێت بێ بەرامبەر ئەو بۆشاییەی بۆ پڕ بکەنەوەو چونکە ئەو خوێندانە لە بەرامبەر شتی تردا دانەنراوە.

بەڵام سەبارەت بە مافە داراییەکانی خەڵکی، وەك خراپ کردنو لە ناو بردنی ماڵی خەڵك بە هەڵە، ئەوە لەم حاڵەتەدا بژاردنی پێویستەو، بە هەڵە کردنو خراپ بوونو لە ناو بردنی نابێتە پاساو بۆ نەبژاردنەوەی، چونکە ئەو بژاردنە لە جیاتی ماڵەکەی کابرایە کە خراپ بووەو، لە ناو چووە، نەك لە بەرامبەر کردەوەکەداو، ئەم بژاردنە پەیوەستە بە پاراستنی شتەکەوەو، پرسی ئەوەی کە هەڵە کار بە هەڵە ئەو ماڵەی لە ناو بردوەو، بیانووو پاساوی هەیە، ئەم حاڵەتە دژی پرسی پاراستنی شتەکە نییە.

ئینجا سەبارەت بە مامەڵەکان، هەڵە نابێتە پاساو بۆ بەرگرتن لە بەستنی گرێبەستو، کار پێنەکردنیو، ئەمەش ڕای هەندێ لە زانایانی حەنەفییە، تەنانەت ئەگەر بەهەڵە ژنەکەی تەڵاقدا، ئەوا تەڵاقەکانی دەکەونو، هەروەها مامەڵەی کەسێ بەهەڵە مامەڵەکەی کردبێت، هەر دروستەو، گیرساوەو چەسپاوە، چونکە لە بنەڕەتدا بە دەستی خۆی کارەکەی کردووەو، (أختیار)ـی، بووە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ڕازی بوونی تیادا نییە، هەڵدەوەشێتەوە[1]، بەڵام لە لای جەماوەری زانایانی، وەك شافعییەکانو جەعفەرییەکانو هی تریش، پێیان وایە کە تەڵاقی کەسێك کە بە هەڵە تەڵاقی خستبێت، ناکەوێت، و هیچ کارێك بە گوفتارە زارەکییەکانی تریش ناکرێت،[2] بەڵگەی جەماوەری زانایانیش ئەوەیە کە قسە

---

[1] شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٦٠.

[2] منهاج الصالحين، لە فيقهی جەعفەریدا، دانانی، محسن الحكيم، ب٢، ل١٨٢، والخلاف، للطوسي، ب٢، ل٦٤٦، (سبل السلام) ب٣، ل٢٣٧، تحفة المحتاج، لأبن حجر، ب٣، ل٣٦٦– ٣٦٨، قواعد الأحكام، للعزّ بن عبدالسلام.

حسابی بۆ دەکرێت، کە نیازی دروستی لە پشتەوەبێتو، بێگومان کەسی هەڵ کار لە نیازیدا دروستی بەدی ناکرێت، بۆیە حساب بۆ گوفتارەکەیشی ناکرێت، هەر بۆیەش گوفتاری کەسی خەوتوو، و بووراوە حسابی لەسەر ناکرێت، چونکە مەبەستی لە پشتەوە نییەو، بۆیە هەڵە کاریش هەروایەو، رایان ئەوەدەردەخات، کە ئەو شتەی لە دەم دەردەچێت بە گوێرەی نیازو مەبەستی بێژەر حساب بۆ دەلالە کەشی دەکرێتو، هەروەها بە گوێرەی ئیرادەو ویستی ئەو بێژەرە مانەکەی بۆ دادەنرێتو ئەوەی دەری بریوە، دەچەسپێت، بۆیە هەرکات ئەو مەبەستە نەما، ئیتر قسەکە بەبێ بنەماو قەشمەریان دێتە ئەژمارو هیچ رێو شوێنێکی لەسەر ناگیرێتە بەر[1]و، ئەم فەرموودەیەش کە دەفەرموێت: (رفع عن أمتي الخطأ والنسيان، و ما استكرهوا عليه)، چەسپێنەری ئەو گوفتانەیە کە درکێنران.

بەڵام حەنەفیەکان بەم جۆرە بەرپەرچی رای جەماوەری زانایان دەدەنەوە کە بێ مەبەست لە تەڵاقی کەسێکدا کە بە هەڵ تەڵاقەکەی خستبێت، لەو کارو بارە شاراوانەن، کە ناکرێت لەسەریان هەڵوەستە بکرێتو، باڵغی ئەو کەسەو ژیرییەکەی لە جێی ئەو مەبەستە دانراون، لە تەڵاق خستنەکەدا، چونکە هۆکاری ئاشکرای (ظاهر) لە کاتی شاراوەییداو، سەختی پەی بردن بە ماناکاندا، لە جێی ئەو شاراوەیی (الخفاء) دادەنیشێتو، ئەگەر بۆ خۆی ئاشکرا (ظاهر) بوو، ئیتر پێویست ناکات، کە هیچ شتێك لە جێگایدا دابنیشێت، بۆیە باڵغیوژیری لە جێی مەبەست (قصد)ـی، کابرا، لە تەڵاقەکەیدا دانانیشن، وەك چۆن رازی بوون، بۆ کەسی خەوتووو، بووراوە هیچ حسابێکی بۆ ناکرێت، چونکە مەبەست بوونو، رازی بوون لە دوو حاڵەتداو بۆ ئەو دوو جۆرە کەسە لەو کردەوە ئاشکراو زانراوانەن، کە هیچ شتێك لە جێگایان دانانیشێت[2].

ئەوەی ئێمە لێرەدا بە رای باشترو پەسەندی دەزانین، رای جەماوەری زانایانە، و پێویستە کار بە سەرجەمی گوفتارەکانی کەسی هەڵەکار نەکرێت، نە تەڵاق خستنو نەهیچ مامەڵەو هەڵوێستێکی زارەکی تری، بەڵام بە مەرجێك ئەو هەڵەکردنەی بچەسپێت.

[1] إعلام الموقعين، لأبن القيم، ب٣، ل٥٥، و ب٤، ل٧٢، و التوضيح،ب٢، ل١٩٥.

٢ التلويح، ب٢، ل١٩٥.

## سێیەم: قەشمەریو شۆخی (الهزل):

**الهزل:** مانای بەكار هێنانو دانانی شتێكە، لە غەیری ئەو جێگایەدا، كە ویستراوە هەبێت[1]، خۆی لە ڕووی عەقڵیەوە قسەو گوفت بۆ ئەوە دانراوە، تا مانای حەقیقی یان مەجازی هەر شتێك بدات بەدەستەوەو، هەڵسوكەوتو بە كار هێنانی گوفتی شەرعی، بۆ ئەوە دانراوە، تا مانای حوكمەكەی پێ بفامرێتەوە، و بۆیە هەركات قسە لە غەیری جێگا عەقڵیەكەی خۆیدا بەكار هێنرا، و مەبەست لەو بەكار هێنانە، بەكارهێنانێكی شەرعییانە نەبوو، لە جێگای خۆیدا و سودی فامانی حوكمەكەی بە هیچ جۆرێك نەداو ڕاڤەی حوكمەكەی نەكرد، ئەوە بە قەشمەریان (الهزل) ناوزەد دەكرێت، كەسی قەشمەر بەویستی خۆیەتی قسە دەكاتو دەردەبڕێتو، مانای قسەكانی خۆی دەزانێت، بە بێ ئەوەی مەبەستی هەبێت بۆ بەدیهێنانی ئەو شتانەی كە لە قسەكان بەدی دێنو، هەروەها ئەو كەسە قەشمەرە گرێبەستو مامەڵەكان بە ویستو ڕازی بوونی خۆی ئەنجام دەدات، بەڵام نایەوێت حوكمیان لەسەر بەرپا ببێتو، ڕازی نییەو نابێت، بەچەسپانی ئەو گرێبەستو مامەڵانە و بە بژاردەی خۆیی نازانێت،[2] و ئەم حاڵەتە دژو پێچەوانەی ئەهلیەتی واجب بوونی مافەكانو ئەهلیەتی جێ بەجێ كردن (الأداء) نییە، بەڵام سەبارەت بە هەندێ لە ئەحكام، بەنیسبەتی كەسی قەشمەركارەوە، كاریگەری دەبێت.

**پوختەی ئەم قسەیە، ئەو مامەڵە زارەكیانەی كە پەیوەستن بە قەشمەریان (الهزل)ەوە، دەبنە سێ بەشەوە:**

– **الأخبارات:** ئەو گفتانەی پەیوەندیدارن بە هەواڵدان بە شتێ.

– **الأعتقادات:** ئەو گفتە زارەكیانەی پەیوەندیدارن بە بیرو باوەڕەوە.

– **الأنشاءات:** گفتە پەیوەندیدارەكان، بە دروستكردنو دامەزراندنی مامەڵەكانو، هەر بەشە لە مانە، حوكمی تایبەتی خۆی هەیە.

١١٢– **الأخبارات:** بریتی یە لە دانپیانانەكان، كە بە هۆی شۆخیو قەشمەریاتەوە بەتاڵ دەبنەوە، ئیتر پێگەی ئەو هەواڵو دانپیانانە لە هەر جێگەیەكدا بێتو، هەرچی بێت،

---

١ كشف الأسرار، ب٤، ل١٤٧٧.

٢ كشف الأسرار، ب٤، ل١٤٧٧.

چونیەکە، چونکە دروستی دان پیانان بەستراوە بە دروستی هەواڵ پێدراوەوە،و قەشمەریش بەڵگەیەکی ڕونە لەسەر درۆیی ئەو شتەی کە هەواڵی لەسەر دراوەو، دانی پیاناوە، بۆیە کار بەو دان پیانانە ناکرێت، بۆیە هەر کەس بە گاڵتەو گەپەوە بڕیاری فرۆشتنی شتێ، یان مارەکردن، یان تەڵاقی دانی ژنێکی دا، ئەوە دانەمەزرێتو، هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعی لەسەر دان پیانانو مامەڵەی ناگیرێتە بەر، تەنانەت ئەگەر قەشمەرکارەکەش مۆڵەتی دابێت، لەسەری، چونکە مۆڵەتدان بۆ شتێکە کە چەسپابێتو جێگیر بوبێتو، بۆی هەیە دروست بێتو بۆشی هەیە، کە بەتاڵ دەبێت، بۆیە مۆڵەتدا بۆ شتێك نابێت، کە هەر لە بنەڕەتدا نەچەسپابێت، هەر وەك مۆڵەتدان شتی درۆ ناتوانێت بکات، بەڕاست.

١١٣- **الأعتقادات:** بیرو باوەڕ، کە بریتیی یە لەوو گفتو قسانەی کە پەیوەندیدارن بە بیرو باوەڕی مرۆڤەوەو، لەم حاڵەتەدا قەشمەریات نایخوات، و نابێتە پاساو بۆ ئەوەی ئەو قسانە نەکرێت، بۆیە هەر کەس بە گاڵتەوە کوفرێکی کرد، بە هەڵگەڕاوە لە ئیسلام دێتە ئەژمار، و ئەمە حوکمەکەیەتی، هەرچەندە کابرای قەشمەر مەبەستی لەو قسەیە هەڵگەڕانەوە نەبووبێتو، نەیویستبێت کافر ببێت، چونکە تەنانەت بە گاڵتەوە قسە کردنیش لەسەر ئیسلامو کوفر کردن، سوکایەتیو تەوهینە بە ئیسلام و سوکایەتی کردنیش کوفرە، بۆیە ئەو کەسەی کە ووشەی کوفر دەربڕێت، بەو گاڵتە کردنە دەبێتە هەڵگەڕاوەو، هەرچەندە مەبەستیشی نەبووبێت، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَئِن سَأَلْتَهُمْ لَيَقُولُنَّ إِنَّمَا كُنَّا نَخُوضُ وَنَلْعَبُ قُلْ أَبِاللَّهِ وَآيَاتِهِ وَرَسُولِهِ كُنتُمْ تَسْتَهْزِئُونَ ﴿٦٥﴾ لَا تَعْتَذِرُوا قَدْ كَفَرْتُم بَعْدَ إِيمَانِكُمْ ﴾[1]. واتە: ئەگەر لێیان بپرسیت سەبارەت بە گاڵتەکردن بە خواو ئایەتەکانیو پێغەمبەری خوا ئەڵێن بە ڕاستمان نەبوو، بەڵکو تەنها گاڵتەو گەپمان دەکرد، جا پێیان بڵێ، ئایا گاڵتەتان بەخەواو ئایەتەکانیو بە پێغەمبەرەکەی کردبوو؟! بڵێ بڕو بیانووی بێ جێ مەهێننەوە، چونکە پاش ئەوەی کە باوەڕتان هێنا، کافربوونەوە.

پاشان سەبارەت بە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام (الردة) ئەحکامی دنیایی زۆر هەن، کە دەگیرێنە بەر، لەوانە جیاکردنەوەی ئەو دوو ژنو پیاوە لە یەکتریو چەندەها ئەحکامی تریش کە لە کتێبەکانی فیقهی ئیسلامیدا یەکالا کراوەتەوەو باسکراون.

---

١ سورة (التوبة/ ٦٥).

١١٤- **الأنشاءات:** كە مانای بە گەڕخستنی ئەو فاکتەرانەیە، کە حوکمە شەرعییە بڕیار دراوەکانیان لەسەر بنیات نراوە، وەك کڕینو فرۆشتنو بەکرێدانو، دیکەی گرێبەستو مامەڵەکان، **کە ئەمەیش دوو جۆرە:**

**جۆری یەکەم:** ئەمەیان بەگاڵتە کردن بە تاڵ نابێتەوە، وەك مارە کردنو تەلاقدانو گێڕانەوەی ژنی تەلاقدراو، بەبەڵگەی ئەم فەرمودەیەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: ((ثلاث جدهن، و هزلهن جد، النكاح والطلاق و الرجعة))، واتە سێ شت هەن، بە جۆشو خرۆش لێیان بنەوی، هەر بەجۆشو خرۆش (جدي) سەیردەکرێنو، بە گاڵتە بەکار بهێنرێن، هەر بە جیددی سەیر دەکرێن، ئەو سێ شتەش بریتین لە مارەکردنی ژنو، تەلاقدانی ژنو بڕیاردان بە گێڕانەوەی ژنی تەلاقدراو، ئەم سیانە گاڵتە کردنیان تیادا نییە، و ئەمە ئەو جۆرە مامەڵەو هەڵسوکەوتانەیە کە هەڵوەشانەوە هەڵناگرن.

**جۆری دووەم:** ئەم جۆرەیان گاڵتەکردنو قەشمەریات کاری تێدەکاتو، بە تاڵی دەکاتەوە، یان هەڵی دەوەشێنێتەوە، وەك، فرۆشتنو بە کرێدانو، دیکەی ئەو مامەڵانەی کە هەڵوەشاندنەوە[1] دەیانگرێتەوە، ئەمەش لە بەر ڕۆشنایی ئەو درێژە باسەی کە لە کتێبە فیقهیە جۆراوجۆرە کاندا باسکراوەو، ئاماژەی پێدراوە.

هەندێ لە شەرعزانان (فقهاء) پێیان وایە کە ئەم جۆرە مامەلانە سەرەڕای ئەوەی کە بە گاڵتەو قەشمەری ئەنجامدراون، هەر دروستن، ئەمەش وەك بەبەردابڕین (قیاس) کردنی دروستی نیکاحو تەلاقدانو، گێڕانەوەی ژنی تەلاقدراو، چۆن بە گاڵتەیش بێت، هەر دادەمەزرێت، ئەمەیش هەر وایەو، ئەو زایانانەی کە جیاوازیان لە نێوان ئەم دوو جۆرە دا کردووە، ئەوەیان کردووە بە بەڵگە کە ئەو فەرمووودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەندێ لە مامەڵەکان بە جددی کاریان تیادا بکرێتو، بە گاڵتە بکرێت، چونیەکنو، هەشیانە کە بە جددی بونو گاڵتە جاڕیان چونیەك نییە، چونکە ئەگەر هەمووی لە یەك پلەدا بوونایە، ئەوا فەرموودەکە بەو دەقە دەهات، کە سەر جەم گرێبەستەکانی کەسی گاڵتە جارو هەڵسو کەوتەکانی بە گاڵتە کردبنی، یان بە جددیو خروشان کردبن چونیەکنو، لە ڕووی ئەم مانایەوە، ئەوە دەفامرێتەوە، کە لە نیکاح کردنی ئافرەتو هاوێنەکانیدا مافی خوای مەزنی تیادایەو، هەر شتێکیش وابوو، ئەوا بۆکەس دروست نییە، کە گاڵتە جاڕیو قەشمەریاتی

---

[1] الأشباه والنظائر،لأبن نجيم، ب١، ل٣٥.

تیادا بکات و هەرکات هۆکارەکەی هاتەدی و حوکمەکەیشی دەچەسپێتو دێتە جێ، هەرچەندە مەبەستیشی تیادا نەبێت، وەك ئەوەی کە ووشەی کوفر بدرکێنێت، چونکە دروستە نییە، بۆ مرۆڤ کە لە گەڵ خودای خۆیدا گاڵتە بکاتو، قەشمەری بە ئایەتەکانی بکات، ئەمەش بە پێچەوانەی ئەو مامەڵە داراییانەی کە تەنها مافی بەندەکانیان تیادایەو، ئەمانەیان بەقەشمەری بەتاڵ دەبنەوەو، هەڵدەوەشێنەوەو، حوکمەکەی ناچەسپێت، چونکە خودی کەسی گاڵتە جاڕ بە حوکمەکە ڕازی نیەو، هەروەها لە بەر ئەوەیە کە نەریتی مرۆڤ وایە، کە جارو بار لە گەڵ خەڵکی تردا گاڵتەو قەشمەریات دەکاتو، بۆیە حوکمی بەسەردا ناچەسپێت، تا خۆی ڕازی نەبێت.[1]

## چوارەم: ((السفه : دەبەنگیو گەمژەیی))

(السفه)، لە زمانی عەرەبیدا بە مانای (الخفة: سادەیی ) دێتو، لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا، بریتی یە لە بەکارهێنانی موڵكو سامان لە غەیری ئەو شێوازەیدا کە شەرعو عەقڵی مرۆڤ داوای دەکەن، هەرچەندە کابرایش خاوەن عەقڵە ![2]

بۆیە (السفه: گەمژەیی) لە ڕیزی بەر بەستە مرۆڤکردەکاندا ژمێردرا، چونکە کەسی گەمژە، بەپێی بڕاردەو حەزو ڕازی بوونی خۆی کارە کە بە پێچەوانەی عەقڵەوە ئەنجام دەداتو[3]، ئەم حاڵەتەیش دژی ئەهلیەت نییە، و کەسی گەمژە (سفیه) ئەهلیەتی تەواوی هەیەو سەر جەم تەکلیفە شەرعیەکانی ڕوو بەڕوو کراوەتەوەو دەیگرێتەوە، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە ئەو گەمژەییە کار لە هەندێ لە ئەحکامە شەرعیەکانی سەری دەکاتو، شوێنەواری ئەم کاریگەری گەمژەییە لەسەر مرۆڤە کە لە وەدا دەر دەکەوێت، کە مندالْ هەرکات زانرا گەمژەیەو نەزانە ئیدی داراییەکەی لێ دەگیرێتەوە و چاودێری دەخرێتە سەر، و هەروەها لەوەدا دەردەکەوێت، کە (سانسۆر: حِجْر) دەخرێتە سەر کەسی بالْغی عاقلْ، ئەگەر (گەمژە: سفیه) بوو، و پێویستە دەربارەی ئەم دوو پرسەو ئەحکامە پەیوەندیدارەکان پێیەوە، بەکورتی بدوێین، و قسە لەسەر (پرسی گەمژەیی) بکەین، لە یاسای مەدەنی عێراقیو میصریدا.

---

١ إعلام الموقعين، ب٣، ل١٠٩- ١١١، المدونة الكبرى، ب٢، ل١٦١.

٢ شرح المنار، ل ٩٨٨.

٣ شرح مرقاة الوصول، ب٢، ل٤٥٨.

- پرسی یەکەم: دەربارەی پێدانی دارایی بە کەسی گەمژە کە تەمەنی گەیشتبێتە سەردەمی باڵغ بوون:

١١٥- جگە لە ظاهیریەکان، شەرعزانان ناکۆکن لەسەر ئەوەی کە منداڵ گەورە بووو، گەمژە دەرچوو، ئەوا ماڵەکەی نادرێتەوە دەستی، تا خۆی بەکاری بهێنێت، لە بەر ئەم ئایەتە پیرۆزە کە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُؤْتُوا۟ ٱلسُّفَهَآءَ أَمْوَٰلَكُمُ ٱلَّتِى جَعَلَ ٱللَّهُ لَكُمْ قِيَـٰمًا﴾[1] واتە: ماڵو سامانی خۆتان مەدەنە دەستی جاحیڵو نەزان خەرجەکان، ئەو هەتیوانەیش کە هێشتا پێ نەگەیشتونو نەزان خەرجن، جا ئەگەر سامانێکیان هەبێت، لای خۆتان ڕایگرنو مەیدەنە دەستیان، کە خوای مەزن کردوویەتیە هۆکاری نەشونماو ژیانو گوزەرانتان.

کە واتە: کاتێک ئەو داراییانەیان دەدرێتەوە دەست، کە فامیان کردبویەوەو چاکو خراپیان لە یەکتر جیادەکردەوەو، دەزانی ئەمەیش بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾[2] واتە: هەتیوان بخەنە ژێر تاقی کردنەوە، هەتا دەگەنە تەمەنی باڵغ بوونو ژن خواستنو توانای ژنو مێردی، واتە بە جارێ ماڵە کە مەکەنەوە مشتیان، بەڵکو جارو بار شتێکیان بدەنیو چاودێریان بن، بزانن فامیان کردۆتەوە، ئەو کاتە ئێوەش بە بێ دواکەوتن، پارەو سامانەکانیان بدەنەوە.

کەواتە بە گوێرەی دەقی ئەم ئایەتە پیرۆزە، دانەوەی ماڵو دارایی بەو کەسانە. ئەوە بە مەرج گیراوە تیایاندا کە دەبێت، باڵغ بووبنو، فامدار بن.

ظاهیریەکان دەڵێن: ماڵو دارایی بەو کەسە دەدرێتەوە، کە عاقڵ بێت، چونکە فامکردنەوە(رشد) لای ئەوان ئەوەیە کە باڵغو عاقڵ بێتو، گەمژەیی (سفه) لای ئەوان بریتیە لە بێ عەقڵی، بۆیە هەر کەسێ گەیشتە قۆناغی عاقڵی، ئەوە فامی کردۆتەوەو چاکو خراپ جیاکردنەوەی تیادا هاتۆتە دیو، پێویستە ماڵو داراییەکەی بدرێتەوە دەست[3]، بەڵام جەماوەری زانایان ڕایان وایە کە (رشد: فامداری) بریتیە لە بوونی عەقڵێکی چاکسازو،

---

١ سورة النساء (٥).

٢ سورة النساء (٦).

٣ المحلى، لأبن حزم، ب٨، ل٢٨٦- ٢٨٧.

توانابوونی ئەو کەسە بۆ پاراستنی ماڵ و داراییەکەی خۆی[1]، مەرج نییە هەموو عاقڵێ فامدارو زانا بێت و بە پێچەوانەوە هەموو فامدارو ژیرێ، عاقڵە!

لە لای جەعفەرییەکان، کەسی (ڕەشید: ژیرو خاوەن ڕوشد) ئەوەیە کە باڵغو عاقڵ بێت، و بزانێت موڵکی خۆی بەچاکی بەکار بهێنێت، لە دیندا ڕاستاڵ بێت[2]، ڕەشیدیو فامداری تەنها بەتوانا بوون بە پاراستنی دارایی نایەتەدی، بەڵکو جگە لەم پاراستنی ماڵە دەبێت ئەو کەسە لە دینەکەیشیدا ڕاستاڵی هەبێت، بەڵام وادیارە ئەم پرسە جێگای کۆکبونی سەر جەم زانایان نییە، هەندێ لە زانایانی موجتەهیدی دواینیە، ئیجتیهادی تایبەت بەخۆیان لەم بارەیەوە هەبووە و دەڵێن کەسی (ڕەشید: بزان) ئەوەیە کە بزانێت بە چاکی موڵکو ماڵی خۆی بەکار بهێنێت و ئەوەیان تیادا بەمەرج نەگرتووە، کە لە دیندا ڕاستاڵ بێت![3]

## ١١٦- مەبەست لە چاو کرانەوەو تێگەیشتن (الرشد):

ئایا مەبەست لە (ڕوشد)، حەقیقەتی تێگەیشتنو ڕوشدەکەیە، یان مەبەست ئەو قۆناغەیە کە تێگەیشتنو چاو کرانەوەو ڕوشد تیایدا بەر جەستەیەو بوونی هەیە، دێتە دی، لەم بارەیشەوە شەرعزانەکان دوو ڕایان هەیە:

**گفتی یەکەم:** دەڵێن مەبەست لە (ڕوشد) حەقیقەتی ڕوشدو پێگەیشتنو، دەبێت بەبێ دوو دڵی بێتە دیو بزانرێتو بناسرێت کە هاتووەتەدی، نابێت شتێکی تر بخرێتە جێگاکەی، وەك ئەوەی بچین تەمەنێکی دیاریکراوی بخەینە جێگا، یان هەر شتێکی تری لەم بابەتەو، لە ڕوانگەی ئەم ڕایەوە بێت، منداڵ لە دوای باڵغ بوونەوە داراییەکەی ڕادەست ناکرێتەوە، تا ئاستی تێگەیشتن (ڕوشد)ـی، دەچەسپێت، ئیتر تەمەنی هەر چەند بێت! و تەنانەت ئەگەر بووبێتە کابرایەکی پیریشو، ئەمەش ڕای جەماوەری زانایانی شافعیو مالکیو حەنبەلیو جەعفەرییو ئەبو یوسفو موحەمەدی هاوەڵانی ئەبوو حەنیفەیە[4].

- بەڵگەی ئەم گفتەی کە ڕابورد، ئەمانەیە:

یەکەم: دانەوەی دارایی لە دوای باڵغ بوون، بەستراوە بە ڕوشدو ئاستی تێگەیشتنی

---

١ التلويح، ب٢، ل١٩١.

٢ الخلاف، للطوسي، ب٢، ل١٢١.

٣ منهاج الصالحين، محسن الحكيم، ب٢، ل١١٣.

٤ المغني، ب٢، ل٤٥٧، الطوسي، ب٢، ل١٢١، محسن الحكيم، ب٢، ل١١٣.

كەسەكە، بۆیە ئەگەر كەسەكە ڕوشدی نەبوو،و ئەمەیش چەسپا، ئەوا دروست نییە، ئەو ..ارایە بدرێتەوە بەو كەسە باڵغە، چونكە ئەو مەرجەی كە بەستراوە پێیەوە پێش بوونی مەرجەكە بەنەبوو حسابە.

دووەم: كەسی گەمژە (سفە) لەوەیدا كە داراییەكەی سانسۆری دەخرێتەسەر، لەمەدا ..ك شێتو، دەبەنگ و كەودەنگ وایە، كە ئەم دووجۆرە نابێت داراییەكەیان بدرێتەوە ..دەست، ئیتر چونیەكە تەمەنیان گەشتبێتە بیستو پێنچ ساڵ، یان زیاتر هەر وەك یەك وایە، هەر وەك چۆن پێش ئەو تەمەنەیش هەر قەدەغە بووە، بیاندرێتەوەو، گەمژەییی (سفە)یش هەر وایە[1].

**گفتی دووەم:** قسەی ئەبوحەنیفەیە كە دەڵێت: مەبەست لە (ڕوشد) حەقیقەتی ڕوشد و تێگەیشتنەكەیە، (كە باسمان كرد)، پێش گەیشتنی بەتەمەنی بیستو پێنچ ساڵانو، لە ..وای ئەو تەمەنە دەبێت، بەقۆناغی ڕوشدەكە گەیشتبێت.

بۆیە هەر كەس گەیشتە قۆناغی ڕوشدو، ئەم پێگەیشتنو ڕوشدەی چەسپا ئیتر داراییەكەی ڕادەست دەكرێتەوە، هەر چەندە تەمەنیشی نەگەیشتبێتە بیسو پێنچ ساڵانو، ئەگەر گەیشتبووەیە ئەو تەمەنە بەڵام ڕوشدی نەبوو، یاخود نەدەزانرا، ئایا ڕوشدی هەیە، یان نا.... ئەوا چاوەڕوان دەكرێت، تا دەگاتە بیستو پێنچ ساڵیو، كە گەیشتە ئەو تەمەنە ئیتر ڕوشدەكە دەچەسپێتو، ڕەشیدو تێنەگەیشتوو، پێشكەوتە دێتە ئەژمارو، داراییەكەی ڕاست دەكرێتەوە، ئیتر ڕوشدەكەی زانرابێت، یان نەزانراوبێت، هەر چونیەكە، چونكە ئەو تەمەنە، پێگەی پێگەیشتنەو چاوەڕێی ئەوە دەكرێت، كە لەو قۆناغو تەمەنەدا پێگەیشتنو تێگەیشتنی هەبێت، چونكە لەم قۆناغەدا مەگەر بەكەمیو دەگمەنی، دەنا ناپێگەیشتن تیایدا ڕوونادات،و بێگومان، حوكم لەسەر گشتیو لایەنە زاڵەكە بنیات دەنرێت، نەك لەسەر شتی كەمو دەگمەن[2].

أ- نەدانەوەی دارایی بەو كەسەی كە پێگەیشتووە، واتە: باڵغ بووە بەڵام ووریاو ژیر

---

١ كشف الأسرار، ب٤، ل١٤٩٠، لێرەدا بۆیە باسی تەمەنی بیست و پێنچ ساڵیمان كرد، چونكە ئەبوو حەنیفە ڕای وایە كە لەو تەمەنەدا دەبێت داراییەكەی ڕادەست بكرێتەوە، هەرچەندە ڕەشید و تێگەیشتویش نەبێت!

٢ التلويح والتوضيح، ب٢، ل١٩١١، وأحكام القرآن، للجصاص ب١، ل٤٩٠.

(ڕەشید) نییە، بۆیە وایە، چونکە گەمژەیی‌و نا ژیری هەر لەسەرەتای باڵغ بوونەوە لە مرۆڤ دوور ناکەوێتەوە، و بۆی هەیە درێژخایەن بێت، تەنانەت تا بیست‌و پێنج ساڵانیش، بۆیە دەبێت ئەو حاڵەتی ژیری‌و ڕوشدەی بە ئەزموون وەرگرتن بێت‌و تیایدا تاقی بکرێتەوە، چونکە ئەزموون وەرگرتن عەقڵ دەکاتەوە و هزر تیژ دەکات، و مرۆڤ بەرچاو ڕوون دەکات‌و، بەم ڕوشدە دەسکەوتووو، وەرگیراوە، ئەو مەرجەی دانەوەی داراییەکە دێتە جێ، چونکە ڕوشد‌و پێگەیشتن، کە مەرجە بۆ ڕادەستکردنەوەی دارایی بەکەسی باڵغ، لە ئایەتە پیرۆزەکەدا بە نەناسراوی (نكرة) هاتووە، و بۆ بە بەسەرلایەنی کەمی ڕوشددا دەچەسپێت.

ب- ڕادەست نەکردنی دارایی بۆ کەسی باڵغی عاقڵی بێ ڕوشد. یان لەبەر ئەوەیە کە تەمێ بکرێت‌و فێربکرێت، یاخود سزایەکە لەسەر کردەوەیەکی یاساغ، کە دەست بڵاوییەو، یاخود حوکمێکی وایە، کە ماناکەی نافامرێتەوە، و بە بەڵگەو دەق چەسپاوەو جێگیر بووە.

جا ئەگەر ئەو بەرگرتن‌و ڕادەست نەکردنەوەیە، بۆ تەمێ کردن‌و ئەدەب دادان بوو، ئەوا ئەو تەمێ کردنە وا باشەو جوانە، کە سودمەند بێت‌و ئومێدی سودگەیاندنی لێ هەبێت، بەڵام ئەگەر ئەم ئومێدەی تیادا نەبوو، وەك ئەوەی کە گەیشتە بیست‌و پێنج ساڵی‌و هەر ژیرو ڕوشدی نەبوو، ئەوا تا ئەو کاتە هیچ مانایەك بۆ ڕادەست نەکردنەوەی ئەو داراییەی نامێنێتەوە، چونکە سودی نییە، و دەبێتە کارێکی بێهوودە، و ئەگەر ئەو ڕادەست نەکردنەوەیە سزا بوو، ئەوا سزا بە گومانداری (شبهة) لا دەچێت، و لێرەشدا گومان بوونی هەیە، چونکە هەر وەك گوتمان کە مرۆڤ گەیشتە ئەم تەمەنە جۆرێك لە ژیری‌و ڕوشدی هەیەو دەبێت، و دەبێت لەم حاڵەتەدا داراییەکەی ڕادەست بکرێتەوە، چونکە کە بەربەستکارەکە لاچوو، ئیتر شتە قەدەغەکراوەکە دەگەڕێتەوە جێگای ئاسایی خۆی، و ئەگەر ئەو ڕادەست نەکردنەوەیە، بەدەقێك چەسپابوو، کە نەدەزانرا مەبەست چییەو چی لێ دەفامرێتەوە؟ لێرەشدا ئەو بەر گرتن‌و ڕادەست نەکردنەوەیە لادەچێت، چونکە مەرجی ڕادەست کردنەوە داراییەکە ئەوەیە کە جۆرێك لە پێگەیشتن‌و ڕوشد لەو کەسەدا بێتەدی‌و. هەر وەك لە برگەی یەکەمیشدا باسمان کرد بەگەیشتنی بەتەمەنی بیست‌و پێنج ساڵی ئەو ڕوشدە دێتەدی[1].

---

[1] أصول البزدوي و كشف الأسرار، ب٤، ل١٤٩٠-١٤٩١.

## ١١٧- قسەی لە پێشتر (الراجح):

ـەگەڵ ئەوەشیدا کەمل کەچی ئەوەین، کە بەڵگەکانی ئەبوو حەنیفە بەهێزن، بەڵام ئەوە ـمەبـ، کە ڕووکەشی ئایەتەکە پشتگیری ئەو ڕایانەی ئەو ناکات، چونکە ڕاست کردنەوەی ـ.ـییەکەی بەستراوە بە بوونی ڕوشد، نەك بەگەیشتنی بەتەمەنێکی دیاریکراوو، تەنانەت ـەگەر ئەو تەمەنە بکرێتە جێگرەوەی ڕوشدەکە، هەر بەوە بەرپەرچ دەدرێتەوە کە بۆچی ـی سەروو،و لای خواروی بیستو پێنج ساڵی دانەنرا؟

جا ئەوەی کە ئێمە بە لای ئەوەدا دەچین، کە ڕای باشترو چاکترو پەسەندترە، ڕای جەماوەری زانایانە.

## پرسی دووەم: سانسۆرخستنە سەر کەسی دەبەنگ (السفیه):

١١٨- شەرعزانان ڕاجیاییان هەیە، لەسەر ئەوەی کە ئایە دروستە، گەمژەیی بکرێتە هۆکار، بۆ سانسۆرخستنە سەر مرۆڤەکە، یان نا... ئیتر چونیەکە ئەو گەمژەییە هەر زگماك ـێتو، مرۆڤەکە سکوما لە گەڵیدا بوو بێت، یاخود لەسەرتادا ساغو ژیرو خاوەن ڕوشد ـووبێتو، دواتر تووشی ئەم دەردی گەمژەییو دەبەنگییە بووبێت.

دەکرێت هۆکاری ئەم ڕاجیاییەیان بگێڕینەوە، بۆ دوو قسە:

- **گفتی یەکەم**: کە ئەمەش قسەی جەماوەری زانایانی شافعیو حەنبەلیو مالکیو جەعفەریەکانن، و هەروەها قسەی ئەبوو یوسفو محەممەدی هاوەڵانی پێشەوا ئەبوو حەنیفەن، و لە لای ئەمانە هەموو سانسۆر دەخرێتە سەر کەسی گەمژە، چونکە گەمژەییو ـەبەنگی هۆکارن، بۆ چاودێریو سانسۆر خستنە سەر مرۆڤو، کە ئەم حاڵەتە بەدی کرا، لە هەرکەسدا، پێویستە سانسۆری بخرێتە سەر[1].

- **گفتی دووەم**: دەڵێن کە مرۆڤ بەهۆی گەمژەییەوە، سانسۆری ناخرێتە سەرو، ئەمەش ڕای خودی ئەبوحەنیفەو ظاهیرییەکانە[2].

---

[1] المغني، لأب قدامة الحنبلي، ب٤، ل٤٥٨، أصول البزدوي وشرحه، ب٤، ل١٤٩٢، الطلوسي، ب٢، ل٢٢.

[2] أحكام القرآن، للجصاص، ب١، ل٤٨٩، المحلى، ب٨، ل٢٧٨ و دواتر، التلويح، ب٢، ل١٩٢، و لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە ئەبوحەنیفە وای داناوە، کە داراییو ماڵ بگێرێتەوە لە کەسی گەمژە، تا دەگاتە (٢٥) ساڵان، بەڵام نەیگوتووە، دەبێت سانسۆری بخرێتە سەر، و بەم پێودانگە بێت، سەرجەم مامەڵەو

## ١١٩- بەڵگەی جەماوەری زانان (الجمهور):

جـەماوەری زانایـان، بەڵگـە گـەلێکیان هەیـە، لەسـەر ئـەوەی کـە دەبێـت کەسـی گەمـژە سانسۆی بخرێتەسەر، لەو بەڵگانە :

أ- خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا أَوۡ ضَعِيفًا أَوۡ لَا يَسۡتَطِيعُ أَن يُمِلَّ هُوَ فَلۡيُمۡلِلۡ وَلِيُّهُۥ بِٱلۡعَدۡلِ﴾ [١] ، واتە: ئەگەر قەرزارەکـە هەڵـەو گەمـژەو نـەزان بووو، یان لە ڕوانگەی عەقڵەوە بێ هێزو لاواز بـووو، یـان نەیـدەتوانی ئـەوەی کـە پێویـستە بیڵێو بنوسرێ، (کەڕ و لاڵ بوو)، یـان نەخوێنـدەوار بـوو، باچـاودێریو سەرپەرشـتیارەکەی بەدادگەرانە گرێبەتەکە داڕێژێو نوسەرەکەیشی بینوسێ، ئەم ئایەتە پیرۆزە دانـانی چـاودێر لەسەر کەسی گەمژە دەچەسپێنێت،و بێگومان چـاودێریش بـۆ کاتێکـە کـە کـابرا سانـسۆری لەسەر بێت.

ب- لە گێڕانەوەکانـدا هـاتووە، کـە پێشەوا عـەلی کـوڕی ئـەبو تالیـب داوای لـە خەلیفـە عوسمانی کوڕی عەفان کردووە، (خوا لێیان ڕازی بێت) کـە سانـسۆر بخاتەسـەر (عەبـدوڵڵای کـوڕی جەعفـەر) چـونکە کەسـێکی دەسـبڵاو بـووەو، ئەگـەر سانـسۆر خـستنەسەر کەسـی دەبەنگ دروست نەبوایە، ئەوا پێشەوا عەلی ئەم داوایەی نەدەکرد.

ج- سانسۆر خستنەسەر منداڵ چەسپاوەو هەیە، چونکە چاوەڕێی ئەوەی لێ دەکرێت، کە دەست بڵاو بێتو، بەڕاستو چەپدا داراییەکەی پەرشو بڵاو بکاتەوەو، لە ناوی ببـاتو، ئـەم حاڵەتو مانایەش لە گەمژەدا هەیەو دەفامرێتەوەو، بۆیە سانسۆر خستنەسەر کەسی گەمژە پێویستە، وەك چۆن پێویستە بخرێتە سەر منداڵیش.

د- کەسی گەمژە (سیفه) نازانێت، چۆن مامەڵە لە گەڵ موڵكو دارایی خۆیدا بکـات، بۆیـە پێویـستی بەکەسـێك هەیـە، کـە چـاودێری بکـاتو، داراییەکـەی بپارێزێـتو، ئەمـەش تـەنیا بەسانـسۆر خـستنەسەر دەکرێـت، هـەر وەك لەسـەر منـداڵیش ئـەم حوکمـە دراوەو، نابێـت بگوترێـت، کەسـی گەمـژە کـە موڵـكو مـاڵی خـۆی بەدەسـبڵاوی لـە نـاو دەبـات، کەسـێکی تاوانبارەو، مافی ئەوەی نییە، کە چاودێری بکرێت، چونکە ئێمە لە وەڵامی ئەمـەدا دەڵـێین:

---

هەڵسو کەوتەکانی دروستن، کە لەسـامانو مـوڵکی خۆیـدا کردوونـی، لـە دوای ئـەوە تەمەنـە، هەرچـەندە سەفاهەتەکەی هەر مابێت!

[١] سورة البقرة: ٢٨٢ .

ێ-هباری‌و تاوانباری نابنەهۆکاری ئەوەی کە کەسەتاوانبارەکە مافی چاو دێری لەسەر
ێ-نی نەمێنێ، و ڕەچاوی بەرژەوەندییەکانی نەکرێت، ئەی نابینی کەسی بکوژ، کە تەنانەت
ـە تایبەتیش کەسێکی کوشتبێت، ئەم تاوانەی نابێتە هۆکاری ئەوەی کە چاودێری نەکرێت،
ـەبەڵگەی ئەوەی کە دروستە ببەخشرێت‌و، بۆیە گەمژە لە پێشترە، کە چاو دێری خۆی‌و
ـەرژەوەندییەکانی بکرێت.

هـ- سانسۆر خستنەسەر گەمژە، دەبێتە هۆی پاراستنی سەرجەمی کۆمەڵگە لە
ێدمەندی، چونکە بەو سانسۆرە دارایییەکەی دەپارێزرێت‌و، نابێتە مشە خۆر بەسەر خەڵکی
ترەوەو، کەسیش پێویست ناکات، بژێوی ژیانی بگرێتە ئەستۆ، کەواتە سانسۆر خستنە
سەر کەسی گێژ، تا زیانەکەی لە کۆمەڵگە دوور بخرێتەوە، کارێکی واجبەو، هەر بۆیەش
سانسۆر دەخرێتەسەر موفتی شێتکارو دکتۆری نەزان، و هەر بەم جۆرەیش سانسۆر
ـەخرێتەسەر کەسی دەبەنگ‌و گەمژە، تا زیانەکەی لە کۆمەڵگە لابدرێت!

## ١٢٠- بەڵگەکانی ئەبو حەنیفە:

**ئەبو حەنیفە، بەڵگە گەلێکی هێناوەتەوە، لەوانە:**

١- کەسی گەمژە (سَفیە)، فەرمایشتی شەرعی ڕوبەڕووکراوەتەوە، و هەر کەسیش خیطاب‌و فەرمایشتی شەرعی ئاراستە کراو خرایە سەرشان، کەواتە ئەهلیەتی هەیەو شیاوە بۆ خستنە سەرشانی ئەرکەکانی شەرع و باڵغی‌و عاقڵی تیادایە، و گەمژەیی هۆکار نییە، بۆ کەم‌و کوڕی لە عەقڵداو، لە جیاکردنەوەی چاک‌و خراپداو، بۆیە هەر بەئەرکدارو ئەرك لەسەرشان دەمینێتەوەو مافە شەرعیەکانی لەسەرشانەو، مامەڵەزارەکیەکانی دروستن، وەك ژن تەلاقدان‌و مارەکردن‌و، لەسەر قەرزاری خەڵکی زیندانی دەکرێت و لەسەر تاوانەکان سزا دەدرێت‌و، بەپێی دانپیانانی خۆی لەسەر هۆکارەکانی تاوان کردن دەگیرێت‌و سزا دەدرێت، بۆیە ئەگەر کەسی گەمژە لەدوای باڵغ بوون، لە چاودێری کردندا هەر لە پێش بووە، و سەرپەرشتی دەکرا سانسۆر لەسەری هەبوو، ئەوە زۆر لە پێشترە کە سانسۆری بخرێتەسەر، لە کاتی دانپیانانی لەسەر هۆکاری تاوانەکانی، چونکە زیانگەیاندن بەگیان، زۆر گەورەترە لە زیان گەیاندن بە ماڵ‌و دارایی.

٢- مرۆڤ کە گەیشتە قۆناغی عاقڵی، ئیتر ئەهلیەت‌و شیاوی‌و کەسایەتی کامڵ دەبێت‌و، سانسۆر خستنە سەری لەم حاڵەتەدا شکاندنی کەسایەتی‌و شکۆمەندی ئەو

مرۆڤەیە، و ئەمەیش دروست نییە، و ئەگەر بگوترێ: ئەو سانسۆرە لەبەر بەرژەوەندی خۆیەتی، ئەمە وەڵامەکەی ئەوەیە زیانگەیاندن بەو کەسە لە ڕووی ئەوەوە کە کەسایەتی بشکێنێ و وەك ئاژەڵان پۆلێنی بکەیت، کە سانسۆرت خستۆتە سەرشان، ئەم زیانە زۆر زیاترە لە ماڵ بەفیڕۆدانو، قاعیدەی شەرعی وا بڕیاری داوە، کە دەبێت زیانە بچوکەکە بکرێت، باشترە، تا خۆمان لابدەین لە زیانە گەورەکەو، بۆیە سانسۆر نەخستنە سەری، لە بەرژەوەندی کەسەکەدایە.

٣- لە فەرموودەدا هاتووە، کە کابرایەك لە کاتی مامەڵەدا بەشی دەخورا، و زیانمەند دەبوو، و فرتو فێڵی لێ دەکرا، جا کەسو کارەکەی هێنایان بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)، و داوایان لێکرد سانسۆری بخاتە سەر، بەڵام پێغەمبەر (ﷺ) سانسۆری نەخستەسەر، بەڵام فەرمانی پێکرد، کە لەکاتی مامەڵەدا مەرجی ئەوە دابنێت، کە مافی پەشیمان بوونەوەی هەبێت، بۆیە ئەگەر سانسۆر دروست بوایە، ئەوا سانسۆری دەخستەسەر.

٤- بەڵام سەبارەت بە بەڵگە کردنی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿فَإِن كَانَ ٱلَّذِى عَلَيۡهِ ٱلۡحَقُّ سَفِيهًا ........﴾کە باسمان کرد، لەمەیاندا بەڵگە نییە، بۆ ئەوان، چونکە مەبەست لە چاودێر (ولي) لێرەدا چاودێری مافەکە، نەك چاودێری کەسەگەمژەکە.

٥- سەبارەت بەوەی کە پێشەوا عەلی داوای کردووە، کە سانسۆر بخرێتەسەر (عبدالله ی کوڕی جەعفەر) ئەمەیش بەڵگە نییە، چونکە داواکردنەکەی بۆ ترساندنە نەك بۆ پێداگیری (إلـزام)، یاخود دەکرێت، لەسەر ئەوە دابنرێت، کە ئەو داواکردنەی نەدانی دارایی بە(عەبدوڵلای کوڕی جەعفەر) کاتێك بووە، کە تەمەنی پێش بیستو پێنچ ساڵان بووە.

٦- دەستبڵاوی تاوانە و تاوانیش نابێت، ببێتە هۆکار، بۆ چاودێری کردنو، سانسۆر خستنەسەر گەمژە سەر بەبابەتی چاودێری کردنیەتیو پێویست ناکات بخرێتە سەریو بۆیەش نابێت، بگوترێت کە تاوان هۆکارە بۆ دەرکردنی تاوانبارەکە لە چاودێری کردن. بەبەڵگەی ئەوەی کە دروستە بکوژی دەست ئەنقەست ببەخشرێت، چونکە ئەوانەی کە بڕوایان بە سانسۆر هەیە، ئەو سانسۆرە بۆ گەمژە بە پێویست دەزانن، و بەخشینی بکوژیش دروستە، بەڵام پێویست (واجب) نییە.

٧- سەبارەت بەو قسەیەی کە پێی وایە، کە سانسۆر خستنەسەر کەسی دەبەنگ بۆ لادانی زیانە لە کۆمەڵگە، ئەمە قسەیەکی بەر پەرچدراوەیە، چونکە کەسی گەمژە لە موڵكو

-رایی خودی خۆیدا مامەڵە دەکاتو بەکاری دەهێنێتو، کەس بۆی نییە، کە بەری پێ بگرێت، لە بەکارهێنانی ماڵی خۆیدا، بە بیانووی لادانی زیانی لە کۆمەڵگە بە گشتی.

## ١٢١- ڕای لە پێشتر (الراجح):

ئەوەی کە ئێمە بەلایدا دەچین، ئەوەیە کە دەبێت سانسۆر لەسەر کەسی گەمژەو دەبەنگ هەبێت، چونکە ڕووی ئاشکرای دەقەکان لە گەڵ ئەمەدانو، هەروەها لەبەر ئەوەی کە لەسانسۆرداناندا بەرژەوەندی کەسە گەمژەکەی تیادایەو، موڵکەکەی دەپارێزرێتو، زیانی لە کۆمەڵگە لادەدرێتو، نابێ بگوترێت: ئەو ماڵی خۆیەتی بەکاری دەهێنێتو، کۆمەڵگە هیچ مافێکی نییە، تیایدا، چونکە ئێمە دەڵێین: بەکار هێنانی ماڵو موڵکی تایبەتی هەر کەسێك، لەسەر ئەوە بەندە کە نابێت ئەو بەکار هێنانە زیان بەکەسانی تر بگەیەنێت، ئەی نابینی ئەگەر کەسێك ئاشێك لە ماڵەکەیدا دابنێت، ڕێگا نادرێت پێی، بۆ ئەوەی زیان بە دراوسێکانی نەگەیەنێت، و تووشی گرفتو سەر ئێشەیان نەکات، کەسی گەمژەو دەبەنگیش هەروایە، ڕێگای لێ دەگیرێت، کە ماڵەکەی بەکار بهێنێت، تا لەناوی نەباتو، پەرشو بڵاوی نەکاتو، دواجار ببێتە مشەخۆر بەسەر خەڵكو دارایی گشتی (بيت المال)یشەوە، و ئەمەش زیانە بۆ کۆمەڵگە بەگشتی، و دەبێت ڕێگای لێ بگیرێت، و ئەم ڕێگا لێ گرتنەیش بە سانسۆرخستنە سەری دەبێت.

**پرسی سێیەم: کەی بە تەواوی سانسۆر دەخرێتەسەر کەسی گەمژە(السفيه)؟!**

١٢٢- هەندێ لە شەرعزانان لەوانە (إمام محمد) بەلای ئەوەدا چوون، کە کەسی گەمژە، تەنها بەو گەمژەییەی خۆیو دەرکەوتنی تیایدا، ئیتر سانسۆردارەو چاودێری لەسەرەو، پێویست بەوە ناکات، کە دادوەر بڕیار بدات، سانسۆری بخرێتەسەرو، بەڵگەیشیان ئەوەیە کە گەمژەیی هۆکارو فاکتەرە بۆ سانسۆر خستنەسەر کەسی گەمژە، بۆیە کە هۆکارەکە هاتەدی، ئیتر ئەو شتەیش کە لەبەر ئەو هۆکارە بەرپادەبێت،دێتەدیو دەبێت جێ بەجێ بکرێت، کە سانسۆرخستنەسەرەکەیەو، هەرکات هۆکارەکە نەما، سانسۆرەکەیش نامێنێت، هەر وەك ئەم حاڵەتە لە شێتو کەودەنو منداڵیشدا هەروایە.

هەندێ لە شەرعزانانی تر، لەوانە (إمام أبو يوسف) ڕایان وایە کە کەسی گەمژە سانسۆری ناخرێتەسەر، تا دادوەر ئەو سانسۆرەی نەخاتەسەر، (واتە بڕیاری دادوەری لەسەر بێت)،و

بەڵگە بۆ ئەم قسەیش ئەوەیە کە سانسۆر لەسەر بنەمای بەرژەوەندی کەسی سانسۆردار دانراوە و ئەم بەرژەوەندییەیش یەکلایی نەبۆتەوە لە نێوان ئەوەیدا کە ئایا سانسۆری بخرێتەسەر، تا موڵکەکەی پارێزراوبێت یان سانسۆری نەخرێتە سەر، تا قسەکانی بێ ڕەواج نەبن، لێرەدا بڕیاری یەکلاکەرەوە لەلای دادوەر (قاضي)یە، لەم جۆرە کارە دوو ڕەهەندو دیوانەدا، و بەس ئەو بڕیار دەدات و هیچ کەسی تر !

هەروەها لێرەدا ئەوەیش هەیە، کە گەمژەیی شتێکی بەرجەستە نییەو، لە نەزانکاری لە هەڵسو کەوتدا دەردەکەوێتو، جاری واهەیە، کە ئەو نەزانییو شپرزەییە، کەسەکە بە فێڵو بەتایبەتی دەیکات و ئەمەیش تەنها بڕیاری دادوەر دەیچەسپێنێت و هەروەها پرسی سانسۆردانان لەسەر کەسی گەمژە، پرسێکی پڕ لە جیاوازیو ڕاجیاییە لە نێوان شەرعزاناندا، و تەنها بە بڕیاری دادوەر دەچەسپێت، وەك سانسۆردانان بە هۆی قەرزارییەوە، و هەروەها هەروەك چۆن سانسۆر بە بڕیاری دادوەر دەچەسپێت، هەروا تەنها بە بڕیاری دادوەریش لا دەچێت.

بەرهەمو دەرەنجامی ئەم دوو ڕایە جیاوازە، ئەوەیە کە هەڵسوکەوتی کەسی گەمژە، پێش دانانی سانسۆر لەلایەن دادوەرەوە لەسەری، بەدروستو دامەزراو دێتە ئەژمار، ئەمەش لەسەر ڕای ئەبو یوسفو پەیڕەوانی، بەڵام لەسەر ڕای (زانا محەممەدی حەنەفی بەناو بانگ) و هاوڕاکانی، ئەو مامەڵانەی دەوەستێنرێنو، وەك مامەڵەی کەسێك کە دادوەر سانسۆری خستبێتە سەر تەماشا دەکرێن.

ئەوەی ئێمەی لێرەدا بە ڕای تەندروستتری دەزانینو بەلایدا دەچین، ئەوەیە کە سانسۆر تەنها بە بڕیاری دادوەر دەچەسپێتو، هەروەها لابردنیش هەر بەبڕیاری دادوەرە، بە هۆی ئەو بەڵگانەی کە خاوەنی ئەم ڕایانە هێناویانەو، یاسای مەدەنی عێراقیش هەر بەم شێوازە بڕیاری لەسەر داوەو هێناویەتی، وەك دواتریش ئەم باسە دێت.

## پرسی چوارەم: حوکمی مامەڵەو هەڵسوکەوتی گەمژەی سانسۆر لەسەر دانراو:

١٢٣- حوکمی کەسی گەمژە لە دوای دانانی سانسۆر لەسەری، وەك حوکمی منداڵێك وایە چاکو خراپ لێك جیا بکاتەوەو، (ممیز) بێت، لەوەیدا کە مامەڵەو هەڵسوکەوتەکانی دەگونجێت، هەڵبوەشێندرێتەوە، وەك کڕینو فرۆشتنو بەکرێدان، کە ئەمانە هەموویان لەسەر مۆڵەتدان وەستاون، ئەگەر هێشتا لە نێوان سودو زیاندا یەکلایی نەبوبونەوە، جا

ـەیان کە بەتەواوی زیانمەندن، ئەوە بەبەتاڵ دێتە ئـەژمار، وەك بـە دیاریـدانو، ئەوانـەیان ـەواوی سودمەندن، بە دروستو چەسپاو دێتە ئەژمارو لە ڕووی بەچاك دانانەوە بەدروست ـروە، وەسیەتی وەریگیرێت بۆ شتی باش و چاکە کاری، هەرچەندە ئەهلی بەخشندەییش ـێتو، هەروەها لە وەقف کردنی شتدا لەسەر خۆیو غەیری خۆی، بۆی دروستە،

ـەڵام ئـەو مامەڵـەو هەڵسوکەوتانەی کـە هەڵوەشـانەوە نایانگرێتـەوە، وەك مـارەکردنو ـڵاقـدان، ئەمانـە بەدروسـتو دامـەزراو دێتـە ئـەژمار، ئەمـەیان بـە پێـچەوانەی منـداڵێکی جیاکەرەوەی چاکەو خراپە!

## پرسی پێنجەم: حوکمی کەسی گەمژە، لە یاسای مەدەنی عێراقیدا:

١٢٤- یاسـای مـەدەنی عێراقـی ڕاکـەی ئـەبو یوسـفو پـەیڕەوانی وەرگرتـووەو چەسپاندوویەتیو، کەسی گەمژەی بە خۆڕسك بە سانسۆردار دانەناوە، و بەڵکو بـە مـەرجی گرتووە، کە دەبێت دادگای تایبەت بڕیاری ئەو سانسۆر کردنەی بەسەردا بـدات[1]، و هـەروەها ئەوەیشی چەسپاندووە، کە لابردنی ئەو سانسۆرەیش لەسەری هەر بەبڕیاری دادگا دەبێت[2].

جا بە تەواوی سانسۆر لەسەر گەمژە دانرا، ئەوە حوکمی مامەڵە داراییەکانی وەك حوکمی مامەڵەداراییەکانی منداڵێکی جیاکەرەوەی چاكو خراپ (ممیز) وایە، بـەڵام لـە پـێش دانـانی سانسۆرەوە لەسەری، حوکمەکەی وەك حوکمی کەسێکی عاقڵی خاوەن ڕوشدو ژێـری تـەواو وایە، مەگەر ئـەو مامەڵەیـەی لـە پـێش دانـانی سانـسۆرەکەوە کردبێـتو، بـە فێـڵ تەڵەکـەو ڕێکەوتن لەگەڵ خەڵکانی تر ئـەنجامی دابێـت[3]، ئەمـەش هـەڵاوێرکردنێکی چـاكو جوانـە، کـە لەگـەڵ ئامـانجی سانـسۆردانانو بنـەما گشتیەکانی شەریعەتیـشدا دەگونجێـت، جـا کەسـی گەمژەی سانسۆر لەسەر دانراو، هەرچەندە ئـەهلی بەخـشندەییش نـەبێت، بـەڵام یاسـا هـەر ڕێگـای پێـداوە، کـە سـێیەکی ماڵەکـەی بەوەسـیەت بکـات، بـەخێر[4]و ئەمـەیش لـە فیقهـدا چەسپاوەو، هونەریش لەمەدا بەڕوونی دیارە، ئەوەیە کە وەسیەتەکە لە حاڵەتی ژیاندا، زیان

---

[1] ماددەی ٩٥ لە یاسای مەدەنی عێراقی.

[2] ماددەی ١٠، لە بڕگەی سێیەم.

[3] ماددەی ١٠ بڕگەی یەکەم.

[4] ماددەی ١٠، بڕگەی دووەم.

بەکەسە گەمژەکە ناگەیەنێت، چونکە مامەڵەیەکە کە دەکەوێتە دوای مەرگی کابراو پەیوەستە بەمیراتەوە.

هەروەها مارەکردنی ژن لەلایەن کەسی گەمژەوە دروستەو دامەزراوە، ئیتر پێش ئەو سانسۆر لەسەر دانانەبێت، یان لەدوایەوە چونیەکە چونکە یاسای باری کەسێتی عێراقی ژمارە ١٨٨ی ساڵی ١٩٥٩ لە دامەزرانی گرێبەستی هاوسەریشدا، عەقڵ‌و باڵغ بوونی بەمەرج گرتووە[1]،و بێگومان کەسی گەمژە (سفیه) عاقڵ‌و باڵغە، و هەر ئەمەیش لە فیقهدا جێگیر بووە، و هەروەها تەڵاقدانیش هەر دروست‌و چەسپاوە، چونکە ماددەی ٣٤ی یاسای باری کەسێتی عێراقی ئەوانەی ژماردوون، کە تەڵاقیان ناکەوێت‌و، تیایاندا کەسی گەمژە (سفیه)ـی، نەهێناوە، و هەر ئەمەیش لە فیقهدا هاتووە و دامەزراوە.

## پرسی شەشەم: حوکمی کەسی گەمژە، لە یاسای مەدەنی میصریدا:

١٢٥- بە بڕیاری دادگا، سانسۆر لەسەر گەمژە دادەنرێت‌و، هەر بەبڕیاری دادگایش لەسەری لادەبرێت[2].

**بەڵام سەبارەت بە مامەڵەو هەڵسوکەوتی کەسی گەمژە، ئەمەیان حوکمەکەی بەم شێوازەی لای خوارەوەیە:**

ئەگەر کابرایەکی گەمژە مامەڵەیەکی کرد. لەدوای تۆمارکردنی بڕیاری سانسۆرەکە لەسەری، ئەوا ئەم مامەڵەیە وەك مامەڵەی منداڵێکی جیاکەرەوەی چاك‌و خراپ سەیر دەکرێت‌و، ئەحکامەکانی لەسەر بنیات دەنرێت، و ئەمەیش مانای ئەوەیە کە ئەو هەڵسوکەوتانەی کەسی گەمژە کە بەتەواوی سودمەندن، بەدروست‌و دامەزراو تەماشا دەکرێن‌و، ئەو مامەڵانەی کە بەتەواوی زیاندارن، بەبەتاڵ دێنە ئەژمار، بەڵام ئەو مامەڵەو هەڵسوکەوتانەی کە ڕووی سودو زیانیشیان هەیە، ئەمانە شایەنی بەتاڵ کردنەوەو هەڵوەشاندنەوەن، بە پێی بڕیارێك کە دەربچێت، کە نەریتی مرۆڤایەتی خوازیاری بڕیارێکی لەو جۆرە بێت، یاخود کەسە گەمژەکە خۆی لەدوای لابردنی سانسۆر لەسەری داوای ئەو بڕیاری هەڵوەشاندنەوەیە بکات.

بەڵام ئەگەر مامەڵەکە لەلایەن کەسە گەمژەکەوە ئەنجام درا، لە پێش دانانی سانسۆر

---

١ ماددەی حەوتەم، برگەی یەکەم.

٢ ماددەی ٦٥ لە یاسای چاودێری داراین ژمارە ١١٩ی ساڵی ١٩٥٢.

ـەسەری، ئەمەیان بەتاڵ نییەو، هەروەها شیاوی بەتاڵکردنەوەو هەڵوەشاندنەوەیشی نییە، ـەنها کاتێك نەبێت، کە لایەنی بەرامبەری مامەڵەکە، هەلەکەی قۆستبێتەوە، بۆ بەرژەوەندی حۆی،و، سودی خۆی، یاخود رێکەوتنی لەگەڵ ئەو کەسە گەمژەیەدا کە وا گومان دەبرێت، ـانسۆری خرابێتەسەر، جا ئەگەر هیچ شتێ لە مانە نەچەسپا، ئەوە مامەڵەکەی دروستە[1]، ـەڵام یاسای میصر، لەم پرسەدا وەسیەتکردن و وەقفی هەڵاوێر (إستثناء)کردووە، و جیای کردۆتەوە، و وای داناوە کە هەر کات دادگا بڕیاریدا، جا ئەو دوانەیش دروستن[2]، هەر وەك ئەم یاسایە هەڵساوە یاسای کاروباری بەڕێوەبردنیشی جیاکردۆتەوە، جا هەر کات سەرپەرشتیارەکە مۆڵەتی پێدا، کە دارایی خۆی ڕادەست بکات، بە ئیدارەکەی،و، بەپێی یاسا ئەو مۆڵەتە بنیات نرابوو[3]، ئەوا لەم حاڵەتەدا ئەو حوکمانەی کە دانراون، بۆ کەم ئەندامێکی ڕێگا پێدراو، بەسەر ئەمیشدا جێ بەجێ دەکرێن[4].

## پێنجەم:- (( سەرخۆشی ))

### ١٢٦- رێـخـۆشکردن:

سەرخۆشـی (السُّكْر): بریتییـە لـە لاچـوونی عـەقڵ، بـەهۆی خواردنـەوەی ئـارەق و سەرخۆشکەرەکانی تری وەك ئارەقەوە، بە جۆرێك کابرای سـەرخۆش،و ئـارەق خـۆر لـەدوای هاتنەوە هـۆش نازانێـت، لـەکاتی ئـەو سەرخۆشـیەدا چـی کـردوەو چـی ئەنجامـداوە[5]، سـەر خۆشی عەقڵ لەکار دەخات و ناهێڵێت، ئیدی چاك،و خـراپ لەیـەکتری جیـا بکاتـەوە،و، ئـەم بارودۆخەیش ئەهلیەتی جێ بەجێ کـردن (الأداء) لەکەسـەکەدا ناهێڵێـت،و، هـەروەها ئـەرکی سەرشــان (تــەکلیف) لەســەر شــانی ســەرخۆش لادەبــات،و، لــەکاتی سەخۆشــیدا هــیچ فەرمایـشتێکی شـەرعی ڕووبـەڕوو ناکرێتـەوە، بـەڵام شـەرعزانان ئەمـەیان بـۆ سـەرجەمی حاڵەتەکانی سەر خۆشی دانەناوە،و، بەڵکو بۆ ئەو سەرخۆشـییەیان دانـاوە، کەبـە ڕێگایـەکی دروست (موباح) سەرخۆش بووە، بەڵام ئەگـەر سەرخۆشـییەکەی بـەڕێگای حـەرام بووبێـت،

---

[1] ماددەی ١١٥ لە یاسای مەدەنی میصری.

[2] ماددەی پێنجەمی یاسای وەسیەتکردن،و، ماددەی ١٦، برگەی یەکەم، لە یاسای مەدەنی میصری.

[3] ماددەی ١١٦، برگەی دووەم: لە یاسای مەدەنی میصری.

[4] ماددەی ٦٨ لە یاسای سەر پەرشتی دانان لەسەر موڵك،و ماڵ.

[5] سەرخۆشی بەوەیش پێناسە کراوە، کە ئـەو حاڵەتەیـە کـە عـەقڵ لادەبـات، لـە کـاتی نزیـك کەوتنـەوەو بەکارهێنانی ئەو شتانەی کە لابەری عەقڵ،و ژیرن. کشف الأسرار، ب٤، ل١٤٨٢.

ئەمەیان بە ئەرك لەسەرشان (مكلف) داناوە، و هەروەها وایان داناوە، كە لەسەر ئەو كردەوانەی كە ئەنجامیان دەدات، لێپرسینەوە دەكرێت‌و، لەم بارەیەوە شەرعزانان بەدرێژی‌و، ڕاجیایی زۆرەوە قسەیان كردووە، هەروەك دوای ئەوەی كە لێرە بەدواوە حوكمی سەرخۆش بەڕێگای دروست (موباح) كە ڕوون دەكەینەوە، ئەو ڕاجیایی‌و درێژە باسەی شەرعزانانمان بۆ ڕوون دەبێتەوە.

## ١٢٧- یەكەم: سەرخۆشی بەهۆی ڕێگایەكی موباحەوە:

سەرخۆشی بەڕێگای ڕێگا پێدراو (موباح) وەك ئەوەی كە كەسەكە بەناچاری، یان بەزۆر سەرخۆش بكرێت، یاخود نەیزانیبێ ئەو شتەی دەیخواتەوە، سەرخۆشكارە، یاخود دەرمانێكی چارەسەر بخوات، كەچی سەرخۆشی بكات و هتد.........

حوكمی سەرخۆش بەم جۆرە، وەك حوكمی بووراوە وایەو، موكەللەف نییە، كە لەم كاتی سەرخۆشییەدا هیچ لە مافەكانی خودا جێ بەجێ بكات‌و، بەڵكو لەدوای هاتنەوە هۆش، قەزا كردنەوەی لەسەرە ئەمیش بەو مەرجەی كە ئەو قەزا كردنەوەیە سەخت نەبێت بۆی، وەك ئەوەی كە سەرخۆشییەكەی درێژخایەن بێت، وەك بوورانەوە (كە باسمان كرد)، و دەستەواژەو دەربڕینەكانی دروست نەبن‌و (شت تێكەڵ بكات)، و هیچ ڕێ‌و شوێنێكی شەرعی لەسەر مامەڵە زارەكییەكانی ناگیرێتەبەر، بەڵام بە مامەڵە پڕاكتیكیەكانی (فعلي) ئەمەیان ڕێ‌و شوێنی شەرعییان لەسەر دەگیرێتەبەر، بۆ ئەوانەیان كە پەیوەندیدارن بە مافە داراییەكانی خەڵكەوەو، هەرچی لە ناوبردووە، لە گیان‌و ماڵ دەبێت، بیبژێرێتەوە، چەنكە ماڵ‌و گیان پارێزراون، نابێت بەزایە بدرێن، و نابێت بە هیچ پاساوێك ئەو پارێزراوییەیان لابدرێت، بەڵام سەبارەت بە كردەوەو تاوانەكانی، سزای جەستەیی نادرێتەوە، چونكە سزای جەستەیی بۆ كاتێكە، كە لەسەر بنەمای عەقڵ‌و جیاكردنەوەی چاك‌و خراپ لە یەكتر، ئەو كردەوەو تاوانە ئەنجام درابێت‌و، بێگومان كەسی سەرخۆش عەقڵی نییەو، چاك‌و خراپیش لە یەكتر جیا ناكاتەوە.

## ١٢٨- دووەم: سەرخۆشی بەڕێگایەكی حەرام:

شەرعزانان لێرەدا ڕاجیاییان هەیە، دەربارەی حوكمی سەرخۆش‌و ئاستی چەسپاوی‌و دروستی مامەڵەو هەڵس‌و كەوتەكانی‌و، هۆكاری ڕاجیاییەكەیشیان ئەوەیە لاچوونی عەقڵ لێرەدا بەهۆی ڕێگایەكی حەرامكراوەوە بووەو، لەسەر ئەم بنەمایە ڕاجیایی لە قسەكانیاندا

هەیە، سەبارەت بە حوکمی مامەڵەو هەڵسو کەوتەکانی ئەم جۆرە سەرخۆشەو، دەکرێت بەم شێوازەی لای خوارەوە پوختی بکەینەوە[1].

أ- سەبارەت بە مامەڵەو هەڵسوکەوتە زارەکییەکانی:

١- هەندێ لە شەرعزانان پێیان وایە کە خودی دەستە واژەی سەرخۆشی (سکران) لابەری تەکلیفەکانە لەسەر شانیو، هیچ حسابێك بۆ قسەکانی ناکرێتو، هیچ ڕێو شوێنێکی شەرعییان لەسەر ناگیرێتەبەر و بۆیە تەلاقی ناکەوێت، و کڕینو فرۆشتنی دانامەزرێتو، هیچ گرێبەستێکی ناچەسپێتو، ئەمەش ڕای مەزهەبی ظاهرییو جەعفەریو (عثمان البتي)و (الليث)ـە، و هەروەها لە یەکێك لە گێڕانەوەکان لە پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش هەروایە، و لەوەشیەوە کە لە پێشەوا ئیبن قەییم گواستراوەتەوە، هەر لەسەر ئەمە ڕۆیشتووەو، لە حەنەفیەکانیشدا پێشەوا طەحاوی هەر ئەم ڕایەی هەڵبژاردووە.

٢- حساب بۆ قسەکانی (ئەم جۆرە سەرخۆشە) دەکرێتو، کاریان پێ دەکرێتو، هەموو ڕێو شوێنێکی شەرعییان لەسەر دەگیرێتەبەر و بۆیە تەلاقی دەکەوێت، و هەروەها دیکەی مامەڵەو هەڵسوکەوتە زارەکییەکانی کاریان پێ دەکرێتو ، ئەمەیش ڕای مەزهەبی حەنەفیو شافعیو مالکی یەکانە، بەم شێوەیەی خوارەوە، سەبارەت بە هەندێ لە هەڵسوکەوتەکانی، لەلای حەنەفیەکان، قسەکانی دروستو وەرگیراون، جگە لە هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلامو، ئەو دانپیانانەی کە بۆی هەیە، لێیان پەشیمان ببێتەوە،و لەلای مالکییەکان، مامەڵەکانی دروستن، جگە لە دانپیانان (الأقرار)و گرێبەست بەستن، بەلام هەموو لایەك کۆکن لەسەر ئەوەی کە تەلاقی دەکەوێت.

ب- سەبارەت بە کاروکردەوەکانی:

هیچ ڕاجیاییەك نییە، لەوەیدا کە سەرجەم کارو کردەوەکانی (سەرخۆشی لەم جۆرە)، کە پەیوەندیدارن بە مافی خەڵکەوە، لە ڕووی داراییەوە دەبێت سزا بدرێتو بیانبژێرێت بۆ خاوەنەکانیان، بۆیە ئەگەر کەسێکی لەناوبرد، یان ماڵێکی لە ناوبرد، ئەوە لەسەریەتی

---

١ زاد المعاد، ب٢، ل٢٠٢-٢٠٣، إعلام الموقعين، ب٤، ل٤٠-٤٢، المغني، ب٧، ل١١٣-١٢٤، (الأم) للأمام الشافعي، والمذهب، للشيرازي ب٢، ل٨٢، المحلى، ب١ ل ٢٠٩-٢١١، الخلاف، للطوسي، ب٢، ل٤٥٤، المختصر النافع، فقه الجعفرية، ل٢٢١، مختصر الطحاوي، ل ٢٨٠، دواتریش، (التلويح) ب٢، ل١٨٥-١٨٦.

بیبژێرێتەوە، بەڵام سەبارەت بە تۆڵە سەندنەوەی جەستەیی واتە سزادانی لەسەر ئەو کردەوانەی کە تاوان بوون کردوونی، ئەوە جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە لە ڕووی جەستەیشەوەدەبێت سزا بدرێتو، ئەگەر کەسێکی کوشت دەبێت بکوژرێتەوەو، ئەگەر داوێن پیسی کرد، دەبێت سزابدرێتو، هتد........... جا زانایانی مەزهەبی (ظاهري)و (عثمان البتي) ڕایان وایە کە لەسەر کردەوەکانی، سزای جەستەیی نادرێت، و تەنها لەسەر ئارەق خواردنیش سزاو شەلاق دەدرێتو بەس!

## ١٢٩- بەڵگەو دۆکیۆمێنتەکان:

یەکەم: ئەوانەی کە ڕایان وایە، حساب بۆ قسەی سەرخۆش ناکرێتو سزای جەستەیی نادرێت، ئەم بەڵگانەیان هەیە:

(أ). ئەو کە سەرخۆشە نازانێت، چی دەڵێت: بە بەڵگەی ئایەتی قورئان کە دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعۡلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾[1] واتە: ئەی باوەڕداران، بەسەر خۆشی نوێژ مەکەن، تابزانن لە نوێژەکەدا چی دەڵێن!، چونکە کەسی سەرخۆش نازانێت چی دەڵێتو، کەسێکیش کە نەیزانی چی دەڵێت، ئیتر پابەند ناکرێت، بە چەسپاندنی قسەکانیەوەو، هیچ حوکمێکیشی لەسەر دانامەزرێت، نەتەڵاقو نەهیچی تر، چونکە ئەو کەسە کەسێکە فەرمایشتی شەرعی ڕوو بەڕوو نەکراوەتەوە، چونکە لەو کاتەدا عەقڵ لەلای میوان نییەو، حوکمی وەك حوکمی شێت وایە.

(ب). تێگەیشتنو حاڵی بوون، وێستگەیە بۆ دانانی ئەرك (تكليف) لەسەر شانی هەر کەسێكو، تێگەیشتن (فهم) نەبوو، تەکلیفیش نییەو، دروست نییە، وەك موکەللەف تەماشا بکرێت، و ئەم تەماشاکردنە نابێت وەك سزا لەسەر سەرخۆش دابنرێتو، لەسەری بهێڵرێتەوە چونکە شەرع سزای بۆ داناوە، کە شەلاقدانیەتیو، بۆیەو سزادانی بەشتی تر دروست نییە، یان سزای زیادەی لەسەر دابنرێت، دیسان هەر نادروستە.

(ج). ئەوەی کە مامەڵەو هەڵسوکەوت بەتەندروست دادەنێت، بەلایەنی کەمەوە، کە ئەو کارو مامەڵەیە مەبەستو ئامانجی هەبێت، یان لە خۆیدا ئامانجەکەی دیار بێت، بەڵام بێگومان کارو مامەڵەی سەرخۆش هیچ لەو ئامانجو مەبەستانەی تیادا نییە.

(د). جیاوازی لە نێوان سەرخۆش بوون، بە ڕێگەی دروستو سەرخۆش بوون بە ڕێگەی

---

[1] (سورة النساء ٤٣).

حەرامو، هەردووکیان لە هەردوو حاڵەتەکەدا بێ عەقڵنو، چاکو خراپ لەیەکتری جیا ناکەنەوەو، دەبێت لە حوکمیشدا یەکسان بن، بەڵام سەبارەت بەیەکەم کە بە ڕێگەیەکی حەرام سەرخۆش بووە، ئەمە لەو ڕووەوە کاریگەری هەیە، لەسەر شێوازی سزادانەکە لەسەر سەرخۆش بوونەکەی بەتەنهاو هیچی تر، ئەی نابینی ئەگەر کەسێك هەردوو قاچی شکێندرابێت، بە دانیشتنەوە نوێژ دەکات، و هەروەها ئەگەر خۆیشی هەردوو قاچی خۆیی شکاندبن، هەر بەدانیشتنەوە نوێژ دەکات، لە کاتێکدا کە کەسی دووەم بە شکاندنی قاچەکانی تاوانێکی ئەنجامداوە، و یەکەم بێتاوانە (بەڵام هەردووك هەر یەك جۆر کاریان ئەنجامدا، کە کردنی نوێژەکە بوو، بە دانیشتنەوە).

دووەم: ئەوانەی کە ڕایان وایە کە تەڵاقیان دەکەوێتو، هەروەها گرێبەستو مامەڵە زارەکییەکان دادەمەزرێنو، لە کاتی کردنی تاواندا، تۆڵەی تەواوی لێ دەکرێتەوە، ئەوەیان کردووە بە بەڵگە کە لێرەدا کەسی سەرخۆش خۆی هۆکاربووە، ڕاستەو خۆ بەلابردنی عەقڵی خۆی، کە چووە ئەو خواردنەوە حەرامەی خواردۆتەوە، یان خواردووەو، مافی ئەوەی نییە، کە تاوانەکەی لەسەر سوك بکرێتو، لەو حاڵەتەدا بەعاقڵو خاوەن هۆش حسابی بۆ دەکرێت، تاوەك سزاو سەختی چەشتن دەرخواردی بدرێتو، سزا بدرێتو، ئەمەش کارێکی سەر سوڕهێنەر نییە، چونکە جاری واهەیە، کە کەسێك بەحەقیقەت شتێکی سڕیوەتەوەو، لابردووە، لە تەقدیرو گریمانەدا وا لە حوکمدا بە زیندوو دادەنرێت، ئەگەر ئەو سڕینەوەیە لە ڕێگای تاوانەوە ئەنجام درابوو، ئەمەش وەك سزاو سەختی چەشتنێ بۆ ئەنجامدەرەکەی، وەك ئەوەی کەسێك میرات دەرەکەی خۆی بکوژێت، کە لەم حاڵەتەدا ئەو میرات دەرە بەزیندوو دێتە ئەژمار بەهۆی تاوانەکەیەوە، ئەمەش وەك سزادانو سەختیو ئازار چەشتنێ بۆ ئەنجامدەرەکە و بە کورتیو پوختی، تاوان نابێتە هۆکار بۆ سوککردنی سزالەسەر تاوانبارەکە، و بەڵکو کردنی ئەو تاوانە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە خاوەنەکەی ڕازییە بەسەر جەم ئەو سزایانەی کە لە ئەنجامی کردنی ئەو تاوانەوە دەچەسپێن لەسەری.

سێیەم: ئەوانەی کە ڕایان وایە دەبێت لە نێوان قسەو تاوانکردنی کەسی سەرخۆشدا جیاوازی بکرێتو، دەڵێن قسەی لێ ناگیرێ، بەڵام لەسەر تاوانکردنی، سزای تەواو دەدرێت، ئەمانە بەڵگەیان ئەوەیە کە قسەدەردانی سەرخۆش هیچ نییەو، خۆی لە خۆیدا خراپەی تیادا نییە، چونکە قسەی کەسێکی غەیرە عاقڵەو پوچەو، بێ دووکەڵو خراپەیە بەپێچەوانەی کردەوەوە، کە خراپی کردووە، لە دوای ڕوودانی کردەوەکە ناتوانین ئەو

خراپەیە بسڕینەوەو لابەرین، بۆیە بە کاردانی کردەوەی تاوانکاری زیانێکی تەواوی هەیەو، خراپەیەکی گەورە دەنێتەوە، و ئەمەیش دروست نییە، و هەروەها ئەگەر تاوانێکی کردو لەسەری سزا نەدرا، ئەمە ئەبێتە بیانوو بۆ ئەنجامدانی تاوانی ترو، چاوشکێن دەبێت و ئیدی کوشتنی خەڵکی بێ تاوان لەلای دەبێتە دروستو ئاساییو، بێگومان لە مەیشدا خراپەیەکی ئاشکرا هەیەو، هەروەها ئەوەیش لێرەدا هەیە، کە سەرخۆشی تاوانەو، تاوانیش نابێت ببێتە لابەری بەرپرسیاری تاوان، بۆ لابردنی تاوانێکی تر، واتە بەرپرسیارێتی تاوان بە تاوان لانەدرێت.

**چوارەم:** حەنەفیەکان کە دەڵێن، کە قسەی سەرخۆش نابێتە هۆی هەڵگەڕانەوەی لە ئیسلام، و هەروەها دانپیانانیش بۆ هەر شتێکی تر نابێتە هۆکار چونکە بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوە، بۆ ئەمە بەڵگەمان ئەوەیە، کە هەڵگەڕانەوە گۆڕانکارییە لە بیمەو باوەڕداو، بیرو باوەڕیش، تەنها بەمەبەستداریو تایبەتی نەبێت، لا ناچێتو ناگۆڕێتو، یاخود دەبێت، بەڕووی ئاشکرا مەبەستی تیادا هەبێت، کە دەیەوێت، ئاینەکەی بگۆڕێتو، ئەویش لە حاڵەتێکدا دەبێت، کە مەبەست (قصد) تیادا دیار بێتو، ئەوەی تیا بفامرێتەوە، کە مەبەستدارەکە، کە ئەمەیش لە حاڵەتی ئاساییو ساغیدا دەبێتو، سەرخۆشیش ئەم حاڵەتە ئاساییو تەندروستەی نییەو، بۆیە قسەکانی نابێتە هۆکاری گۆڕینی بیرو باوەڕو بۆیە هەڵگەڕانەوە لە ئیسلام لەو حاڵەتەدا نایەتە ئەژمار، بەڵام سەبارەت بە حساب نەکردن، بەدانپیانانی کەسی سەرخۆش بۆ هەر کارو بارێ، لەبەر ئەوەیە کە بۆی هەیە پەشیمان ببێتەوەو، لەبەر ئەوەیە کە کەسی سەرخۆش حلحلییەو، لەسەر شتێ دانەمەزرێ و بۆی هەیە، لەو قسەیەی دیسان پەشیمان ببێتەوەو، بۆیە ئەگەر لە کاتی سەرخۆشیدا، دانی نا بەوەدا کە داوێن پیسی کردووە، ئەوە ئەو دانپیانانەی لێ وەرناگیرێت، چونکە بۆی هەیە لەو داننان بە داوێن پیسییە پەشیمان ببێتەوەو، ئینجا بەڵگەی حەنەفیەکان لەوەدا کە قسەکانی تری سەرخۆشەوە وەردەگیرێن، و هەمان بەڵگەکانی ئەوانەن، کە بەڕەهاییو موتڵەقی قسەی سەرخۆش وەردەگرنو حسابی لەسەر دەکەن.

**پێنجەم:** مالیکییەکان کە دەڵێن، گرێبەستو دانپیانانی سەرخۆش کاری پێ ناکرێت، بەڵگەیان ئەوەیە کە مەرجی دروستی گرێبەست ئەوەیە کە کەسی گرێبەستکار بتوانێ چاکو خراپ لە یەکتر جیا بکاتەوەو، بێگومان سەرخۆش توانای جیاکردنەوەی چاکو خراپی نییە، بەڵام سەبارەت بە دانپیانانەکان (إقرار) دەڵێن، ئەمەیان یان بەدارایییەو، لەم حاڵەتەشدا

دانانی پەیوەندیدار بە داراییەوە دروست نییە، چونکە بەهۆی سەرخۆشیەکەیەوە، بەسانسۆر لەسەر (محجور علیه) دێتە ئەژمار، یاخود دان پیانانەکەی لە بواری داراییدا نییە، کە لێرەیشدا فەرمودەکەی باسی (ماعز) [1] بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دانپیانانی سەرخۆش حسابی بۆ نەکراوە.

## ١٣٠- توێژینەوەی بەڵگەکان و، دیاریکردنی ڕاست و باشترین (راجح) ترینی، بیروڕا جیاوازەکانی شەرعزانان لەم بارەیەوە:

١- بێگومان ئەوانەی کە دەڵێن قسەی سەرخۆش دروست نییە و، نا دامەزراوە، قسەکەیان وەرگیراوە و ساغ و تەندروستە، چونکە قسە کاتێك حسابی بۆ دەکرێت، کە بە نیاز و مەبەستەوە بکرێت و، بێگومان سەرخۆش هیچ نیاز و مەبەستێکی نییە چونکە عەقڵ لەلای میوان نییە، بۆیە حساب بۆ قسەی ناکرێت و، هەروەها پابەندکردنی سەرخۆش بەو قسانەوەی، وەك سزایەك لەسەری ئەمیش هەر دروست نییە، چونکە سزا شەرع دیاری دەکات و دای دەنێت، نەك ئیجتیهاد کردن، هەروەك کە دەق هەیە، کە ئەوە دەردەکێنێت، کە سەرخۆش نازانێ چی دەڵێت و، هەر کەسیش نەزانێت چی دەڵێت، ئیتر مانا و مەبەستی ئەو شتە نازانێت کە دەری بڕیوە و، بۆیە هیچ ڕێ و شوێنێکی شەرعی لەسەر ئەو قسانەی ناگیرێتە بەر، وەك ئەوەی کە کەسێکی غەیرە عەرەب ووشەی (تەلاق) دەردەبڕێت، لە کاتێکدا کە ماناکەی نەزانێت، بۆیە هیچ ڕێ و شوێنێکی شەرعی لەسەر ئەم قسەیەی ناگیرێتەبەر.

٢- ئەم کەسە سەرخۆشە قیاسی دەکرێتە سەر کەسێك کە میراتدەری خۆیی کوشتبێت، کە ئیتر لە میراتبردن بێ بەش دەبێت، چونکە کەسە میراتدەرەکە لەم حاڵەتەدا، کە کوژراوە، بەزیندوو دەهێنرێتە ئەژمار، بە گریمانەیی و میراتبەرەکە لە میرات بێ بەری دەبێت، و ئەمەیش (قیاسی مع الفارق)ـە، واتە: قیاسی نەگونجاوە، چونکە ئەم بکوژە مەبەستی هەبووە، کە میراتدەری خۆیی کوشتووە، تا زوتر میراتەکەی دەست بکەوێت و،

---

[1] فەرمودەکەی (ماعز) ئەوەبوو، کە دانی نا بەوەیدا کە زینای کردووە و لە لای پێغەمبەریشدا (ﷺ)دانی پیادانا، و پێغەمبەر (ﷺ) پرسیاری لێ کرد و یاخود دەمودووی تاقیکردەوە تا جەختی پێ بکاتەوە، کە ئایا سەرخۆشە یان نا.... و ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە دان پیانانی کەسی سەرخۆش حسابی بۆ ناکرێت.

لەدەرەنجامدا بەبێ بەشكردنی لە میرات سزادراوەو، بەڵام كەسی سەرخۆش مەبەستی لەسەر خۆشكردنی خۆیدا هەبووە، بەڵام بۆ نموونە مەبەستی نەبووە كە لەو كاتی سەرخۆشیەدا تەلاقەكانی خۆی بخات، ئیتر چۆن تەڵاقی دەكەون؟

٣- تەنانەت ئەگەر لەسەر ئەو قسانەی وەك سزایەك دوچاری گرتنو تەمبێ كردنی بكەین، جا چۆن سزایەكی وای دەدەین، كە كاریگەری بكاتە سەر كەسێكی بێ تاوانو بێ ئاگا، بۆ نموونە وەك ئەوەی كە ژنەكەی لە كاتی سەرخۆشیدا تەڵاق بدات؟ كە بێگومان ژنەكە لەو كاتەدا بێ ئاگایەو، بێ تاوانە لەو پرسەدا.

٤- بەڵام سەبارەت بە بەڵگەی ئەوانەی كە رایان وایە، دەبێت سەرخۆش لە سەرتاوانەكانی سزا بدرێت، ئەمانە بەڵگەكانیان وەرگیراونو، هیچ شتێك لە ئارادا نییە، كە هەڵوەشێنەرەوەی بەڵگەكانیان بێتو، لەم حاڵەتەشیدا ناكرێت، هاوتا بكرێت لەگەڵ حاڵەتی شێتدا، چونكە كەسی سەرخۆش لەم كاتەدا تاوانبارە بەسەرخۆشكردنی خۆیو، هەروەها تاوانبارە لەوەیشدا كە تاوانی بەرامبەر بەخەڵكی ئەنجامداوە، ئیتر چۆن پاڵپشتی لێوە دەكرێت؟ لایەنی كەسی تاوانبار كراو بەردەدرێت؟! وئەگەر چاو پۆشی لەمەیش هەمووی بكەین، بێگومان سزادانی سەرخۆش لەسەر تاوانەكانی، یاساكانی (سد الذرائع إلى المفاسد: بیانوو نەهێڵان، بۆ خراپەكاری) پاڵپشتی لێوە دەكەن، كە دەبێت سەرخۆش لەسەر تاوانەكانی سزا بدرێت، كە ئەمەیش یاسایەكە بنەماكانی شەریعەتو گەلێك دەقو تێكست هەن، كە شایەتی دروستی ئەو بنەما شەرعییەی سەرەوە دەدەن، لەسەر ئەم بنەمایە ئەوەی لەلای ئێمە رای باشتر (راجیح) ترە، ئەوەیە كە كار ناكرێت، بەسەر جەم قسەكانی كەسی سەرخۆش كە بەرێگایەكی حەرام خۆی سەرخۆشكردبێت، و لە گەڵی ئەوەیشدا لەسەر تاوانەكانی سزای تەواو دەدرێت.

## ١٣١- حوكمی سەرخۆش، لە یاسا دەستكردەكاندا:

أ- دەقی یاسای باری كەسێتی عێراقی: دەڵێت: كە تەڵاقی سەرخۆش ناكەوێت، و ئیتر بە مەرجی نەگرتووە، ئەو سەرخۆشییەی بەرێگای حەڵاڵ ئەنجام دابێت، یان رێگای حەرام و دەقەكە بەرەهایی باسی كردووەو، دەبێت هەر بەرەهاییو موتڵەقی سەیر بكرێتو، مەرجدار نەكرێو، بۆیە دەڵێت: كە تەڵاقی كەسی سەرخۆش بە موتڵەقی ناكەوێتو، هەروەها هەر

بەپێی هەمان یاسا ژن مارەکردنی کەسی سەرخۆشیش هەر دانامەزرێت، چونکە ئەوەی بەمەرج گرتووە، کە دەبێت، ئەو کەسەی گرێبەستی هاوسەرێتی ئەنجام دەدات، عاقڵو باڵغ بێت[1]، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ژن مارەکردنی سەرخۆش بەتاڵە، چونکە لەو حاڵەتەدا بێ عەقڵە، و هەروەها سەرجەم مامەڵەو هەڵسوکەوتە زارەکییەکانی تریش هەر بەم شێوازە بەتاڵنو دانامەزرێن، چونکە مەرجی دامەزراندنیان بریتین لە بوونی مەبەست لەلای ئەو کەسە، بەئەنجامدانی ئەو کارەو، هەروەها دەبێت بەدەستو بژاردەی خۆیو، بەبێ زۆر لێکردن کارەکە بکاتو بێگومان کەسی سەرخۆش نەمەبەستو نەبژاردەو دەسچنی خۆی نییە، کە ئەو کارە دەکات.

لە میسر یاسای ژمارە ٢٥ی ساڵی ١٩٢٩ بەدەق هێناویەتی، کە تەڵاقی کەسی سەرخۆش ناکەوێت[2]و، ئەمیش جیاوازی نەکردووە لە نێوان ئەوەی بە ڕێگای حەرام خۆی سەرخۆش کردبێت، یان بەڕێگای حەڵاڵو، بۆیە ئەم یاسایە درکاندویەتی کە بەرەهاییو موتڵەقی تەڵاقی کەسی سەرخۆش ناکەوێتو، ئەمەیش لەبەر ڕۆشنایی گشتی بوونو ڕەهایی دەقەکەدا دەردەکەوێت، کە ئەوەی دەرخستووە تەڵاقی سەرخۆش بە موتڵەقی ناکەوێت[3].

- دەقی یاسای سزادانی میسری دەڵێت، هەرکەس هەستی لەدەست دابێت یاخود کار لەدەست بوونی خۆی (إختيار)ی، نەمابێت، لە کاتی کارکردنداو، لە کاتی کردنو جێ بەجێ کردنی ئەو کردەوەیە، ئەوە سزای لەسەر نییە، ئیتر ئەم کارەی بەهۆی شێت بوون کردبێت یاخود بەهۆی کەمو کوڕی عەقڵییەوە، یان بەهۆی بێ هۆشییەك کە بەهۆی بەکارهێنانی هەر جۆرێك لە ماددەسڕکەرەکان بەسەریدا هاتبێت، ئەگەر بەزۆر پێی کرابوو، یاخود بە نەزانی ئەنجامی دابوو[4].

یاسای تاوانی میصری و ڕای سەرجەم شەرعزانان لەسەر ئەوەیە کە کەسی سەرخۆش لەسەر کردەوەکانی سزا نادرێت، ئەگەر ئەو سەرخۆش بوونەی بەڕێگای حەڵاڵ ئەنجام دابووو، لەم دەقەوە ئەوە دەفامرێتەوە کە سەرخۆشەکە بە ڕێگای حەرام سەرخۆش بووبوو، وەك ئەوەی کە

---

[1] ماددەی ٣٥، بڕگەی یەکەم لە یاسای باری کەسێتی عێراقی، ژمارە ٨٨ی ساڵی ١٩٥٩.

[2] ماددەی ٧، بڕگەی یەکەم.

[3] لە ماددەی یەکەمی ئەو یاسایەدا وا هاتووە.

[4] ماددەی ٦٣ لە یاسای سزادانی میسری ژمارە ٥٨ ی، ساڵی ١٩٣٧.

بەتایبەتیو بەدەست خۆی ئارەقەکەی خواردبێتەوەو، یاخود زانیبێتی کە ئەوەی دەیخواتەوە، ئارەقو سەرخۆشکەرە، ئەمەیان لە سزادانی یاسای ناپارێزرێت و لە کاتی جێ بەجێ کردنی ئەم دەقەدا لەوە تێ دەگەین کە دەبێت ئەو کەسەی هەستی لەدەست داوە، یان ئیختیاری لەدەست داوە، بەهۆی ماددە سڕکەرەکانەوە دەبێت بەمانای ووشە لە دەستی دابێ، مەرج گەلەکە لەمیشدا هاتبنە دی، ئەگەر نا.... ئەو مرۆڤە بەو قۆناغە نەگەیشتبوو، ئەوە دەقەکەی لەسەر جێ بەجێ ناکرێت و دواجار بەرپرسیارێتی لە سەرشان دەبێت.

هەروەها ئەمەو یاسای سزادانی بەغدادیش هەمان دەقی ئەوەی تیادایە کە لە یاسای سزادانی عێراقی نوێ، ژمارە ١١١ی ساڵی ١٩٦٩دا هەیە، کە لە ماددەی ٦٠یدا، هاتووە، کە دەڵێت: هەر کەس لەکاتی کردنی تاوانێکدا، هەستی نەبووبێت، یاخود ویستی لە دەست دابێت، بەهۆی شێتی یان کەمو کوڕی عەقڵیەوە، یاخود لەبەر ئەوەی کە لە حاڵەتی سەرخۆشیدا بووە، یاخود سڕ بووبێت، لە دەرەنجامی ماددەی سەرخۆشکەر، یاخود ماددەی سڕکەرەکە بەزۆر پێی درابێت، یاخود بە نەزانین بەکاری هێنابوو..... هتد، لەم کاتو حاڵەتەدا، ئەم کەسە سزای تاوانەکەی نادرێتو، تۆڵەی لێ ناسەندرێتەوە !

## شەشەم: زۆر لێکردن ((الاكراه)):

١٣٢- ڕێخۆشکردن:

زۆر لێکردن، لەبەر بەربەستە مرۆڤکردەکانە، بەڵام کردەوەی خودی مرۆڤەکە نییە، بەڵکو کردەوەی کەسێکی ترە، کە بە تۆبزی بەسەر ئەمدا ئەنجامی دەداتو لەمەودوا دەربارەی پێناسەکەیو مەرجەکانی هاتنەدی ئەم زۆر لێکردنەو جۆرەکانیو، ئاستی دژایەتی ئەمە لەگەڵ ئەهلیەتی مرۆڤدا، یان ئاستی گونجانی لە گەڵ ئەهلیەتدا باس دەکەینو، دەدوێنو، هەروەها باسی کاریگەری لەسەر هەڵسوکەوتو مامەڵەکانی کەسی زۆر لێکراو دەکەین، یاخود حوکمی هەڵسوکەوتەکانی کەسی زۆر لێکراو ڕوون دەکەینەوە و پاشان کۆتایی بە باسەکە دەهێنین، بە کورتە باسێکی زۆرلێکردن لە یاسای عێراقیدا.

## ١٣٣- پێناسەی زۆر لێکردن:

زانایانی ئوصول، زۆر لێکردن (إكراه) یان بە پێناسە گەلێکی نزیك لە یەکتری لەوانە ئەو پێناسەیەیە کە دانەری کتێبی (التلويح) دەری بڕیوە، کە دەڵێت: زۆر لێکردن، بریتییە لە زۆر کردن لە کەسێکی تر کە کارێك ئەنجام بدات، کە خودی کەسە زۆر لێکراوەکە پێی ڕازی

نەبێت‌و، ئەگەر کەسەکە خۆی سەرپشك بکرێت، ئەوکارە ئەنجام نادات، و زانایانی تریش وا پێناسەیان کردووە، کە بریتییە لە زۆرلێکردنی کەسێکی تر، بە کارێك کە نایەوێت ئەنجامی بدات و بە زۆر پێی دەکرێت، ئەمەش بە ترساندن‌و چاو لێسورکردنەوە، لە کاتێکدا کە کابرای زۆر دار توانای ئەنجامدانی ئەو تۆقاندنەی هەبێت، کە کابرای زۆر لێکراوی پێی ترساندووە، ئەم پێناسەیەش، کۆمەڵە فەرمانێکی لە خۆ گرتووە، کە بوونی ئەوشت‌و فەرمانگەلە بۆ هاتنەدی زۆر لێکردن پێویستن‌و، بەم پێیە بێت، ئەم پێناسەیە، لە پێناسەی یەکەم روونترە.

## ١٣٤- مەرجەکانی هاتنەدی زۆر لێکردن:

١- دەبێت کابرای زۆردار، توانای ئەنجامدانی ئەو کارەی هەبێت، کە کابرای زۆر لێکراوی پیێ ترساندووەو ئەگەر توانای ئەنجامدانی ئەو کارە ترسێنەرەی نەبووکە هەرەشەکەی پێکردووەو، کابرای زۆر لێکراو دەیزانی، کە توانای ئەو قسە زلەی نییە، ئەوا ئەوکاتە ئەو ترساندنەی بە هیچ حساب دەکرێت، و گوێی پیێ نادرێت.

٢- دەبێت کابرای زۆر لێکراو لەو هەرەشەیە بترسێت، بەجۆرێك کە لە دەرونی خۆیدا ئەوە لێك بداتەوە و تەتەڵەی ئەوە بکات، کە بڵێت، بەخوا لەوانەیە ئەم کابرا زۆردارە، بەم پەلەپەلە ئەم هەرەشەیەی بەسەرمدا جیێ بەجیێ بکات، یاخود زۆرینەی گومانی بەلای ئەوەدا زاڵ بێت، کە هەرەشەکەی ئەنجام دەداتو، ئیدی ئەو کارە، لە ژێر کاریگەری ترسی ئەو هەرەشەیەدا ئەنجام بدات.

٣- دەبێت ئەو شتەی یان ئەو هەرەشەیەی کە زۆردار کابرای زۆر لێکراوی پیێ ترساندووە، جۆرە زیانێکی وابێت، کە لە ناو بەری گیانی کابرا بێت، یان لە ناوبەری بەشێکی ئەندامەکانی لەشی بێت، یان شتێکی کەمتر لە مانە، وەك زیندانی کردن‌و، بەستنەوەو، لێدان، بەڵام سەبارەت بە هەرەشە کردن بە لەناو بردنی موڵکو سامانەکەی، بەڵام بە لە ناوبردنێکی زۆر نەك کەم‌و لابەلایی، ئەمەیش هەر بەهەرەشەی بەهەند وەرگیراو دێتە ئەژمار، لەلای شافعی‌و حەنبەلی‌و جەعفەرییەکان‌و هەندیێ لە شەرعزانەکانی مەزهەبی حەنەفی هەر بە (زۆر لێکردن) حسابە.

هەروەها هەرەشەکردن بە زیانگەیاندن بە کەسێك، کەئەم کەسە لە لای زۆر لێکراوەکە

گرنگو بایەخدار بێت، ئەمیش هەر بە هەڕەشە دێتە ئەژمار، لەلای جەعفەرییەکانو، هەروەها لەلای حەنەفییەکانیش هەر زۆر کردنە، ئەگەر ئەو زیانە بۆ سەر کەسێکی وەك هاوسەر، یان خزمانی نزیك بێت، یاخود هەڕەشە بێت، بۆسەر منداڵیش، لەلای حەنبەلییەکان هەر بەزۆر لێکردن دێتە ئەژمار[1].

## ١٣٥- جۆرەکانی زۆر لێکردن

**زانایانی حەنەفی زۆر لێکردنیان کردووەتە دوو بەشەوە:**

- زۆر لێکردنی تەواو، و تێر و تەسەلو کامڵ.
- زۆر لێکردنی ناتەواو، نا کامڵ[2].

**أ- زۆر لێکردنی تەواو:**

ئەو زۆر لێکردنەیە، کە هەڕەشەی تیادا کراوە، بە کوشتن، یان لە ناوبردنی بەشێکی جەستە، چونکە ئەندامەکانی جەستە، بەشێکن لە مرۆڤو، وەك چۆن کوشتنو لە نابردنی گیانو ڕوح حەرام کراوە، لە ناوبردنی ئەندامەکانی جەستەیش هەر حەرامە، چونکە بەشێکن لەلاشەو جەستە.

هەروەها هەڕەشە کردن بە لەناو بردنی سەرجەم موڵكو دارایی کەسێكو، یاخود

---

١ التلويح، ب٢، ل١٩٦.

٢ البحر الرائق، ب٨، ل٢، حاشية إبن عابدين، ب٥، ل١١٠، الأقناع لە فیقهی حەنبەلیدا، ب٤، ل٤، (منهاج الصالحين) لە فیقهی جەعفەریدا، دانانی موحسین ئەلحەکیم، ب٢، ل١٤، المغني ب٧، ل١٢٠، المذهب ب٢، ل٨٣، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە هەندێ لە شەرعزانانی مەزهەبی حەنبەل ئەوەیان بەمەرج گرتووە، بۆ هاتنەدی زۆر لێکردن، کە دەبێت ئەو هەڕەشەیە بە کردەوە لەسەر کەسی زۆر لێکراو هاتبێتەدیو، لەلایان تەنها بە هەڕەشەی زارەکی حساب نییە، بەڵام ڕای ڕاست هەر لە هەمان مەزهەبدا ئەوەیە کە تەنها هەڕەشەکردنەکە بەسە و بە زۆر لێکردن حسابە، المغني ب٧/ل١١ ، و منی وەرگێڕی ئەم کتێبەیش بۆ کوردی پێم وایە، هێنانی بەشی یەکەمی ئەم ڕایە لەم پەراوێزەدا زۆر زیادەیە و نازانم دانەر بۆچی هێناویەتی، چونکە زۆر قسەیەکی بێ مانایە، جا کە هەڕەشەکە ڕوویدا، ئیتر چی تیادا دەمێنێتەوە؟ و کورد گوتەنی، ئەم هاتو هاوارەی شەرع بۆ ئەوەیە کە پێستەکە سەگەکە نەیبات، جا کە بردی ئیتر چی؟ بەڵام بەشی دووەمی پەراوێزەکە کە ڕای (راجح)ـی، مەزهەبی حەنبەلییە، پینەی ئەو قسە بێ مانایەی ئەو گروپە دەکات.

هەڕەشەکردن بە کوشتنی کەسێکی کابرای زۆر لێکراو، کە کوشتنی ئەم کەسە، بۆ کابرای زۆر لێکراو بایەخ بێتو، لەلای گرنگ بێت، (ئەمەیان لەسەر ڕای ئەوانەی کە ئەم جۆرە هەڕەشە لێکردنەیان، بە زۆر لێکردن دەزانن)، بەهەرحاڵ ئەو دوو جۆرە هەڕەشەیەی سەرەوەیش، واتە: لە ناو بردنی ماڵو کوشتنی کەسی نزیکی زۆر لێکراو، هەر بە زۆر لێکردن دێنە ئەژمارو، ئەم جۆرە زۆر لێکردنە بە (مُلجیء) ناوزەد کراوە، چونکە کابرا پەنا دەباتە بەرکردنی ئەو کارە و ناچاری دەکات ئەنجامی بدات، لە ترسی ئەوەی نەبادا کابرای زۆردار بیکوژێت، یان بەشێکی جەستەی لەناو بباتو، ئەم جۆرە زۆر لێکردنە بژاردە (إختیار)ـی، مرۆڤەکە، و مرۆڤەکەیش لەم حاڵەتەدا خاوەن ڕەزا نییە، واتە بەحەزەری خۆی کارەکە ناکات، بەڵام بەتەواوی ئیختیاری لە دەست نادات، ڕاڤەی ئەم مەبەستەمان لەم قسەیە ئەوەیە کە هەڵبژاردە (إختیار) بریتیە لە مەبەست بوونی کەسێك بە کردنی کارێك، بەڵام هێشتا یەکلایی نەبۆتەوە، لە نێوان کردن یان نەکردنیشداو بەڵام لە سەرو خواری ئەوەدایە کە یەکێکیان هەڵبژێرێت، بەسەر ئەوەی تریاندا، و یاخود بەدەستەواژەیەکی تر، ئەوەیە کە بریتیە لە مەبەست بوونی کەسێك بەکردن یان نەکردنی کارێکو، دواجار هەر خۆیشی بڕیار دەداتو، بڕیار لای خۆیەتی کە کامیان بکاتو کامیان نەکات، جا ئەم مانایە کە ڕاڤەمان کرد بۆیە دەستەواژەی (إختیار) بەزۆر لێکردن لا ناچێت، چونکە کابرای زۆر لێکراو، کردەوەکە بە مەبەستی خۆی ئەنجام دەداتو، لەو کارەیدا ئامانجدارو مەبەستدارە، چونکە ئەو کارەیان دواجار هەڵدەبژێرێت، کە ساناترو ئاسانترە، لەسەری، و ئەگەر ئەو کارەی کە زۆری لێکراوە بیکات، ئەنجامی بداتو جێ بەجێی بکات، ئەم ئەنجامدانە یەکلاکردنەوەو تەرجیحەکە لەلایەن خۆیەوە کردوویەتی، تا خۆی بپارێزێت، لەو شتەی کە هەڕەشەی پێ کراوە، لەلایەن زۆردارەکەوە (واتە: دواجار ئەو شتەی هەڵبژاردووەو، (إختیار) کردووە، کە هەڕەشەیان لێکردووە، ئەنجامی بدات، تا لەهەڕەشەکەو سزای هەڕەشەکە خۆی بپارێزێت)، بەڵام لەبەر ئەوەی کە کابرای زۆر لێکراو لە خودی نیەتو نیازی خۆیدا خاوەن مەبەست نییەو، سەر بەخۆ نییەو، بەڵکو مەبەستو هەڵبژاردنی ئەم کابرا زۆر لێکراوە، بووەتە پاشکۆی مەبەستو هەڵبژاردنی کابرای زۆردار، بۆیە دواجار هەڵبژاردە (إختیار)ەکەی بە خراپ بوو (فاسد) دادەنرێتو، حسابی بۆ ناکرێت.

هەروەها هۆکاری نەمانی (ڕازی) بوون، لە کاتی زۆر لێکردندا، ئەمیش لەبەر ئەوەیە کە (ڕازی بوون) بریتیە لە حەزکردنو خواستی هەر مرۆڤێك بۆ کردنی کارێكو، ئاسودە بوونی بە

ئەنجامدانی ئەو کارەو، بێگومان ئەم حاڵەتەیش لە کاتی زۆر لێکردندا بوونی نییە کەواتە (ڕازی بوون)یش، لە کاتی (زۆر لێکران)دا، هیچ پێگەیەکی نییەو، بوونی نییە.

**ب- زۆر لێکردنی ناتەواو:**

ئەمیش ئەو جۆرە زۆر لێکردنەیە کە هەڕەشەکە بەلە ناوبردنی گیانی یان ئەندامەکانی لەشی نییە، بەڵکو هەڕەشەکردنە بەلێدانو زیندانی کردنو هتد......... و ئەمەیان (إختیار) تێك نادات، بەڵام (ڕازی بوون) لەناو دەباتو، بۆیە بژاردە (إختیار) لەناو نابات، چونکە کابرا ناچار نییە لەسەر ئەوەی کە هەر دەبێت، ئەو کارە بکات، چونکە دەتوانێت، خۆڕاگربێت، لەسەر ئەو هەڕەشانە، چونکە لەناو بەرنین، بە پێچەوانەی هەڕەشەکانی پێشووەوە کە کوشندە و لەناوبەر بوون.

## ١٣٦- دژایەتیو پێچەوانە بوونەوەی نێوان زۆر لێکردنو ئەهلیەت:-

زۆر لێکردن بە هەردوو جۆرەکەیەوە، (تەواو ملجیء)و (ناتەواو: غیر ملجیء)، دژو پێچەوانەی هیچکام لە دوو جۆرەکەی ئەهلیەت (أهلیة الأداء)و (اهلیة الوجوب) نینو،هەروەها زۆر لێکردن نابێتە هۆکار بۆ ئەوەی کە ئیتر خیطابو داوای شەرع لەسەر کابرای زۆر لێکراو لابچێتو، هۆکارو ڕەهەندی پێچەوانە نەبوونی لەگەڵ هەردوو جۆرەکەی ئەهلیەت لەو ڕووەوەیە کە ئەهلیەت بەهۆی پەیمان (ذمة)و عەقڵو باڵغ بوونەوە چەسپاوەو، جێگیر بووەو، زۆر لێکردن لابەری هیچکام لەمانە نییەو، هۆکاری ئەوەیش کە فەرمایشتو داواکاریو خیطابی شەرع لەسەر زۆر لێکراو لاناچێت، لەبەر ئەوەیە کە جاری وامەیە، کە ئەو کردەوەیەی زۆر لە کابرا کراوە، کە بیکات، حەرامەو کردنی تاوانەو، بە گوناهـ لەسەری دێتە ئەژمار، وەك پیاو کوشتنو داوێن پیسیو، جاری وا هەیە، کە کردنی ئەو کارە فەرزو پێویستە لەسەری بەجۆرێك کە ئەگەر نەیکات، گوناهبار دەبێت، وەك خواردنی ئارەقو گۆشتی مردارەوەبووو، جاری وا هەیە، کە دەرفەتی دراوەتێ بیکاتو، (رخصة)ـی، هەیەو، کە کردی، تاوانبار نییەو، ئەگەر خۆڕابگرێتو، ئەنجامی نەدات، پاداشتی بۆ هەیە، وەك کوفر کردنو لە ناوبردنی ماڵی خەڵکی (بەزۆر)، ئەمانە هەموو، واتە بەحەرامو فەرزو ڕوخسەتەوە، نیشانەن بۆ جێگیریو چەسپاوی داواکاریو خیطابی شەرع، لەسەر کەسی زۆر لێکراوو، هەروەها نیشانەن کە کەسی زۆر لێکراو ڕوو بەڕووی فەرمایشتی شەرع کراوەتەوەو

(مخاطب)ـه، چونكه ئەم شتانە بەبێ داواكاری جێ بەجێ كردنی ئەرك (خطـاب التكليـف) نابن‌و ناچەسپێن[1].

## ١٣٧- كاریگەرییەكانی زۆر لێكردن لە هەڵسوكەوتەكانی كەسی زۆر لێكراو:

پێش ڕاڤەو ڕونكردنەوەی كاریگەرییەكانی زۆر لێكردن، لە كارو بارو هەڵسوكەوتەكانی كەسی زۆر لێكراودا، واتە: ڕونكردنەوەی حوكمی هەڵسوكەوت‌و، مامەڵەی زۆر لێكراو، پێویستە باسی ئەو یاسا بنەڕەتیە (قاعدة)یە بكەین، كە ئەحكامەكانی هەڵسوكەوتە گوفتاری‌و كردارییەكانی كەسی زۆر لێكراوی لەسەر بنیات نراوە.

بنەمای ئەم پرسە لەلای حەنەفیەكان ئەوەیە كە زۆر لێكردن كاریگەری نییە، لەسەر بەتاڵكردنەوە و دانەمەزرانی‌و هەڵوەشاندنەوەی هەڵسوكەوتە گوفتاری‌و كردارییەكانی كەسی زۆر لێكراوو، بەڵكو كاریگەرییەكی لەسەر ئاستی گۆڕانی نیسبەتی ئەو هەڵسوكەوتانە بۆ كابرای زۆردار دەبێت، ئەگەر دەكرا، ئەو هەڵسوكەوتانە نیسبەت بدرێتە لای كابرای زۆر دار، بۆیە لەم حاڵەتەدا حوكمەكە بەسەر كابرای زۆرداردا دەچەسپێت‌و، ئەگەر ئەو نیسبەت دانەی بۆلای كابرای زۆردار نەدەكرا، ئەوا ئەو كاتە هەڵسوكەوتەكە هەر دەدرێتە پاڵ خودی زۆر لێكراوو، حوكمەكەیشی بەسەر ئەودا دەچەسپێت، جا ئەم نیسبەتدانەیش بۆلای كەسی زۆردار، تەنها لە كاتێكدا دێتە جێ‌و دەبێت، كە بتوانرێت كەسی بكەر (زۆر لێكراو) تەنها وەك ئامرازێكی جێ بەجێ كاری كەسە زۆردارەكە بزانرێت‌و دابنرێت.

جا بەپێی ئەم قاعیدەو بنەمایە، هەڵسوكەوتەكانی كەسی زۆر لێكراو دەبنە دووبەشەوە، یەكەمیان ئەمەیە كە دەگونجێت، نیسبەت بدرێتە لای كەسی زۆرداروو، كابرای زۆر لێكراو تەنها ئامرازی جێ بەجێ كردنی كارەكەیەو، دووەمیان ئەوەیە كە ناگونجێت‌و ناكرێت نیسبەتی بدرێتە لای كابرای زۆرداروو، بۆیە هەر دەدرێتە پاڵ خودی كەسی زۆر لێكراوو، حوكمەكەیشی تەنها بەسەر ئەودا دەچەسپێت.

بنەمای ئەم پرسە لەلای غەیری حەنەفیەكان، بۆ نموونە لەلای شافعیەكان لەسەر ئەوەیە كە زۆر لێكردن، ئەگەر لەسەر هەق بوو بۆ وێنە، زۆر كردن لەكەسی قەرزار بەفرۆشتنی

---

١ فـواتح الرحمـوت بـشرح مـسلم الثبـوت، ب١، ل ١٦٦٦، وأصـول البـزدوي، وشـرحه (كـشف الأسرار)، ب٤، ل١٥٠٣-١٥٠٤.

شتەکە، تا گەرەنتی قەرزەکە بێتەدی،ئەمە لێرەدا ئەم زۆر لێکردنە هیچ کاریگەرییەکی لەسەر مامەڵەکە نییەو، مامەڵەو هەڵسوکەوتەکەی دروستو دامەزراوەو، ئەگەر زۆر لێکردنەکە ناهەق بوو، ئەوا تەماشا دەکەین، ئەگەر ئەو زۆر لێکردنە ئەنجامی ئەو کارەی زۆرەکەی لەسەر کراوە حەڵاڵ نەکات، ئەوە حوکمەکە هەر لەسەر بکەرەکەو زۆر لێکراوەکە بە چەسپاوی دەمێنێتەوە، وەك زۆرکردن لەسەر کوشتنی کەسێكو، ئەگەر ئەو زۆر کردنە لە ئەنجامدا کارە زۆر لەسەر کراوەکە حەڵاڵ بکاتو، بگونجێت کارەکە بدرێتەوەلای زۆردارەکە، وەك لەناو بردنی موڵكو ماڵی خەڵکی، لێرەدا حوکمەکە لەسەر زۆر لێکراو لادەچێتو ئاوقەی گەردنی زۆردارەکە دەبێتو، ئەگەر نەدەگونجا، نیسبەت بدرێتە لای کابرای زۆردار، وەك قسەو شتی زارەکی، ئەمەیان بەتاڵو پوچەو، هیچ حوکمێکی لەسەر ناچەسپێتو دانامەزرێت، نەبۆ زۆردارو نەبۆ زۆر لێکراو[1].

**١٣٨- دوای ئەوەی قاعیدە و بنەمای ئەم پرسەمان لەلای حەنەفییەکان و** غەیری ئەوانیش ڕوون کردەوە، دەڵێین: زۆر لێکردن یان گوفتارییەو یان کردارییەو، هەیە کە لەمانەیش حوکمی تایبەتی خۆیی هەیە، لەسەر ڕۆشنایی ئەو قاعیدەیەی پێشوودا، بە پێی ئەو درێژە باسەی کە لەم بارەیەوەو، لەمەو دوا دەیخەینەڕوو.

## یەکەم: گوفتار:

ئەگەر ئەم گوفتارانە، دان پیانان (إقرار) بوون، ئەوە بەدانەمەزراو دێتە ئەژمارو بی جێن، چونکە (إقرار) بۆ حاڵەتی یەکلایی کردنەوەی لایەنی ڕاستیو دروستی ئەو شتەیە، جاکە لە ئیقراردا زۆر لێکردن هاتە کایەوە، ئەوە بۆ بەلاداخستنی لایەنی درۆکەیە، نەك ڕاستی، بۆیە حساب بۆ ئیقرار لە کاتی زۆر لێکردندا ناکرێت.

جا ئەگەر لەو هەڵسوکەوتو مامەڵ گوفتارییانەبوو، کە دەگونجێ هەڵبوەشێنەوەو، بەگاڵتەو گەپ بەتاڵ نەبنەوە، وەك مارەکردنو تەڵاقدانی ژنو، گێڕانەوەی ژن، ئەمانە حوکمەکانیان دەچەسپێنو، بەدامەزراوو چەسپاو دێتە ئەژمار، و زۆر لێکردن هیچ کاریگەرییەکی لەسەر یان نابێتو، ئەمەش ڕای زانایانی حەنەفی مەزهەبەو، بەڵگەیشیان بۆ ئەمە ئەوەیە کە ئەم هەڵسوکەوتو مامەڵانە، تەنها لەبەر ئەوەی کە بە بژاردەی مرۆڤەکە خۆی واتە: بە ئیختیاری خۆی ئەنجامی داوە، بۆیە هەموو ڕێو شوێنێکی شەرعیی لەسەر

---

[1] فواتح الرحموت بشرح مسلم الثبوت، ب١، ل١٦٧-١٦٨. التلويح، ب٢، ل١٩٦-١٩٧.

دەگیرێتەبەر، چونکە شەرع تەنها دەربڕینیانی لە جیاتی ماناو حوکمەکانی داناوە و ئەو دەربڕینەی کردۆتە ئەلتەر ناتیفی ئەم دووانە، بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەگەر کەسێك بەگاڵتەو گەپ دەریانبڕێت، هەرچەندە مەبەستدار نەبووە تیایاندا کە حوکمەکەیان بێتەدی‌و، هەروەها مەبەستی لە کاکڵی ماناکەیان نەبووە، بەڵام هەر دادەمەزرێن، بۆیە لەم حاڵەتەدا، کابرای زۆر لێکراو لە پێشترە، چونکە ئەو مەبەستی ڕوودانی ئەو شتەی هەبووە، و حوکمەکەیی هەڵبژاردووە، هەرچەندە لە کاتی زۆر لێکردنی تەواوو تێرو تەسەلدا، ئەو کەسە هەڵبژاردنەکەی نا تەندروست (فاسد) بووە.

بەڵام ئەگەر ئەو هەڵسوکەوتو مامەڵە زارەکییانە، لەو مامەڵە گوفتاریە دروستکراو (إنشاء) یانەبوون، کە دەگونجێت هەڵبوەشێنەوەو، لەگەڵ گاڵتەو گەپو شۆخیدا ناگونجێن، وەك کڕین‌و فرۆشتن، ئەمە لەم حاڵەتەدا ڕێ‌و شوێنی‌و کاریگەری زۆر لێکردن تیایاندا ناتەندروست (فاسد)ـە، بەڵام هەڵوەشاوەی تەواوەتی نین، ئەمە بەڕای حەنەفیەکان‌و، بەڵگەیشیان ئەوەیە کە کەزۆر لێکردن، (ڕازی بوون) لەکار دەخات، بەڵام بژاردە (إختیار) هەر دەهێڵێتەوە، و ڕازی بوونیش مەرجی دروستی کارەکەیە، نەك مەرجدامەزرانی‌و، کەواتە ئەم کارو مامەڵانە دادەمەزرێن، بەڵام هەر ناتەندروستن،و (فاسد)ـن، و بێگومان حوکمی ئەم مامەڵەو هەڵسوکەوتە زارەکییانە لەسەر ئەو شێوازەی کە ڕونمان کردەوە، لەسەر شانی بکەرەکە (زۆر لێکراوەکە) دەچەسپێن، نەك لەسەر شانی هاندەرەزۆردارەکە، چونکە دەرفەتی نیسبەت دانیان نیی، بۆلای کابرای زۆردار، چونکە هیچ کەسێ ناتوانێت، بەئەندامی زمانی کەسێکی تر بدوێت‌و! گفتوو گۆ بکات‌و، ڕاستەوخۆ زمانی ئەو بەکار بهێنێت! و کەواتە ناتوانرێت کەسی زۆر لێکراو لەم حاڵەتەدا بە ئامرازی دەستی کەسی زۆردار دابنرێت‌و، قسەکە بدرێتە پاڵ کەسە زۆردارەکەو، دواجار حوکمەکە لەسەر زۆردارەکە ناچەسپێت‌و، لەسەر زۆر لێکراوەکەیە.

شافعی‌و جەعفەری‌و حەنبەلی‌و هی تریش پێیان وایە کە هیچ ڕێ‌و شوێنێکی شەرعی لەسەر قسەی زۆر لێکراو ناگیرێتەبەر، و بەڵکو قسەکانی بە پوچ دێنە ئەژمارو، بۆیە تەڵاقی ناکەوێت‌و، کڕین‌و فرۆشتنی دانامەزرێت‌و، هەروەها هیچ مامەڵەیەکی زارەکی تری

ناچەسپێتو، بەڵگەیشیان بۆ ئەم قسەگەلە، لەچەند ڕوویەکەوەیە[1]:

١- بێگومان خوای پەروەردگار، حوکمی کافر بوونی، لەسەر کەسی زۆر لێکراو بە کوفر کردنو، دەر بڕینی ووشەی کوفرلابردووە، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿إِلَّا مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُۥ مُطْمَئِنٌّۢ بِٱلْإِيمَـٰنِ﴾[2] واتە: کەسێك بەزۆر کوفری پێ کرابێت، و دڵی پڕبێت، لە نووری بیروباوەڕی ئیسلامەتی، ئەوە ئەو کوفرەی لەسەر نایەتە ئەژمارو، بێگومان حوکمی کوفر کردن زۆر گەورەترە، لە حومکی کڕینو فرۆشتنو، ئەو جۆرە شتانە، چونکە یەکەمیان واتە: لە کوفر کردنەکەدا، جیاکردنەوەی ژنو پیاو لەیەکتریو، کوشتنو، دەست بەسەرداگرتنی ماڵەکەیی، بەدوادادێت، جا کە شتی گەورە لابرا، بێگومان بچوك لە پێشترە بۆ ئەوەی کەلا ببرێت.

٢- فەرموودە دەربارەی ئەوە هاتووە، کە کەسی زۆر لێکراو حوکمی لەسەر نییەو، بە بێ تاوان تەماشا کراوە، کە دەفەرموێت: : «إِنَّ اللّٰهَ وَضَعَ عَنْ أُمَّتِي الْخَطَأَ، وَالنِّسْيَانَ، وَمَا اسْتُكْرِهُوا عَلَيْهِ»، کە لێرەداو وەك چەندەها جار پێشتریش ئەم دەقەمان هێناوەو پەرچڤەمان کردووە، دەڵێت: بە هەڵەکردنی کارێکی خراپو حەرامو، لە بیرچوونەوەو زۆر لێکردن تاوانیان لەسەر نییە، هەروەها لە گێڕانەوەیەکدا، هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا طلاق في إغلاق)، واتە: لە کاتی زۆر لێکردندا تەڵاق ناکەوێت، کە لێرەدا ووشەی (إغلاق) بە (إكراه: زۆر لێکردن) ڕاڤە کراوەو، لێکدراوەتەوەو، هەروەها لە پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو تالیبەوە گێڕدراوەتەوە، کە فەرموویەتی: (لا طلاق لمُكرَه) کەسی زۆر لێکراو تەڵاقی ناکەویو حسابی لەسەر ناکرێت، و گێڕانەوەی زۆری لەم جۆرە لە هاوەڵانەوە گێڕدراوەتەوە.

٣- بوونی ئامانجو مەبەست لە هەر هەڵسوکەوتو کارێکدا، مەرجی دروستی ئەو کارەیەو، بۆیە هەڵسوکەوتی منداڵو شێت دروست نییە، چونکە کارەکانیان بێ ئامانجو مەبەستنو، ئەم مەرجی ئامانجو مەبەستەیش لەکاتی زۆر لێکردندا تیا دەچێتو نامێنێت،

---

١ الأم، للأمام الشافعي، ب٣،ل ٢٠، إعلام الموقعين، ب٣، ل١٠٨و ب٤، ل٤٣-٤٤و الكاساني ب٧،ل ١٨٢-١٨٤، زاد المعاد، ب٢، ل٢٠٠، المغني، ب٧، ل١١٨، والشيرازي، ب٢، ل٨٣، والطوسي، ب٢، ل٤٥٣، منهاج الصالحين، محسن الحكيم، ب٢، ل١٢٢-١٨٢.

٢ سورة النحل: ١٠٦ .

چونکە کەسی زۆر لێکراو ئامانجو مەبەستی لەو هەڵسوکەوتەیدا نییە، بەڵکو تەنها مەبەستی لادانی زیانی ئەو شمشێرو شتانەیە لەسەری خۆی، کە وەك هەڕەشەو کاری فشار لەسەری بەکار هێنراون.

٤- کەسی زۆر لێکراو، ئەو گوتەیە بۆیە دەردەبڕێ، تا زیانەکە لەسەر گیانی خۆی لا ببات و دووربخاتەوەو، هیچ مەبەستی لە ماناکەی نییەو، ویستی لەسەر هونەرو حیکمەتەکەیشی نییە، بۆیە نابێت هیچ ڕێو شوێنێك لەسەر ئەم قسەیەی بگیرێتە بەر، و بەڵکو دەبێت بە قسەیەکی پوچ (لغو) سەیر بکرێت، وەك قسەی شێتو، خەوتوو، قسەی بێ مەبەستی هەرکەسێکی لەم بابەتە.

حەنەفییەکان بەم جۆرە بەرپەرچی ئەم گوتەیەدەدەنەوە، کە زۆر لێکردن، کار لەسەر بیروباوەڕ ناکات، بۆیە کەسی زۆر لێکراو بە کوفر کردن چاوپۆشی لێکراوەو، سەبارەت بە فەرموودەی ((عفي عن أمتي الخطأ والنسيان وما أستكرهوا عليه))، ئەمە مەبەستی لەوەدایە کە زۆر کردنە لەسەر کافربوونەوەو، کوفر کردن چونکە خەڵکی لەو سەردەمەدا تازە هاتبوونە نێو ئیسلامەوەو، زۆر لێکردن لەسەر کوفرو کافرێتی لەو سەردەمو حاڵەدا زۆرو بڵاو بوو، و تەنانەت ئەگەر مەبەست لە زۆرلێکردن (إكراه) لێرەدا، زۆر لێکردن بێت، لەسەر غەیری کوفریشئەوا لێرەدا ئێمە ملکەچی ئەوە نابین، کە هەڵسوکەوتو مامەڵەی زارەکیو گوفتاری لە چوار چێوەی پرسی زۆر لێکردندا جێگای ببێتەوە، چونکە زۆر لێکردن کاریگەری لەسەر قسەکردنو شتی زارەکی نییە، هەروەك چۆن کاریگەری لەسەر پرسە پەیوەندیدارەکان بەبیرو باوەڕەوە نییە، چونکە هیچ مرۆڤێك توانای ئەوەی نییە کە ئەندامی زمانی کەسێکی تر وەك ئامراز بەکار بهێنێت، بۆ قسەکردن وەك ئەوەی ئەم دەیەوێتو، بۆیە قسەکەر خۆی سەرپشکە کە چۆن قسە دەکاتو، لە حەقیقەتدا زۆر لێکراو نییەو، حوکمی فەرموودەکە نایگرێتەوە.

هەروەها دەربارەی ئەوەیش کە دەڵێن، هەڵسوکەوتی ئامانجدارو مەبەستدار، بوونی ئەو ئامانجو مەبەستە تیایدا، بۆ دروست بوونی بە مەرج گیراوە، ئەمەیش بۆ بێژەرانی ئەم قسەیە ناچەسپێتو، قسەیەکی لەم جۆرەیان بۆ ناچێتەسەر، چونکە ئەوەتا دەبینی کە تەلاقی کەسێ بەگاڵتە بیخات، هەر دەکەوێت، هەرچەندە کەلەو قسەیەو مامەڵەو هەڵسوکەوتەیدا مەبەستی نەبووە، کە بکەوێت، کەچی هەر کەوتووە هەروەها تەنانەت ئەگەر ئەم (مەبەستداریو ئامانجداری) یە، مەرجی دروستی هەر کارێك بن، خۆ ئەوەتا ئەم مەرجە

له حاڵەتی زۆر لێکردنیشدا هەر بوونی هەیە، چونکە کابرای زۆر لێکراو مەبەستو ئامانجی ئەوەی لە دڵدا هەیە، کە زیانو بەڵا لەگیانی خۆی لابداتو، ئەم پرۆسەیەش پێویستی بەمەبەستو ئامانج داری هەیە، لە ناخی مرۆڤەکەداو، بە هەوانتە ناکرێتو، دواجار کەسی زۆر لێکراو بەناچاری ئەو مەبەستەی لە دڵدا چەسپاندووەو، ئەو ئامانجەی گرتۆتە بەر، ئینجا سەبارەت بەو ڕێچکەو گێڕانەوانەی کە دەڵێن: تەلاقی کەسی زۆر لێکراو ناکەوێت، ئەمانە پێچەوانەو دژی کۆمەڵە گێڕانەوەیەکی ترن کە دەربڕی ئەوەن کە تەلاقی کەسی زۆر لێکراو دەکەوێتو، دواجار وەرگرتنی بەڵگەکانی ئەوان لە پێشتر نین، لە بەڵگەکانی ئێمە، کە لەم بارەیەوە هاتوون.

## ١٣٩- قسەی ڕاسترو یەکلاکەرەوە (الراجح) لەم پرسەدا:

ئەوەی ئێمە لەم پرسەدا هەڵی دەبژێرین، بریتیە لە قسەو ڕای جەماوەری زانایان، واتە: هیچ هەڵسوکەتو مامەڵەیەکی زارەکی کەسی زۆر لێکراو نایەتە دامەزراندن، ئیتر ئەو مامەڵەیە نەگونجێت بۆ هەڵوەشاندنەوە، وەك تەلاقدانو مارەکردنی ژن، یان بگونجێت، بۆ هەڵوەشاندنەوەو، سڕینەوە، وەك کڕینو فرۆشتنو بە کرێدان، چونیەکەو، بۆیە دواجار سەرجەم هەڵسوکەوتو مامەڵەزارەکیەکانی کەسی زۆر لێکراو بەتاڵن.

ئەوەیش کە حەنەفیەکان باسیان کردووە، بەڵگەدار نییەو، ئەوەی ئەوان بۆی چوون، بەڵگەو دۆکیۆمێنتی لەسەر دروست ناکرێت و بنیات نانرێت، و سەرجەم ئەوەی کە باسیان کردووە، شایانی بەرپەچدانەوەو توێژینەوەیەو، لێرەدا ئەوەندەمان بەسە کە هەندێ لەو شتانەی کە وەك بەرپەچدانەوەی حەنەفیەکان هاتووە، باسی بکەینو، بڵێین: بەڵگەی حەنەفیەکان لەسەر ئەوەی کە تەلاقو نیکاحی کەسی شۆخیبازو گاڵتەچی دادەمەزرێتو، دروستە، ئەمە قسەیەکی بێ سودە، چونکە جیاوازی هەیە، لە نێوان گاڵتەچیو زۆر لێکراودا، چونکە کەسی گاڵتەچی ئەو کارەو هۆکارەکە بژاردەو ئیختیاری دەست خۆیەتیو، فامدارە بەوشتەی کە دەیکاتو، زانایە بەو ڕێو شوێنانەی کە لەسەر شانی دەکەوێت، لەدەرەنجامی کردنی ئەو کارەوە، بەڵام کەسی زۆر لێکراو، ئەو کارەی بە زۆر پێکراوەو، بۆیە کردوویەتیو دەیکات، تا زیانی ئەو هەڕەشەیە لەسەر خۆی لاببات، کە ڕوو بەڕووی بۆتەوەو، ئەمکەسە تەنها وەك گێڕەدەیەکی قسەی کەسێکی تر وایەو، جا ئەمەیان لەکوێو

ئەوی تر لە کوێ؟!

ئینجا دەقیش هەیە، لەسەر کەوتنی تەڵاقی کەسێ بەگاڵتە تەڵاقەکەی خستبێتو، جا کوا دەق لەسەر ئەوە هەیە کە تەڵاقی کەسی زۆر لێکراو دەکەوێت؟و پاشان (ڕازی بوون) لە کڕینو فرۆشتندا زۆر گرنگەو بایەخدارە، بێگومان لە کڕینو فرۆشتندا وابێت، لە مارەکردنی ژندازۆر پێویست ترو بایەخدارترەو، دەبێت ڕازی بوونی تیادا بێت، چونکە بێگومان نرخی شەرمگا زۆر گرنگترە، لە نرخی ماڵو سامان، جاکە خوای پەروەردگار بردنی ماڵی خەڵکی حەرام کردبێت، مەگەر بەڕازی بوونی خاوەنەکەی نەبێت، ئینجا حەڵاڵە، بێگومان شەرمگای مرۆڤ زۆر لەوە بەنرخترەو، دەبێت تەنها بەڕازی بوونێکی شەرعییانە حەڵاڵ بکرێتو، بەس! و بۆیە نەهی کراوە، لە سەرپەرشتیاری ئافرەت، کە دەبێت، کچەکەی یان ئەو ئافرەتەی ئەو سەرپەرشتیاریەتی تەنها بەڕازی بوونی خۆی نەبێت نابێت بیدات بە شوو[1]!

سەبارەت بەو قسەیەی کە حەنەفییەکان دەیڵێن: زۆر لێکردن کاریگەری نابێت، لەسەر قسەو گوفتار، ئەمیش هەر بەر پەرچدراوەیە، چونکە دەقی قورئان هەیە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هیچ ڕێو شوێنێك ناگیرێتەبەر، لەسەر ووشەی کوفر، ئەگەر کەسێك بەزۆر پێی بگوترێت، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە زۆر لێکردن لە قسەو گوفتاردا کاری گەری هەیەو، حسابی بۆ دەکرێت.

## دووەم: کردارەکان:

جۆری دووەمی ئەو شتانە کە زۆریان لەسەر دەکرێت، کارو کردەوەکانن‌و، باسمان لەبەشی یەکەم کرد، کە باسی (گوفتار) بوو، و پوختەی قسە تیایدا ئەوەیە کە، ئەگەر زۆر لێکردنەکە ناتەواوو، ناتێرو تەسەل بووو، کابرای زۆر لێکراو کارەکەی ئەنجامدا، ئەوا تەنها کابرا خۆی بەرپرسیارێتی تەواوی کردەوەکەی خۆی دەگرێتە ئەستۆو، تەنها ڕێو شوێنی تەواو لەسەر خۆی دەگیرێتەبەر، بەڵام ئەگەر زۆر لێکردنەکە تەواوو تێرو تەسەل بوو، ئەوە کردەوەکانی پەیوەندیدار بە کابرای زۆر لێکراو دەبنە سێ بەشەوە.

---

[1] نظرية العقد، للأمام إبن تيمية، ل ١٥٥.

## بەشی یەکەم:

ئەو کردەوەگەلەی کە شەرع لە کاتی پێویستیدا حەڵاڵی کردوون، وەك خوارنەوەی ئارەق‌و خواردنی گۆشتی مردارەوە بووو، بەراز، ئەمانە حەڵاڵن بۆ کەسی زۆر لێکراو کە بیانخوات‌و ئەنجامیان بدات‌و، تەنانەت لەسەری پێویستە (واجب)ـە، بیانکات‌و ئەگەر نەیانکات، گوناهبار دەبێت، چونکە خوای پەروەردگار حەڵاڵی کردوون، و بەکارهێنانی شتی حەڵاڵ، بۆ خۆ پاراستن لە لەناچوون واجبە، و دروست نییە وازی لێ بهێنرێت.

## بەشی دووەم:

ئەو کردەوانەن، کە لەکاتی پێویستدا دەرفەت دراوە ئەنجام بدرێن، ئەگەر کەسەکە هەستا بەکردنیان، گوناهبار نابێت، و ئەگەر نەیکردن و تووشی سزاو ناڕەحەتی‌و سەختی بوو، ئەوە لەلای خودا خاوەن پاداشتەو، نموونەی ئەم بەشەیش وەك، کردنی کوفر بەزۆرو ناچاری لە کاتێکدا کە کەسەکە دڵی پڕ لە ئیمان بێت‌و، هەروەها وەك لەناو بردنی ماڵی خەڵك بەزۆر، بەڵام لە مەیاندا بژاردنی ئەو موڵکە لەسەر کەسە زۆردارەکەیە نەك لەسەر زۆر لێکراوەکە، چونکە کردەوەی لەناو بردن و خراپ کردنەکە دەکرێت بدرێتەوە پاڵ کابرای زۆردارو، کابرای زۆر لێکراوو ئەنجامدار تەنها ئامڕازی کردنی کارەکەیە، بۆیە حوکمەکە بەسەر زۆردارەکەدەچەسپێت‌و، ئەوەش ڕای حەنەفی‌و شافعییەکان، و ڕەوتی تریشە .....

## بەشی سێیەم:

ئەمەیان ئەو کردەوە گەلەیە، کە بەهیچ جۆرێك بۆ کابرای زۆر لێکراو دروست نییە کە ئەنجامی بدات، وەك کوشتنی کەسێك، چونکە گیانی خەڵکی تر، وەك گیانی ئەم کەسە پارێزراوەو، دروست نییە، کەسێك بە کوشتنی خەڵکی‌و زیان گەیاندن پێیان خۆی لە زیان بپارێزێت‌و کردەوەی لەم جۆرە گوناهبارییە، و کە ئەنجام درا، تۆڵەکردنەوەو کوشتنەوە لەسەر زۆر کارەکەیە، و ئەو دەکوژرێتەوە، لە جیاتی کابرای کوژراو، چونکە کوشتن دەکرێت نیسبەت بدرێتەوە لای کابرای زۆردارو، کابرای ئەنجامدەر، تەنها وەك ئامرازی جێ بەجێ کردنی کردەوەکە سەیر بکرێت‌و، کوشتنەوەیش لەسەر کوشتنەکەیە، نەك لەسەر ئامرزای کوشتنەکە، و ئەمەیش ڕای حەنەفییەکانە، لەبەر ڕۆشنایی ئەو یاسا بنەڕەتییەی کە هەیانە، لە بواری زۆر لێکردندا، بەڵام شافعییەکان‌و هی تریش ڕایان وایە کە کوشتنەوە لەسەر کابرای ئەنجامدەرە زۆر لێکراوەکەیە، چونکە کردەوەیەکی ئەنجامداوە، کە بەزۆر

لێکردن دروست نییە، ئەنجام بدرێت‌و، نابێت زۆر لێکردن بکرێتە بیانوو بۆ کردنی‌و، بۆیە حوکمەکە بەسەریدا دەچەسپێت‌و، هەروەها کابرای زۆر کەریش هەر دەکوژرێتەوە، چونکە ئەویش هۆکاری ئەنجامدانی کوشتنەکەیەو، دەبێت سزا بدرێت، بەکوشتنەوەو تۆڵە سەندنەوە لێی.

کردەوەی داوێن پیسی هەروەك کوشتن وایە، لەلای سەرجەمی زانایانو، حوکمەکەی بەسەر بکەرەکەیدا دەچەسپێت، چونکە کاری داوێن پیسی ناکرێت نیسبەت بدرێتە پاڵ، کابرای زۆردار، چونکە مرۆڤ ناتوانێت بە ئامێری شەرمگای کەسێکی تر هەڵسێت، کردەوەی داوێن پیسی ئەنجام بدات، بەڵام حەنەفییەکان رایان وایە، کە لەبەر ئەوەی لەم حاڵەتەداو لەم پرسەدا گومان (شبهة) هەیە، حوکمەکە لەسەر بکەرە زۆر لێکراوەکە لا دەچێت‌و، شافعییەکان رایان وایە، کە سزای شەلاقدانی لەسەر جێ بەجێ دەکرێت، لەسەر بنەمای ئەو یاسا بنەڕەتییەیان کە دەڵێت: (کەسی زۆر لێکراو ، کردەوەیەکی کردووە، کە حەڵاڵ نییە، بە هیچ جۆرێك بیکات، بۆیە حوکمەکە بەسەریدا دەچەسپێت‌و، ناکرێت لەم حاڵەتەدا بەسەر کابرای زۆردار جێ بەجێ بکرێت).

## ١٤٠- پرسی ((الأكراه: زۆر لێکردن)) لە یاسای عێراقیدا:

أ- زۆر لێکردن لە یاسای مەدەنی عێراقیدا:

یاسای مەدەنی عێراقی، (زۆر لێکردن)ـی، بەم جۆرە پێناسە کردووە، بریتییە لە زۆر کردن لە کەسێك، بەناهەق، کە کارێك بەبێ ڕازی بوونی خۆی ئەنجام بدات[1]،و زۆر لێکردنی کردۆتە دووبەشەوە: تەواو (ملجئ)و ناتەواو (غير ملجئ).

یەکەمیان: ئەوەیە کە هەڕەشەکە بەشتێکی مەزنی لەسەر پێ‌و ئامادە بێت، وەك کوشتن‌و لەناو بردنێکی ترسناکی ماڵ‌و موڵك.

دووەمیان: ئەوەیە کە لەوەی سەرەوە کەمتر بێت، وەك زیندانیکردن‌و لێدان، ئەمەش بەپێی ئەحواڵی کەسەکان‌و ئەو خەڵکەو هەروەها گەیاندنی زیان بە هاوسەرو، یان بەهەر کەسێکی نزیکی مەحرەم لێی، هەر بە هەڕەشەی زۆر لێکردن حسابە، ئیتر ئەو زۆر لێکردنە

---

[1] بڕگەی یەکەم، لە ماددەی ١١٢.

تـەواو یـان ناتـەواو بێـت، هەرچـونیەکە، بـەپێی حـاڵو ئـەحواڵی ئـەو کەسـانە دەبێـت[1]و، هەروەهاهەڕەشـەی پیـاو لـە ژنەکـەی بـەوەی کـە لێـی دەدات، یـان ڕێگـری لێ دەکـات، لـە پەیوەندی بوونی لەگەڵ خزمەکانی، کە ئەمە هەڕەشەیە لەسەر بەرژەوەندییەکانی ئەو ژنەو، دواجار بەزۆر لێکردن حسابە[2]و، ئەمەش بەگشتی لەگەڵ ڕای هەنـدێ لـە شـەرعزاناندا کۆکـە، کە دەڵێن: فەرمانی پیاو بۆ ژنەکەی، کە داوای لێ بکات، کارێك ئەنجام بدات، کە حەزی لێـی نییە، وەك فەرمانی دەسـەڵاتدار وایـەو، ئەگـەر ژنەکـەی بزانێـت، کـە نـەیکاتو، پێـچەوانەی ببێتەوە، توشی سزای سەخت دەبێت، لەم حاڵەتەدا بە (زۆر لێکردن) دێتە ئەژمار[3].

دواجار، ئەو شتانەی کە لەپرسی زۆر لێکردندا شەرع بەمەرجی گرتوون، یاسـایش دیـسان بەمەرج گرتوونی[4].

سـەبارەت بەکاریگـەری زۆر لێکـردن، دەقـی یاسـا ئـەوەی تیـادا هـاتووە، کـە دەڵێـت: گرێبەستەکانی کەسـی زۆر لێکـراو کـار پێکردنیـان دەوەسـتێنرێت، ئـیتر چـونیەکە ئـەو زۆر لێکردنـە تـەواو بێـت، یـان ناتـەواو[5]، بـەڵام سـەبارەت بـەو کردەوانـەی کـە بەرپرسـیارێتی مـەدەنییان لەسـەرە، وەك لـەناو بردنـی مـاڵو مـوڵکی خـەڵك یـان کوشـتنی کەسـێك، دەقـە یاساییەکە واهاتووە، کە کردەوەکە دەدرێتە پاڵ بکەرەکەیو، کاریگـەری لەسـەر مـافی ئـەو بکەرە دەبێتو، نادرێتە پاڵ کابرای زۆردار، مەگەر لە کاتێکدا نەبێت، کە کـابرای ئەنجامـدەر بەزۆر لێکردنی تەواو (ملجئ) ئەو کارەی بەزۆر پێکرابێت[6].

---

[1] برگەی یەکەمو دووەم، لە ماددەی ١١٢، یاسای مەدەنی میصری ئـەو هەڕەشـەیەی بـەزۆر لێکـردن داناوە، کە لەبەرامبەر مەترسییەکی گەورە لەسەر گیان یـان مـاڵ یـان شـەرەفو نـاموس کرابێـت، لـە ماددەی ١٢٧ برگەی دووەم.

[2] ماددەی ١٦.

[3] حاشية إبن عابدين، ب٥، ل١٢٠.

[4] ماددەی ١١٣.

[5] ماددەی ١١٥، و ئەم ماددەیەش جیاوازی لە نێوان ئەوەدانەکردووە، کە ئـەو گرێبەسـتەی کـە دانامـەزرێت کامیانـە؟ ئەوەیانـە کـە شـایەنی هەڵوەشـاندنەوەیە؟ یـان ئەوەیانـە کـە شـیاوی هەڵوەشاندنەوە نییە؟! و یاسای مەدەنی میصری بەدروستی داناوە، کە گرێبەستی بـەزۆرکراو، بەتاڵ بکرێتەوە، بەپێی ماددەی ١٢٧.

[6] ماددەی ٢١٥ لە یاسای مەدەنی عێراقی.

بەکورتی‌و بەپوختی، یاسای مەدەنی عێراقی، لە چوار چێوەی قسەی شەرعزانان سەبارەت بەئەحکامەکانی بواری زۆر لێکردن کە چەسپاندویانە نەچووەتە دەرەوە، ئەوەندە هەیە کە خۆی بە مەزهەبێکی دیاریکراوەوە نەبەستۆتەوە.

**ب- زۆرلێکردن لە یاسای باری کەسێتی عێراقیدا:**

دەقی یاسای باری کەسێتی عێراقی ژمارە ١١٨ی ساڵی ١٩٥٩ ئەوەی درکاندووە، کە تەڵاقی کەسی زۆر لێکراو ناکەوێت[١]و، ئەمەش لەگەڵ ڕای جەماوەری زانایاندا کۆکە، هەروەك پێشتریش باسمان کرد.

**ج- زۆرلێکردن لە یاسای سزادانی عێراقیدا:**

ئەم یاسایە لە ماددەی ٦٣دا، دەقی ئەوەی هێناوە کە، هەر کەس تاوانێکی ئەنجامدا، لەبەر پێویستی‌و ناچاری‌و، بۆ پاراستنی گیانی خۆی، یان گیانی کەسێکی تر، یان موڵك‌و ماڵی خۆی، یان هەر کەسێکی تر، لە مەترسیەکی گەورەی لەسەر پێ و ئامادە، ئەمە لێپرسینەوەی بە مەبەستی تۆڵە لێ ناکرێت، بەڵام بەو مەرجەی تایبەت (عمداً) ئەنجامی نەدابێت، و لە توانایدا نەبووبێت، بەڕێگاو ئامرازێکی تر، لەو بەڵایە خۆی بپارێزێت[٢].

دەقی ئەم ماددەیە، مەبەستی حاڵەتی پێویستی‌و ناچاریەو، ئەگەر مەرجە پێویستیەکان هاتنەدی، سزای لەسەر لادەچێت‌و، هەروەها لەبەر ئەوەی کە پێویستی (ضرورة)، دەچێتە چوار چێوەی پرسی (زۆر لێکردنەوە)، چونکە زۆر لێکردن، شێوەیەکە لە شێوەکانی پێویستی (ضرورة)، ئەم ماددەیە جێ بەجێ دەبێت، لە حاڵەتی زۆر لێکردندا، بەو مەرجە کە ئەو زۆر لێکردنە، بە هەڕەشەیەکی مەزن درکێندرابێت‌و، لەبۆ سەر جەستەی کابرای زۆر لێکراو ئاڕاستە کرابێت، یاخود سەر کەسێکی تر، یان بۆسەر موڵك‌و ماڵی کابرای زۆر لێکراو، یان ماڵ‌و موڵکی کەسێکی تر! نەك هەڕەشەیەکی سادەی لابەلایی بێت!

---

[١] برگەی یەکەم: لە ماددەی ٣٥، و لە وڵاتی میسریش دەقی یاسای ژمارە ٢٥ی ساڵی ١٩٢٩ ئەوەی درکاندووە، کە تەڵاقی کەسی زۆر لێکراو ناکەوێت.

[٢] نموونە لەو جۆرەیش لە یاسای سزادانی میصریدا ماددەی ٦١ هاتووە.

# بەندی دووەم

# بەڵگەی حوکمەکان ( أدلة الأحكام )

**ڕێخۆشکردن:**

حوکمە شەرعییەکان تەنها لە ڕێی بەڵگەکانەوە دەزانرێن، ئەو بەڵگانەی کە شەرع بەرپای کردوون‌و دایناون، تا خەڵکانی موکەللەف ڕێنوێنی بکات‌و، شارەزایان بکات، بۆ سەر ئەو حوکم گەلەو، ئەم بەڵگەو دۆکیۆمێنت گەلەیش بە (أصول الأحكام: بنەمای یاساکان)و، یاخود بە (مصادر الشرعية للأحكام: چاوگی شەرعی، یاساکان)و، یاخود (أدلة الأحكام: بەڵگەی یاساکان) ناوزەدکراون، واتە هەرکامیان بۆ بەکاربێت،هەر دروستەو، ئەم ناوانە بەرامبەرو موورادیفی یەکترن‌و، یەك مانایان هەیە.

بەڵگە (دلیل) لە زمانی عەرەبیدا، ئەوەیە کە جۆرێك لە هۆکارو ڕێنموونی بۆ هەر کارێك، تیادابێت.

لە زاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا دەلیل بەڵگە، ئەو شتەیە کە دەتوانرێت، کە بە چاوێکی دروست سەیر کرا بتگەیەنێت،بە هەواڵێکی داوا کراو[1]، و لێرەیشدا ئەو هەواڵە دیاریکراوەبریتیە لە حوکمە شەرعییەکە.

هەندێ لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقه، لە بەڵگە (دەلیل)دا، ئەمەیان بەمەرج گرتووە، کە دەبێت گەیەنەری یەکلاکەرەوە بێت، بۆ حوکمێکی شەرعی‌و، ئەگەر گەیەنەری نا یەکلاکەرەوەو گوماندار بوو، ئەوە نیشانەیە[2]و، دەلیل نییە، بەڵام ئەوەی لەلای زانایانی ئوصول باوو ناسراوە، ئەوەیە کە ئەمەیان بە مەرج نەگرتووە، و دەلیلیان وا پێناسە کردووە، کە ئەو شتەیە کە حوکمێکی شەرعی کرداری لێ وەردەگیرێت، بە وەرگرتنی یەکلاکەرەوە بێت، یان بە وەرگرتنی گوماندارو نا یەکلاکەرەوە بێت، هەر چونیەکە[3].

ئینجا ئەوە بزانە، کە بەڵگە شەرعییەکان، پێچەوانەی عەقڵ نین، و بۆیە لە شەرعدا

---

[1] الأمدي، ب١٣، ل١١.

[2] لێرەدا ووشەی (إمارة)ـی، هێناوە، کە موورادیفی (علاقة)یە، و بە مانای نیشانەو پەیوەندیدارکردن دێت.

[3] المسودة، ل ٥٧٣.

دانراون، تا بەهۆیانەوە ئەحکامەکان بزانرێن‌و، لێیانەوە حوکم دەربهێنرێت، بۆیە ئەگەر دژی عەقڵ بن‌و، پێچەوانەی ببنەوە، ئەوا ئامانج‌و مەبەستەکەمان لەدەست دەردەچێت، هەروەك بەئەزموون جێگیر بووە، کە بەڵگەکان لەسەر ڕەوتی عەقڵ ڕێ دەکەن و عەقڵی تەندروست شێلگیرانە ئەوبەڵگانە قەبوڵ دەکات‌و، گوێڕایەڵی ئەو شتانە دەبێت، کە ئەوبەڵگانە داوای کردوون.[1]

## ١٤٢- دابەشکردنی بەڵگەکان:

بەڵگەکان بەپێی ڕواڵەت‌و پێوەندنگی جیاوازی خۆیان، دابەشکراون بۆ چەند بەشێکی جیاواز، واتە بەپێی ئەو ئاڕاستەیەی کە لەم پێوەدانگەوە تەماشای ئەو بەڵگانە دەکرێت، و لێرەدا دوو دابەشکردن، لەو دابەشکردنانە باس دەکەین:

**دابەشکردنی یەکەم:**

**بەڵگەی ئاستی کۆك بوون‌و، جیاوازی، لە بەڵگە کردنیدا، دەبێتە ئەم جۆرە شێواز گەلەی لای خوارەوە:**

**جۆری یەکەم:** کە جێگای کۆڕای‌و کۆکبوونی پێشەوایانی ئیسلام‌و، ئەم جۆرەیش (قورئان) و (سوننەت) دەگرێتەوە.

**جۆری دووەم:** کە ئەمەشیان جێگای کۆکبوون‌و هاوڕای جەماوەر (جمهور)ی زانایانی ئیسلامە، کە ئەمەیشییان (إجماع)و (قیاس) دەگرێتەوە، بەڵام سەبارەت بە ئیجماع، زانای مەزنی موعتەزیلەکان، کە ناوی (النظام)ـە، لەمەدا ڕای جیاوازی هەیە، و هەروەها هەندێ لە خەواریجەکانیش هەر جیاوازن لەسەری[2]، و لە پرسی قیاسیشدا، جەعفەری[3]و ظاهیریەکان[4] لەسەری کۆك نین‌و، ڕاجیاییان هەیە.

**جۆری سێیەم:** کە ئەمەیان جێگای‌و مشت‌و مڕی نێوان زانایانە، تەنانەت لە نێوان ئەو زانایانەشیدا کە بڕوایان بە بەڵگە بوونی قیاس هەیە، هەرلێرەدا ڕاجیان‌و، جیاوازن‌و، ئەم جۆرەیش ئەم بەڵگانەی لای خوارەوە دەگرێتەوە.

---

١ الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٣، ل٢٧-٢٨.

[2] مذكرات في أصول الفقه، الشيخ محمد الزفراف، ل٦٣.

[3] أصول الأستنباط، السيد علي تقي الحيدري، ب٢، ل ٢٥٨و دواتريش.

[4] الأحكام في اصول الأحكام، للأمام إبن حزم الظاهري، ب٧، ل٥٣و دواتريش.

(العرف[1]، الأستصحاب، الأستحسان، المصالح المرسلة، شرع من قبلنا، مذهب الصحابي)، كە هەندێ لە زانایان ئەم جۆرەیان بە سەرچاوەی شەرع زانیونو، هەندێکی تر بەسەرچاوەی شەرعییان دانەناون.

<u>دابەشکردنی دووەم:</u>

**بەڵگەکان، لە ڕووی گەڕانەوەیان بۆ نەقڵ، یان ڕەئی، دەبنە دووبەشەوە: نەقڵی و ئەقڵی.**

**جۆری یەکەم:** بەڵگە نەقڵیەکان، کە بریتین لە قورئانو فەرموودەو، هەروەها ئیجماع (کۆڕای زانایان)و (مذهب الصحابي)و (شرع من قبلنا)یش، لە لای ئەوانەی کە بە بەڵگەیان دادەنێنو بەسەرچاوەی شەرعیان دەزانن، بەپاشکۆی ئەو دووانەی سەرەوەیان دەزانن، سەر بەقورئانو سوننەتیان دادەنێنو ئەم جۆرەیش بۆیە بە بەڵگەی نەقڵی دێنە ئەژمار، چونکە تەنها لەبەر ئەوەیە کە بەتەنها فەرمانێك، کە لە شەرعەوە گوستراوەتەوە بۆمان، ئەم فەرمانە دەبێتە پەرستشو تەکلیفو، ئیجتیهادی کەس تیایدا دەستی نییە، بەڵکو تەنها فەرمانی نەقڵکراوی شەرعە.

**جۆری دووەم:** بەڵگە عەقڵییەکان ، واتە ئەو بەڵگانەی کە بۆ سەرنجو ڕاکان دەگەڕێنەوەو، ئەمەیش بریتییە لە (قیاس: بەبەردا گرتن)و، پاشان (إستحسان)و (المصالح المرسلة)و، (إستصحاب)یش، پاشکۆینیو، سەربەونو،بەڵگەی عەقڵی بوونی ئەم جۆرەیش ئەوەیە کە بۆ سەرنجو ڕاکان دەگەڕێتەوە نەك فەرمانێکی نەقڵکراو لە شەرعی پیرۆزەوە.

ئەم دابەشکردنەی کە باسمان کرد، لە ڕوانگەی کردنە بەڵگەیان بۆ حوکمێکی شەرعیی، هەر جۆرێ لەم دوو جۆرە پێوستییان بەیەکتری هەیە، چونکە بە بەڵگەکردنی شتێکی نەقڵکراو لە شەرعەوە پێویستی بەتێڕامانو بەکارهێنانی عەقڵ هەیە کە ئامرازی تێگەیشتنە، هەروەك چۆن رەئیش دروست نابێتو، پێگەی خۆی نییە، تا پشت بە (نەقڵ) نەبەستێت، چونکە عەقڵی ڕووت بەتەنها خۆی لە دانانی ئەحکامی شەرعدا جێگەو پێگەی نییە و ڕێگە پێنەدراوە[2].

---

[1] عورف، موعتەبەرە و دانپیانراوە، و بە سەرچاوەی شەرع دانراوە، بەڵام گرفتو جیاوازی لەوەدایە، کە بەڵگەیەکی سەربەخۆیە؟ یان نا.....

[2] الموافقات، للشاطبي، ب٣ ل٤١.

## ١٤٣- قورئان سەرچاوەی سەرجەمی جۆری بەڵگەکانە :

پێشتر گوتمان، کە بەڵگەکان دوو جۆرن، نەقڵی‌و عەقڵی‌و، لە کاتی تێرامان دەزانین کە بەڵگە شەرعییەکان لە قورئان‌و سوننەتدا کورت‌و حەرام کراون، چونکە بەڵگە جێگیرەکان بە عەقڵ جێگیر نەبوون‌و، بەڵکو بە قورئان‌و سوننەت جێگیر بوون، چونکە هەر بەهۆی قورئان‌و سوننەتەوە بوونەتە ئەو بەڵگە دروستانەی کە دەکرێ پشتیان پێ ببەسترێت‌و، کەواتە قورئان‌و سوننەت چاوگ‌و سەرچاوەی ئەحکامن‌و پشتیان پێ دەبەسترێت، لە دوو ڕەهەندەوە:

**ڕەهەندی یەکەم**: لە ڕووی دەلالەت کردنیان لەسەر حوکمە جوزئیە فەرعیەکان، وەك ئەحکامەکانی زەکات‌و کڕین‌و فرۆشتن‌و سزاکان‌و هتد.....

**ڕەهەندی دووەم**: لە ڕووی دەلالەت کردنیان لەسەر ئەو یاساو بنەمایانەی کە ئەحکامە جوزئیە فەرعیەکان پشتیان پێ بەستوون، وەك دەلالەت کردنیان لەسەر ئەوەی کە ئیجماع بەڵگەیەو بنەمای ئەحکامەکانەو، هەروەها (قیاس)و (شرع من قبلنا)و هتد.....

**هەروەها بە دوو بەڵگە دەسەلمێنن، کە سەرچاوەی سوننەتیش هەر قورئانە، ئەمیش لە دوو ڕەهەندەوەیە:**

**ڕەهەندی یەکەم**: کارکردن بە سوننەت و پشت پێ بەستن‌و هەڵهێنجانی حوکمەکان لێیەوە، قورئان فەرمانی پێداوەو بووەتە بەڵگە لەسەری. وەك دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ وَأُوْلِي ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ﴾[1] ئەی باوەڕداران، گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرو کاربەدەستەکانتان بکەن، و هەروەها پەروەردگار لە زۆر جێگادا دووپاتی کردۆتەوە کە فەرموویەتی: ﴿أَطِيعُواْ ٱللَّهَ وَأَطِيعُواْ ٱلرَّسُولَ﴾[2] و ئەم چەندەها جار دووبارە کردنەوەیە، بەڵگەیە لەسەر گوێڕایەڵی کردنی سوننەت بەگشتی ئیتر چونیەکە ئەو شتەی کە سوننەت دریکاندویەتی، لە قورئانیشدا هەبێت، یان نەبێت‌و، دەقی تریش هەن، کە هەر ئەم مانایە دەبەخشن، وەك خودای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُواْ﴾[3] کە گوێڕایەڵی کردنی

---

[1] سورة النساء: ٥٩ .

٢ سورة (النساء ٥٩).

٣ سورة (الحشر ٧).

ئەو نەهیانەی کە سوننەت نەهی لێکردوون، و هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلْيَحْذَرِ الَّذِينَ يُخَالِفُونَ عَنْ أَمْرِهِ أَن تُصِيبَهُمْ فِتْنَةٌ أَوْ يُصِيبَهُمْ عَذَابٌ أَلِيمٌ﴾[1] ئەوانەی کە سەرپێچی فەرمانی رسول الله (ﷺ) دەکەن (کە سوننەتە)، دەبێت لەوە بترسن، کە تووشی بەڵایەک ببن، یاخود ئازاری توندو بەئێش بچێژن.

ڕەهەندی دووەم: سوننەت بۆیە هاتووە، تا ڕوونکەرەوە و ڕاڤیاری قورئان بێت، و ماناکەی شی بکاتەوە، بە بەڵگەی ئایەتی: ﴿وَأَنزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[2] واتە: ئێمە قورئانمان دابەزاندۆتە سەرت، تا ببێتە ڕاڤیارو ڕوونکەرەوەی ئەو شتانەی کە لە قورئاندا هەیەو، نازڵ کراوەتە سەر ئەو خەڵکە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الرَّسُولُ بَلِّغْ مَا أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ﴾[3] ئەی پێغەمبەر (ﷺ) ئەوەی لەلای خوداوە نێردراوە بۆت، بیگەیەنەو باسو ڕاڤەی بکە بۆ خەڵکیو، بێگومان (التبليغ: گەیاندن) گەیاندنی قورئانو ڕاڤەی ماناکانیشی دەگرێتەوە.

کەواتە: سوننەت ڕونکردنەوەی قورئانەو، ڕاڤیاری ماناکانیەتی، و درێژە باسە بۆ باسە کورتەکانی، هەروەک ڕونکردنەوەو شیکردنەوەی ئەم پرسە، لە بابەتی سوننەتدا دواترو لە جێگای خۆیدا دێت.

لەسەر ئەم بنەمایە، قورئان، کە کتێبی خوای پەروەردگارە، بنەمای سەرجەم بنەماکانەو، سەرچاوەی سەرچاوەکانەو، چاوگی سەرجەمی بەڵگەکانە[4].

## ١٤٤- ڕیزبەندی بەڵگەکان:

باسی ئەو بەڵگانەمان کرد، کە کۆکبوونی نێوان زانایانی لەسەرەو، هەروەها باسی ئەوانەشییمانکرد، کە ڕاجیایی ئەوانی لەسەرە، و گوتمان کە قورئان سەرچاوەی سەرجەمی بەڵگەکانە و چاوگی یەکەمە، و بۆیە ئاساییو شتێکی بەڵگە نەویستە، کە یەکەم بێتو، لە پێشتر بێت، لەوەیدا بۆی بگەڕێینەوە، لە کاتێکدا کە ویستمان حوکمێکی شەرعی بناسینو

---

١ سورة (النور ٦٣).

٢ سورة (النحل ٤٤).

٣ سورة (المائدة ٦٧).

٤ الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٣، ل٤٢-٤٣.

بزانین، بۆیە ئەگەر حوکمەکەی تیادا دەست نەکەوت، ئەوا پێویستە بگەڕێینەوە بۆ لای سوننەت، چونکە سوننەت ڕاڤیاری قورئانەو، ڕوونکەرەوەی ماناکانیەتیو، ئەمیش هەردیسان بەڵگە نەویستەو ئاساییە کە بگەڕیینەوە بۆ لای هەرکات حوکمەکەمان لە قورئاندا دەست نەکەوت، و جا ئەگەر حوکمەکە لە سوننەتو فەرموودەشدا نەبوو، ئەوا پێویستە کە بگەڕێینەوە، بۆ کۆڕای زانایان (إجماع)، چونکە پاڵشتی ئیجماع، یان دەقی قورئانە، یان دەقی سوننەتە، و ئەگەر لەو پرسەدا ئیجماع نەکرابوو، ئەو کاتە پێویستە کە بگەڕێینەوە بۆ (قیاس).

بۆیە ڕێزبەندی بەڵگەکان، لە گەڕانەوەدا بۆلایانو لە هەڵێنجانی حوکم لێیانەوە دەبێت بەم ڕیزبەند و شێوازە بێت، قورئان، پاشان سوننەت، ودواتر ئیجماعو پاشان قیاسکردن، و جەماوەری شەرعزانەکان لەسەر ئەم ڕیزبەندییە کۆکن، ئەوانەیان کە ئیجماعو قیاس بە بەڵگە دەزانن، و بە دوو سەرچاوەی حوکمی شەرعییان دادەنێن، لە پاڵ قورئانو سوننەتدا، و بەڵگەو شوێنەوار گەلێکی زۆر هەن، کە پاڵپشتی لەو ڕێزبەندییەی بەڵگەکان دەکەن، کە جەماوەری زانایان لە سەری ڕێککەوتوون لەوانە:

١- پێغەمبەر (ﷺ)کاتێك کە موعازی کوڕی جەبەلی (خوا لێی ڕازی بێت) نارد بۆ یەمەن، پێی فەرموو: ئەگەر پرسێکت هاتە بەردەم بەچیو چۆن دادگاییان دەکەیتو بریار دەدەیت؟ ئەویش گوتی: بەقورئان بڕیار دەدەم، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی، ئەگەر لە قورئاندا نەبوو، موعاز گوتی: بە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بڕیار دەدەمو، پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: ئەی ئەگەر لە سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)ولەقورئانەکەی پەروەردگاریشدا نەبوو؟ موعاز گوتی بەڕای خۆی ئیجتیهاد دەکەمو هیچ خەمساردییەکی تیادا ناکەم، جا پێغەمبەر (ﷺ) کێشای بەسەر سینگیداو فەرمووی: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە نێردراوی پەیامبەری خوای خستەسەر ئەو ڕەوتەی کە پەیامبەری خودا(ﷺ) پێی ڕازییە[1].

ڕەهەندی بەڵگە بوونی ئەم فەرموودەیە: لەم پرسەدا ئەوەیە کە پێغەمبەر (ﷺ) قسەکەی موعازی سەبارەت بە ئیجتیهاد کردن، لە شتێکدا کە لە قورئانو سوننەتدا نەبێت، پەسەند کرد، و قیاسیش بەشێکە لە بەشەکانی ئیجتیهادکردن بە ڕەئی.

---

[1] تیسیر الوصول، لأبن البدیع الشیباني، ب٤، ل٥٥.

٢- لە مەیمونی کوڕی میهرانەوە، گێڕدراوەتەوە، کە گوتویەتی پێشەوا ئەبوبەکری صدیق (خوا لێی ڕازی بێت)، ئەگەر کێشەی بهاتایەتە بەردەست، ئەوا بۆ چارەسەرەکەی لە قورئان ڕادەما، ئەگەر هەبوایە، بەپێی قورئان بڕیاری دەداو، ئەگەر لە قورئاندا نەبوایە، تەماشای سوننەتی پێغەمبەری (ﷺ) دەکرد، ئەگەر لەسوننەتدا هەبوایە، ئەوا بەپێی سوننەت بڕیاری لەسەر دەدا، جا ئەگەر چارەسەری لەو دووانەدا دەست نەکەوتایە، ئەوا ئەهلی حەل‌و عەقدو سەرانی خەڵکی کۆدەکردەوەو، ڕاوێژی پێدەکردن، و ئەگەر لەسەر ڕایەك کۆ ببونایەتەوە ئەوا بەپێی ئەو ڕایە بڕیاری دەدا، و هەروەها پێشەوا عومەری کوڕی خەطابیش هەر بەم شێوازەی دەکرد[1].

٣- پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب بەشورەیحی قازی کوفەی گوت: بەپێی قورئان بڕیار بدە، ئەگەر لە قورئاندا نەبوو، ئەوا بە پێی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاربدەو، ئەگەر لەوێشدا نەبوو، ئەوا بەپێی ئەوەی کە پێشەواکانی هیدایەت بڕیاریان لەسەرداوە، تۆیش بەو شێوەیە بڕیار بدە، ئەگەر لەوێشدا نەبوو، ئەوا بە ڕای خۆت ئیجتیهاد بکە، و لە گەڵ زانایان‌و پیاوچاکان ڕاوێژبکە[2]و، هەروەها عەبدوڵڵای کوڕی مەسعودیش (خوا لێی ڕازی بێت)، قسەیەکی لەم جۆرەی فەرمووە[3].

---

[1] إعلام الموقیعن، ب١، ل٥١.

[2] إعلام المقیعین، ب١، ل ١٧١.

[3] إلاعلام الموقیعین ب١، ل٥٢.

# بەشی یەکەم:

## بەڵگەی یەکەم: قورئانی پیــرۆز

### ١٤٥- پێناسەی قورئانی پیــرۆز و، بە بەڵگە بوونی:

قورئانی پیـرۆز، لەوە ناسراوترە، کـە پێناسـە بکرێـت، لەگـەڵ ئەوەیشدا زانایـانی ئوصـوڵی فیقهـ، هەر پێناسەیان کردووەو، چەندەها پێناسـەیان بـۆ دانـاوە، و هـەر یـەکێك لـەو زانایانـە هەوڵی داوە، کە پێناسەکەی خۆی کۆکەرەوەو پڕ بەپێستی خۆی بێت[1] و شتی زیادەو ناپێویست لـێ بەرگری کرابێت، و لێی دوور خرابێتەوە، و پێناسەکە پڕاوپڕی خۆی بێت.

لەو پێناسەیەیش، ئەمەیە کە دەڵێت: قورئانی پیرۆز، ئەو پەڕاوەیـە کـە نێردراوەتـە سـەر پەیامبەری خودا موحومەد (ﷺ) کە لە چوار چێوەی پەڕاوو دەفتەرەکاندا نووسـراوەتەوە، و بە گێڕانەوەی موتەواتیـر و بێگومان لەو پەیامبەرەوە (ﷺ) بە ئێمە گەیشتووە[2].

ڕاجیایی لە نێوان مسوڵمانانـدا نییە و سەرجەمیان لەسەر ئەوە کۆکن، کە قورئان بەڵگەیـە بۆ سەرجەمی باوەڕداران، بەتاكو کۆو، سەرچاوەی یەکەمو تـەنهای شـەرع دانانـە، و بـەڵکو بەڵگەو حوجەتە بۆ سـەرجەمی مرۆڤایـەتیو، بەڵگـەیش لەسـەر حوجـەتو بـە بەڵگـە بـوونی قورئان ئەوەیـە کـە لەلایـەن زاتـی پـەروەردگارەوە هـاتووەو، بەڵگـەی ئـەم لـە لای خـوداوە بونـەیش ئەوەیـە کـە دەستەوەسـتان کـارە و موعجیزەیـە، هـەروەك کـەمێکی تـر ڕوونـی دەکەینەوە، و کە ئەوە چەسپا، لەلای خوداوە هاتووە، بەبەڵگـەی ئـەوەی کـە موعجیزەیـە، ئەو کاتە پێویستە هەموو لایەك پابەندی بن.

### ١٤٦- تـایبە تمەنییەکانی قورئـانی پیرۆز:

یەکەم: قورئانی پیرۆز، کەلامی خوداووەندە، کە نێردراوەتە سـەر پەیامبـەری خـۆی، کـە موحەمەدە (ﷺ)و پەڕاوە ئاسمانیەکانی تری، وەك تەوراتو ئینجیلو هتد... بە بەشێك لـە قورئان نایەنە ئەژمار، چونکە بۆسەر پێغەمبەر(ﷺ) نەنێردراون.

دووەم: قورئان کۆکەرەوەی لەفزو مانایە، پێکەوە، واتە: شتێکە بەهـەمان لـەفزو هـەمان

---

[1] لەم کتێب گەلەدا سەیری ئـەو پێناسـە جیاوازانـە بکـە، حاشـیة الأزهـري علـى مـرآة الأصـول، ب١، ل٨٦-٨٧، والأمیدي، ب١، ل٢٢، وشرح مرقـاة الوصـول، ب١، ل٩٣-٩٦، والتوضـيع والتلـويح، ب١، ل ٣٦ و المستصفى، للأمام الغزالي، ب١، ل٦٥.

[2] أصول البزدوي، ب١ ل ٢١-٢٣.

ماناوه نێردراوەو، لەفزەکەی بەزمانی عەرەبی هاتووە، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّا جَعَلْنَٰهُ قُرْءَٰنًا عَرَبِيًّا﴾[1] ئێمە قورئانمان بەزمانی عەرەبی داناوە، بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا لەفزێکی غەیرە عەرەبی نییە، ئیمامی شافعی ڕەحمەتی خوای لێبێ دەفەرموێت: سەرجەمی پەڕاوەکانی پەروەردگار بەزمانی عەرەبی نێردراونەتە خوارەوەو، هەروەها دەفەرموێ: لە پەڕاوی پەروەردگاردا شتێك نییە، کە بەزمانی غەیری عەرەبی هاتبێت[2]،و بۆیە لەسەر ئەم بنەمایە، فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) بە قورئان حساب نەکراون، چونکە لەفزەکانیان هی خوای پەروەردگار نین، هەر چەندە ماناکەیان لە سروش (وەحی) خودا وەرگیراوەو، هەروەها تەفسیری قورئان سەریە قورئان حساب نەکراوە، هەر چەندە عەرەبیش بێتو، هەروەها وەرگێڕانی عەرەبی بۆ زمانێکی تر، هەر بە قورئان نایەتە ئەژمار.

سێیەم: قورئانی پیرۆز بە موتەواتیری گەیشتووە بەئێمە، واتە: قورئان خەڵکانێك گەیاندویانەتە دەستمان، کە گومان نابرێت، ئەو خەڵکە زۆرو خاوەن متمانەیە لەسەر درۆ ڕێك بکەونو کۆ ببنەوە، چونکە ژمارەیان زۆرەو، خاوەن پێگەی جیاوازنو، ئەوانیش لە کەسانو خەڵکانی تری وەك خۆیان وەریانگرتووە و تا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر (ﷺ) هەر ئاوایەو سەرەتای گێڕانەوەکە وەك کۆتاییەکەی وایەو، ناوەڕاستەکەیوسەرەتا و کۆتاییەکەیو دوولایەکەی یەکێکنو وەك یەك وان[3] و لەسەر ئەم بنەمایە، ئەو جۆرە خوێندنەوانەی (قراءات) کە بە موتەواتیری بە دەستمان گەیشتوون بە قورئان حساب ناکرێت، وەك ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە، لە عبدوڵلای کوڕی مەسعودەوە (خوا لێی ڕازی بێت) کە ئەم ئایەتەی قورئانی بەم شێوازە خوێندۆتەوە، ﴿فَمَن لَّمْ يَجِدْ فَصِيَامُ ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ﴾[4]، کە ووشەی (متتابعات)ـی، بۆ زیاد کردووە، و ئەم جۆرە خوێندنەوەیە، بەوە دانراوە کە تەفسیری ﴿ثَلَٰثَةِ أَيَّامٍ﴾ دەکات، کە لەسەر ڕای ئیبن مەسعود دەبێت، ئەو سێ ڕۆژ ڕۆژووە بەسەر یەکەوە بێتو پچڕپچڕ نەبێت.[5]

چوارەم: قورئانی پیرۆز لە زیادەو کەمکردن پارێزراوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّا

---

[1] الزخرف: ٣ .

[2] الرسالة، للامام الشافعي، ل ٤٠-٤٢.

[3] أصول البزدوي، ب١، ل٢٨٢.

[4] سورة (البقرة ١٩٦) – (المائدة ٨٩).

[5] المستصفى، للإمام الغزالي، ب١، ل٥٦.

﴿إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾﴾[1]، ئێمــە قورئانمــان دابەزانــدووەو هــەر ئێمــەش دەیپارێزین، بۆیە هیچ کەمو کورتیو زیادەیەکی تیادانیەو هیچ کەسێك ناتوانێت، کە شتێکی لەسەر زیاد بکات یان کەم بکات، چونکە خوای پـەروەردگار خـۆی پاراستنەکەی لـە ئەسـتۆ گرتووەو هەر شتێکیش پاراستنی لە دەست پـەروەردگاردا بێـت، دەسـتی هـیچ خراپـەکارو بەدکارو هەرزەکارێکی پێ ناگات.

پێنجەم: قورئـان موعجیزەیـە، مانـای ئەمـەیش ئەوەیـە کـە سـەرجەمی مرۆڤایـەتی دەستەوسانە لەوەیدا کـە نموونەیـەکی وەك ئـەو قورئانـە بهێنێـت، ئـەم ئیعجـازەی قورئـان بەوەش چەسپاوە کە بێ منەتی خۆی ڕاگەیاندووە، لە بەرامبەر عەرەبە نکۆڵیکارەکانـدا، کـە بچن نموونەیـەکی وەك قورئـان بهێـنن، کـە چـی دەستەوسـتان بـوونو، نـەیانتوانیو، دواتـر بەرەنگاریان بوویەوەو، بێمنەت بوو، بەرامبـەریان، کـە تـەنها دەئایـەت بهێـنن، هـەر دیسان دەستەوستان بوونو نەیانتوانیو، دواجار بەتەنها سـورەتێك بـێ منـەتی کـرد، بەرامبـەریان، هەر نـەیانتوانی بیهێـنن، وەك پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ﭙ ﭚ ﭛ ﭜ ﭝ ﭞ ﭟ ﭠ ﭡ ﭢ ﭣ ﭤ ﭥ ﭦ ﭧ ﭨ ﭩ ﭪ ﭫ ﭬ﴾[2] واتە: بڵێ ئەگـەر هـەموو مـرۆڤو پەرییـەکان، بـە ڕەوانبێژ و بیرتیژ و وریا و زیرەکەکان کـۆ ببنـەوە، بـۆ ئـەوەی وێنـەی ئـەم قورئانـە بهێـنن، هـەرگیز نـاتوانن، ئەگـەر چـی هەنـدێکیان پاڵپـشت و هاوکـاری هەنـدێکی تریـان بـن، بـۆ ئەنجامدانی ئەو کارەو هێنانی وێنەی قورئان هەر ناتوانن.

هەروەها خوای پەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿أَمْ يَقُولُونَ ٱفْتَرَىٰهُ ۖ قُلْ فَأْتُوا۟ بِعَشْرِ سُوَرٍ مِّثْلِهِۦ مُفْتَرَيَٰتٍ وَٱدْعُوا۟ مَنِ ٱسْتَطَعْتُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿١٣﴾﴾[3] واتـە: دەڵـێن موحەمـەد (ﷺ) خۆی ئەم قورئانەی هەڵبەستووەو داویەتیە پاڵی خودا؟!

پێیان بڵێ، جا ئێوە ئەگـەر ئـەو قورئانـە بـە درۆو هەڵبەسـتراو دەزانـن دەسـا فـەرموون، ئێـوەش، دەسـورەتی هەڵبەسـتراو، وەك خۆتـان دەڵـێن، وەك ئـەو بهێـنن، کـە لـە هـەموو ڕوویەکەوە وەك ئەو وابن، هەر کەسیش دەتوانن، جگە لە خودا، بانگی بکەن بۆ هاوکاریتان، ئەگەر ڕاست دەکەن، دەڵێن ئەم قورئانە درۆو هەڵبەستراوە!

هـەروەها خـوای پـەروەردگار دەەرموێـت: ﴿وَإِن كُنتُمْ فِى رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا۟

---

[1] سورة (الحجر: ٩).

[2] سورة الأسراء: ٨٨ .

[3] سورة الهود: ١٣ .

﴿بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِۦ وَٱدْعُوا۟ شُهَدَآءَكُم مِّن دُونِ ٱللَّهِ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ ﴿٢٣﴾ فَإِن لَّمْ تَفْعَلُوا۟ وَلَن تَفْعَلُوا۟ فَٱتَّقُوا۟ ٱلنَّارَ ٱلَّتِى وَقُودُهَا ٱلنَّاسُ وَٱلْحِجَارَةُ ۖ أُعِدَّتْ لِلْكَٰفِرِينَ ﴿٢٤﴾﴾[1] واته: ئەگەر سەبارەت بەو قورئانەی ئێمە نارومانەتە سەر بەندەی خۆمان موحەممەد (ﷺ) ئێوە دوودڵو بەگومانن، ئاخۆ ڕاستە یان نا...؟! ئادەی هەوڵ بدەن هیچ نەبێ، بچوکترین سورەتێك وەك ئەو بهێنن، بۆ ئەوەیش شایەتو هاوباوەڕەکانتان، ئەوانەی وا لەکاتی تەنگانەدا پەنایان بۆ دەبەن، بێجگە لەخوا، بانگ بکەن،ئەگەر ئێوە ڕاست دەکەن، کە دەڵێن: موحەممەد خۆی هەڵیبەستووە، خۆ ئێوەیش خۆشخوانو ڕەوانبێژن، دەسا فەرموون وەك کورترین سورەتی ئەو قورئانە، وێنەیەك بهێنن، خۆ ئەگەر هیچتان بۆ نەکرا،کە هەرگیز هیچتان پێ ناکرێ، دەساوەرن باوەڕ بهێننو، خۆتان بپارێزن لەو ئاگرەی کە دەستە چیلەو هەڵگیرسێنەرەکەی جەستەی ئادەمیو بەردە، دان بەوەیشدا بێنن، کە ئەم قورئانە لەلایەن خوداوە هاتووە، دەنا دەبنە سوتەمەنی ئەو ئاگرەی، کە ئێستا بۆ کافرانو بێ باوەڕان ئامادە کراوە.

جا سەرەڕای ئەم بەرەنگاریو بێ منەتییە، کە هیممەتی مرۆڤەکان دەهەژێنێتو، دەیانخاتە بەردەم هەوڵی بەرەنگار بوونەوە، عەرەبەکان لە بەرەنگاری کردنی دەستەوەستان بوون، سەرەڕای ئەوەیش کە هەلو مەرجیان لەبار بوو، بۆ بەرەنگاربوونەوە، و هیچ ڕێگرییەك لە ئاردا نەبوو، جا سەبارەت بە بوونی هەوڵو مەرجی لەبارو پاساو ئەوەیە کە عەرەبەکان بەتەواوی سوور بوون لەسەر هەڵوەشاندنەوەی پەیامو بانگەوازەکەی پێغەمبەر موحەممەد (ﷺ)، جا ئەگەر بیانتوانیایە، پەنایان دەبردە بەر ئەو شتەی کە پێچەوانەی قورئانەو، هەڵوەشێنەرەوەی بانگەوازەکەی موحەممەدە (ﷺ)و سەبارەت بە نەبوونی ڕێگریو لەمپەڕ لەسەر بەرەنگاربوونەوەیان ئەوەیە کە عەرەبەکان خۆشخوانو ڕەوانبێژبوونو زمان پاراو بوونو، زانای تەواو بوون، بەزمانی عەرەبیو، خاوەن دەسەڵاتو پێگە بوون، بۆیە کە دەستەوستانیان چەسپا ئەویش جێگیر بوو، کە ئەو قورئانەی بە عەرەبی هاتۆتە خوارەوە، پەڕاوی خوای پەروەردگارەو، موحەممەدیش (ﷺ) پەیامبەری هەقو ڕاستی ئەو خوداوەندەیە.

---

[1] سورة (البقرة ٢٣-٢٤).

## ١٤٧- ڕەهەندەکانی ئیعجازی قورئانی پیـرۆز:

### ئیعجازی قورئـان زۆرن، لەوانە:

١- ڕەوانبێژی قورئان، بوویە هۆی سەرسامیو ملکەچ بـوونو هیـستریای عەرەبـەکانو، بەجۆرێك سەرسامی کردن کە ئەو ڕەوانبێژییە لە پێشتردا لە هیچ کەلامێکی تـردا نـەبووە، چ شیعر، چ پەخشان،و سەرەڕای گشتگیری قورئان بەسەر باسو خواسە جیاوازەکانو، حوکمە جیاوازەکانو دابەزینیان لە کاتی جیاوازداو، دوولەیەکتر هـەر ئـەم ڕەوانبێژییـە لـە سـەراپای بەشەکانی قورئانی پیرۆزدا، و لە پلەیەکی بالاّدا بوونی هەیە.

٢- هەواڵدانی بەڕوودانی ڕووداو گەلێك لە داهاتوودا، کـە دواتـر بـەکردەوە ئـەو ڕووداونـە ڕوویانـداوە، لەوانـە فەرمایـشی قورئـانی کـە دەفـەرموێ: ﴿الٓمٓ ۝١ غُلِبَتِ ٱلرُّومُ ۝٢ فِيٓ أَدۡنَى ٱلۡأَرۡضِ وَهُم مِّنۢ بَعۡدِ غَلَبِهِمۡ سَيَغۡلِبُونَ ۝٣ فِي بِضۡعِ سِنِينَ﴾[1]، واتـە: سـەرەتا ئـەم ئەلف، لام، میمە، پیت گەلێکن، کە هێماو ئاماژەن بـۆ دەستەوسـتانی عەرەبـەکان بەرامبـەر بەقورئانو دواتر هەواڵ دەدات کە ڕۆمەکان بەدەستی فارسەرکان تێکشکان، لە بەشێکی زۆر نزیـك بـە وڵاتـی عەرەبەکانـەوە، کـە دەکەوێتـە نێـوان ئـوردنو فەڵەسـتین، و ئەوانـەیش (ڕۆمەکان) پاش زاڵبوونی فارسەکەان بەسەریاندا زاڵ دەبنەوەو، لە چەند سـاڵێکدا، واتـە لـە نێوان (٣-٩) ساڵدا، ڕۆمەکان بەسەر فارسەکاندا دیـسان زاڵ دەبنـەوەو، دوای حـەوت سـاڵ ئەم هەواڵە وەك خۆی هاتە دیو وادەرچووو، فارسەکان تێکشکان!

٣- هەواڵدانی قورئان بە کۆمەڵـە ڕووداوێـك کـە لـە سـەردەمی گەلـە پێـشووەکاندا ڕووی داوە، لە کاتێکدا کە ئەم زانیاریانە بـە هـیچ جۆرێـك لای عەرەبـەکان زانـراو نـەبوونو نادیـار بوون، چونکە هیچ نیشانەیەك نەبوو، کە بەڵگە بێت، لەسەر شوێنەواری ئەو گەلە پێشووانە، و زانیـاری لەسـەریانو، قورئـانیش ئامـاژەی بـە هەواڵگـەلێکی لـەم جـۆرە کـردووە، کـە دەفەرموێت: ﴿تِلۡكَ مِنۡ أَنۢبَآءِ ٱلۡغَيۡبِ نُوحِيهَآ إِلَيۡكَۖ مَا كُنتَ تَعۡلَمُهَآ أَنتَ وَلَا قَوۡمُكَ مِن قَبۡلِ هَٰذَا﴾[2]، واتە: ئەم هەواڵو دەنگو باسـانە، بەشـێکە لـەو هەواڵـە نادیارانـە، خۆمـان بـە وەحـی پێـت ڕادەگەیەنین ئەی پێغەمبـەر (ﷺ)، نـە تـۆ دەتزانـی بـەر لـە هـاتنی ئـەم قورئانـە، و نـــە

---

[1] سورة (الروم: ١-٤).

[2] سورة (هود/ ٤٩).

ئەتەوەکەیشت دەیزانی !

٤- ئاماژەدانی قورئانی پیرۆز، بە هەندێ لە ڕاستیە کانی بونەوەر، کە زانستی نوێ چەسپاندونی‌و، پێشتر نەزانراو بوون، وەك پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿ أَوَلَمْ يَرَ الَّذِينَ كَفَرُوا أَنَّ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ كَانَتَا رَتْقًا فَفَتَقْنَاهُمَا ۖ وَجَعَلْنَا مِنَ الْمَاءِ كُلَّ شَيْءٍ حَيٍّ ۖ أَفَلَا يُؤْمِنُونَ ﴿٣٠﴾ ﴾[1] واتە: ئاخۆ، خوانەناسان‌و بێ باوەڕان نەیانبینیوە، واتە: بە چاوی دڵ سەیریان نەکرد، تابزانن کە بێگومان ئاسمانەکان‌و زەوی یەکپارچە بوون‌و هەردوو پێکەوە نووسابوون، کە نە ئەم بارانی دەباراند و نە ئەویش ڕووەکی سەوز دەکرد، جا لەوەودوا ئێمە لەیەکمان کردنەوە و لە ئاویش هەموو شتێکی زیندوومان دروستکرد، ئاخۆ هێشتا بڕواناکەن‌و ناهێنن؟ بە دەسەڵاتی خوای مەزن ! !

هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَأَرْسَلْنَا الرِّيَاحَ لَوَاقِحَ ﴾[2] واتە: باکانیشمان ناردن، بۆ موتوربەکردنی هەورەکان، واتە: (با) هەورەکان بەسەر یەکتریدا ئەکوتێ و ئەوجا ئاویان لێ پەیدا دەبێت، هەر وەك وشتری مێ بە نێرەکەی موتوربە دەکرێ، هەورەکانیش بە (با) کان موتوربە دەکرێن!

## ١٤٨- ئەحکامەکانی قورئانی پیرۆز:

**قورئانی پیرۆز، حوکمی زۆرو جۆراو جۆری لە خۆ گرتوون، کە دەکرێت، بۆ سێ بەش دابەش بکرێن:**

**بەشی یەکەم:** ئەحکامەکانی پەیوەست بە بیروباوەڕ، وەك باوەڕ بوون بە خوداو فریشتەکان‌و پەڕاوەئاسمانیەکان‌و پێغەمبەران‌و ڕۆژی پەسڵان‌و، ئەمانەیش ئەحکامی بیرو باوەڕن‌و ئیعتیقادین‌و، لە زانستی یەکتا پەرستی (التوحيد)دا، توێژینەوەیان لەسەر دەکرێت.

**بەشی دووەم:** ئەحکامەکانی پەیوەست بە پاکردنەوەو بەهێزکردنی دڵ‌و دەروون‌و، ئەمانەیش ئەحکامی ئەخلاقین‌و، لە زانستی ئەخلاق‌و تەصەوفدا توێژینەوەیان لەسەر دەکرێت.

**بەشی سێیەم:** ئەحکامە پراکتیکییەکان (العملية) ئەوانەی کە پەیوەستن، بە گوفتارو

---

[1] سورة (الأنبياء/ ٣٠).

[2] سورة (الحجر/ ٢٢).

کرداری ئەو کەسانەی کە تەکلیفی شەرعیان لەسەرەو مەبەست لەمەیش (فقه)ـە، و ئەو ئەحکامانەیش، حوکم گەلێکن کە ئامانجی زانستی فیقهـ، و زانستی ئوصولی فیقهـ، ناسینی ئەمانەیەو بەدەستهێنانیانە، و ئەم ئەحکامانەیش دوو جۆرن:

**جۆری یەکەم:** پەرستشەکانی، وەك نوێژ کردنو ڕۆژووکرتنو، مەبەستو ئامانج لێیان، ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی بەندەیە لەگەڵ زاتی خوای پەروەردگاردا.

**جۆری دووەم:** ئەوشتانەن کە لە غەیری پەرستشەکانن، کە لەزاراوەی شەرعزانەکاندا، بە کڕینو فرۆشتنەکان (معاملات) ناوزەد کراون، کە ئەویش ئەو حوکمانە دەگرێتەوە، کە دەچنە چوار چێوەی یاسا تایبەتیو گشتییەکانەوە، بەپێی زاراوەی یاسای نوێۆ، مەبەست لەم یاسایانەیش ڕێکخستنی پەیوەندییەکانی نێوان تاکەکانەو، هەروەها ڕێکخستنی پەیوەندی تاك بە کومەڵگەو، کۆمەڵ بەکۆمەڵۆ، ئەمانەیش بریتین لە[1]:

أ- ئەحکامەکانی تایبەت بە خێزان، کە ئەم ئەحکامانەیش دەچنە چوار چێوەی ئەو یاسایەی کە بە یاسای خێزان نازەد کراوە، یان بەرپرسەکانی باری کەسێتی ناونراوە، وەك ژن مارە کردنو، ژن تەلاقدانو، کورایەتیو وەچەسازیو ڕەچەڵەكو چاودێریو هتد.... و مەبەستیش لەمانە بنیاتنانی خێزانە، لەسەر بنەماگەلێکی بەهێز و ڕونکردنەوەی مافو ئەرکەکانی تاکەکانو نزیکەی حەفتا ئایەت، لەم بارەیەوە و سەبارەت بە ئەحکامەکانی خێزان لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون.

ب- ئەو ئەحکامانەی کە پەیوەستن، بە مامەڵەدارایییەکانی تاکەکان، وەك، کڕینو فرۆشتنو، بەبارمتەدانو، دیکەی گرێبەستەکان، کە ئەمیش لەناو چوار چێوەی یاسامەدەنییەکاندایەو، ئەمیش نزیکەی حەفتا ئایەتی دەربارە هاتووە.

ج- ئەحکامەکانی پەیوەندیدار بە دادگا و شایەتیدانو سوێند خواردن، و مەبەستیش لەمانە ڕێکخستن ڕێۆ شوێنەکانی دادگاو بڕیاردانەکانە، بەمەبەستی چەسپاندنی دادپەروەری لە نێوان خەڵکیدا، و ئەمەیش دەچێتە چوار چێوەی ئەو یاسایانەی کە بەیاسای دادگەریو سکالاّ بردنەسەر دادگا ناسراون، و نزیکەی (١٣) ئایەت لەم بارەیەوە هەن.

د- ئەحکامەکانی تایبەت بە تاوانو سزاکانیو، ئەمەیش کە پێکهێنەری یاساو تاوانەکانە لە ئیسلامداو، نزیکەی (٣٠) ئایەت لەم بارەیەوە هەنو، مەبەست لەم ئەحکامانە پاراستنی

---

[1] الشیخ عبدالوهاب خلاف، سەرچاوەی پێشوو، ل ٧و دواتر.

خەڵکی‌و شەرەف‌و ماڵ‌و موڵکی خەڵکانەو، لەگەڵ بڵاوکردنەوەی ئاسودەیی‌و ئاسایش لەناو کۆمەڵگەدا.

هـ- ئەحکامەکانی تایبەت بە سیستمی حوکمو، ئاستی پەیوەندی نێوان دەسەڵات‌و کۆمەڵگەو ڕوونکردنەوەی ماف‌و ئەرکەکانی هەریەکە لە دەسەڵاتدارو خەڵك‌و ئەمەیش بەیاسای دەستووری ناوزەد کراوە و نزیکەی (دە) ئایەت لەم بارەیەوەن.

و- ئەحکامەکانی پەیوەندیدار بە مامەڵەی دەوڵەتی ئیسلامی، بە دەوڵەتانی ترەوە، (دیبلۆماسیەت)، و ئاستی ئەو پەیوەندیە دیبلۆماسییانەو، شێوازی ئەو پەیوەندییانە لە هەردوو کاتی ئاشتی و جەنگدا، و هەروەها ئەو ئەحکامانەی تر کەلەم بارەیەوە بەدی دێن‌و، دێنە بەردەم‌و، هەروەها ڕونکردنەوەی پەیوەندیەکانی خەڵکانی بێگانەی نیشتە جێ لە دەوڵەتی ئیسلامیدا، لەگەڵ ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەداو، هەندێ لەم ئەحکامانە دەچنە چوار چێوەی یاسا گشتییە نێودەوڵەتییەکان‌و، هەندێکیشیان دەچنە چوار چێوەی یاسا تایبەتییە نێو دەوڵەتییەکان‌و، نزیکەی (٢٥) ئایەت لەم بارەیەوە هەن.

ز- ئەحکامە ئابوورییەکان: ئەم ئەحکامانەیش پەیوەندیدارن، بەسەرچاوە داراییەکانی دەوڵەت‌و، چۆنیەتی سەرفکردنیان‌و، هەروەها پەیوەستن بەمافی تاك، لە موڵکی دەوڵەمەندەکان و ئاستی سوودمەندبوونیان لەو سامانەی سەرمایەداران، و نزیکەی (دە) ئایەت لەم بارەیەوە هاتوون.

## ١٤٩- شێوازی ڕونکردنەوەی ئەحکامەکان لە قورئانی پیرۆزدا:

خوای پەروەردگار دەفەرموێ: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾[١] واتە: قورئانمان ناردۆتە سەرت، کە ڕوونکەرەوەی گشت شتێکەو، هەروەها دەفەرموێ: ﴿مَّا فَرَّطْنَا فِى ٱلْكِتَٰبِ مِن شَىْءٍ﴾[٢] واتە: هیچ شتێکمان لەم قورئانەدا فەرامۆش نەکردووەو نەپەڕاندووە، کەواتە قورئانی پیرۆز ڕوونکردنەوەو ڕاڤەی سەرجەم ئەحکامە شەرعییەکانی تیادایە، بەڵام ئەم ڕوونکردنەوەیە لە سەر دوو **جۆر پێکهاتووە:**

**جۆری یەکەم:** باسکردنی یاساو بنەماو ناوەڕۆکە گشتییەکانی شەرع‌و باسکردنی

---

[١] سورة (النحل/ ٨٩).

[٢] سورة (الأنعام/ ٣٨).

ئەحکامەکان بەگشتیو پوختی، نموونەی ئەو یاساو ڕێساو بنەمایانەی کە بناغەی شەرعدانانن، بەگشتیو لقو پۆپەوە وەك، ئەمانەی خوارەوە:

أ- ڕاوێژکردن (الشوری) وەك، قورئان دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَىٰ بَيْنَهُمْ﴾[1] واتە: کاری ئیمانداران لە سەر بنەمای ڕاوێژکردن بنیات دەنرێتو، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الْأَمْرِ﴾[2] واتە: لە کارەکاندا ڕاوێژیان پێ بکە.

ب- دادپەروەری (العدل)، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ﴾[3] واتە: خودای مەزن فەرمان دەکات، بە دادپەروەری، هەروەها دەفەرموێ: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَن تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَىٰ أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُم بَيْنَ النَّاسِ أَن تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ﴾[4] واتە: خودای مەزن فەرمانی کردووە، کە سپاردە بدەنەوە، بە خاوەنەکانیان، وەك خۆیو، بێ خیانەت کردن تیایداو، هەروەها کە فەرمانداری خەڵکتان کرد، ئەوا بەدادپەروەرانە ئەو فەرمانداریيە ببەن بەڕێوە.

ج- مرۆڤ بەرپرسیارە لە کردەوەکانی خودی خۆیو پرسیاری لێ ناکرێت، لەسەر تاوانی خەڵکانی تر، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَىٰ﴾[5] واتە: کەس بەرپرسیار نییە لە تاوانی کەسێکی تر، و تاوانی کەسێکی تر ناخرێتە سەرشانیو لە ئەستۆی ناگرێت.

د- سزادان بەپێی تاوانەکە دەبێت، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَجَزَاءُ سَيِّئَةٍ سَيِّئَةٌ مِّثْلُهَا﴾[6] واتە: سزای خراپ سزایەکی شیاوی وەك ئەو خراپەو تاوانەی هەیە، نەك زیاتر.

هـ- حەرامی موڵکی خەڵکانی تر، وەك قورئان دەفەرموێ: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ﴾[7] واتە: سامانو دارایی یەکتر بەناڕەواو نادروست لە نێو

---

١ سورة (الشوری- ٣٨).
٢ سورة (آل عمران/ ١٥٩).
٣ سورة (النحل/ ٩٠).
٤ سورة (النساء/ ٥٨).
٥ سورة (الأنعام/ ١٦٤).
٦ سورة (الشوری/ ٤٠).
٧ سورة (البقرة/ ١٨٨).

خۆتاندا مەخۆن، مەیشی دەن بە حاکمو کاربەدەستان، تا بەناڕەوا بەشێك لە ماڵو سامانی مەردوم بخۆن، بۆ خۆشیان چاك دەزانن، کەئەو جۆرە کارانە نادروستو ناڕەوان.

و- هاوکاری کردن لەسەر چاکەو لەسەر ئەو شتانەی کە خێرو سودی گەلی تیادایە، وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[1] واتـە: لەسەر چاکەو خواناسی هاوکاری بکەن، لەسەر خراپەو دوژمنایەتی هاوکاری مەکەن.

ز- پابەنـدبوون بەئەرکەکانـەوەو، پەیامەکانـەوە، وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[2] واتـە: ئـەی کەسـانێ کـە بڕواتـان هێنـاوە، پابەنـدبن بـە گرێبەستو پەیمانو مامەڵەکانتانەوە.

ح- نەبوونی سەختیو سەختگیری لـە دینـدا، وەك پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[3] واتـە: خـودای مـەزن، لـە ئاینـدا هیچ شتێکی سەختی نەخستۆتە سەرشانی ئێوە.

ی- کارە ضەرور و پێویستەکان، جاری وا هەیە دەبنە هۆی حەلاڵ بـوونی شـتی یاساغو حـەرامکراو، وەك قورئـان دەفـەرموێت: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ غَيْرَ بَاغٍ وَلَا عَادٍ فَلَا إِثْمَ عَلَيْهِ﴾[4] واتـە هەر کەسێ لەبەر ناچاریو بێ ئارەزوو، هـەر بەئەنـدازەی پێویـست بخـواتو، زیـادە خـۆری نـەکات، هـیچ تـاوانو گونـاهێکی ناگـات، لـە خـواردنی ئەوشـتە حەرامانـەدا، سـەبارەت بـەو ئەحکامانەیش کـە لـە قورئـانی پـیرۆزدا، بـەکورتیو پـوختی (مجمـل)ی هـاتوونو، بەدرێـژی حوکمەکەیان نـەهاتووە، وەك فـەرمانکردن بەزەکاتـدان، کـە قورئـان دەفـەرموێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً﴾[5] واتە: لە سامانەکانیان زەکاتو صەدەقە وەر بگرەو، هەروەها وەك پرسی

---

١ سورة (المائدة/ ٢).

٢ سورة (المائدة/ ١).

٣ سورة (الحج/ ٧٨).

٤ سورة (البقرة/ ١٧٣).

٥ سورة (التوبة/ ١٠٣).

کوشتنەوە (القصاص) کە قورئان دەفەرموێت: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَٰٓأُو۟لِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴾[1] واتە: ئەی خاوەنانی فامو ژیری، لە تۆڵە وەرگرتنەوەو کوشتنەوەدا ژیانی خۆش و مەزنتان هەیە، چونکە ئەم یاسایە دەبێتە هۆی مانەوەی ژیانی مرۆڤو بەهۆیەوە مۆرڤەکان خۆیان بەدوور دەگرن، لە تاوانی خەڵك کوشتن.

جا لەم ئایەتانەدا، خوای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا مەرجەکانی کوشتنەوەی باس نەکردووەو، لە سوننەتدا باسکراونو، هەروەها دەربارەی کرینو فرۆشتنو سوخوارن (الربا)، کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلْبَيْعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰا۟﴾[2] واتە: خودای مەزن کرینو فرۆشتنی حەڵاڵ کردووەو، سووخواردنی یاساغ کردووە، جا سوننەتو فەرموودەی پێغەمبەر (ﷺ) هاتووە، کە ڕوونکردنەوەی لەسەر کرینو فرۆشتنی حەڵاڵو مەرجەکانی داوەو، سووی حەرامو جۆرەکانی ڕاڤەو شی کردۆتەوەو، ئەم جۆرە ڕاڤەو ڕوونکردنەوەیەی ئەحکامەکان، ڕوونکردنەوەیەکی کورتو پوختنو، بەزۆریش ڕوونکردنەوەکانی قورئانی پیرۆز لەم جۆرەنو، کورتبڕو پوختنو، هونەرو حیکمەتی هاتنی ئەحکامەکانی قوئان لەسەر شێوازی یاساو ڕێسای گشتیو، بنچێنەی ئەوەیەکە هاتنیان بەم جۆرە لە بەر ئەوەیە کە لە کاتی گۆڕانکارییە تازەکاندا، بواری گونجانو فراوانکردنیان هەبێتو، تەسکبیری نەدەن بە دەستەوە.

**جۆری دووەم:** ئەحکامە درێژە پێدراوەکان (الأحكام التفصيلية)، کە ئەمانەیش لە قورئانی پیرۆزدا کەمنو، لەوانە ئەندازەی میرات بردنو، ئەندازەی سزاکانی تاوانەکانو، چۆنیەتیو ژمارەی تەلاقو، ڕوونکردنەوەی لەسەر ئەو ژنانەی کە مەحرەمنو مارەکردنیان دروست نییەو، هتد....

## ١٥٠- ڕەوشو شێوگی قورئان لە ڕاڤەی ئەحکامەکاندا:

قورئانی پیرۆز، شێوگیو شێوازی جیاجیای هەن، لە ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکانداو، ئەمەیش بە هۆی ئەو ڕەوانبێژیو ئیعجازە مەزنەوەیە کە ئەو پەڕاوە پیرۆزە هەیەتیو، هەروەها پەڕاوی هیدایەتو ڕێنمونی خەڵکەو، ئەو جیاوازی دەربڕینانە، بەشێکە لە

---

[1] سورة (البقرة/ ١٧٩).

[2] سورة (لبقرة/ ٢٧٥).

ڕەوانبێژیو ئیعجازی قورئان، و بۆیە بەجۆرێك ئەو ئەحكامانە ڕوون دەكاتەوە، كە مرۆڤ زیاتر هان بدات و سووری بكات، لەسەر گوێڕایەڵی كردنیانو، دووركەوتنەوە لەو شتانەی كە نەهی لێكردوونو دژایەتی كردوونو، بۆیە ئەو شتانەی كە واجبن، دەبینین بە دەستەواژەی فەرمانكردن (صیغة الأمر) دەری بڕیبوون، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَأَقِيمُواْ ٱلشَّهَٰدَةَ لِلَّهِ﴾[1] واتە: شایەتیدان لەبەر خاتری خوا بەڕێكو پێكی ئەنجامی بدەن، یاخود بەجۆری دەری بڕیوە، كە ئەو كردەوەیە لەسەر ئەو خەڵكەی ئاڕاستەیان كراوە، نووسراوە، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ﴾[2] واتە: ڕۆژووی ڕەمەزانتان لەسەر پێویست كراوە، وەك چۆن پێشتریش لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست بووە، تابە هۆی ئەم كردەوەیەوە لە خواترس بن، و هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلۡقِصَاصُ﴾[3] واتە: كوشتنەوەتان لە كاتی كوشتنی ناهەقدا، لەسەر نووسراوەو، پێویست كراوە.

جاری وا هەیە، ڕوونكردنەوەی دەستەواژە واجب بوونی ئەو شتە فەرمان پێكراوە بەشێوەی باسكردنی پاداشتی بكەرەكەیو سزای ئەنجامدەرەكەی دەردەبڕێت، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ يُدۡخِلۡهُ جَنَّٰتٖ﴾[4] واتە: هەر كەس گوێڕایەڵی خواو پێغەمبەرەكەی بكات، دەچێتە بەهەشتەوە.

جاری واهەیە، كە شتی حەرام، ڕوونكردنەوەكەی بەشێوەی دەستەواژەی نەهیكردن دەبێت، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡتُلُواْ ٱلنَّفۡسَ ٱلَّتِي حَرَّمَ ٱللَّهُ إِلَّا بِٱلۡحَقِّ﴾[5] واتە: هیچ كەسێ لەسەر ناهەق مەكوژن، چونكە خودا ئەم كارەی حەرام كردووەو، بەرگری لێكردووە، كە بكرێت.

---

١ سورة (الطلاق/ ٢).

٢ سورة (البقرة/ ١٨٣).

٣ سورة (البقرة/ ١٧٨).

٤ سورة (النساء/ ١٣).

٥ سورة (الأنعام/ ١٥١).

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾[1] واتە: بەدەستی خۆتان، خۆتان مەخەنە ناو مەینەتی‌و لەناو چوونەوە!

جاری وا هەیە، کە ڕوونکردنەوەی قورئان، لەسەر شێوازی هەڕەشە ئامێزو بەڵێندان دێت، لەسەر سزادانی بکەری ئەو کارە، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا (١٠)﴾[2] واتە: ئەوانەی کە موڵك‌و ماڵی بێ باوکان بەستەمکاری دەخۆن، ئەوا ئەو موڵکە دەبێتە ئاگرو، خوا دەیخاتە سکیانەوەو، دەخرێتە ناو ئاگری بەتینی دۆزەخەوە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَن يَعْصِ اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَيَتَعَدَّ حُدُودَهُ يُدْخِلْهُ نَارًا﴾[3] واتە: هەر کەس سەرپێچی خوداو پێغەمبەرەکەی بکاتو، سنورەکانیان ببەزێنێت ئەوا دەخرێتە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

لەم ڕوانگەیەوە پێویستە لەسەر هەر کەسێك کە دەیەوێت حوکم لە قورئانی پیرۆزەوە هەڵبهێنجێت، دەبێت ئەو شێوازانە بزانێت، کە قورئان هەیەتی لە دەربڕینیداو، شارەزابێت، لە چۆنیەتی ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکان لە قورئانداو، هەروەها زانابێت، بەو شتانەی کە پەیوەندیدارن بەو دەقانەوە کە مانای واجب بوون، یان موباح بوونی لێ دەفامرێتەوە، **ئەمەی خوارەوەیش ژمارەیەکە لەو یاساو ڕێساو بنەما بەسودانەی کە لەم بوارەدا هەن‌و دانراون:**

١- هەرکارێك ئەگەر بەدەستەواژەی واجب بوون هاتبوو، ئەوە واجبەو، ئەگەر بەدەستە واژەیێ هاتبوو، کە مانای مەندوب بوونی لێ بفامرێتەوە، ئەوە مەندوبە، یاخود ئەگەر لە قورئاندا بەشێوەی پیاهەڵدان، یان حەزپێکردن، یان ستایش کردن بەکردنی ئەو کارە هاتبوو، یان بەڵێن درابوو، بەپاداشتی باشی لەسەریو، خەڵاتکردنی بکەرەکەی، ئەمەیش هەر بەسەر واجب‌و مەندوبەکانە.

٢- هەر کارێك ئەگەر بەدەستەواژەی حەرام بوون‌و، مەکروە، بوون دەر بڕدرابوو، ئەوە

---

١ سورة (البقرة/ ١٩٥).

٢ سورة (النساء/ ١٠).

٣ سورة (النساء/ ١٤).

بێگومان حەرامە، یا مەکروهە، کە ئەو کارە ئەنجام بدرێتو، ئەگەر بەدەستەواژەیەك هاتبووە، کە مانای کردنی ئەنجامدانی ئەو کارەی تیا بفامرێتەوە، لە لایەن خودای مەزنەوەو لەلایەن شەرعەوەو، داوای کردبێت، کە لێی دوربکەونەوە، یاخود بەجۆرێك باس کرابوو، کە سەرزەنشتی تیا دەفامرێتەوەو، هەروەها سەرزەنشتی بکەرەکەی کرابوو، یاخود وادەربڕدرابوو، کە هۆکار دەبێت بۆ سزادانی بکەرەکەیو، یان بۆ توڕەییو خەشمی پەروەردگار، یان هۆکاربێت، بۆ چوونە ناو ئاگر، یان نەفرەت کرابێت، لە بکەرەکەی، یان کردەوەکە وا باس کرابوو، کە پیسە، یان خراپەکارییە، یاخود لە کردەوەی شەیتانە، یاخود بکەرەکەی بە ئاژەڵو شەیتان و هتد.... ناوزەد کرابوو، ئەمانە هەموو سەر بەحەرامو مەکروهەکەن، کە باسمانکرد.

٣- ئەگەر هەر کردەوەیەك، بەدەربڕینێك هاتبوو، کە موباح بوونی لێ دەفامرایەوە، وەك لەفزی حەڵاڵکردن، یان مۆڵەتدان، یان بەکارێك باسکرابوو، کە تاوان نییە، یان گوناهـ نییە، یان ئەوەی کە بەحەرامی داناوە، نکۆڵی لەو قسەیەی کرابوو، یان هتد.... ئەمانە سەر بە موباحەکەن و کردنیان دروستە.

## ١٥١- دەلالەتی قورئان لەسەر ئەحکامەکان:

پێشتر باسمان کرد، کە قورئانی پیرۆز لە ڕووی گەیشتنی بەدەستی ئێمە، یەکلایی (قطعي الورود)ـە، و هیچ گومانێکی تیادا نییە، واتە بە بێگومانو یەکلایی ئەوە چەسپاوە، کە بەرێگەی موتەواتیر گەیشتووە بە ئێمەو، زانیاری بێگومانو دڵ ئاسودەکەر (یقیني) دەدات، بە ئێمە ، چونکە بەدروستی گەیشتۆتە دەستمانو، کەواتەو بەم بۆنەیەوە ئەحکامەکانیشی لە ڕووی چەسپاندنەوە یەکلاکەرەوەنو بێگومانن، (قطعي الثبوت)ـن، بەڵام لە ڕووی دەلالەت کردنی لەسەر ئەحکامەکان، جاری واهەیە، دەلالەتەکەی قطعی یەو، جاری واهەیە کە دەلالەتەکەی یەکلاکەرەوە نییەو (ظني) یە بۆیە هەر کات دەربڕینەکەی تەنهاوتەنها یەك مانای دەگەیاندو هەڵدەگرت، ئەوا لەم حاڵەتەدا دەلالەتی ئەو لەفزە قطعی یەوەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَلَكُمْ نِصْفُ مَا تَرَكَ أَزْوَاجُكُمْ إِن لَّمْ يَكُن لَّهُنَّ وَلَدٌ فَإِن كَانَ لَهُنَّ وَلَدٌ فَلَكُمُ الرُّبُعُ مِمَّا تَرَكْنَ مِنۢ بَعْدِ وَصِيَّةٍ يُوصِينَ بِهَآ أَوْ

دَيْنٍ﴾[1] واته: لەو میراتە کە ژنانتان بە جێی دەهێڵن ئەگەر منداڵیان نەبێ، کوڕ یان کچ، لە دوو بەشەوە بەشێکتان هەیە، ئەگەر منداڵیشیان هەبوو، ئێوە ئەی مێردەکان، چوار یەکتان دەکەوێت، لەو کەلەپورەی ئەو ژنانەتان بە جێیان هێشتووە، ئەوەی تریش بۆ میراتبەرەکانی تر دەبێت، ئەمانەیش لەدوای ئەنجامدانی وەسیەتێك کردوویانە، یان دانەوەی قەرزو قۆڵەیەك کە لەسەریانە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجْلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٍ مِّنْهُمَا مِاْئَةَ جَلْدَةٍ﴾[2] واتە: کچو کوڕی داوێن پیس، لەسەر ئەو کردەوە خراپەیان، یەکی سەد شەلاقیان لێ بدەن.

کە لەم ئایەت گەلەدا (نیوەی میرات)و (چوار یەك)و (سەد شەلاق) هەموویان بە قەطعی دەلالەت دەکەن لە سەر مانا بەخشراوەکانیان، و سەرجەمیان تەنهاو تەنها یەك مانا دەگەیەنن، کە لە ئایەتەکەدا باسکراوە.

جاری وا هەیە، کە دەلالەتی قورئان لەسەر مانای حوکمێك مانا هەڵگری مانای تریشە (ظـني) یە، ئەگەر ئەو دەربڕینە مانای تری هەڵدەگرت، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَٱلْمُطَلَّقَٰتُ يَتَرَبَّصْنَ بِأَنفُسِهِنَّ ثَلَٰثَةَ قُرُوٓءٍ ﴾[3] واتە: ئەو ژنانەی پاش چوونە لایان، تەڵاقدران، تا سێ پاکی دەبێ خۆیان بگرنو مێرد نەکەنەوە کە لێرەدا لەفزی (القروء) دەکرێت مەبەس پێی پاکبوونەوە لە بێ نوێژی (الطهور) بێتو، هەروەها دەکرێت، کە مەبەست پێی بێ نوێژی (الحيض) بێت، بۆیە لەگەڵ بوونی ئەم فەرمانەدا، دەلالەتی ئایەتەکە (ظـني) دەبێت، نەك (قطعی) .

---

[1] سورة (النساء/ ١٢).

[2] سورة (النور/ ٢).

[3] سورة (البقرة/ ٢٢٨).

# بەشی دووەم

# بەڵگەی دووەم: سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)

## ١٥٢- پێناسەی سوننەت:

سوننەت، لەزمانی عەرەبیدا مانایەکی هەیە،و لە زاراوەی لە شەرعزاناندا مانایەکی هەیەو، لەلای زانایانی ئوصولیش مانایەکی تری هەیە.

**سوننەت لە زمانی عەرەبیدا:** بریتیە لەو ڕەوتو ڕێبازەی کە بووەتە نەریتو پارێزگاری لەسەر ئەو شێواز و نەریتەی کراوە، و لەسەر هەمان ڕەوتو ڕێبازو نەریت، ئەو کارە دووبارە دەکرێتەوە، هەروەك پەروەدگار لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿ سُنَّةَ ٱللَّهِ فِى ٱلَّذِينَ خَلَوْاْ مِن قَبْلُ وَلَن تَجِدَ لِسُنَّةِ ٱللَّهِ تَبْدِيلًا ﴿٦٢﴾ ﴾[1] واتە: ئەم سوننەتو نەریتو باوو بڕیارەی پەروەدگار، هەر پێشتریش سەبارەت بەگەلانی پێشوو هەر وابووەو، تۆ نابینیت، کە لە سوننەتو نەریتو ڕەوشی پەروەردگاردا گۆڕانکاری ڕوویدات، سوننەتی مرۆڤیش، بریتییە لەو ڕەوتو ڕێگایەی کە پابەندە پێوەی لە کاتی ئەنجامدانی کارەکانیداو، پارێزگاری لەو شێوازو نەریتەی خۆی دەکات، ئیتر چونیەکە لەسەر ئەو کارە ستایش بکرێت، یان تەنانەت سەرزەنشت بکرێت.

پاشان سوننەت، لە زاراوەی شەرعزاناندا، (إصطلاح الفقهاء) وەك ئەوەی کە هەندێکیان گوتویانە، بریتییە لەو پەرستشە سوننەتانەی کەلە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ ئێمە گوازراوەتەوە، واتە: ئەوانەیان کە واجب نین، لەسەرمان[2]، بەڵام ئەوەی کە لە کتێبە فیقهیەکان دەستمان دەکەوێت، ئەوەیە کە سوننەت لەلای شەرعزانەکان بۆ پەرستشی مەندوبو ئەوانە بەکاردەهێنرێت، و جاری واهەیە کە سوننەت، لە فەرمایشتی هەندێ لە شەرعزاناندا بۆ بەرامبەری پێکردنی ووشەی (بیدعەت) بەکار دەهێنرێت، وەك دەگوترێت، فلانەکەس لەسەر سوننەتەو پابەندە پێوەی، ئەمە بۆ کاتێکە کە دەقاو دەق وەك سوننەتو

---

[1] سورة (الأحزاب/ ٦٢).

[2] الشوكاني، ل٣٣، الأميدي، ب١، ل٢٤١.

کارو کردەوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) مامەڵە بکاتو ڕەوت بکات، و کە دەگوترێت فلانەکەس بیدعە چییە، ئەمە بۆ کەسێکە کە پێچەوانەی سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ) کار بکاتو بچێت بەڕێوە، پاشان سوننەت لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا، بریتییە لەو شتانەی، جگە لە قورئانی پیرۆز کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرچاوەیان گرتبێت، لە گوفتارو کردارو دانە پاڵ (تقریر)[1]، و بۆیە سوننەت بە پێی ئەم پێودانگەی باسمان کرد، بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی ئەحکام، و سەرچاوەیەکە لە سەرچاوەکانی شەرعدانان.

## ١٥٣- سوننەت سەرچاوەی شەرعدانانە :

**گوتمان کە سوننەت سەرچاوەیەکە ئەحکامی شەرعی لێوە هەڵدەهێنجرێت، و ئەمەش بەڵگەی قورئانو کۆڕای زانایانو بەڵگەی عەقڵی لەسەرە.**

## یەکەم: بەڵگەی قورئان :

أ- قورئان بەڵگەی لەسەر ئەوە تیادایە، کە ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەری دەبڕێت، لەسەر شێوەی شەرعدانان، ئەوە لەسروشە (وەحی) یەوە، سەرچاوەی گرتووەو، لەلایەن خوای پەروەردگارەوە ڕەوانە کراوە، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿وَمَا يَنطِقُ عَنِ الْهَوَىٰ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْيٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾﴾[2] واتە: ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) دەری دەبڕێت، لە خۆیەوە نییە، بەڵکو وەحیو سروشی خوای پەروەردگارەو ڕەوانەی کردۆتە سەریو، جا بۆیە فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) وەك قورئان وایە، لەو ڕووەوە کە هەردووکیان واتە قورئانو فەرموودە سەرچاوەکەیان وەحی پەروەردگارە بەڵام ئەوەندە هەیە، کە سوننەت تەنها بە (مانا) نەك (لەفز) وەحی کراوەتە سەر پێغەمبەر (ﷺ) و لەبەر ئەوەی کە قورئان واجبە پەیڕەوی لێوە بکرێت، چونکە لەلای خوای مەزنەوە هاتووە، هەر بەم شێوازەش واجبە کە پەیڕەوی لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەریش (ﷺ) بکرێت، چونکە ماناکەیان لەخوداوەیە، کە بێگومان مەبەست لە هەر قسەو فەرمایشتێك، زیاتر ماناکەیەتیو، سوننەتیش ماناکەی لە وەحییەوە سەرچاوەی گرتووە.

---

[1] سورة (النجم/ ٣-٤).

[2] حاشية الأزميري، ب٢،ل١٩٦، و الآمدي، ب١، ل٢٤١، و لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە جەعفەرییەکان ئەو شتانەی کە لە پێشەوا مەعصومەکانیانەوە گێڕدراوەتەوە بۆیان، هەر بە سوننەتی دەزانن، کە گوفتار و کردار و تەقریرە، بڕوانە پەڕتووکی (محاضرات في أصول الفقه الجعفري)، للشيخ محمّد أبو زهرة، ل١٢٢ .

ب- خوای پەروەردگار ئەرکی ڕونکردنەوەی ماناکانی قورئانی خستۆتە سەرشانی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەوەی لەسەر داناوە کە ڕاڤەو شیکردنەوەی ئەحکامە کورت برەکانی قورئان بکات، وەك خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ﴾[1] واتە: ئێمە قورئانمان بۆ تۆ ناردووە، ئەی موحەمەد (ﷺ)، تا بۆ خەڵکی ڕاڤە بکەیت و، مانای ئەو شتانەی کە تیایدایە، شی بکەیتەوە بۆیان، کە واتە ڕوون کردنەوەو ڕاڤەو شیکردنەوەی قورئان بەشێکی تەواوکەری قورئانەکەیەو، شتێکی پێویستو ضەرورییە بۆ بەدەسهێنانی حوکمی شەرعی، و زانینی ئەو شتانەی کە داواکراون و، بۆیە سوننەت بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی ئەحکامی شەرعی.

ج- دەقی زۆر زۆر لە قورئانی پیرۆزدا هاتوون، کە بەشێوەیەکی یەکلاکەرەوە (قاطع) بەڵگەن لەسەر پێویستی پابەند بوون بە پەیرەوی کردنی سوننەتەوەو، پابەند بوون پێیەوەو، هەروەها دانانی وەك سەرچاوەیەکی شەرعدانان و سوود وەرگرتن لێی، بەمەبەستی هەڵێنجانی، ئەحکامەکانی شەرع و، ئەو دەقانەی کە بەڵگەن لەسەر ئەم قسەیەی کە باسمان کرد، بەشێوازی جۆراو جۆر هاتوون و، بەدەستە واژەی جیاجیا دەرکەوتوون، کە فەرمان دەکەن، بە گوێڕایەڵی کردنی پێغەمبەر (ﷺ)و گوێڕایەڵی پێغەمبەر (ﷺ) بەگوێڕایەڵی کردنی خودای مەزن دادەنێن و، ئەو ئایەتانە فەرمان دەکەن، کە لە هەر شتێکدا ڕاجیایی دروست بوو، بگەڕێینەوە بۆ لای قورئان و سوننەت بەمەبەستی چارەسەر کردنی و، هەروەها فەرمان دەکەن، بەگرتن و پابەند بوون بەو شتانەی کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) پێمان گەیشتووەو، دووربکەوینەوە لەو شتانەی کە فەرمانیداوە لێی دوورە پەرێزبین و، هەروەها بێ پێچ و پەنا ئەوەی درکاندووە، کە هەر کەس لەکاتی ڕاجیاییدا حوکمی بەفەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) نەکردو، پێی ڕازی نەبوو، ئیمانی نییەو، هەروەها دەبێژێت، کە مسوڵمان هەر کاتێك لە کارێکدا کە پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری لەسەردا بژاردەیەکی تری لەبەردەمدا نییەو، دەبێت هەر پێوەی پابەند بێت و، هەروەها هەڕەشە لەو سەرپێچیکارانە دەکات، کە سەرپێچی فەرمانی پێغەمبەر (ﷺ) دەکەن، کە تووشی دواڕۆژی خراپ و سزای سەخت دەبنەوە.[2]

---

[1] سورة (النحل: ٤٤).

[2] ژمارەیەك لەو دەقانە وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ أَطِيعُوا۟ ٱللَّهَ وَأَطِيعُوا۟ ٱلرَّسُولَ وَأُو۟لِى ٱلْأَمْرِ مِنكُمْ ۖ فَإِن تَنَـٰزَعْتُمْ فِى شَىْءٍ فَرُدُّوهُ إِلَى ٱللَّهِ وَٱلرَّسُولِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِٱللَّهِ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ﴾ (النساء/ ٥٩) واتە:

## دووەم: بەڵگەی کۆڕایی زانایان (الأجماع):

مسوڵمانان لەسەر دەمی پێغەمبەردا (ﷺ) بەئەمڕۆیشەوە لەسەر ئەوە کۆك بوون، کە واجبە، ئەو حوکمانەی کە لە سونەتی پێغەمبەر (ﷺ)دەرچوون، دەبێت فەرمانبەرداریان بین‌و ملکەچیان بین‌و، بەمەبەستی زانینی حوکمە شەرعییەکان، دەبێت بگەڕێینەوە بۆ لایان، و بە چی بڕیاریاندا تەسلیمیان بن‌و کاری پێ بکەن، و لە سەردەمی هاوەڵان‌و دوای ئەوانیشدا، جیاوازیان نەخستۆتە نێوان ئەو بڕیارانەی کە لە قورئاندا هاتون و ئەوانەی کە لە سوننەتدا هاتوون‌و، وەك یەك ملکەچی هەردووکیان بوون‌و، کە لای هەموویان پەیڕەوی کردنی هەردووکیان واجب بووە، چونکە سەرچاوەی هەردووکیان یەك سەرچاوەیە، کە ئەویش وەحی خودای مەزن‌و، ئەو پێشهات‌و ڕووداوانەی کە بەڵگەن لەسەر ئیجماعی زانایان لەسەر ئەم پرسە زۆر زۆرن‌و لە ژمارە نایەن، و هەندێ لەو نموونانەمان لە کاتی قسەکردن لەسەر بەڵگەکان‌و ڕیزبەندی کردنیان لە کاتی بە بەڵگە کردنیاندا هێناوە.

---

ئەی باوەڕداران گوێڕایەڵی خوداو پێغەمبەرو کار بەدەستە مسوڵمانەکانتان بکەن‌و لە هەر کارێکدا ڕاجیایی دروست بوو لە نێوانتاندا ئەوا بۆ چارەسەرەکەی بگەڕێنەوە لای خوداو پێغەمبەرەکەی ئەگەر ئێوە باوەڕدارن بەخودا و ڕۆژی دوایی.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿مَّن يُطِعِ ٱلرَّسُولَ فَقَدْ أَطَاعَ ٱللَّهَ﴾ (النساء/ ٨٠) هەر کەس گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە گوێڕایەڵی خودای مەزنی کردووە.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَآ ءَاتَىٰكُمُ ٱلرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَا نَهَىٰكُمْ عَنْهُ فَٱنتَهُوا۟﴾ (الحشر/ ٧) واتە: هەرچی پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی پێکردن، گوێڕایەڵی بکەن‌و، لە هەرچی بەرگری لێکردن، ئێوەش مەیکەن.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا۟ فِىٓ أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا۟ تَسْلِيمًا ۝٦٥﴾ (النساء/ ٦٥) واتە: سوێند بە پەروەردگارت، نابنە بڕوادار، تا بۆ یەکلاکردنەوەی کێشەکانی نێوانیان تۆ دەکەنە دادوەر، و دواتریش بۆ ئەو بڕیارەی تۆ داوتە، هیچ شتێکی خراپ‌و غایەلەی خراپ دروست نابێت، لە دەرونیاندا، و بە تەواوی ملکەچ‌و تەسلیم دەبن.

- هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ﴾ (الأحزاب/ ٣٦) واتە: بۆ هیچ پیاوو ژنێکی بڕوادار نییە، کاتێك خواو پێغەمبەرەکەی بڕیاری کارێکیاندا، سەر پشك کرانیان بۆ هەبێ لە کارەکانیانداو، واتە: بۆیان نییە، کە خۆیان بارێك هەڵبژێرن، بەڵکو دەبێت بێ ڕا ڕایی فەرمانبەرداروو ملکەچی فەرمانەکەی خوداو پێغەمبەری خودابن.

## سێیەم: بەڵگەی عەقڵی:

بە بەڵگەی یەکلاکەرەوە (الدلیل القاطع) ئەو چەسپاوە، کە پێغەمبەر موحەمەد (ﷺ) پەیامبەری خودایەو، مانای پەیامبەریش ئەوەیە کە گەیەنەری ئەو شتانەیە کە خودا پیایدا رەوانەی کردووە، کە مرۆڤیش باوەڕی بە پەیامەکەی هەبوو، دەبێت پابەند بێت، بە گوێڕایەڵی کردنییەوەو، ملکەچ بێت، بە حوکمەکانییەوەو، ئەو شتانەی لەوەوە سەرچاوە دەگرن، قەبوڵی بێت و بە بێ ئەم پەیڕەوی کردنانە، باوەڕەکەی هیچ مانایەکی نابێتو، گوێڕایەڵی کردنی خوای گەورەو ملکەچ بوون بە فەرمانەکانی لە گەڵ پێچەوانە بوونەوە لەگەڵ پێغەمبەرەکەیدا (ﷺ) تێك ناگرنەوەو کۆنابنەوە.

١٥٤- **پرسیارێك**: بەڵام ئایا سەرجەمی ئەو شتانەی کە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرچاوەیان گرتووە، ئەو پلەیەی هەیە؟ واتە پلەی پەیڕەوی کردنو پابەندبوونی تەواو پێیەوەو، بە بەڵگە کردنی لەسەر هەر حوکمێکی شەرعی؟ یان نا.....؟ وە هەروەها سەرجەم ئەو شتانەی کە لە پێغەمبەروە(ﷺ) سەرچاوەی گرتووە، دەگونجێت، کە ببنە سەرچاوەی شەرعدانان؟ یان نا.....؟! بۆ وەڵامی ئەم دوو پرسیارە، دەبێت بێگومان قسە لەسەر جۆرەکانی سوننەت بکەین، لە ڕووی چییەتیو بنچینەی هاتن (ماهیة)ـەوە، و پاشان قسە لەسەر جۆرەکانی بکەین، لەڕووی گەیشتن بە ئێمە.

١٥٥- جۆرەکانی سوننەت، لە ڕووی چییەتیو چۆنیەتیو خودی خۆیەوە، و ڕەچەڵەکی هاتنیەوە (ماهیة) جا سوننەت لەم ڕووەوە بۆ سێ بەش دابەش دەبێت:

- **سوننەتی گوفتاری. (السنّة القولیة).**
- **سوننەتی کرداری (السنة الفعلیة).**
- **سوننەتی "تەقریری: دانە پاڵ"، (السنة التقریریة).**

## یەکەم: سوننەتی گوفتاری:

ئەمیش بریتیە لە فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)، کە لە بۆنە جۆراو جۆرەکانی فەرموونی، و بە مەبەستی جیاجیا دەری بڕیونو ئەمەیش کە ناوی فەرموودە (حدیث)ـی، بەسەردا براوە، و هەر کات ئەم ناوە بەکار هێنرا، هزری مرۆڤ ڕاستەوخۆ ئەوەی بە بیردا دێت، کە مەبەست پێی سوننەتی گوفتارییە، واتە فەرمایشتەکانیەتیو، بەم پێوەدانگە بێت،

هاو ماناو مورادیفی لە نێوان (سوننەتی گوفتاری)و (فەرموودە) داھەیەو، بەڵام ئەوەندە ھەیە، کە ناوی (فەرموودە)، لە ناو چوار چێوەو مانای گشتییەکەی سوننەتدا، تایبەتمەندییەکی خۆیی ھەیەو، سەرەڕای ئەمەش ھەندێ لە زانایان مانای (فەرموودە) یان والێك داوەتەوە، کە بریتییە لە شوێنەوارەکانی پێغەمبەری خوا (ﷺ)، واتە: ئەو شوێنەوارانەی کە لەقسەو کردارو دانە پاڵ لە پێغەمبەرەوە(ﷺ) سەرچاوەیان گرتووە، و بەم مانایە بێت، لەفزی (حدیث) مورادیفو ھاومانای سوننەتە، بەمانای گشتییەکەی‌و، ھەر لەسەر ئەم پێوەدانگەیشە کە ئیمامی بوخاری کتێبە ناسراوەکەی ناو ناوەتە (الصحیح من الحیث)، کە سەرەڕای فەرموودە، شتی تریشی لە خۆ گرتوون، کە لە گوفتارو کردارو دانە پاڵ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) سەرچاوەیان گرتووە.

سوننەتی گوفتاری زۆرن، لەوانە فەرموودەی (العمد قود) واتە: سزای کوشتنی بە ئەنقەست، کوشتنەوەی بکوژەکەیە، و ھەروەھا وەك فەرموودە: (لاضررَ و لا ضِرار) واتە: کەس مافی ئەوەی نییە کە زیان بەخەڵکی بگەیەنێت، یاخود تۆڵەی زیان لێکەوتن، نابێت بە زیانگەیاندن بکاتەوەو، ھەروەھا فەرموودەیەکی تر، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: «مَنْ رَأى مِنْكُمْ مُنْكَرًا فَلْيُغَيِّرْهُ بِيَدِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِلِسَانِهِ، فَإِنْ لَمْ يَسْتَطِعْ فَبِقَلْبِهِ، وَذَلِكَ أَضْعَفُ الْإِيمَانِ»، واتە: ھەر کەس خراپەیەکی بینی، با بەدەست ڕێگری لێ بکات، ئەگەر نەیتوانی با بەزمان ئاگاداری خەڵکی بکاتەوە لەسەر نەکردنی، ئەگەر ئەویش ھەر نەکرا، با بەدڵ کردنی ئەو کارە خراپەی لا ناخۆش بێت، ھەرچەندە ئەمە نزمترین‌و لاوازترین پلەی ئیمانە.

جا فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (ﷺ)سەرچاوەی شەرع دانانن، ئەگەر مەبەست لێیان ڕوونکردنەوەی ئەحکامەکان‌و شەرعدانان بوو، بەڵام ئەگەر تەنھاو تەنھا کاروباری دنیایی ڕووت بوون، و پەیوەندییان بەشەرع دانانەوە نەبوو، و لەسەر وەحی بنیات نەنرابوون، ئەمانەیان نابنە بەڵگە لە بەڵگەکانی ئەحکام‌و، نابنە سەرچاوە کە ئەحکامی شەرعییان لێوە ھەڵبھێنجرێت‌و، پەیڕەوی کردنیشیان واجب نییەو، لەمانەیش وەك ئەوەی کە لێیەوە گێڕدراوەتەوە، کە پێغەمبەر گیان (ﷺ) کۆمەڵێکی بینین، لەشاری مەدینە کە دار خورماکانیان موتوربە دەکردن، و ئەویش فەرمووی مەیکەن، ئیتر بەرھەمی ئەو ساڵەی خورمایان تیا چووو، نەبوو! ! ویان بێ بەرھەم بوون، یان بەرھەمێکی خراپ‌و کەمیان ھەبووو، دواترو ساڵی ئایندە پێغەمبەر (ﷺ)پێی فەرموون، موتوربەیان بکەن، ئێوە شارەزاترن بە کاروبارە دنیاییەکانی خۆتان.

## دووەم: سوننەتی کرداری:

ئەمەیش بریتییە لەو کردەوانەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوونی وەك بەرپاکردنی نوێژ بەتەواوی شێوازو پایەکانییەوەو، هەروەها وەك بڕیاردان بە بوونی شایەتێكو سوێندخواردنی کابرای سکاڵا کار، (کە لە جیاتی شایەتی دووەم حسابی کردووە)و، چەندەها نموونەی تر، کردەوەکانی پێغەمبەر (ﷺ) هەیانە کە دەبنە سەرچاوەی شەرعدانانو، هەیانە کە نابنە سەرچاوە[1]و، لێرەدا ڕاڤەو ڕوونکردنەوەی زیاتر هەیە، بەم شێوازەی لای خوارەوە:

أ- کردارە خۆڕسکی و زگماکییەکان (جِبلّي)، واتە ئەو کردەوانەی کە وەك سروشتی مرۆڤانەی خۆیو وەك ئەوەی کە مرۆڤە و مرۆڤ ئاسا ئەنجامی داون، و لێیەوە سەرچاوەی گرتووە، وەك، خواردنو، خواردنەوەو، چوون بەڕێگاداو، دانیشتنو، هتد.... ئەمانە ناچنە ناو بواری شەرع دانانەوە، تەنها لەو ڕوانگەوە نەبێت،کە ئەبنە مایەی حەڵاڵ بوونی ئەو جۆرە کردەوانە، لەسەر شانی کەسی موکەللەفو، لەسەر ئەم بنەمایە پەیڕەوی کردنی پێغەمبەر (ﷺ) لەم بابەتەدا واجب نییە، هەرچەندە هەندێ لە هاوەڵانی (خوا لێیان ڕازی بێت)، لەسەر ئەم پەیڕەو کردنە زۆر سوورو بەردەوام بوون، وەك (عەبدوڵڵای کوڕی عومەر)، و ئەم پەیڕەوکردنەیش کارێکی چاکە.

وپاشان ئەو کردەوانەی کە لە ڕوانگەی سروشتی مرۆڤی خۆیەوە بەتایبەتی ئەنجامی داون، لە کاروبارە دونیاییەکانیدا، هەرسەر بەو بوارەی سەرەوەن‌و، وەك سەرچاوەی شەرعدانان نایەنە ئەژمار، وەك ڕێکخستنی سوپاو، ئەنجامدانی تەکتیکەکانی شەڕو، کاروباری بازرگانیو، هتد....

ئەم جۆرە کردەوانە بەسەر چاوەی شەرعدانانی گەلی ئیسلام نایەن ئەژمار، چونکە لە ئەزموونەوە، سەرچاوەیان گرتووەنەك وەحییەوەو، پێغەمبەریش (ﷺ) تۆبزی لەسەر موسڵمانان نەکردووە، کە هەردەبێت پێوەی پابەندبن، و سەر بەبواری دانانی ئەحکامەکان نەیهێناونەتە ئەژمار، و بۆیە کاتێك کە پێغەمبەر (ﷺ) ویستی موسڵمانان لە جێگایەکی دیاریکراو دابمەزرێنێت، لە شەڕی بەدردا.

هەندێ لە هاوەڵان پێیان فەرموو، ئایا خودای مەزن خستویەتیە دڵتەوە ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) کە لەم جێگایەدا دابمەزرێین؟ یان ئەوە ڕای جەنابتانەو؟ فێڵو تەکتیکی

---

[1] شرح مسلم الثبوت، ب٢، ل١٨١، الآمدي، ب١، ل ٢٤٧-٢٤٨، الشوكاني ل٣٥-٣٦.

جەنگە؟ جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: نەوەڵڵا، ڕای خۆمەو، فێڵو تەکتیکی جەنگە! جا هاوەڵێ فەرمووی: ئەو جێگایە گونجاو نییەو، ئاماژەی بە پێغەمبەر (ﷺ) دا، کە لە جێگایەکی تردا، کە ئەم هاوەڵە پسپۆڕە دیاری کردبوو، سوپاکە دابمەزرێنێت، لەبەر چەند هۆکارێ کە ڕوونی کردنەوە، بۆ پێغەمبەر (ﷺ)، جا پێغەمبەر (ﷺ) گوێڕایەڵی لەو هاوەڵە بەرێزە کردو وای کرد!

هەروەها سەبارەت بە نەبوونە سەرچاوەی شەرعدانان، ئەم نموونانەی خوارەوەیش دەبنە پاشکۆی ئەو جۆرەی سەرەوە، کە بریتین لەوەی ئەگەر پێغەمبەر (ﷺ) لە سکاڵایەکدا ڕووداوو پێشهاتەکانی ئەو سکاڵایەی جێگیر کردبێتو بڕیاری لەسەر دابن، ئەمە کارێکی سەر بە (شەرعدانان: تشریع) نییە، چونکە ئەمە کارێکی تەقدیریو ئەندازە دانان بووە، بەپێی پێشهاتەکانو مەبەستی شەرعدانان نەبووە، بۆ تەواوی گەلی ئیسلام، بەڵام لێرەدا حوکمدانی پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر پێویستیو فەرزبوونی جێگیر بوونیو چەسپاندنی پێشهاتەکانی ئەو ڕووداوانەی کە دابێتی، ئەمەیان کە شەرعدانانە بۆ گەلی ئیسلامو، هەر بۆیە پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: «إِنَّمَا أَنَا بَشَرٌ، وَإِنَّكُمْ تَخْتَصِمُونَ إِلَيَّ، وَلَعَلَّ بَعْضَكُمْ أَنْ يَكُونَ أَلْحَنَ بِحُجَّتِهِ مِنْ بَعْضٍ، وَأَقْضِيَ لَهُ عَلَى نَحْوِ مَا أَسْمَعُ، فَمَنْ قَضَيْتُ لَهُ مِنْ حَقِّ أَخِيهِ شَيْئًا فَلاَ يَأْخُذْ، فَإِنَّمَا أَقْطَعُ لَهُ قِطْعَةً مِنَ النَّارِ»[1]، واتە: منیش مرۆڤێکم وەك ئێوەو، بێگومان کێشەو گرفتەکانتان دەهێننەلای منو، جاری واهەیە، کە یەکێکتان زمان پاراوترە، لە گەیاندنی بەڵگەکانیدا لەوی تر، جامن بەگوێرەی ئەوەی دەبیستم بڕیاردەدەم، بۆیە بڕیارم بۆ هەرکەسداو شتێ لەمافی برا مسوڵمانەکەیم پێدا، و کەوتە لای، کە مافی خۆی نەبوو، بێگومان بێت کە ئەوە بەشێك لە ئاگری دۆزەخی بۆ خۆی پچڕاندووە.

ب- ئەو شتانەی کە چەسپاون، کە لەتایبەتمەندییکانی خودی پێغەمبەر (ﷺ) بوونو، گەلی ئیسلام تیایداو، لەو خەسڵەتە تایبەتیانە بەشدار نەبووە، وەك تایبەتمەندی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەیدا، کە بە بەردەوامیو بێ شکاندنی لە ڕۆژوو گرتن بەردەوام بووەو، یاخود لە چوار ژن زیاتری هێناوە، و هتد.... کە ئەم کردارانە لە تایبەتمەندی تەنهاو تەنهای ئەو زاتە بوونو، دروست نییە، تیایاندا پەیڕەوی لێ بکرێت، بۆ وێنە لەژنهێناندا، بەڵگە هاتووە، کە تەنها چوار ژن دروستە بهێنرێت، لەیەك کاتداو، لە بەردەوامی دان بەڕۆژوو گرتنو

---

[1] تیسیر الوصول إلى جامع الأصول من حدیث الرسول، ب٤، ل٥٦، و رواه البخاري،(٦٩٦٧).

نەشكاندنیشدا، نەهی هاتووە، كە نابێت گەلی ئیسلام وا بكات!

ج- ئەگەر زانرا فلان كرداری پێغەمبەر (ﷺ) ڕونكردنەوەی دەقێكی كورتو پوخت (مجمل)ی، قورئان بێت، بۆیە ئەو ڕونكردنەوەیە هەر حوكمێكی تیادا بوو، دەبێت بەسەرماندا بچەسپێتو جێ بەجێ بكرێتو، ئەو كردارەی لەم حاڵەتەدا لێوەی سەرچاوەی گرتووە، حوكمەكەی وەك حوكمێكی ئەو دەقە وایە، كە بەكردار ڕوونی كردۆتەوە لە ڕووی واجب بوونو، مەندوبیو هی ترەوە...... جا ئەو كردارەی پێغەمبەر (ﷺ) كە ڕوونكەرەوەی موجمەلی قورئانی پیرۆزە یان بە ڕاستەوخۆیی خۆی فەرموویەتی: كە ڕاڤەی قورئانە، یان نیشانەی تیادایە، كە ئەو حاڵەتە ڕاڤەی قورئانە، جا نموونە بۆ یەكەمیان، وەك فەرمودەی پێغەمبەر (ﷺ) كە دەفەرموێت: (صَلُّوا كَمَا رَأَيْتُمُونِي أُصَلِّي)، بەو جۆرە نوێژ بكەن، كەمن دەبینن دەیكەمو، هەروەها دەفەرموێت: (خُذُوا عَنِّـي مَنَاسِـكَكُمْ)، واتە: شێوەو ڕەوشتی حەجكردن لە منەوە فێربینو وەری بگرن، بۆیە نوێژكردنی پێغەمبەر (ﷺ) ڕوونكردنەوەی خودی ئەو نوێژەیە كە خوای پەروەردگار فەرمانی پێكردووە، بەو شێوازە بیكات، وەك پەروەردگار فەرموویەتی (وأقيموا الصلاة)، كە نوێژی پێغەمبەر (ﷺ) هەمان ئەو نوێژەیە، كە پەروەردگار فەرمانی پێكردووە،و بەرپاكردنی ئەو شێوەو ڕەوشەی كە لەحەجكردندا پێغەمبەر (ﷺ) ئەنجامی داوەو كردوویەتی، ڕوونكردنەوەی شێوەی هەمان ئەو حەجەیە كە خودا فەرزی كردووە، كە لە قورئاندا دەفەرموێ: ﴿وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلْبَيْتِ مَنِ ٱسْتَطَاعَ إِلَيْهِ سَبِيلًا﴾[1] واتە: هەر كەس توانای هەیە، بۆ ڕۆیشتن بۆ ماڵی خودا، با حەجكردن بەرپا بكاتو، ئەمەیش فەرمانی خودایە لەسەر موسڵمانان ئینجا سەبارەت بەو نیشانانەی كە هەنو، لە حاڵەتەكاندا ئاماژە بەوە دەكەن، كە كرداری ڕوونكەرەوەی دەقەكانی قورئانن، وەك بڕینی دەستی دز، یان فەرمانكردنی بە بڕینی دەستی دز لە جومگەدا، كە ئەم كردارەی ڕوونكردنەوەی مەبەستی ئەم ئایەتە پیرۆزەیە كە دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقْطَعُوٓا۟ أَيْدِيَهُمَا﴾[2] واتە: دەستی پیاوو ژنی دز ببڕنو، ئەمەش لەسەر ئەو ڕایەی كە پێی وایە، ئەو دەقەی قورئان سەبارەت بە بڕینی دەستی دز هاتووە، دەقێكی موجمەلو كورتو

---

١ سورة (آل عمران/ ٩٧).

٢ سورة (المائدة/ ٣٨).

پوختە، بەلام ئەوانەی کە لەفزی (ید: دەست) بەلەفزێکی ڕەها موتلەق دەزانن، ئەوە ئەم کردارەی پێغەمبەر (ﷺ) بەسنور دارکارو پێوەندکاری ئەو ئایەتە دەزانن، کە مەتلەقە، موقەیەدی دەکەن، کە ئەمەیش جۆرێکە لە جۆرەکانی ڕاڤەو ڕوونکردنەوەی قورئانی پیرۆز.

د- ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) هەر لەسەرەتاوە، و بە بێ بوونی بڕیارێکی قورئان ئەنجامی داوەو، لە ڕووی واجب بوون، یان مەندوب بوون، یان موباح بوونەوە، پێناس‌و خەسڵەتی شەرعی خۆیی وەرگرتبێت، و یەکێك لەو حوکمە شەرعییانەی هەبێت، ئەمە لەم حاڵەتەدا شەرعدانانە بۆگەلی ئیسلامو، ئەوەی بەم شێوەیە ئەنجامی داوە شەرعەو، لەسەر کەسانی موکەللەف پێویستە پێوەی پابەند بن، و هەر حوکمێکی تیادا بوو، بەسەریاندا دەچەسپێنرێت، وەك قورئان دەفەرموێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[1] واتە: پێغەمبەری خوا (ﷺ) سەر مەشق‌و نموونەی چاکەیە بۆ ئێوە).

هـ- ئەو کردەوەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) کردوویەتی‌و، صیفەتی شەرعی وەرنەگرتووە، بەلام ئەوە دەزانین، کە مەبەست لە کردنی ئەو کارە نزیك بوونەوە بووە لەخوا، وەك کردنی هەندێ پەرستش، بێ ئەوەی زۆر پابەندو بەردەوام بێت، لە سەریان، جا ئەو جۆرە کردەوەیە بۆ گەلی ئیسلام سوننەتە بیکەن، بەلام ئەگەر لە کردەوەکەدا ئەوە دەرنەکەوت‌و نەزانرا، کەمەبەستی نزیك بوونەوە بووە لە خوای گەورە، ئەوە لەم حاڵەتەیاندا، ئەو کردەوەیە بۆ گەلی ئیسلام، موباحە بیکەن، وەك کشوکاڵ کردن‌و، کڕین‌و فرۆشتنی‌و هتد....

## سێیەم: سوننەتی تەقدیری:

ئەمیش بریتیە لە بێدەنگبوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) و نکۆڵی نەکردنی لە قسەیەك یان کارێك کە لە ئامادەبوونی ئەودا کەسێك کردبێتی یان ئەو لەوێ نەبووبێت، بەلام زانیبێتی فڵان شت کراوەو، گوتراوە و نکۆڵی لێ نەکردبێت، جا ئەم بێ دەنگی‌و نکۆڵی نەکردنە بەڵگەیە لەسەر دروست‌و موباحی ئەو شتە، چونکە پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر شتی بەتاڵ و خراپ بێ دەنگ نابێت، نموونەی ئەم جۆرە سوننەتەیش وەك، بێدەنگ بوونی پێغەمبەر (ﷺ) و نکۆڵی نەکردنی لە یاری ڕمبازی منداڵان لە مزگەوتداو، هەروەها بێدەنگ بوونی لە سرودو گۆرانی وتنی دووکەنیزەك لە ڕۆژی جەژندا، کە بەدەنگێکی پڕ لە جۆش‌و خرۆش‌و پەرۆشییەوە دەیانچڕاند.

---

[1] سورة (الأحزاب/ ٢١).

هەروەها دڵخۆش بوونو، ڕازی بوونو، یان بەچاك دانانو، ئەوانەی پێغەمبەر (ﷺ) لە بەرامبەر هەر شتێکدا، وەك بێدەنگ بوونی وایە، کە بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەو کارەو، بەڵکو ئەو ڕازی بوونو، چاك دانانە زیاترو باڵاترەو، ئاشکراترە لە تەنها بێدەنگ بوونی، لە بەدروست دانانی ئەو کارەداو، لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە ئەو موباحی کارانەی کە لە بێدەنگی پێغەمبەر (ﷺ) وەرگیراون، مانای ئەوە نییە، کە ئەو کارە تەنها دروستەو بەس (جائیزە)، بەڵکو جاری وا هەیە، کە ئەو کردەوەیە بە بەڵگەیەکی تر واجبەو، بۆیە تەنها بێدەنگ بوونی پێغەمبەر (ﷺ) تەنها بەڵگەیە لەسەر موباح بوونی ئەو شتە[1]و، جاری وا هەیە، کە ئەو کارە صیفەتی (واجب) بوون، یان (مەندوب) بوون، لە بەڵگەیەکی ترەوە، وەردەگرێت.

## ١٥٦- جۆرەکانی سوننەت، لە ڕووی گەیشتنی بە ئێمە:

**سوننەت لە ڕووی گێڕانەوەیەوە، و گەیشتنی بە ئێمە، کە بە ڕشتە (سند السنة) ئامازەی پێدراوەو، دەربڕدراوە، دەبێتە سێ بەشەوە:**

- سوننەتی موتەواتیر (فرە گێڕانەوە).
- سوننەتی مەشهور (بڵاوو بەناوبانگ).
- سوننەتی ئاحاد (تاك لایەنە).

**ئەمەیش دابەشکردنی حەنەفییەکانە:**

**بەڵام لە لای جەماوەری زانایان، سوننەت دوو بەشە:**

**یەکەم: موتەواتیر.**

**دووەم: سوننەتی ئاحاد.**

بەڵام سوننەتی (مەشهور)، لەلای ئەمان بەشێکە، لە بەشەکانی سوننەتی (ئاحاد)، وەك حەنەفییەکان بە بەشێکی سەربەخۆیان داناوە[2]، جا ئێمە لێرەدا پەیڕەوی لە دابەشکردنە سێ ڕەهەندییەکە دەکەین، و هەریەکە بە پێی خۆی باس لەو سێ بەشە دەکەین:

---

[1] الأحكام، إبن حزم، ب٢، ل٦.

[2] شرح نخبة الفكر، في مصطلح اهل الأثر، للحافظ إبن حجر العسقلاني ل ٦-٧، المستصفى، ب١، ل٩١، الشوكاني، ل٤٩.

## ١٥٧- یەکەم: سوننەتی موتەواتیــر:

پێناسەکەیشی بریتییە لەو سوننەتەی کە ژمارەیەکی زۆر گێڕابێتیانەوە کە کۆکبوونی ئەو ژمارە زۆرە لەسەر درۆ مەحاڵ بێت، یان یاخود تەنانەت بەپێی کۆکبوونو ڕێکەوتنیشیان بەدەست ئەنقەست لەسەر درۆ، هەر مەحاڵ بێت، کە ئەم ژمارە زۆرەو بەم حاڵەوە، ئەو ڕیوایەتەیان کردبێت، لە ژمارەیەکی زۆری تری وەك خۆیان، تا دەگاتەوە سەر پێغەمبەر (ﷺ)،و ئەو شتەی کە ئەوان زانیارییان لەسەری هەیەو، لە پێغەمبەرەوە گێڕاویانەتەوە، دەبێت یان بە چاو دیبێتیان، یان بە گوێ بیستبێتیان[١]، بەپێی ئەم پێناسەیە، بۆمان دەردەکەوێت، کە مەرجەکانی موتەواتیر بوون بریتییە لە:

أ- دەبێت گێڕەوەرانی ئەو سوننەتە، ژمارەو کۆمەڵێکی زۆرینەو مەحاڵ بێت، لەسەر درۆ کۆببنەوەو، یاخود عادەتەن بەبێ ڕێکەوتنیشیان لەسەر درۆ دەبێت، ئەوەندە زۆربن، کە مەحاڵ بێت بە بێ مەبەستیش بکەونە درۆوە، بەڵام سەبارەت بە موتەواتیر، ژمارەیەکی دیاریکراو دانەنراوە، بەڵکو ئەوە بە موتەواتیر دادەنرێت، کە بە پێی نەریت دڵمان ئاسودە دەکات، لەسەر ئەوەی کە ئەو گێڕەرەوانە ڕاستگۆن، و ئەو ژمارە زۆرە مەحاڵە لەسەر ناڕاستی کۆببنەوە، ئەمەیش یان لەبەر ئەوەی کە زۆرن،و، یان لەبەر ئەوەیە کە خەڵکانێکی زۆر پیاو چاکو بەدینن،و، هتد..... هەروەها بۆ موتەواتیر بوون، ئەوەیش بەمەرج نەگیراوە، کە سەرجەمی خەڵکی ئەو شتە بەڕاست دابنێن،و، بەڵکو یاساو ڕێسای موتەواتیر بوون ئەوەیە کە زانیاری بەپێی پێویست بدات بەدەستەوەو، هەرکات ئەم زانیارییە پێویستە هاتە دی، ئەوا دەزانین کە ئەم گێڕانەوەیە موتەواتیرەو، ئەگەر وانەبوو، ئیتر موتەواتیر نییە.

ب- دەبێت ئەو گێڕەرەوانە لەسەر جەم چینەکانی گێڕانەوەکەدا ئەو خەسڵەتانەیان تیادابێت، کە لەسەر مەرجی یەکەمدا باسمان کردن.

ج- دەبێت ئەو زانیارییەی کە گێڕەرەوەکان دەیدەن، لە ڕێی بینین، یان بیستن دەستیان کەوتبێت، و ئەم مەرجەیش دوو پرسی بەشوێندا دێت:

یەکەم: ئەگەر گێڕەرەوەکان زانیارییان نەبوو، لەسەر ئەو شتەی کە هەواڵیان لەسەر داوە، بۆ نموونە گومانیان هەبوو، ئەوا مەرجەکە نایەتەدی، و دواجار گێڕانەوەکە بە موتەواتیر نایەتە ئەژمار.

---

[١] العقیلاني، ل ٣-٤، الشوكاني، ل٤٦، المستصفى، ب١، ل٩٠.

دووەم: ئەگەر گێڕەرەوەکان ئەو زانیارییانەی دەیاندا، لە ڕووی عەقڵیەوە وابوو، نەك لە ڕووی هەست پێکردنەوە، دیسان موتەواتیر بوون، نایەتەدی .

جا کە مەرجەکانی موتەواتیر هاتنەدی، ئیتر ئەو هەواڵە دڵ دامەزرێنەرە (یقین)یە، و زانیاری پێویست دەدات بەدەستەوە واتە: (العلم الضروري)، و ئەم عیلمە ضەرورییەیش بریتییە لەو زانینەی کە لەخودی مرۆڤدا هەیە و لە گەڵیدایە، و ناتوانێت لە خوی دوربخاتەوە، یان خۆی لێی بێ ئاگا بکات[1]، چونکە ئەو شتەی بەموتەواتیر بوون جێگیر دەبێت، وەك ئەو شتە وایە کە بە چاوی خۆتو بەبینین ببینی جێگیر ببێت[2].

لەم ڕوانگەیەوە، سوننەتی موتەواتیر، بە بێگومان و بە یەکلایی ئەوەی هەیە کە تەواو ڕاستە کە دراوەتە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ)و بۆیە بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی ئەحکامو، سەرچاوەی یاساداناو بە شەرع کردنی ئەحکامەکانە، ئەمەیش بە بێ هیچ ڕاجیاییەك لە نێوان مسوڵماناندا[3].

## ١٥٨- جۆرەکانی سوننەتی موتەواتیـر :

سـوننەتی موتەواتیـر، یـان گوفتارییـەو، یـان کردارییـە، و گوفتارییەکـەی کەمـە، و کردارییەکەی زیاترو زۆرە، و زۆر بەکورتی لەسەر هەردووکیان قسە دەکەین:

**سوننەتی موتەواتیری گوفتاری، ئەمەیش دوو جۆرە، لەفزیو مەعنەوی.**

- **موتەواتیری لەفزی:** ئەوەیە کە بەلەفز و دەربڕین بە موتەواتیری گێڕدراوەتەوە، وەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) کەدەفەرموێت: (مَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ)، واتە: هەر کەس بەتایبەتیو بەدەستی ئەنقەست درۆم بەدەمەوە دروست بکات، با جێگای خۆی لە ئاگردا دیاری بکات.

- **موتەواتیری مەعنەوی:** بریتییە لەو موتەواتیرەی کە لە ڕێگا جیاوازەکانی گێڕانەوەیدا مانایەکی هاوبەشی هەیە، بەڵام بە لەفزو دەربڕین جیاوازە، واتە: لەفزی

---

[1] قواعد التحديث، للقاسمي، ل ١٢٨، العسقلاني ل٤، المسودة، ل٢٣٣.

[2] أصول السرخسي، ب١، ل٢٩١.

[3] الأحكام في اصول الأحكام، لأبن حزم الأندلسي ب١، ل١٠٤، القاسمي، ل ١٢٨.

گێڕەرەوەکان جیاوازن، بەڵام لەسەرجەم گێڕانەوەکاندا یەك مەبەستی هاوبەشەو مانای هاوبەش دەفامرێتەوەو، لەم جۆرەدا بەمەرج نەگیراوە، کە دەبێت ئەو کەسانەی لەسەرجەم گێڕانەوەکاندا هەنو هەر چەندە هەن، هەریەکەو بەپێی خۆی، گەیشتبنە پلەی موتەواتیر بوون، بەڵام لە مانا هاوبەشەکەدا دەبێت، هەموویان موتەواتیر بن، لە ڕوانگەی سەرجەمی گێڕانەوەکانەوە، نموونەی ئەم جۆرەیش وەك ئەوەی کە بنەمای کارەکانیان، نیەتەو کاتێك کار حسابی بۆ دەکرێت، کە نیەتی لەگەڵ دا بێت، جا ئەم مانایە بە موتەواتیری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕدراوەتەوە، چونکە فەرموودەی زۆر لەم بارەیەوە هەن، کە گەیشتوونەتە پلەی موتەواتیر بوونو، هەمان ئەم مانایە دەگەیەنن، هەرچەندە هەر گێڕانەوەیەك بەتەنها خۆیو لە خودی خۆیدا نەگەیشتووەتە پلەی موتەواتیر، بەڵام سەرجەم گێڕانەوەکان پێکەوە گەیشتوونەتە ئەو پلەیەو، ئەم ژمارە فەرموودەیەی خوارەوە، لە نمونەی ئەم جۆرە فەرموودەن کە باسمان کرد، وەك ئەوەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إِنَّمَا الأعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)، واتە: هەموو کردەوەیەك بەنیەتو نیازەو، بێگومان هەموو مرۆڤێکیش لە کارەکانیدا نیازی لە دەرونیدا حەشاردراوە، و بە گوێرەی ئەو نیازە، حساب بۆ کارەکەی دەکرێتو، هەروەها دەفەرموێت: (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللّهِ هِيَ العُلْيَا، فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللّهِ)، واتە هەرکەس بەو نیەتە شەڕ بکات تا بەرنامەی خوا باڵا بێت، ئەمە کاری پوختو خاڵس بۆ خودایەو، لە ڕێگای خودایەو، هەروەها دەفەرموێت: (رُبَّ قَتِيلٍ بَيْنَ الصَّفَّيْنِ، اللهُ أعْلَمُ بِنِيَّتِهِ)، واتە: کەسانێ هەن کە لەشەڕی کافراندا دەکوژرێنو، لە ڕیزی مسوڵمانانداندان، و خودا بەنیەتیان ئاگادارە، کە مەبەست لەو کارەی چی بووە؟ بۆ خودا بووە، یان بۆ نازناوی دنیاییو شتی تر! و چەندەها فەرموودەی فراوانو زۆری تر، کە دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، کە کارو کردەوە بەستراوەتەوە بە نیەتەوەو، ئەم مانایەش بە موتەواتیری لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بە چەندەها گێڕانەوەی جیا جیا بۆ ئێمە گێڕدراوەتەوە، چونکە گێڕانەوەی زۆر هەن، کە هەموو ئەو مانایە دەگەیەننو، هەرچەندی لەفزەکانیان جودانو، لە بۆنەی جیاوازیشدا گوتراونو، دەر بڕدراون[1].

---

[1] التعريف بالقرآن والحديث، للشيخ الزفزاف، ل ٢٤٠-٢٤١، والقاسمي، ل ١٢٨-١٢٩.

## ١٥٩- دووەم: سوننەتی مەشهور:

سوننەتی بڵاوو زانراو (المشهور)، ئەوەیە کە کەسێك یان دووکەس، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بیگێڕنەوە، واتە ژمارەیان نەگاتە ئاستی موتەواتیر بوونو، پاشان لەسەر دەستی تابعیندا بگاتە پلەی موتەواتیریو، یاخود لەسەر دەمی تابیعی تابعیندا بگات بە جۆرێك گێڕەرەوەکانی هێندە زۆربن، مەحاڵ بێت، کە لەسەر درۆ کۆ ببنەوە یان ڕێك بکەون[١]، کەواتە سوننەتی مەشهور ئەوەیە کە لە بنەمادا سەر بەسوننەتی ئاحادە، واتە ژمارەیەك کەس کە نەگەیشتونەتە پلەی موتەواتیری گێڕاویانەتەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ)و، دواتر لە سەدەی دووەمو سێیەمی کۆچیدا فەرموودەکە بڵاو بۆتەوەو، بووەتە موتەواتیر، کە ئەو دوو سەدەیەش، سەردەمی تابعییەکانو، تابعی تابعیەکان دەگرێتەوە[٢]، لەم پێناسەیەوە بەڕوونی ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە سوننەتی مەشهور، لەو ڕووەوە کە دروستی دانە پاڵ پێغەمبەر (ﷺ) یەکلا نەبۆتەوەو، (قاطع) نییەو یەقین نادات بەدەستەوەو بەڵکو لەو ڕووەوە یەکلاییە کە درانە پاڵ گێڕەرەوەکەی دروستەو یەکلاییە و یەقینییە، و بۆیە حەنەفییەکان لە بارەی مەشهورەوە ڕایان وایە کە ظەننی بەهێز دەدات بەدەستەوەو ئەو ظەننە وەك یەقین وایە، و سوکنایی بەدڵو دەروون دەداتو، لەو ڕووەوە کە تەواوەو، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) هاتووەو ئەمەیش کە بە (علم الطمأنينة) ناوزەد کراوەو، ئەم سوننەتەو فەرموودەیە لەلای حەنەفیەکان لە ڕووی پابەند بوونو کارپێکردنییەوە، وەك موتەواتیر وایەو، بەسەرچاوەی شەرعدانانیان داناوەو، بە بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی ئەحکام حسابیان کردووەو، ئەم فەرموودانەی خوارەوە، نموونەی ئەم جۆرەی فەرموودەی مەشهورن، کە دەفەرموێت: (إِنَّمَا الأَعْمَالُ بِالنِّيَّاتِ، وَإِنَّمَا لِكُلِّ امْرِئٍ مَا نَوَى)، و هەروەها فەرموودەی (تحريم نكاح المرءة على عمتها أو على خالتها)، واتە: حەرامە ژنێ لە یەك کاتدا لەگەڵ پوری باوکی، یان پوری دایکی خۆی پێکەوە ژنی یەك کەس بن[٣].

---

[١] مسلم الثبوت، ب٢، ل١١١، وحاشية الأزميري ، ب٢، ل١٩٦.

[٢] سەردەمی تابعین، ئەو سەردەمەیە کە لەدوای سەردەمی هاوەڵانی پێغەمبەر (ﷺ) دێتو، سەردەمی تابعی تابعین ئەو سەردەمەیە کە لە دوای سەردەمی تابعین (شوێنکەوتوان) دێت، و لە دوای ئەم سێ سەردەمە، ئیتر مەشهور بوونو، موتەواتیر بوون، هیچ بایەخێکی نییە، چونکە لەم سێ سەردەمە بەدواوە، ئیتر فەرموودە نوسرابویەوەو بڵاو بوویەوەو، تەواوی خەڵکی لە خەڵکی تر وەریان دەگرت.

[٣] أصول السرخسي، ل ٣٩٢.

## ١٦٠- سوننەتی ئاحاد:

بریتییە لەو فەرموودەو سوننەت گەلەی کە ژمارەیەك گێڕەرەوە لەسەر دەمی تابعیندا، یان لەسەردەمی تابعی تابعیندا، لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) دەیگێڕنەوە، کە ژمارەیان نەگاتە ژمارەیەکی موتەواتیرو، بەپێی تێڕوانینی حەنەفیەکان، ئەم جۆرە سوننەتە، نەموتەواتیرەو، نەمەشهورەو لەسەر ڕای زانایانی تر، ئاحاد ئەوەیە، کە لەغەیری موتەواتیر بێت، ئیتر هەمووی ئاحادە[1]و، لەلای جەماوەری زانایان، ئاحاد ئەو سوننەتەیە، کە لە ڕووی دروستی دانە پاڵی بۆلای پێغەمبەر (ﷺ) ظەنێکی ڕاسترو، لە پێشتر دەگەیەنێت، واتە (الظن الراجح)ی، لێ دەفامرێتەوەو، ناگاتە پلەی یەقینو، لەلای ظاهیریەکانو لە هەندێ لە ئەهلی فەرموودە ڕایان وایە، کە سودی (علم: زانیاری بوون)ی هەیە، نەك گومان (ظن)، بەڵام ئایا ئەم جۆرە سوننەتە، دەبێتە بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی ئەحکام، تا واجب بێت، کاری پێ بکرێت، یان نا........؟ و ئەگەر بڵێین واجبە کاری پێ ناکرێت! ئایا مەرجەکانی ئەم کارپێکردنە چین؟ جا لەم خوارەوە وەڵامی ئەم پرسانە دەدەینەوە[2]:

## ١٦١- واجبە پەیڕەوی لە سوننەتی ئاحاد بکەینو، سەرچاوەی شەرعدانانیشە:

ڕاجیایی لە نێوان موسڵماناندا نییە، لەوەیدا کە بێگومان سوننەتی ئاحاد بەڵگەیە بەسەر موسڵمانانەوە، لە ڕووی کار پێکردنو، پابەند بوون بە حوکمەکانییەوەو، دەبێت وەك یەکێك لە بەڵگەکانی ئەحکام تەماشای بکەینو، بەڵگەی ئەم قسەیەشمان لە چەند ڕوویەکەوەیە، کە ئەم ڕووانەی خوارەوەی لێ باس دەکەین:

١- خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَوْلَا نَفَرَ مِن كُلِّ فِرْقَةٍ مِّنْهُمْ طَآئِفَةٌ لِّيَتَفَقَّهُوا۟ فِى ٱلدِّينِ وَلِيُنذِرُوا۟ قَوْمَهُمْ إِذَا رَجَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ لَعَلَّهُمْ يَحْذَرُونَ﴾[3]، واتە: با لەجیاتی ئەوەی کە هەموو بچنە دەرێ، لەناو هەموو دەستەیەك چەند کەسێکیان بچنە دەرێ، بۆ ئەوەی لە کارو باری ئایندا شارەزاو ئاگادار بنو کە لە گۆڕەپانی جیهادیش گەڕانەوە، ناو خێڵی خۆیان،

---

[1] مسلم الثبوت، ب٢، ل١١١.

[2] أصول السرخسي، ب١، ل٣٢١، الأحكام، إبن حزم، ب١، ل١٠٨، ودواتر، و محاضرات في أصول الفقه الجعفري، للشيخ محمد ابو زهرة، ل ١٣٠و دواتر، الشوكاني، ل٤٩، والمستصفى، ب١، ل٩٣، العسقلاني، ل٨-٩، مسلم الثبوت، ب٢، ل١٣٢، الأمدي ب٢، ل٤٧و دواتر.

[3] سورة (التوبة/ ١٢٢).

بیان ترسێننو هۆشداریان بکەنەوە، بەڵکو لە نافەرمانی خودا خۆیان بەدوور بگرن.

لەم ئایەتە پیرۆزەدا، ووشەی (الطائفة) بۆ تەنها کەسێکیش بەکار دەهێنرێت، جا ئەگەر قسەو هەواڵی تاکە کەسێ، لە کار پێکردندا بەڵگەی نەبێت، ئیتر بێدارکردنەوەی کەسێك، خەریکی بەدەسهێنانی زانیاری ئاینییە، سودی نابێت!

٢- بەشێوەیەکی موتەواتیر ئەوە لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ ئێمە باسکراوە، کە پێشەوا(ﷺ) ئەمیر و قازیو نێردراو پەیامنێرانی خۆی دەنارده هەموو جێگایەکی ئەم سەرزەمینەی ئیسلامو، بەتەنهایش دەیناردن، و ژمارەیان لە رێژەی (ئاحاد) تێپەڕی نەدەکردو، ناردنیشیان بە مەبەستی وەرگرتنی زەکاتو خێرو پەیمانو بەستنی گرێبەستەکان و هەموارکردنیان بوو، و لە پێناو بانگەوازی ئیسلامیو گەیاندنی ئەحکامەکانی شەرع بوو، و پێغەمبەریش (ﷺ)، خەڵکانی ئەو دەوروبەرانەی پابەند دەکرد، بەوەوە کە دەبێت ملکەچی فەرمانو قسەی ئەو نێردراوانە بنو ئەگەر خەبەری ئاحاد بەڵگەیە نەبوایە، فەرمانی لەو شێوەیەی پێ نەدەکردن؟

٣- بەپێی کۆڕای زانایان، تەواوی خەڵکی فەرمانیان پێکراوە، کە دەبێت پابەندی بڕیارەکانی موفتی بنو، بڕوای پێ بکەن، لەگەڵ ئەوەیشدا کە جاری واهەیە، بە گومانی خۆی بڕیار دەردەکات، بۆیە کەسێك کە هەواڵ لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) بۆ ئێمە دەگوێزێتەوە، کە خۆی بیستویەتیو، گومانی تیادا نییە، ئەمەیان لە پێشترە، لە رووی بڕواپێکردنو، وەرگرتنیو، کار کردن بەپێی ئەو خەبەرە، تا ئەوەی سەرەوە.

٤- ئێمە فەرمانمان پێکراوە، کە بە شایەتیدانی دووکەس بڕیار بدەین، لەگەڵ ئەوەیشدا بۆی هەیە، شایەتی ئەو دووانەیش درۆ بێت، جا ئەگەر کار کردن بەو دوو شایەتیە دروست نەبوایە، تا گومانی درۆکردنیان بڕەوایەتەوە، بە تەواوی (قاطع) ئەو کارەمان پێ نەدەکرد، جا کەواجب بوو، کار بەو شایەتییانە بکەین، لە کاتێکدا کە بۆی هەیە درۆیش بێت، هەر لەبەر ئەمەیشە کە کارکردن بە سوننەتی ئاحادو گێڕانەوەی لە پێغەمبەر (ﷺ) لە پێشترە.

٥- کۆڕا (إجماع)ـی، هاوەڵان لەسەر پێشهاتەکان لە ژمارە بەدەرە، کە خەبەری ئاحادیان وەرگرتووەو، کاریان پێکردووە، بۆ نموونە پێشەوا ئەبو بکر (خوا لێی ڕازی بێت) شەش یەکی لە میرات داوە، بەداپیرە، چونکە فەرموودەی ئاحادی لەسەرەو، پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێی ڕازی بێت) هەر لە بەر هەمان شت، لە خوێنی پیاو، وەك میرات بەشی ژنەکەی داوەو، مزە (جزیـة)ی، لە ئاگر پەرستەکان وەرگرتووە، چونکە

فەرموودەی ئاحادی لەسەرەو، هەروەها هاوەڵی زۆری تر هەن، کە فەرموودەی ئاحادیان گەیشبێتەلا، هەر وایان کردووە.

## ١٦٢- مەرجەکانی کارکردن بە فەرموودەی ئاحاد:

سەرجەمی موسڵمانان کۆکن لەسەر ئەوەی کە سوننەتی ئاحاد بەڵگەیەو، لەسەر گشت لایەك پێویستە کە وەك بەڵگە بیناسنو، پێوەی پابەندبنو، هەروەها لەسەرچاوەکانی شەرعدانانە، بەڵام سەبارەت بەمەرجەکانی ڕاجیاییان هەیە، واتە: لە شەرتەکانی کار پێکردنیو دەرهێنانی حوکمەکان لێیەوەو، دەکرێت لەدوو گفتدا بەر پەرچی ڕاجیاییەکانیان بدەینەوە:

١٦٣- **گفتی یەکەم**: ئەو فەرموودەیەی کە گێڕەرەوەی ڕاستاڵ (عادل)و متمانەدار (ثقة) دەیگێڕنەوە، بە جۆرێك لە کەسە گێڕەرەوەکەدا مەرجەکانی وەرگرتنی فەرموودەکە هاتبنەدی، ئەو مەرجانەی کە توێژەرانی ئەم گفتە دایاننـاونو بە مەرجیان گرتوون، هەرچەندە لە مەرجەکانیشدا ڕاجیاییان هەیەو، دەبێت ڕشتە (سند)ـی، گێڕانەوەکەی بێ پچڕان ڕۆشتبێتەوە سەر پێغەمبەری خوا (ﷺ)، لەم حاڵەتەدا کارکردن بەم فەرموودەو دەرهێنانی حوکم لێیەوە پێویستەو، هەروەها بەسەرچاوەی شەرعدانان دەژمێردرێتو، ئەمەش گفتو ڕای حەنبەلیو شافعیو ظاهریو جەعفەرییەکانەو، هەروەها هەندێ لە شەرعزانانی مەزهەبەکانی تریش دەریان بڕیوە.

بەڵام ئەگەر سەنەدەکە پچڕاو بوو، و لە زنجیرەی گێرەرەوەی هاوەڵەکاندا (خوا لێیان ڕازی بێت)، گێڕەرەوەی نادیار هەبوو، کە فەرموودەکەیان لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) گێڕاوەتەوە، کەس هەبوو کە پچڕابوو، کە ئەمەیشە بە فەرموودەی (مورسەل) ناوزەد کراوە، ئەوا لەم حاڵەتەدا خاوەنانی ئەم ڕایە ڕاجیاییان هەیە، سەبارەت بەئاستی واجبی عەمەلکردن بەم جۆرە فەرموودەیەی، کە ئەم گرفتەی هەبێت.

جا لە لای ظاهیرییەکان، بە بەڵگە نایەتە ئەژمارو، واجبیش نییە کە کاری پێ بکرێتو، لە مەزهەبی شافعیدا، وەردەگیرێت، بەڵام بەمەرج، لەو مەرجانە ئەوەیە کە دەبێت، با مورسەلیش بێت، بەڵام دەبێت، لە مورسەلی شوێنکەوتە مەزنەکان (کبار التابعين) بێت، وەك، سەعیدی کوڕی موسەییب، (خوا لێی ڕازی بێت)و، یاخود لەلایەکی ترەوە سەنەدی تری هەبێتو، یاخود هاوڕای فەرمایشتی هاوەڵێ لە هاوەڵان بێت، (خوا لێیان ڕازی بێت) و

یاخود زۆرینەی زانایان بە پێی ناوەڕۆکەکەی فەتوایان دابێت، و مەزهەبی حەنبەلی لەم بارەیەوە وایە، کە وەردەگیرێت و کار بەو مورسەلە دەکرێت ئەگەر لەو بوارەدا فەرموودەیەکی ڕشتە پەیوەست (متصل السند) نەبوو[1].

١٦٤- **گفتی دووەم:** بێژەرانی ئەم ڕایە، تەنها بەوەندە ڕازی نەبوون، کە دەبێت گێڕەرەوەکان ڕاستاڵ و متمانەدار بن، و بەڵکو مەرجی تریان هەن، کە پەیوەندییان نییە، بە سەنەدی گێڕانەوەکەوە، و بەڵکو پەیوەستە بەشتی ترەوە، تابەم هۆیەوە ئاستی دروستی فەرمودەو، ئاستی گەیشتنەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) یەکلایی ببێتەوە، و مالکییەکان و حەنەفییەکان ئەم ڕایەیان دەربڕیوەو، لە خوارەوە بەکورتی، گرنگترین مەرجەکانیان باس دەکەین.

**١٦٥- مەرجە مالکییەکان، بۆ وەرگرتنی سوننەتی ئاحاد:**

مالکییەکان سەبارەت بە وەرگرتنی سوننەتی ئاحاد، ئەمەیان بە مەرج گرتووە، کە دەبێت، پێچەوانە نەبێت، لەگەڵ کردەوەی خەڵکی شاری مەدینەداو، بەڵگەیشیان ئەوەیە کە کارو کردەوەی خەڵکی مەدینە وەك سوننەتی موتەواتیر وایەو، لە پلەی ئەودایە چونکە کردەوەیان لە خەڵکانی پێش خۆیانەوەو لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) وەرگرتووەو، بۆیە کارو کردەوەیان وەك ڕیوایەت و گێڕانەوە وایەو، لە پلەی سوننەتی موتەواتیر دایە، و موتەواتیریش لە سوننەتی ئاحاد لە پێشترەو، لەسەر ئەم بنەمایە ئیمامی مالیك ئەم فەرموودەیەی وەرنەگرتووە، کە دەفەرموێت! (البَيِّعَانِ بِالخِيَارِ مَا لَمْ يَتَفَرَّقَا)، واتە: کڕیارو فرۆشیار تا لەیەکتری جیانەبنەوەو دوور نەکەونەوە، مافی پەشیمان بوونەوەیان لەو مامەڵەیە هەیە.

جا ئیمامی مالیك سەبارەت بەم فەرموودەیە دەفەرموێت: (ئێمە سەبارەت بەم فەرمودەیە، ناسینێکی ئەوتۆمان نییە، و هەروەها نەمانزانیوە، کە ڕەوشی کارکردن پێی لە ئارادا هەبوو بێت).

هەروەها بەمەرجیان گرتووە، کە دەبێت فەرموودەی ئاحاد پێچەوانەی بنەما جێگیرو یاسا ڕەچاو کراوەکانی شەریعەت نەبێت و، لەسەر ئەم بنەمایە ئەو فەرموودەیەی کە دەربارەی (المصراة: هێشتنەوەی شیر لەگوانی مەڕو مالات)دا، وەریان نەگرتووە. کە دەفەرموێت: (لاَ تُصَرُّوا الإِبِلَ وَالغَنَمَ، فَمَنِ ابْتَاعَهَا بَعْدُ فَإِنَّهُ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ بَعْدَ أَنْ يَحْتَلِبَهَا: إِنْ

[1] القاسمي، ل١١٥-١٢٠، المستصفى، ب١، ل١٤٩-١٧١، الأحكام، لأبن حزم، ب١، ل١٠٨و دواتر،و ب٢، ل٢و دواتر.

شَاءَ أَمْسَكَ، وَإِنْ شَاءَ رَدَّهَا وَصَاعَ تَمْرٍ)، واتـه: گـوتنی حوشـترو مـەڕ مەبەسـتن، ئـەو کاتـه کەسی کڕیار، که شیرەکه بەکار دێنیّ، له نێوان دوو بژاردەدایـه، یـان ڕازی دەبـیّو، قـەبوڵی دەکاتو، یان ڕەتی دەکاتەوەو، دەبیّ ئاژەڵەکه بگێڕێتەوه لەگەڵ (صاعێك) لـه خورمـا، جـا بۆیه کاریـان بـەم فەرموودەیـه نـەکردووه، چـونکه ئـەم فەرموودەیـه، بـه تێڕوانینـی ئـەوان پێچەوانەی ئەم یاسا بنەماییه که دەڵێت: (الخراج بالضمان) واته:ئـەو سـودەی لـه فرۆشـیار بەدی دێت، مافی کڕیارە، چونکه ئەگەر لەناوچوو ئـەم (ضـامن) یـەتی، و دەسـتەبەریەتیو، ئەبیّ بیبژێریّو، هەروەها پێچەوانەی ئەم بنەمایـه کـه دەڵێـت: (إن متلـف الـشيئ إنمـا يغـرم مثله إن كان مثلياً، و قيمته إن كان قيمياً) واته: ئەگەر کەسێك شتێکی لەناو برد، یان خراپی کـردو، ئـەو شـته وێنـەی خـۆیی هـەبوو، ئـەوا بـەو هـاو وێنەیـه قـەرەبووی دەکاتـەوه بـۆ خاوەنەکەیو، ئەگەر هاو وێنەی نەبووو، نرخی لەسەر بوو، ئەوا بـایی نرخەکـەی قـەرەبووی دەکاتەوە، بۆیه لـه کـاتی لـه نـاوبردنی شـتێکدا کـه هـاو وێنـەی هـەبوو، شـتێکی تـری وەك خواردنو کاڵای له جیاتی قـەرەبوو، نادرێتـەوه هـەروەها مالیکیـەکان ئـەو فەرموودەیـەیان ڕەتکردۆتەوە، که تیایدا هاتووە، که پێغەمبەری خوا (ﷺ) لـه پێـشهاتێکدا فـەرمانی کـرد، که ئەو تیانەو کەلو پەلانـەی کـه لـەپێش دابەشـکردنی دەسـکەوتەکانی جەنگـەوه گۆشـتی وشترو مەڕە دەسکەوتەکانیان تیادا سورکردبوویەوە، سەرەو نخونیـان بکەنـەوەو، بیانێرنـه سـەرزەوی، ئەمـەیش لـه ڕوانگـەی ئـەوەوە ڕەتیـان کردۆتـەوە، کـه پێـچەوانەی ئـەو یاسـا بنەماییەیه که دەڵێت: دەبێت سەختیو ناڕەحەتی وەلا بنرێتو، بەرژەوەنـدی (مەصـالیحی مورسەله) ڕەچاو بکرێتو، جا بۆیه ئەوەندە بەس بوو که پێغەمبەری خوا (ﷺ) بفەرموێت: ئەو کارەی ئێوە کردوتانـه دروسـت نییـەو، دواتـر مۆڵـەتیان بـدات، کـه خواردنەکـه بخـۆن[1]، چـونکه لـەناو بردنـی خـواردنی ئامـادەکراوو سـوورەوەکراو پێـچەوانەی بەرژەوەندییـەو،

[1] ئەمه پوختەی فەرموودەکەیه که له صـەحیحی بوخاریـدا هـاتووه، کـه پوختەکـەی ئەمەیـه، کـه لـه ڕافیعی کوڕی خەدیجەوە گێڕدراوەتەوە، که فەرمویەتی، لـه (ذي الحليفه) لـه خزمـەتی پێغەمبـەرا (ﷺ) بووین، تووشی برسێتی بوو بوینو، دواتر وشـترو مـەڕێکی زۆرمـان لـه جەنگدا دەسـکەوت، جـا پێغەمبـەر (ﷺ) لەدوای خەڵکەکەوە بوو، خەڵکەکه پەلەیان کردو، لێیان سەربڕیو دیزەو تیانەیان خسته سەرئاگر، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کرد دیزەکان سەرەونخوون کرانەوەو، دواتر دەسـکەوتەکەی بـەش کـرد، دە مەڕی بەرابەر به وشتریّ کرد، وشتریّ یاخی بوو، لەناو لەشـکرەکەدا ئەسـپ سـوار کـەم بـوو، بـه شـوێنیدا چوون، ماندووی کردن، نەیانگرت، پیاویّ تیرێکی بۆ هاویشت، خوا بـەو تـیرە وەسـتانی، پێغەمبـەر (ﷺ) فەرمووی: ئەم ئاژەڵانه سەرکێشو وەحشییان تێدایه، وەك ئاژەڵی وەحشی هەرکامێکیان لێتان یاخی بێن، وەهای لیّ بکەن! وەرگێڕ

ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر نادروستی ئەو هەواڵە[1].

## ١٦٥- مەرجی حەنەفییەکان، بۆ وەرگرتنی سوننەتی ئاحاد:

أ- نابێت ئەو سوننەتە پەیوەندیدار بێت، بەو شتانەی کە زۆر ڕوو دەدەن، چونکە ئەوەی کە لەم شێوەیەو، زۆر ڕوودەدات، بێگومان پێویستە کە لە ڕێی تەواتور و مەشهور بوونەوە بگوێزرێتەوە، چونکە ڕێو شوێنەکانی گواستنەوەو گێڕانەوەی سازن‌و زۆرن، جا ئەگەر بەم شێوازە نەگێڕدرایەوە، ئەم بەڵگەیە لەسەر نادروستی ئەو فەرموودەیەو، نموونەیش وەك: (رفع اليدين في الصلاة: واتە: بەرزکردنەوەی دەستەکان لەدوای ڕکوعو، لە نوێژدا)، کە ئەم گێڕانەوەیە لە ڕێگای (ئاحاد)ـەوە، هاتووەو بە بەڵگەی ئەوەی کە ڕۆژانە نوێژ دووبارە دەکرێتەوە، کردنی ئەم کارە ڕەهایەو گشتییەو زۆرەو، زۆر ڕوودەدات، بۆیە فەرموودەکە وەر ناگیرێت.

ب- نابێت ئەو سوننەتە، پێچەوانەی قیاسێکی دروست (صحيح) یان بنەماو ڕێسا چەسپاوەکانی شەریعەت بێتو، ئەم مەرجەیش بۆ کاتێکە کە گێڕەوەکە شەرعزان نەبوو، چونکە لەم حاڵەتەدا، فەرموودەکە بەمانا نەك لەفز دەگێڕێتەوە،- کە ئەم حاڵەتەیش زۆر ڕوودەدات- جا شت گەلێکی لە مانای فەرموودەکە لە بیردەچێتو، لەدەستی دەدات کە بەهزر پەی پێ نەبردووەو، بۆیە لەم حاڵەتەدا ئامادەکاری پێویستی دەبێت هەبێتو، هەر فەرموودەیەك لەم حاڵەتەدا پێچەوانەی بنەما گشتییەکان‌و قیاسی صەحیح بوو، نابێت، وەری بگرێتو، لەسەر ئەم بنەمایە، کە مالکییەکان کاریان بە فەرموودەکەی (المصراة) کە باسمان کرد، نەکردووە، چونکە گێڕەرەوەی فەرموودەکە، کە (ئەبو هورەیرە)یە، لەلای مالیکییەکان کەسێکی شەرعزان نییەو، هەروەها ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی بنەماو یاسا چەسپاوەکانە، وەك یاسای (الخراج بالضمان) کە لە سوننەتدا هاتووەو، پێشتر مانامان کردو، ئەم ڕێسایە فەرمان بەوە دەکات، کە ئەو شیرەی لە ئاژەڵە کڕدراوەکەدا هەیە، لە کاتی مامەڵەکەدا هی کڕیارە، چونکە لەو کاتەدا ئەگەر ئەو ئاژەڵە بمرێتو، مردار ببێتەوە، لەگەردنی کڕیارەکەدایە، بۆیە ئەو دەرهاویشتەو سودەیش هەر بۆ ئەو دەبێت، کەواتە لەکاتی مردارەوەبووندا لەسەر کێ ماڵە، ئەو بەرهەمەیش لەو کاتەدا هی ئەوەیە، هەر وەك

---

[1] الموافقات، ب٣، ل٢١-٢٢، (مالك) للشيخ محمد أبو زهرة، ل٣٠١-١٣١، دواتر.

زانرا کە ئەو فەرموودەیە پێچەوانەی ئەو یاسای لە ئەستۆ بوون (ضمان)ـەیە، کە دەڵێت: ئەگەر موڵك‌و ماڵە خراپ بووەکە هاوێنەی هەبوو، دەبێت بەهەمان شتی هاو وێنەی خۆی ببژێردرێت[1]!

ج- نابێت گێڕەرەوە پێچەوانەی ئەو فەرموودەیەی کە گێڕاویەتییەوە کار بکات، چونکە کارکردنەکەی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە (نەسخ) بۆتەوەو، هەڵوەشاوەتەوە، یاخود بەهۆی بوونی بەڵگەیەکی ترەوە، کاری بەمیان نەکردووەو، یاخود لەبەر ئەوەیە، کە ئەم گێڕانەوەیەی ئەم ئەو مانایەی نییە، کە لە ڕوخساردا هەیەتی‌و، مانای تری تیادا حەشار دراوەو، نموونەیشیان بۆ ئەم قسەیە یان، وەك ئەم فەرموودەیە: (إذا وَلَغَ الكلب في إناء أحدكم، فاغسلوه سبعاً، إحداهن بالتراب) واتە: ئەگەر سەگ دەمی خستە ناو قاپ‌و قاچاغتانەوە، حەوت جار بیشۆن‌و، جارێ لەو حەوت جارە بابە قوڕاو بشوردرێت، کار بەم فەرمودەیە نەکراوە، چونکە گێڕەرەوەکەی، هەر سەگێ دەمی خستبێتە قاپ‌و قاچاغەکانییەوە، سێ جار شۆردونی!

## ١٦٦- ڕای لە پێشتر (الراجح) لەم پرسەدا:

لەگەڵ ئەوەیدا کە قبوڵمانە، حەنەفی‌و مالکییەکان بۆیە ئەو مەرجانەیان داناوە، تا دڵنیابن، لەسەر صەحیحی فەرموودەکەو صەحیحی گەیشتنەوەی بە پێغەمبەر (ﷺ) و، ئەم ڕایەیان ڕاستەوخۆ بایی خۆی پێشڕەوایەتی هەیەو (مرجوح)ـە، بەڵام ڕای گروپەکانی تر لە پێشترەو، (راجح)ـە، چونکە فەرمووده هەرکات گێڕانەوەکەی دروست بوو،و کەسانێکی ڕاستاڵ‌و خاوەن متمانەو، خاوەن بیر (ضابط) گێڕابوویانەوە، ئیتر پێویستە وەربگیرێت‌و پەیڕەوی لێوە بکرێت، حوکمی لێوە هەڵبهێنجرێت‌و، ئیتر چونیەکە کۆك‌و هاوڕای کاروکردەوەی خەڵکی شاری مەدینە بێت، یان نا..... و هەروەها چونیەکە لە گەڵ بنەما چەسپاوەکاندا کۆك بێت، یان نا.... ویاخود لەگەڵ داواکاری‌و دەرهاویشتەکانی قیاسدا، کۆك بێت، یان پێچەوانە، هەر چونیەکەو، یاخود کابرا گێڕەرەوەی کاری پێ کردبێت، کە زۆر ڕوودەدەن یان کەم ڕوودەدەن دیسان هەر چونیەکە، چونکە خەڵکی مەدینە بەشێکن لەگەڵی ئیسلام‌و، سەرجەمی نین‌و، کار بەو شتە دەکرێت کە گێڕەرەوەکە گێڕاویەتەوە، نەك بەکار پێکردنی ئەو یان بەکار پێنەکردنی، چونکە بۆی هەیە، کە بە پێچەوانەی گێڕانەوەی خۆی کار بکات، ئیتر یان بەهەڵەیە، یان لە بیرچوونەوەیە، یان مانای تری بۆ کردووەو،

---

[1] أصول السرخسي، ب١، ل٣٤١.

بەهەرحاڵ کەسێکی پارێزراو (معصوم) نیەو، هەروەها ئەو کردەوانەی کە زۆر ڕوو دەدەن‌و، لە فەرموودەدا هاتن، ئەمە کاریگەری دروست ناکات، لە وەرگرتنیدا، یان لەبەرپەچدانەوەی فەرموودەی (ئاحاد)دا، چونکە پێویستی بوون، بە زانین و حوکمی شتە کەمەکان، هەر وەك پێویستی بوون بە زانینی حوکمی شتە زۆرەکان وایەو، هەردووکیان دەکرێت، کە بە شێوەیەکی گێڕانەوەی (ئاحاد) بگێڕدرێتەوەو، سەرەڕای ئەوەی کە (زۆری)و (کەمی) لەم بوارەدا هیچ چوار چێوەو کۆنترۆڵێکی بۆ دانەنراوە.

بیانوو هێنانەوە بەوەی کە ئەو سوننەتە ئاحادە، پێچەوانەی بنەماکانە، ئەمەیش بڕوا هێنەر نییە، چونکە سوننەتەکە بنەماکان (أصول) بنیات دەنێت‌و، دەیانکاتە بنەماو، جا کە سوننەت حوکمێکی بەر پاکرد، کە پێچەوانەی (ئەسڵ) بوو، ئەوا ئەم حوکمە وەك ئەسڵێکی سەربەخۆو، لەناو بازنە گشتییەکەدا دادەنرێت‌و، کار دەکات، وەك لە مامەڵەی (سَلَم)دا، کە شتە فرۆشراوەکە نادیارە، بەڵام وا جێگیر بووە، کە ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی ئەو سوننەتە ئاحادانەی کە سەنەدی صەحیحیان هەیەو، بەهۆی پێچەوانەبوونەوەیان لەگەڵ ئەسڵەکاندا ڕەتدەکرێنەوە، بەڵام لە ڕاستیدا کۆك‌و هاوڕای ئەسڵەکانن، نەك پێچەوانەوە.

ئینجا ئەو فەرموودەیەی (المصراة: کە باسمان کرد)و، ڕەتیان کردۆتەوە، بەهۆی پێچەوانەبوونەوەی لە گەڵ بنەما (أصل)ـەکاندا، ئەمە پێچەوانەی ئەو بنەمایانە نییە، کە گوتویانەو، یاسای (الخراج بالضمان) لێرەدا کار ناکات، چونکە ئەو شیرەی ماوەتەوە لە گوانی ئاژەڵەکەدا لەدوای کڕینەکە نەبووەو، بەڵکو لە پێش کڕینەوە بووەو، بۆیە ئەم شیرە بەو دەسکەوت‌و دەرهاویشتەیە نییە، لە کاتی بوونی شتە فرۆشراوەکە لەلای کڕیار وەدەست هاتبێ‌و ڕووی دابێت، تا کڕیار زیاتر هەقی خاوەندارێتی هەبێت.

و هەروەها یاسای (الضمان) لێرەدا کار ناکات، چونکە ئەندازەی ئەو شیرەی کە هاتۆتە گوانی ئاژەڵەکە لەلای کڕیارەکە نازانرێت، چەندە؟ چونکە تێکەڵ بووە، بەو شیرەی کە پێش فرۆشتنی لە گوانەکانیدا بووەو، لێرەدا قەرەبووی هاو وێنە (الضمان بالمثل) ناکرێت‌و، مەحاڵەو، بۆیە فەرمانی داوە، کە صاعێ خورمای وەك قەرەبوو بدرێتەوە، چونکە نزیکترین هاو وێنە لە شیرەوە، زیاتر خورمایەو، نزیکی هاوشێوە بوونیان لەوەدایە، کە هەردووکیان بەکیلۆ دەفرۆشرێن‌و، هەردووکیان خۆراکن‌و، خواردەمەنین‌و، کەواتە دواجار ئەم پێچەوانە بوونەوە لەگەڵ بنەماکان‌و قیاسدا لە کوێدایە؟![1]

---

[1] بڕوانە بەرپەرچدانەوەی ئەوانەی کە بەر پەرچی فەرموودەی (المصراة) دەدەنەوە، لە کتێبی (إعلام الموقعين) ب١، ل٣٦٦، ودواتر.

ئینجا بە بەڵگە کردنی ئەوەی کە کابرای گێڕەرەوە شەرعزان نییە، ئەمەیش هەر بەڵگەیەکی وەر نەگیراوەو، چونکە سەرچەمی گێڕەرەوانی سوننەت، لەبەر ئەوەی کە هاوەڵایەتی پێغەمبەریان (ﷺ) کردووە شتێ لەشەرع هەر دەزانن‌و، پلەیێ لە شەرعزانییان هەر هەیە، کە دڵنیامان دەکاتەوە، کە ئەوەی گێڕاویانەتەوەو گواستویانەتەوە دروستە و هیچ لە ماناکەیانیان لە دەست نەچووە، سەرەڕای ئەوەی کە شێوازی زمانی عەرەبی‌و پاراوییەکەیان زانیوەو، لەسەر ئەم بنەمایە بێت، ڕای جەماوەری زانایان لە پێشترە، (راجح)ـە، و بۆیە هەر فەرموودەو سوننەتێ کە بە دروستی ئەوەی تیادا دەرکەوت، کە کەسانێکی خاوەن متمانەی زاڵ‌و زۆژ (ضابط) گێڕابێتیانەوە، ڕووتێکردنی پێویستەو، ئیتر نابێت ڕووبکرێتە ئەو گێڕانەوانەی کە پێچەوانەی ئەم دروستەیان‌و ئیتر پێچەوانەبووەوەکە هەرچی‌و هەر کێ بێت، چونکە خوای گەورە فەرمانی کردووە، بە ئێمە کە پەیڕەوی لە سوننەتی پێغەمبەرەکەی(ﷺ) بکەین‌و، گەیشتن بەسوننەتیش تەنها لەڕێی گێڕەرەوەکانەوە دەبێت‌و، کە توانای کونترۆڵ کردنی هزر (ضبط)و ڕاستاڵیان چەسپاو یاخود زیاتر ئەم حاڵەتەیان تیادا بوو، ئەمە بەڵگەیە لەسەر دروستی دانەپاڵی ئەو گێڕانەوەیە بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و، ئەمەیشیان بە ڕێگای یەکلایی (قاطع) وایە، یاخود بە گومانێکی لە پێشتر (الظن الراجح) و کار کردن بەهەردووکیان لە ڕووی شەرعەوە واجبە.

## ١٦٧- جۆرەکانی ئەو ئەحکامانەی کە لە سوننەتدا هاتوون:

– **جۆری یەکەم:** ئەو ئەحکامانەن، کە هاوشێوەی ئەحکامی قورئانن‌و، جەخت کەرەوەن لەسەریان‌و، نموونەیش وەك، بەرگرتن لە ئازاردانی دایەو بابەو، بەرگرتن لە شایەتی دانی درۆو، کوشتنی خەڵك، و هتد....

– **جۆری دووەم:** ڕوونکەرەوەی ماناکانی قورئانن‌و، درێژە پێدەری بابەتە کورت‌و پوختەکانی قورئانن، وەك ئەو سوننەتەی کە شێوازەکانی حەج ڕوون دەکەنەوەو، ئاست‌و ئەندازەی زەکات دیاری دەکەن‌و، هەروەها ئەو ئەندازەیە دیاری دەکەن، کە دەستی دزی تیادا دەبڕدرێت‌و، هتد....

– **جۆری سێیەم:** جاری وا هەیە، سوننەت کە ئەحکامە ڕها (موتلەق)ـەکانی قورئان، پەیوەندیدار (مقید) دەکات‌و، یاخود ئەحکامە گشتییەکان (عام)ـەکانی، تایبەت (تخصیص) دەکات، هەروەك لە جێگای خۆیدا ئەم باسە دێت.

– **جۆری چوارەم:** جاری واهەیە، کە حوکمێکی قورئان بێدەنگی لێکردووەو، سوننەت هێنایەتی‌و دەری بڕیوە، چونکە سوننەت خۆی لە خۆیداو، لەم بوارەدا سەربەخۆیی لە

شەرعاندنی ئەحکامەکاندا، و وەك قورئان وایە، هەروەك ئەم فەرموودەیەش بەڵگەیە لەسەر ئەم قسەیە کە دەڵێت: (أَلَا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ، وَمِثْلَهُ مَعَهُ) بە دروستیو تەواوی قورئان بەمن دراوەو، هەروەها هاو شێوەی قورئانیش، کە سوننەتە و لەو شتانەیدا کە قورئان بێدەنگی لێکردووەو، نموونەی لەم بابەتەیش زۆرن، لەوانە، حەرامی خواردنی گۆشتی گوێدرێژی خۆماڵیو، خواردنی گۆشتی دڕندە (ئاژەڵی چڕنۆکدار)و باڵندەی چڕنۆکدارو، هەوەرها وەك بڕیاردان بە شایەتێكو سوێند خواردنێك پێکەوەو، دروستی ڕەهن کردن (بارمتە)، لە حاڵەتی نیشتە جێبووندا، واجبی دانی خوێنی کوشتن، لەسەر کەسو کاری بکوژەو، میراتبردنی نەنكو هتد.....[1].

## ١٦٨- دەلالەت و بەڵگەداری سوننەت، لە سەر ئەحکامەکان:

پێشتر گوتمان، کە سوننەت لە ڕووی گەیشتنەوە، بە ئێمە، جاری وا هەیە، کە یەکلاییەو، (قطعي يە)، هەروەك لە سوننەتی موتەواتیر وایەو، جاری واهەیە، کە نا یکلایی یە (ظني) یە، وەك لە سوننەتەکانی مەشهورو ئاحاددا وایەو، بەلام لە ڕووی دەلالەت کردنییەوە لەسەر ئەحکامەکان جاری واهەیە، کە (ظني)یەو، جاری وا هەیە کە (قطعي يە)و، لەم ڕووەوە وەك قورئان وایەو، کاتێك دەلالەت کردنەکەی (ظني) دەبێت، کە لەفزەکەی لە مانایەك زیاتر ببەخشێت، واتە: ڕاڤە زیاترو مانای زیاتر (تأويل) هەڵبگرێت، لە نمونەی فەرموودەی قطعی، وەك ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر(ﷺ) کە دەفەرموێت: (في خمس من الأبل شاة) واتە: زەکاتی پێنج وشتر مەڕێکە، کە لێرەدا لەفزی (خمس: پێنج)، بەتەواوی دەلالەت لەسەر ماناکەی خۆی دەکاتو، (قطعي يە)و، مانای تر هەڵناگرێت، بۆیە حوکمەکە دەچەسپێنرێت، بەسەر ئەو حاڵەتو مانایەدا کە لە لەفزەکە دەفامرێتەوە، کە ئەویش واجبی دەرکردنی زەکاتە لەو ماڵە، کە برەکەی دانی مەڕێکەو، نموونەی فەرموودەی (ظني) وەك، (لا صلاة إلا بفاتحة الكتاب)، واتە: نوێژ بە بێ سورەتی فاتیحە، دانامەزرێت، ئەم فەرموودەیە مانای تر هەڵدەگرێتو، دەکرێت مەبەست لێی ئەوە بێت، کە نوێژ بە بێ سورەتی فاتیحە، دروستو لە کۆڵەوە بوونی نییە، و نابێت، و هەروەها دەکرێت، مەبەست ئەوەیش بێت، کە نوێژی تێرو تەسەلو تەواو بەبێ سورەتی فاتیحە نابێتو، جەماوەری زانایان (الجمهور) ڕای یەکەمیان وەرگرتووەو، حەنەفییەکان ڕای دووەمیان پەسەند کردووە، کە ماناهەڵگری زیاترەو، (تأويل)ـی، تیادا کراوە.

---

[1] الشوكاني، ل٣٣.

# ﴿بەشی سێیەم﴾

# بەڵگەی سێیەم: کۆڕای زانایان (الأجماع)

## ١٦٩- پێناسەی ئیجماع:[1]

ئیجماع لە زمانی عەرەبیدا،نیازو خولیاو بیرکردنە لەسەر ئەنجامدانی شتێك‌و، ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش (ﷺ) هەر لەمەوە هاتووە، کە دەفەرموێت: (لا صیام لمن لم یجمع الصیام من اللیل) واتە: هەرکەسێ لە شەوەوە نیازی نەبووبێ‌و، بیری لەسەر ئەوە نەبووبێ، کە ڕۆژەکەی بە ڕۆژوو بێت، ئەوە ڕۆژووەکەی دانامەزرێت‌و، هەروەها دەگەوترێت: (أجمع فلان علی الأمر) واتە: فلان کەس، لەسەر فلان کار نیازی بەرپاکرد و بوویە خولیای سەری‌و بیری لەکردنی کردەوە، و هەروەها مانای (الأتفاق: کۆکبوون) دەگەیەنێت هەروەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَأَجْمِعُوٓاْ أَمْرَكُمْ وَشُرَكَآءَكُمْ﴾[2] واتە: خۆتان‌و بەرستراوەکانتان بڕیارێکی یەکلاکەرەوە بدەن، واتە: پێکەوە کۆك ببن‌و ڕێکبکەون‌و، هەروەها دەگەوترێت (أجمع القوم علی کذا) واتە: ئەو هۆزە لەسەر فلانە شت ڕێکەوتن و بیر و خولیایان لەسەر ئەنجامدانی کۆك بوو، بەم مانایەش بێت، ڕوودانی ئیجماع، لە کاتێکدا کە زیاتر لە کەسێك لە پرۆسەکەدا هەبێت، بە پێچەوانەی مانای یەکەمەوە، کە دەکرێت لە تەنها کە سێکیشدا دروست‌و بەرجەستە ببێت.

پاشان لە زاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا، ئیجماع بریتییە لە ڕێکەوتن‌و کۆکبوونی موجتەهیدانی گەلی ئیسلام، لە سەردەمێ لەسەر دەمەکاندا، لەسەر حوکمێکی شەرعی، لە دوای وەفاتی پێغەمبەر[3] (ﷺ).

---

[1] هەندێ لەزانایانی مەزهەبی جەعفەری، ئیجماعیان بەوە پێناسە کردووە، کە بریتیە لە ڕێکەوتنی ئومەتی موحومەد (ﷺ) لەسەر کارێك‌و، یاخود کۆبونەوەی موجتەهیدەکانی ئەم گەلەیە لەسەر دەمێکدا، لەسەر شتێك، (کتاب الأرائك) ل١٧٦، و بڕوانە پێناسەی تر، لە کتێبەکانی تردا، وەك (شوکانی ل ٦٣) والمستصفی ب١، ل١١٠، والأمدي ب١، ل١٨٠و دواترو، کتێبی (الأجماع) دانراوی، عەلی عبدالرزاق، کەلەم کتێبەیدا پێناسەی جیاجیای چەندەها زانای جیاوازی ئوصولی هێناوە.

[2] سورة (یونس/ ٧١).

[3] الأمدي ب٤، ل١١٥.

## ١٧٠- ئەمانەی خوارەوە، لەم پێناسە زاراوەییە وەردەگیرێن:

**یەکەم: کۆکبوونەوەو کۆکبونی ئەوانەی کە موجتەهید نین، کاری پێ ناکرێت.**

موجتەهیدیش، ئەو کەسەیە کە تواناو ئامادەگی دەرهێنانی ئەحکامی شەرعیی هەیە، لە بەڵگە تەفصیلییەکانەوە و جاری وایش هەیە، کە بە (فقیهـ: شەرعزان) ناوزەد دەکرێت، هەروەك چۆن موجتەهیدەکان بە (ئەهلی حەلو عەقد) ناوزەد کراون، یاخود بە ئەهلی رەئیو ئیجتیهاد ناو دەبرێنو، یان بە زانایانی گەلی ئیسلام ناوزەد دەکرێن[1]، بەڵام ئەوەی کە موجتەهید نییە، ئەو کەسەیە کە توانای هەڵێنجانی حوکمی نیەو، وەك زۆرینەی خەڵك وایەو، یاخود وەك کەسێ وایە کە لە کاروبارە شەرعییەکان بێ ئاگایەو، هەرچەندە لە بوارەکانیو هونەرەکانیتری، وەك پزیشکیو ئەندازیاری ئاگاداری هەبێت.

دووەم: رێکەوتنو کۆکبوونی موجتەهیدەکان، مەبەست پێی رێکەوتنی سەرجەمیانەو، بۆیە کۆکبوونی تەنها خەڵکی شاری مەدینە یان شارەکانی مەککەو مەدینە بەس نییەو، هەروەها رێکەوتنی گروپێکی دیاری کراویش هەر بەس نییەو، ئەو جۆرە ئیجماعانە، بە ئیجماعی زاراوەییو ئەوەی کە مەبەستو ئامانجەکەیە نایەنە ئەژمارو، پێچەوانە بوونەوەی تەنها یەك موجتەهیدیش هەر زیان دەگەیەنێتو دەبێتە هۆی دانەمەزرانی ئیجماعەکەو، جەماوەری زانایانی ئوصولی فیقهیش لەسەر ئەم رایەن.

و هەندێ لە زانایان رایان وایە، کە پێچەوانە بوونەوەی کەسێك یان دووکەس یان سێ کەس زیان ناگەیەنێت.

هەندێ تریش بەلای ئەوەدا چوون کە رێکەوتنی زۆرینە، هەرچەندە ئیجماعیش نەبێت، بەڵام هەر دەبێتە بەڵگەو، پەیرەوی لێوە کردنی کارێکی پێویستە، چونکە کۆکبوونو رێکەوتنی زۆرینە، نیشانەی ئەوەیە کە هەق لەلای ئەوانەو، بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە (قاطع) و باشترو لە پێشتر(راجح) هەیە، کە لەسەر ئەو کۆبوونو رێکەوتنە کۆی کردوونەتەوە، چونکە لە نەریتو عادەتدا زۆر دەگمەنە، کە بەڵگە پێچەوانەکە لە پێشتر(راجح) بێت[2].

لە روانگەی ئەم پێناسەیەوە، ئێمە ئەوە دەبینین کە، کۆکبوونو رێکەوتن دەبێت سەرارای موجتەهیدەکان بگرێتەوە، بەبێ جیابوونەوەی یەکێك یان هەندێکیانو، هەڵاوێر

---

[1] المسودة، ل٣٣١.

[2] أصول الفقه، للشيخ الرحوم الخضري، ل ٣٣٧.

بوونیان، بۆیە ئەگەر هەندێکیان پێچەوانە بوونەوە، هەرچەندە تاکە کەسیش بێت، ئیتر بە ئیجماع نایەتە ئەژمارو کە ئیجماعیش نەبوو، ئیتر بەڵگەیش نییەو، پەیڕەوی لێوەکردنی واجب نییە، چونکە زۆرینە بوون، بەڵگەی یەکلاکەرەوە نییە لەسەر ئەوەی کە ئیتر لەسەر ڕای ڕاستو هەقنو، جاری وا هەیە، کە کەسانێکیان لەگەڵدایە، کە لەسەر ڕێگای هەڵەنو، ژمارەکەمەکە لەسەر ڕاستیو هەق بووە، بەڵێ هەڵبەتە ئەگەر بەلایەکدا خستن (رجحان)ـی، بەڵگە پێچەوانەکەمان بۆ ڕۆشن نەبێتەوە، ئەوا ڕای زۆرینە زیاتر ئاسودەکەرەو، دەبێت بە ئاڕاستەکەی برۆین، بەو پێوەدانگەی کەڕایەکی ئیجتیهادیو لە پێشترە بۆ وەرگرتنیو، کارپێکردنی.

– سێیەم: مەرجی موجتەهیدەکان ئەوەیە کە دەبێت موسڵمان بن، چونکە ئەو بەڵگەو دۆکیۆمێنتانەی کە هەن، لەسەر بە بەڵگە بوونی ئیجماع، ئەوە دەگەیەنن کە دەبێت ئەو کەسانەی ئەو کۆکبوونەیان بەر پاکردووە، سەربەگەلی ئیسلام بن، سەرەڕای ئەوەی کە پرسی ئیجماع کاروبارێکی شەرعییەو، لەسەر بیرو باوەڕ (عقیدة) بنیات نراوە، و پەیوەستە پێیەوەو، سەر بەچڵو پۆپەکانییەتی.

– چوارەم: دەبێت ئەو ڕێکەوتنەی نێوان موجتەهیدەکان بە تەواوی بێتەدی، لە کاتی کۆبوونەوەیان لەسەر حوکمی ئەو پرسەو، بۆیە بەسەر چوونی سەردەمەکانیان مەرج نییە، واتە: بەمەرج نەگیراوە، کە ئەو موجتەهیدانەی کە ئیجماعەکەیان ئەنجامداوە، بمرنو، تامردنیش هەر لەسەر ئیجماعەکەیان سووربووبنو، لەم ڕوانگەیەوە بێت پەشیمان بوونەوەی هەندێکیان لەڕاکەیان گرفتی تیادا نییەو، هەروەها دەرکەوتنوپەیدا بوونی موجتەهیدێکی تر کە لەسەر دەمی ئیجماعەکەدا نەبوبێتو، دواتر پەیدابێو، پێچەوانەی ئیجماعەکەیان ببێتەوە، دیسان زیان نا گەیەنێت.

هەندێ لەزانایانی ئوصول دەڵێن، بەسەر چوونی سەردەمەکە پێویستە، بۆ هاتنەدیو چەسپاندنی ئیجماعەکە، چونکە بۆی هەیە کە هەندێکیان لە ڕاکەیان پاشگەز ببنەوە.

ڕای لە پێشتر (الراجح) لێرەدا ئەوەیە کە گروپی یەکەم: دەریان بڕی، چونکە بەڵگەکانی بە بەڵگە بوون (حجیة)ی ئیجماع پێداگیر نین لەسەر ئەوەی کە دەبێت سەردەمەکەیان بەسەر چوو بێتو، بەڵکو تەنها ڕێکەوتنیان بەمەرج گیراوەو، هەرکات ڕێکەوتنی موجتەهیدەکانی سەردەم لەسەر ڕووداوێك دروست بوو، ئەوە ئیجماع ڕوویداوەو، هاتۆتە دیو، پەیڕەوی لێوەکردنی واجبەو، بە پاشگەز بوونەوەی هەندێکیان لە ڕاکەیانو، یاخود

بەدەرکەوتنی موجتەهیدی تر و بە ڕای جیاوازەوە، کار لە ئیجماعەکە ناکات، و نابێتە هۆکاری هەڵوەشانەوەی.

- **پێنجەم:** دەبێتو بەمەرج گیراوە، کە ڕێکەوتنی موجتەهیدەکان لەسەر حوکمێکی شەرعیی، وەك (واجب بوون)و (حەرام بوون)و (مەندوب بوون)و هتد.... بێت. بۆیە ئیجماع لەسەر پرسە ناشەرعییەکانی، وەك پرسی وەرزشیو پزیشکیو، زمانەوانیو ئەوانە.... ئەمانە بەو ئیجماعە شەرعییە نایەنە ئەژمار، کە مەبەستمانە.

- **شەشەم:** ئیجماع کاتێك دروستەو، کاری پێ دەکرێت، کە لە دوای وەفاتی پێغەمبەرەوە (ﷺ) کرابێتو، ئەمەیش ڕای زۆرینەی زانایانی ئوصوڵە کە لە پێناسەکانیاندا باسیان لێوە کردووەو، ئێمەیش هەڵمان بژاردووە.

هەندێ لە زانایانیش گوتویانە، کە ئەمە مەرج نییەو، دروستە کە ئیجماع لەسەر دەمی پێغەمبەریشدا (ﷺ) ڕوویدات، لەسەر حوکمی پرسێكو، بۆیە بەڵگەی ئەو حوکمە بریتی دەبێت، لە ئیجماعو ڕازی بوونی پێغەمبەری خوا (ﷺ) بەڵام ئێمە ڕامان وانیە چونکە لە کاتی بوونی پێغەمبەردا (ﷺ) پێویستمان بە ئیجماع نییەو نابێتو، چونکە کار بە فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ)و ڕازی بوونی ئەو دەکرێتو، حساب بۆ ئەوە دەکرێتو، سەرچاوەی شەرعدانانەو، بۆیە ئەگەر لەسەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ئیجماع ڕوویدا، یان ئەوەیە کە پێچەوانەی فەرمایشی ئەو زاتەیە، یان هاوڕایەتیو، بۆیە ئەگەر پێچەوانەی بوو، ئەوا هیچ کارێکی پێ ناکرێتو، ئیجماعەکەیان بێ کەڵکە، (کە بێگومان شتی وا ڕوونادات‌و، نەبووەوو نییەو نابێت)و، یان ئەوەیە کە ئیجماعەکەی هاوڕای ڕازی بوونی پێغەمبەرە (ﷺ)و، لەم حاڵەتەیشدا هەر کار بەڕازی بوونەکەی پێغەمبەر (ﷺ) کراوەو دەکرێتو، لەم ڕوانگەیەوە، ئێمە بەڵگەیەکی دەرد خواردووو، ڕەهەندێکی وەرگیراومان نییە، کە سەلمێنەری ئەوە بێت، کە ئیجماع لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) ڕووی دابێتو، بۆیە بڕوا بەم پرسە ناهێنین.

## ١٧١- بە بەڵگە بوون (حجية)ی ،ئیجماع:

هەرکات ئیجماع بە تەواوی مەرجەکانییەوە هاتەدی، و ڕوویدا ئەو کاتە بەڵگەیەکی تەواوەو، یەکلاکەرەوە(قاطع)ـە، لەسەر حوکمی هەر پرسێ کە ئیجماعەکەی لەسەر کرابووو، دواجار ئەو ئیجماعە، بە بەڵگەیەکی قطعی دێتە ئەژمارو، پەیڕەوی لێوەکردنی پێویستە بۆ

سەرجەمی موسڵمانانن و، پێچەوانە بوونەوە لە گەڵیداو هەڵوەشاندنەوەی دروست نییەو، ئەوانەی کە ئیجماع بە بەڵگە دەزانن، زۆرینەی جەماوەری زانایانن و، بەڵگە گەلێکی زۆریان لەم بارەیەوە هێناون، کە ئێمە لێرەدا هەندێکیان دەهێنین، لەو بەڵگانەیش:

أ- خوای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَمَن يُشَاقِقِ ٱلرَّسُولَ مِنۢ بَعۡدِ مَا تَبَيَّنَ لَهُ ٱلۡهُدَىٰ وَيَتَّبِعۡ غَيۡرَ سَبِيلِ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ نُوَلِّهِۦ مَا تَوَلَّىٰ وَنُصۡلِهِۦ جَهَنَّمَۖ وَسَآءَتۡ مَصِيرًا ﴿١١٥﴾ ﴾[1] واتە: هەر کەسێك لەدوای ئەوەی رێگای هەق و راستی بۆ دەرکەوتو، شارەزای ئاینی خوای پەروەردگار بوو، دژایەتی پێغەمبەر (ﷺ) بکات و رێگاو رێبازێ بگرێتەبەر، کە رێگای راستی باوەڕداران نەبێت، ئێمەیش رووی دەکەینە ئەو بەرنامەو رێگایەی بەئارەزووی خۆی لە دنیادا هەڵیبژاردووە، ئیتر ئێمە وازی لێ دەهێنین و، هەقمان نییە بەسەرییەوەو، لە قیامەتیشدا ئەیخەینە ناو ئاگری تاوداری دۆزەخەوە، ئای کەدۆزەخ جێ و رێیەکی زۆر سامناك و خراپەو بۆیان ئامادە کراوە.

رووی بە بەڵگەکردنی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەوەدایە کە خوای پەروەردگار هەڕەشەی لەوە کردووە، کە بە پێچەوانەی رێبازی مسوڵمانان کار بکرێت، چونکە رێگای موسڵمانان رێگای هەقەو، پەیڕەوی لێوە کردنی پێویستەو، رێگای تر بەتاڵەو پێویستە پشتی لێ هەڵبکرێت و، ئەو رێگایەی کە موسڵمانان لەسەری کۆدەبنەوەو، رێك دەکەون، ئەوە رێگای یەکلایی و قطعی ئەوانەو، هەر رێگای ئەوانیش بە تەواوی و یەکلایی رێگای هەق و راستییە، دەبێت بێ دوودڵی پەیڕەوی لێوە بکرێت و، واجبە پێوەی پابەندبین و، ئەمەش مانا و مەبەست و داواکراوە لە ئیجماعدا، و ئیجماع ئەمەیە کە باسمان کرد.

ب- لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ)شوێنەواری زۆرهەن، کە بەڵگەن لەسەر پارێزراویی گەلی ئیسلام لە هەڵە، هەرکات لەسەر کارێك کۆبوونەوە، هەروەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرمووێت: (لا تجتمع أمتي على خطأ) گەلەکەم لەسەر هەڵە کۆنابنەوەو، هەروەها دەفەرموێت: (لا تجتمع أمتي على ضلالة) گەلەکەم لەسەر گومرایی کۆنابنەوە، جا ئەم فەرموودە گەلە هەرچەندە ئاحادن، بەڵام ماناکانیان هەر موتەواتیرن و، بەڵگەی تەواو و یەکلایی لەسەر ئەوە دەگەیەنن، کە ئەوەی گەلی ئیسلام لەسەری کۆدەبنەوە، ئەوە هەق و،

---

[1] سورة (النساء/ ١١٥).

ڕاستەو، ئیجماعی گەلی ئیسلامیش بە کۆبوونەوەی موجتەهیدەکانی ئەو گەلە پێك دێت، چونکە ئەوان خاوەنی ڕاو، زانیارییان هەیەو، خەڵکی تر پەیڕەوکاری ئەوانن‌و، بۆیە ئیجماعەکەیان هەق‌و ڕاستەو پێکاویانەو هەرچیش هەق بوو، ئەوا پەیڕەوی کردنی واجبەو، نابێت پێچەوانەی ببینەوە، و ئەمەش مانای بە بەڵگە بوونی ئیجماعە کە باسمان کرد[1].

ج- هاوڕابوونی موجتەهیدەکان دەبێت لەسەر بنەمای بەڵگەی شەرعی بێت، چونکە ئیجتیهادی بێ بەڵگەو لەسەر حەزو خواستن دانامەزرێت‌و، بەڵکو دەبێت بەگوێرەی پەیڕەو گەلێکی نەخشەدارو ڕێسای دیاری کراو، ڕەوتێکی وابێت، کە دوور بێت‌و، لە حەزو هەواو خوازیاری، هەروەك لە پێشەکیدا باسمان کرد، بۆیە لەم ڕوانگەیەوە ئەگەر موجتەهیدەکان ڕێککەوتن لەسەر ڕایەك، ئەوە بە تەواوی زانیاری ئاسودەکار بە ئێمە دەدات، کە بەڵگەیەکی شەرعییان بەدەستەوەیە، کە بەڵگەیە لەسەر ئەو ڕایەی کە لەسەری ڕێکەوتوون‌و، دڵی ئێمە ئاسودە دەکات، چونکە ئەگەر ئەو بەڵگەیە، مانای یەکلاکەرەوە نەدات بەدەستەوەو،

---

[1] لێرەدا تێبینی ئەوە دەکێت، کە جەعفەرییەکان ڕایان وایە کە ئیجماع بۆیە بەڵگەیە تا چەسپێنەری ئەوە بێت، کە یەکێك لە ئیمامە مەعصومەکانی تیادایە، لە نێو ئیجماعکارەکاندا، هەروەك (حلي) لە کتێبی (تهذيب الأصول إلى علم الأصول) دا، ئاماژەی ڕاستەوخۆی پێداوە، و هەروەها خاوەنی کتێبی (الأرائك)یش، هەمان مانای ڕوون کردۆتەوەو گوتویەتی بە بەڵگە بوونی ئیجماع لەسەر بنەمای زانیاری بوون، بە هەبوونی یەکێ لە ئیمامە مەعصومەکان لە ناو ئەو ئیجماع کارانەدا دەچەسپێت‌و ، یاخود بە چەسپاندنی ئەوەی کە یەکێ لەو پێشەوا مەعصومانەی لەسەری هاوڕا بووەو، ڕازی بووەو، یاخود زانیاری هەبێت، لەسەر ئەوەی کە یەکێ لەو ئیمامە مەعصومانە پەی بردووە، بەو قسانەو ڕایانەی کە ئیجماع کارەکان لەسەری ڕێکەوتوون، (الأرائك) ل١٧٦-١٧٧و هەروەها تەماشای (كفاية الأصول) بکە، ل٦٩و دواتر، (أصول الأستنباط)ـی، عەلی تەقی حەیدەری ل ١٤٥و دواتر، بەڵام (نائیبی) کە زانایەکی جەعفەرییەکانە، سەبارەت بە بەڵگە بوونی ئیجماع ئاراستەیەکی تری باسکردووە، کە ئەویش ئەوەیە ئەو ئیمامە مەعصومە لەناو ئیجماع کارەکاندا خۆی لە خۆیدا بەڵگەیەو، ئەم ئاڕاستەیەشی بە لەپێشتر داناوە، چونکە نزیکترینی شێوازەکانە، چونکە چوونەناوی یەکێ لە پێشەوا مەعصومەکان بۆ ناو گروپی ئیجماع کارەکان کارایی دەدات بە پرۆسەکەو، لە کاتی ئامادەنەبوونیدا پرۆسەکە ناکارا دەکات، بەڵام خاوەنی کتێبی (الأرائك) لەم بارەیەوە ڕای وایە کە ئەم کارە قسەی پێشەوا مەعصومەکان بۆ ئێمە دەرناخات‌و، کەواتە دواجار کارەکە بە ئیجماع نایەتە ئەژمار، چونکە لەو ئیجماعەدا پێویستیمان بە کۆکبوونی تێڕوانینی سەرجەمیان نییە ! ! بڕوانە نووسینەکانی (نائینی) لە کتێبی (فوائد الأصول) ب١، ل٨٦-٨٧، و (الأرائك) ، ل١٧٨.

بەڵگەی تەواو نەبێت، لەسەر ئەو حوکمە، ئەوا بێگومان وا بەئاسانی لەسەری ڕێك نەدەکەوتن، چونکە عەقڵ‌و ئارەزو سروشتی مرۆڤەکان جیاوازن، ئەگەر بەڵگەیەکی فرەمانایان لەلابوایە کە ڕووی ترو مانای تری هەبووایە، وا بەئاسانی لەسەری ڕێك نەدەکەوتن‌و کۆك نەدەبوون.

## ١٧٢- جۆرەکانی ئیجماع:

### یەکەم:- ئیجماعی ڕاشکاوانە (الأجماع الصریح):

ماناکەی ئەوەیە کە موجتەهیدەکان ڕاکانیان بە ڕاشکاوی‌و بێ پێچ‌و پەنا دەردەبڕن‌و، دواتر لەسەر ڕایەك کۆدەبنەوە، وەك ئەوەی کە پرسێك بخرێتە بەردەم موجتەهیدەکان‌و، ئەوانیش لەیەك جێگادا کۆببونەوەو، هەریەکەیان ڕای خۆی لەسەری دەربڕێت‌و، دواتر کۆببنەوە لەسەر تەنها یەك ڕاو، یاخود ڕاکە بە جیاجیا بخرێتە بەردەستیان‌و، دواتر بەگشتیانەوە لەسەر یەك ڕا کۆببنەوەو، یاخود هەندێ لە موجتەهیدەکان فەتوا بدەن، لەسەر ڕایەك‌و، ئەو فەتوایە بگات بە موجتەهیدەکانی ترو، ئەوانیش بەڕاشکاوانە ڕەزامەندبن، لەسەر فتواکەو، یاخود موجتەهیدێك لەسەر پرسێك، حوکمێکی دیاریکراو بدات‌و، ئەم حوکمەیش بگاتە دەستی موجتەهیدەکانی ترو، ئەوانیش بەڕاشکاوی ڕازی بن لەسەری، ئیتر شێوەی ڕازی بوونەکە چونیەکە، بە گوفتار ڕازی بن، یان ئەوانیش فتوایەکی لەو جۆرە دەربکەن‌و، یان بڕیارێکی لەو جۆرە بدەن، چونیەکەو ئەم ئیجماعە، بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە (قطعي)یە، دروست نییە، نەپێچەوانەی ببینەوەو، نە هەڵی بوەشێنینەوە.

**دووەم: ئیجماعی بێدەنگی (سکوتی):** بریتیە لەو ئیجماعەی کە موجتەهیدێك ڕای خۆی لە پرسێکدا دەربڕێت‌و، ئەو ڕایە بناسرێت‌و، بڵاو ببێتەوەو، بەخەڵکی تر بگات‌و، موجتەهیدەکانی تریش بێدەنگی لێ بکەن‌و، نکوڵی ڕاستەوخۆو ڕاشکاوانەی نەکەن‌و، بە ڕاشکاویش لەسەری هاوڕا و کۆك نەبن، و لەو سەروبەندەدا ڕێگرێك نەبێت، کە ببێتە هۆی بێدەنگی ئەو موجتەهیدانە، واتە ماوەیەکی دیاریکراو بەسەر تێڕامان لە پرسەکەدا بگوزەرێت‌و، فاکتەری دەرەکی وەك ترس لە کەسێ، یان هەیبەت‌و شان‌و شکۆی کەسێ لەدڵداو، یان هەر ڕێگرێکی تر لەو ڕێگرانەی کە دواتر باسیان دەکەین، لە ئارادا نەبن، جا زانایان سەبارەت بە حوکمی ئەم جۆرە ئیجماعەو ئاستی کارابوونی، لەسەر سێ گفت

جیاوازییان هەیە:

– **گفتی یەکەم**: دەڵێن ئەم ئیجماعە بێدەنگییە، بە ئیجماع نایەتە ئەژمارو، تەنانەت بە بەڵگەیەکی تەمو مژدار (حجة ظنيّة)یش، حسابی ناکەن، ئەمەیش ڕای شافعیو مالیکییەکانە.

بەڵگەی ئەم گروپەیش ئەوەیە، کە قسە نادرێتە پاڵ کەسی بێدەنگ، چونکە ناکرێت گفتێکی بدرێتە پاڵ، کە نەیگوتووە، و هەروەك بێدەنگیش ناکرێت، بە تەواوی بخرێتە سەر ئەرازووی ڕازی بوونی ئەو کەسە، لەسەر ئەو شتە، چونکە جاری وادەیە، کە ئەو بێدەنگییە هۆکارەکەی نەگەیشتنی پرسەکە بەکەسانی تر، یاخود لەبەر ئەوەیە کە ئیجتیهادیان تیادانەکردووەو، یاخود کاتێکی گونجاوو پێویستی بەسەردا تێ نەپەڕیوە، تا ڕای خۆیان لەو بارەیەوە دەربڕنو بەرپابکەنو، یاخود کابرای بێدەنگ وا گومان دەبات، کە دەنگ هەڵبڕینو دەربڕینی ڕای ئەو کارێکی پێویست نییەو، یاخود کەسێکی تری پێچەوانە لێیان ڕاست دەبێتەوەو، ئەرکی سەرشانی ئەم لەو بارەیەوە لادەباتو، یاخود ڕای وایە کە هەر موجتەهیدێ لەهەر شتێکدا ئیجتیهادی کردبێ، ئەوە ڕێبازە هەقەکەی لای خوای گەورەی گرتووەو، پێویست بە بەرپەرچ دانەوەو نکۆڵی کردن ناکاتو، یاخود جاری وادەیە، کەلە دەسەڵاتدارێکی ستەمکارو، یاخود لەبەر شکۆو هەیبەتی موجتەهیدێکی تر ڕای خۆی دەشارێتەوەو، سەرەڕای ئەم گشتە گریمانانەو هی تریش ناکرێت دانی تەواو بەوەدا بنێین، کە بێدەنگی بۆ ڕازی بوونەو، کە نەبوویە بەڵگەیش لەسەر ڕازی بوون، ئەمە نە کۆکبوونو هاوڕابوونەو نە ئیجماعە، و کە ئیجماعیش نەبوو، بەڵگە نییە!

– **گفتی دووەم**: ڕایان وایە، کە بەڵگەی یەکلاکەرەوە (قطعی یە)و، دروست نییە، سەرپێچی بکرێتو، وەك ئیجماعی ڕاشکاو (صریح) وایە، و هەرچەندە لە ڕووی هێزەوە کەمێك لەو کەمترە، و ئەمەیش ڕای زۆرینەی حەنەفییەکانو، حەنبەلییەکانە[1].

بەڵگەی ئەم گروپەیش ئەوەیە کە ئەگەر نیشانە لە ئارادا هەبووو، ئەو ڕێگرانەی کە دەبنە هۆی ئەژمار نەکردنی بێدەنگی لەسەر ڕازی بوون، لە ئارادا نەبوو، ئەوا ئەم کاتە بێدەنگی بە ڕازی بوون، دەهێنرێتە ئەژمارو، ئەم نیشانە بوونە و نەمانی ڕێگرەکان کاتێك دەچەسپێت،

---

[1] روضة الناظر وجنة المناظر، للشيخ موفق الدين بن قدامة المقدسي، ل ٣٨١، إرشاد الفحول، ل٨٤–٨٥.

که ئەو رایە بڵاو ببێتەوەو بگات بە موجتەهیدەکانی ترو، کاتێکی گونجاو تێپەر ببێت، بە سەر تێرامانو سەرەنجدان لەو پرسەو، هیچ لە مپەرێك لە ئارادا نەبێت، کە موجتەهیدەکە وا لێ بکات، رایەکەی خۆی کە پێی گەیشتووە، بە راشکاوانە دەرببڕێت، بە جۆرێ وا گومان ببات، کە غەیری ئەو رەتی ئیجتیهادەکە دەدەنەوە، و یاخود رای وابێت کە پێویست بە بەرپەرچدانەوە ناکات، و یاخود ترسی دەسەڵاتدارانی هەبێتو، هتد... لەو فاکتەرو رێگرانەی کە دەبنە هۆی ئەوەی کە ئیجتیهادو راکەی خۆی بە راستەوخۆو راشکاوانە دەرنەبڕێت، جا ئەگەر هەموو ئەمانەی کە باسمان کرد هاتنەدیو هیچ رەهەندێکی نەمایەوە کە بێدەنگی بەرازی بوون نەیەنەتە ئەژمار، ئەو کاتە ئیجماعەکە دەچەسپێتو، ئیجماعیش بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە.

- **گفتی سێیەم**: بە ئیجماعی نایەننە ئەژمار، بەڵام بە بەڵگەی (ظني) حساب دەکەن، ئەمەیش رای هەندێ لە حەنەفیو هەندێ لە شافعییەکانو، بەڵگەی ئەمانەیش ئەوەیە کە کرۆكو ناوەرۆکی ئیجماع ئەوەیە کە هەموولایەك بە حەقیقی نەك بە پەی پێ بردن لەسەر شتێ کۆببنەوەو، ئەم حاڵەتەیش لە ئیجماعی (سکوتی)دا، رووی نەداوە، چونکە بێدەنگی هەرچەندە بگوترێ بەڵگەیە لەسەر رازی بوون، بەڵام هەروەك راشکاویو راستەوخۆ بوون نییە، لە دەلالەتکردنیدا لەسەر رازی بوونو، بۆیە بە ئیجماع نایەتە ئەژمارو، بەڵام سەبارەت بە لەپێشتر دانانی، لەسەر ئەوەی کە ئەم لە پێشترە بۆ ئەوەی کە بێدەنگی مانای رازی بوونی هەیە، بەم هۆیەوە وەك بەڵگەیەکی (ظني) دێتە ئەژمار ئەمیش هەر بەو مەرجەی کە رێگرەکانی بەر دەم راشکاوی بوونی خاوەن رایەکە لە ئارادا نەبن.

## ١٧٣- رای لە پێشتر ((الراجح)):

لە راستیدا ئەوەی کە پێویستە سەبارەت بە ئیجماع بێتەدی، ئەوەیە کە هاورابوونو کۆکبوونی هەموو لایەك لەسەر رایەك بێتەدیو، ئەو کۆکبونەیش چۆن بە راشکاوی دێتەدی، دەبێت لەرووی دەلالەت کردنو بە بەڵگەکردنیشەوە بێتەدیو، نابێت ئەو هاورابوونە تەنها بە راشکاو و راستەوخۆیی (صریح)ەکە، بێت و بەس! چونکە بێدەنگی دەکرێت، رێگایەك بێت، بۆ دەلالەت کردن لەسەر رازی بوونو، هاورابوون، ئەگەر نیشانە لەم بارەیەوە هەبووو، رێگر نەبوون! هەروەك بێژەرانی گفتی دووەم ئەمە رایانە، چونکە لەم حاڵەتەدا بێدەنگی روونکردنەوەیە، و پێداویستییەکی قۆناغەکەیە، چونکە حەرامە لەسەر موجتەهید ئەگەر ئەو

ڕایەی دەربڕدراوە، بەتاڵ بێت، بێدەنگی لێ بکات، لە کاتێکیشدا بەتایبەتی ئێمە وا تەماشای موجتەهیدەکانمان دەکەین، کە ئەوان لە دەربڕینی ڕاستیداو، ڕای هەقدا سڵ لەهیچ ناکەنەوەو، هەق دەردەبڕنو، هەرچەندە بەم هۆیەوە توشی چەرمەسەریو بەرتەسکبوونەوەبن‌و، ئەم گومانەیش ئەو ڕایەمان لە لابەهێز دەکات، کە بێدەنگ بوونیان لەسەر ڕازی بوون‌و هاوڕابوون‌و ڕەزامەندییان حساب دەکرێت، نەك لەسەر نکوڵی کردنییان‌و پێچەوانەبوونەوەیان.

بەڵام ئەگەر بەتەواوی نەمانتوانی چەسپێنەری ئەوە بین کە ئەو بێدەنگییە بۆ ڕازی بوونەو، هەروەها نەمانتوانی کە ڕێگرەکانی بەردەم ڕاشکاوی (صريح) بوون، بسڕینەوە ئەوا ئێمە لەم حاڵەتەدا وای دەبینین، کە لەم ئیجماعە بێدەنگییە (سكوت) یەدا، تەنها ئەوەمان دەستکەوتووە، کە بەڵگەیەکی گوماناوی (ظني)یەو، ئەو ئیجماعە نییە، کە مەبەستمانە لە هاتنەدی ئیجماعی تێروتەسەل‌و تەواو.

## ١٧٤- دابەشبوونی ڕاجیایی موجتەهیدەکان، لە یەك پرسدا، بۆدووگفتو ناڕاستە[1]:

ئەگەر لەسەر دەمێك لە سەردەمەکاندا لەسەر حوکمی پرسێك موجتەهیدەکان ڕاجیاوازییان تێکەوتو، سەبارەت بە حوکمی ئەو پرسە دوو ڕای جیاوازیان دەربڕی، ئایا دروستە ڕای سێیەم‌و گفتی سێیەمیش هەر لەم بارەیەوە دەر ببڕدرێت؟ یان نا....؟!

زۆرینەی زانایان لەم بارەیەوە ڕێگرییان کردووەو، هەندێکیان ڕێگەیان داوەو، گروپێك ئەم پرسەیان بەلای ئەم درێژە باسەدا بردووە، کە لە خوارەوە ڕوونی دەکەینەوە:

- **گفتی یەکەم**: ڕێگرییان کردووە، کە ڕای سێیەمیش هەر لەم بارەیەوە بێتە ئاراوە، چونکە کورتهەڵهێنانی ئەو ڕاجیاوازییە لە دوو ڕاداو، لە دووقسەدا، خۆی لەخۆیدا ئیجماعێکی ناڕاشکاوانە (ظني)یە، و یاخود هەروەك ناویان ناوە ئیجماعێکی ئاوێتە (مركب)ە، لەسەر ئەو بنەمایەی کە لەو پرسەدا ڕای سێیەم بوونی نییەو، کارکردن بەڕای سێیەم، پێشێلکردنی ئیجماعەکە تێرو تەسەل‌و تەواوەکەیەو، ئەمەیش کارێکی نادروستە.لە ڕاستیدا، ئەم قسەیەش لاوازە، چونکە ئەوەی لێرەوە دەردەکەوێت ئەوەیە کە کار بەقسەو ڕای سێیەم ناکرێت‌و، دەرنەبڕینی شتێ‌و، ڕازی نەبوونی پێی، بەڵگەنییە لەسەر دەرنەبڕینی حەقیقی ئەو شتە، و لە نێوان ئەم دوانەشیدا جیاوازییەکی ڕوون هەیە، و ئەوەی ئەوان گوتویانە نابێتە

[1] إرشاد الفحول، ل٧٦-٧٧.

بەڵگەی ئەو ئاڕاستەیەی کە پێیدا چوون.

- **گفتی دووەم:** بە ڕەهایی بەدروستی دەزانن‌و، بەڵگەیشیان لەسەر ئەم قسەیەیان ئەوەیە کە لەبەر ئەوەی کە ڕاجیایی لە نێوان مەجتەهیدەکاندا لەسەر پرسێك دروست بووە، ئەمە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە، لەسەر ئەوەی کە لەسەر ئەو پرسە ئیجماع دروست نەبووە، چونکە ئیجماع بریتییە لە کۆکبوونی سەرجەم موجتەهیدەکان، نەوەك هەندێکییان......و کە ئەم کۆکبونەیش نەهاتەدی‌و، ئیتر هیچ ڕێگرێك لە ئارادا نییە، بۆ بەرپابوونی قسەو ڕای سێیەم‌و چوارەم‌و زیاتریش، چونکە ئەوە پێشێلی ئیجماعیان نەکردووەو، ئەم بەڵگەیەش، هەرچەندە لە ڕووکەشدا بەبەهێز دەردەکەوێت بەڵام لە حەقیقەتدا ئەمەیش لاوازە، چونکە دەکرێت، کە ئیجماع ڕووبدات، لە نێوان موجتەهید گەلێکی ڕاجیاوازدا، بەڵام ڕاجیاییەکەیان لە هەندێ شوێنی ئەو پرسەدا دەبێت، کە ڕاجیاییان لەسەری هەیەو، ئەو ئەندازەیەی کە لەسەری هاوڕاو کۆکن، لەوەدا ئیجماعەکەیان بۆ ئەژمار دەکرێت‌و، دروست نییە، سەرپێچی بکرێت‌و، لەبەر ئەوەی کە خاوەنانی ئەم ڕایە لەم حاڵەتە بێ ئاگابوون، بۆیە کەوتوونەتە ناو ئەو هەڵەیەوە، کە سەرجەم پرۆسەکەیان بە ڕەهایی بە دروست زانیوە!

- **گفتی سێیەم:** ئەم ڕای سێیەمە، پێویستی بەدرێژە باسێ هەیەو، پوختەکەی ئەوەیە کە ئەگەر لە نێوان ئەو خاوەن ڕاجیاوازانەدا ئەندازەیەکی هاوبەش هەبوو کە لەسەری کۆکبوون، ئیتر بەرپاکردنی ڕای سێیەم دروست نییە، کە پێچەوانەی ئەو ئەندازەیە بێت، کە کۆکبوونی لە سەر کراوە، چونکە ئەمە دەبێتە پێشێل کردنی ئیجماعێکی ئەنجامدراوو بەرپاکراوو، ئەمەیش کارێکی نادروستە، بەڵام ئەگەر هاتوو، ئەو قسەو ڕای سێیەمەی کە دواتر هاتۆتە کایەوە، هیچ دژایەتی‌و ناکۆکییەکی نەبوو، لەگەڵ ئەو ئەندازەیەدا، کە کۆکی تیادایە، لە نێوان کەسە ڕاجیاکاندا، ئەمە لێرەدا دروستە کە قسەو ڕایەکی تر لەم پرسەدا بەرپا بکرێت، چونکە لەم حاڵەتەدا ئەم ڕای سێیەمە، دژایەتی لەگەڵ هیچ جۆرە ئیجماعێکدا نییە، **و بۆ ڕوونکردنەوەی ئەم ڕایە چەند نموونەیەك دەهێنینەوە:**

أ- هاوەڵان سەبارەت بە میرات بردنی باپیرو برایانی دایك‌و باوکی‌و یاخود برایانی باوکی ڕاجیایان هەبووو، لەسەر دووڕا بوون، یەکەمیان ئەوەیە کە باپیر، ئەو برایانە بێ بەش دەکات‌و، نغرۆیان دەکات لەمیرات بردن‌و، تەنها خۆی میراتەکە دەبات، ئەگەر تەنها خۆیان بوون‌و، کەسی تریان لەگەڵدا نەبووو، دووەمیشیان ئەوەیە کە باپیر لەگەڵ براکاندا میرات

دەباتو، بێ بەشیان ناكات، جا ئەو ئەندازەیەی كە خاوەنی ئەم دوو ئاڕاستەیە تیایدا هاوبەشن، لە ڕاجیاییەكەیاندا، ئەوەیە كە كارێكی پێویستە باپیر لەگەڵ براكاندا میرات ببات، ڕاجیاییەكەیان لەوە دایە، كە ئایا باپیر، ئەو برایانەی بێ بەش (حجب) دەكات، یان نا..... جا لێرەدا بەرپاكردنی ڕای سێیەم، بەوەی كە باپیر لەگەڵ براكاندا میرات نابات، قسەیەكی نادروستە، چونكە ئیجماعە پێشووەكە پێشێل دەكات، كە دانی بەوە دانـاوە، كە بردنی میرات، لەلایەن باپیرەوە، لەگەڵ براكاندا كارێكی پێوستیەو، ئەمەیش ئەو ئەندازەیەیە كە لە ناو ڕاجیاییەكەدا لەسەری ڕێكەوتوون.

ب- هەروەها هاوەڵان سەبارەت بەماوەی دانیشتن (عدة)ی، ژنێكی سكپڕ، كە مێردەكەی مردبێت، ڕاجیاییان هەیە، جا گروپێكیان ڕایان وایە كە بە دانانی سكەكەی عیددەكەی بەسەر دەچێتو، گروپەكەی تر ڕایان وایە، كە هەركام لەو دوو عیددەیە ماوەیەكی درێژتری هەبوو، ئەوەیان كاری پێدەكرێت، واتە ئەگەر تێپەڕاندنی عیدەكە، لە چوارمانگو دەڕۆژ زیاتر كاتی كێشا، ئەمە عیددەكەیەتیو، ئەگەر بەماوەی دانانی سكەكەی كاتێكی زیاتری كێشا، ئەوا دانانی سكەكە بە عیددە بۆی دێتە ئەژمار، جا ئەو ئەندازەیەی كە هاوبەشە لە نێوانیاندا لەم ڕاجیاییەداو، لەسەری كۆكن ئەوەیە كە تەنها مانگ بەسەر بردنەكان، لە پێش دانانی سكەكەیدا بەس نییەو، بۆیە بەرپاكردنی ڕای سێیەم: بەوەی كە ئەو مانگانەی پێش دانانی سكەكە ئەژمار بكات، قسەیەكی نادروستە، چونكە ئەمە پێشێلكردنی ئەو ئەندازەیەیە كە لەسەری كۆكبوونو، دواجار پێشێلكردنی ئیجماعیش كارێكی نادروستە.

ج- ئینجا نموونەی بەرپاكردنی قسەو ڕای سێیەم، كە دژایەتی نەبێت، لەگەڵ ئەو ئەندازەیەدا كە لەسەری ڕێككەوتوون وەك، پرسی كورتهەڵهێنانی میرات لە باوكو دایكو یەكێ لە دوو هاوسەرەكەدا، كە لەم پرسەدا موجتەهیدەكانی چەرخی یەكەم ڕاجیاییان هەیە، جا هەندێكیان دەڵێن، بەشی دایك لەسەرجەمی ماڵەكەدا بە سێیەك دانراوەو، دەبێت بدرێتو، دواتر یەكێ لە دوو هاوسەرەكە بەشی خۆی دەبات، كە بۆژن چواریەكەو، بۆ پیاو نیوەی ماڵەكەیەو، دواتر ئەوەی كە ماوەتەوە، دەدرێت بە باوكەكەو، گروپێكی تر ڕایان وایە كە دایك سێیەكی ئەوەی دەدرێتێ، كە ماوەتەوە، لە دوای ئەوەی كە یەكێ لەم دوو هاوسەرە كە بەشە پێویستەكەی خۆیی برد، و ئەوەی دەمێنێتەوە لە میراتەكە، ئەوا باوك بە (میرات بەپشت بردن: عصبة) دەیبات.

موحەممەدی کوڕی سیرین (خوا لێی ڕازی بێت)، کە زانای سەردەمی تابعینە، ڕای وایە کە دایك لە تێکڕای ماڵەکە سێ یەك دەبات، ئەگەر ژنەکەو دایكو باوکی کابرا لە ژیاندا بوون‌و، دایکیش سێیەکی پاشماوەکە دەبات، لە دوای ئەوەی کە پیاوەکە بەشە پێوستەکەی خۆیی برد، لە حاڵێکدا کە لەگەڵ دایكو باوکی کابرای مردوو، ئەمان لە ژیاندا بوون، ئەم قسەیە دژی ئەو بەشە کۆکەی نێوان ئەو دوو ڕاجیاوازە نییەو، بە پێشێلکردنی ئیجماع‌و، پێشێلکردنی ئیجماع نایەتە ئەژمار، و بۆیە ئاساییە بگوترێت‌و دەرببڕدرێت.

د- شەرعزانەکانی چەرخی یەکەم، سەبارەت بە ئاستی مافی پیاو لە هەڵوەشاندنەوەی گرێبەستی هاوسەرێتیدا ڕاجیاییان هەیە، کە ئەگەر پیاوەکە لە ژنەکەیدا، بەڵەکی، یان شێتی، یان کەودەنی، یان دڕاوی‌و، یان بوونی ئێسك لە شەرمگای کچەکەدا بەدی کرد، ئەوا گروپێکیان ڕایان وایە، کە بەبوونی هەریەکێ لەم عەیبانە گرێبەستەکە هەڵدەوەشێتەوە، و گروپێکی تر ڕایان وایە کە هەڵوەشاندنەوەکە دروست نییە، چونکە پیاوەکە مافی تەلاقی لەدەستدایە، و ئەمە بڕیار دەری دۆخەکەیە، جا ئەگەر لەم سەرو بەندەدا هەندێ لە موجتەهیدەکان بڵێن، دروستە کە گرێبەستەکە بە فلان‌و فیسار لەو عەیبانە هەڵبوەشێتەوە، بەڵام بە فلانیان هەڵناوەشێتەوە، ئەم قسەیەیان بە پێشێلکردنی ئیجماع نایەتە ئەژمار، چونکە دوو قسە کە لەسەر ئەندازەیەکی هاوبەش کۆك نەبوون، کە بەشێك بن، لەو عەیبانەی کە ڕای سێیەم، لەسەر ئەوەیە کە شیاوی ئەوەن، گرێبەستەکەی پێ هەڵبوەشێنرێتەوە.

## ١٧٥- ڕای لە پێشتر، لە نێو ئەم گفتانەدا:

ڕای لە پێشتر (الراجح) لەم بارەیەوە، بریتییە لەڕای سێیەم، چونکە لە گۆشە نیگای حەقیقەتەوە تەماشای ئیجماع دەکات‌و، تەنانەت ئەگەر ئیجماع لە یەکێك لە لقەکانی پرسێکی پڕلە جیاوازیدا بەرپا کرابێت، ئەوا هەر بەدروستی نازانێت، کە قسەو ڕای سێیەم لە پێچەوانەیدابکرێت، بەڵام ئەگەر ئیجماع بەرپا نەکرابوو، ئەوا پێیان وایە، کە هیچ ڕێگرێك نییە، کە لەبەر دەم بەرپاکردنی ڕای سێیەمدا خۆی حەشار دابێت، چونکە قسەی سێیەمێ قەدەغەیە، کە پێشێلی ئیجماعە پێشووەکە بکات‌و، هەروەك بێژەرانی ڕای یەکەم دەڵێن، کە ئیجماعی پێشوو، لەسەر ئەو قسەو ڕاگەلە نەوەستاوە، کە خاوەنی ڕاجیاوازەکان بۆی چوون، تا بگوترێت، بەرپاکردنی قسەیەکی تر بەڕەهایی‌و موتڵەقی دروست نییە، و بەڵکو لەسەر حوکمی پرسەکان بنیات نراوەو، جاری وا هەیە کە لە هەندێ بابەتی چڵ‌و پوپەیی‌و،

لق‌و ئه‌وانه‌دا، جۆره كۆكبوونێ دێته ئاراوه، هه‌ر چه‌نده به شێوه‌یه‌كی گشتیو له‌سه‌ر ئاستی ڕه‌ها جیاوازیش بن، وه‌ك نموونه‌مان دا، بۆ وێنه له پرسی بردنی میراتی باپیردا، له‌گه‌ڵ براكان، خاوه‌ن ڕاجیاوازه‌كان، وه‌ك ئه‌وه وایه كه هه‌ندێكیان گوتبێتیان: باپیر ئه‌گه‌ر براكانی له‌گه‌ڵدابوو، میرات ده‌بات‌و، هه‌ندێكی تر ده‌ڵێن: ئه‌گه‌ر براكان له‌گه‌ڵ باپیر كۆبوونه‌وه‌ئیتر ئه‌وان میرات نابه‌ن جا ئه‌و بابه‌ته لاوه‌كییه‌ی كه له‌م پرسه‌دا له‌سه‌ری كۆكبوون ئه‌وه‌یه كه باپیر بێگومان میرات ده‌بات، بۆیه به‌رپاكردنی قسه‌یه‌كی نوێ، كه ئه‌م به‌شه لاوه‌كییه (جزئي) یه‌ی، كه له‌سه‌ری كۆك بوون هه‌ڵبوه‌شێنێته‌وه، دروست نییه.

## ١٧٦- به‌ڵگه و پاڵپشته‌كانی ئیجماع:

ئیجماع بێ دوودڵی پێویستی به به‌ڵگه‌و پاڵپشتی شه‌رعی هه‌یه، چونكه قسه‌كردن له ئاینی ئیسلامدا، به‌بێ زانیاریو، به‌بێ به‌ڵگه قسه‌یه‌كی پڕوپوچه‌و، هه‌ڵه‌یه‌كی ته‌واوه،و ئه‌مه‌یش دروست نییه‌و، نابێ ڕووبدات، چونكه گه‌لی ئسلام پارێزراوه له هه‌ڵه، به به‌ڵگه‌ی ئه‌و فه‌رموودانه‌ی كه باسمان كرد، و پاڵپشت‌و به‌ڵگه‌ی ئیجماعیش جاری وا‌هه‌یه، كه قورئانه‌و، جاری واهه‌یه، كه سوننه‌ته، جا ئیجماع له‌سه‌ر حه‌رامی ماره‌كردنی داپیره‌كان‌و، كچانی كوڕو، كچانی كچ، له‌هه‌ر پله‌یه‌كدابن، پاڵپشت‌و به‌ڵگه‌ی ئه‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌یه كه ده‌فه‌رموێت: ﴿ حُرِّمَتْ عَلَيْكُمْ أُمَّهَٰتُكُمْ وَبَنَاتُكُمْ ﴾[1] واته: دایكانتان‌و كچه‌كانتان لێتان حه‌رام كراون، كه ئیجماع لێره‌دا له‌سه‌ر ئه‌وه‌یه، كه مه‌به‌ست له (أمهات: دایكانتان) له‌م ئایه‌ته پیرۆزه‌دا، بریتییه له بنه‌ڕه‌تی ژنه‌كان، كه داپیره‌كان تا كوێ گه‌یشتبن، ده‌گرێته‌وه‌و، مه‌به‌ستیش له (بنات: كچه‌كان) لقه‌كانی ژنانه، كه كچی خۆیو كچی كوڕو كچه‌كانی خۆی، تا كوێ ده‌گات، ده‌گرێته‌وه.

ئه‌و ئیجماعه‌یش كه پاڵپشته‌كه‌ی سوننه‌ته، وه‌ك ئیجماع كردنیان له‌سه‌ر ئه‌وه‌ی كه ده‌بێت شه‌ش یه‌ك بدرێت به داپیره، چونكه پێغه‌مبه‌ر (ﷺ) شه‌ش یه‌كی داوه به داپیره.

ئینجا زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ، سه‌باره‌ت به ئاستی دروستی به‌رپابوونی ئیجماع، به پاڵپشتی ئیجتیهادو قیاس، ڕاجیاییان هه‌یه‌و، هه‌ندێكیان به دروستیان زانیوه‌و، هه‌ندێكیشیان ڕێگرییان لێ كردووه، وه‌ك (الأمام داود الظاهري)و (إبن جرير الطبري)، و ئێمه

---

[1] سورة (النساء/ ٢٣).

بە لای ئەو ڕایەدا دەچین، کە زۆرینەی بەلایدا چوون، کە بێگومـان لەسـەر دەمـی هاوەڵانـدا (خوا لێیـان ڕازی بێـت) ئیجمـاع بـەرپاکراوە، بـە پاڵپـشتو بەڵگـەی ئیجتیهـادو قیـاس، کـە ئیجماعیـان کـردووە، لەسـەر کۆکردنـەوەی قورئـانی پـیرۆزو، پاڵپـشتو بەڵگـەیان، تـەنها بەرژەوەندی تیادابوون بووە لەو پرسەدا، کە ئەمەیش بەشێکە لە بەشەکانی ئیجتیهاد کردن، هەروەك ڕازی بوون، لەسەر قسەکەی پێشەوا عوسمانی کوڕی عـەففان کـە بـانگی سـێیەمی داوە لە نوێژی هەینیدا، و بەڵگەو پاڵپشتیشیان ئـەوەبووە کـە بەرژەوەنـدی خـەڵکی لـەوەدا بووە، کە بەو بانگانە ئاگادار بکرێنەوە، لەکاتی هاتنی کردنی نوێژی هـەینی، بەتایبـەت ئـەو خەڵکانەی کە دوورن لەمزگەوتەوەو، هەروەها ئیجماع کردنیان لەسەر حەرامی پیوی گۆشتی بەراز، بەقیاس کردنیان لەسەر ئـەوەی کـە گۆشـتەکەی حەرامە، کەواتـە پیوەکەیـشی هـەر حەرامە[1].

## ١٧٧- ئاستی گونجانی بەرپابوونی ئیجماع و ڕاجیایی لەم پرسەدا:

جـەماوەری زانایـان ڕایـان وایـە، کـە لـە حەقیقەتـداو بـە پراکتیکـی ئیجمـاع ڕوودەداتو، هەندێکیشیان پێیان وایە، کە هـەرگیزو لـە بنەڕەتـدا ئـەم جـۆرە کۆکبوونـەی کـە بـەئیجماع نـاوزەد کـراوە، ڕوونـاداتو، لەوانـەی کـە ئـەم ڕایـەی هەیـە، زانـای مـەزنی موعتەزیلـەکان (النظام)ـە!

ئەوانەی کە ڕایان وایە، ئیجمـاع ڕوونـادات، ئـەوەیان کردۆتـە بەڵگـە کـە زانیـاریو زانینـی خـودی موجتەهیـدەکان کـارێکی سـەخت و دژوارەو مەحاڵـە چـونکە هـیچ پێـوەرو چـوار چێوەیەکی ڕێسایی نییـە، کـە موجتەهیـدو ناموجتەهیـد لـە یـەکتری جیابکاتـەوەو تەنانـەت ئەگەر کەسێك لە شارێکدا ببێتە موجتەهیدو، بـە موجتەهیـد بناسـرێت، ئـەوا لـە شـارەکانی ترەوە نکۆڵی لەو پلەیەیو لە تواناکەی دەکرێتو، جاری وامەیە کە لەناو شارەکەی خۆشیدا نکۆڵی دەکرێتو، دانی پیادانانرێتو، تەنانەت ئەگەر نکۆڵی لێ نەکـەن، لـە دانپیانانیـداو، بـە موجتەهیدی بزانن، هەر زۆر سەختە، کۆکردنەوەو کۆکبوونیان لەسەر ڕایەكو، یاخود خستنە بەرچاوی هەر پرسێك بۆیەك بەیەکیان، چونکە بەشارو ناوچە جیاجیاکاندا بڵاو بوونەتـەوەو، ئەگەر بمانەوێت کە ئەو پرسە بخەینە بەردەم موجتەهیدێك هەر لە وڵاتەکەی خۆیدا، دیسان ئەمەیش کارێکی سەختو دژوارە، کە بمانەوێت پرسەکەی بخەینـە بـەردەم یـەك بەیـەکیانو

[1] الآمدي، ب١، ل ٣٢٠.

ڕای هەر یەکێکیان لەسەر ئەو پرسە بزانین، بە جۆرێ کە ئاسودەکەرو دڵنیابین لەم بارەیەوە، بە شێوەیەکی متمانەدارو، دواتریش بێگومان بین کە تا دوارامان لەو بارەیەوە وەرگرتووە، ئەو لەسەر ڕایەکەی خۆی ماوەتەوەو، سەرەڕای ئەمانە هەموویش ئیجماع هەر پێویستی بە بەڵگەو پاڵپشت هەیە، جا ئەگەر ئیجماعەکە یەکلاکەرەوە (قطعي)بوو، ئەوە خەڵکی دەیزانن‌و، عادەتەن لێی بێ ئاگا نابن، چونکە خۆی لە خۆیدا (قطعي) بوون، ئەوەیە کە ناسراوو بڵاوبێت‌و، پێویستی بە ئیجماع نەبێت‌و، ئەگەر بەڵگەکە تەمومژاوی (ظني) بوو، ئەوە ڕێکەوتن لەسەری مەحاڵە، چونکە موجتەهیدەکان لەهزرو سروشتیاندا لە دەرهێنانی ئەحکامەکاندا جیاوازن.

بەڵگەی جەماوەری زانایانیش ئەوەیە کە دەڵێن: ئەوانەی بەرپا بوونی ئیجماع بە مەحاڵی دەزانن، تەنها ترس‌و گومان دروست دەکەن، لەسەر کارێك، کە دەکرێت ڕووبداتو بەر پابکرێت‌و، بۆیە گوێ بەڕایەکەیان نادرێت.

بەڵگەی گونجانی ڕوودانی ئیجماع لای ئەمان ئەوەیە، کە ئەم پرسە بەکرداری ڕوویداوە، بۆ نموونە لەسەر دەمی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێت) ڕوویداوە، و بەرپا بووە، و لەوانیشەوە ئیجماعی زۆر بۆ ئێمە گواستراوەتەوە، وەك ئیجماع کردنیان لەسەر ئەوەی کە نەنك، لە میراتدا شەش یەك دەبات، و هەروەها ئیجماعکردنیان لەسەر ئەوەی کە ئەگەر ئافرەتی موسڵمان شوو بەکافر بکات، گرێبەستەکەی دانامەزرێت‌و، هەروەها ئیجماعکردنیان لەسەر ئەوەی کە لەژن مارەکردندا، ئەگەر مارەییەکەیشی دیاری نەکرێت، ئەوا ئەو گرێبەستە هەر دروستە و ئیجماعکردنیان لەسەر ئەوەی کە نابێت ئەو زەوییانەی لەلایەن سوپای ئیسلامەوە دەستیان بەسەردا گیراوە، بەسەر چەکدارە فەتح کارەکاندا دابەش بکرێت‌و، هەروەها ئیجماعکردنیان لەسەر ئەوەی کە براو خوشکی تەنها باوکی، لەکاتی نەبوونی خوشك‌و برای دایکی‌و باوکیدا، دەگەنە هەمان حوکم‌و، وەك دایك‌و باوکییان پێ دێت‌و، هەروەها ئیجماعکردنیان لەسەر ئەوەی کە کوڕ دەبێتە ڕێگر لە میراتبردنی کوڕەزاو، چەندەها ئیجماعی زۆرو بێ شوماری ترو، بۆیە بەرپابوونی ئەم ئیجماعانە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوە (قاطع)ـە، لەسەر ئەوەی کە دەکرێت ئیجماع ڕووبدات، و ئیتر چۆن دەگوترێت: ئیجماع ڕووی نەداوەو، ڕوونادات؟!!

## ١٧٨- درێژە باسێكی پێویست، لەسەر ئەم ڕاجیاییە:

بەڕای ئێمە لەم ڕاجیاییەدا، پێویستمان بە درێژەباسێك هەیە، بەم شێوەیەی لای خوارەوە، ئێمە ڕای جەماوەری زانایان بەڕەهایی (مطلق)ـی، وەرناگرین‌و هەروەها بەڕەهایی قسەی ئەوانەیش وەرناگرین، كە ڕوودانی ئیجماع بە مەحاڵ دەزانن‌و، ئەو درێژە باسەی كە ئێمە بە پێویستی دەزانین، زیاتر بەو بارەدایە، كە تاوتوێی ئەو قسەو بەڵگانە بكەی، كە ئەو گروپە دەیكەن، كە ڕایان وایە ئیجماع ڕوونادات، و لەم بارەیەوە دەبێژین:

یەكەم: ئەوەی كە گروپی بێ بڕوا بە بەرپابوونی ئیجماع بەبەڵگە دەیهێننەوە، و دەڵێن، پێویستە بەڵگەو پاڵپشتی ئیجماع، ئەگەر یەكلاكەرەوە (قطعی)بوو، ئیتر ئەوە لە خەڵكی شاراوە نییە، و ئیدی پێویستی بە ئیجماع لەسەر كردنی نییەو ئەگەر بەڵگەو پاڵپشتەكەیان تەمومژاوی (ظني) بوو، ئەوەیش ڕێكەوتن‌و كۆكبوونیان مەحاڵە، بۆیە ئیجماعی لەسەر بەرپا ناكرێت، ئەم قسەیە بە هەردوو ڕەهەندو بەشەكەیەوە نابێتە بەڵگە بۆ ئەو قسەیەی ئەوان، چونكە ئیجماع بەبوونی بەڵگەی قطعی ، زیاتر بەهێز دەبێت‌و، ئیتر پێویستیمان بە گەڕان نابێت، بە دوای بەڵگەكانیداو، ئەگەر بەڵگەو پاڵپشتی ئیجماعەكە ظەننی بوو، وەك فەرموودەی ئاحاد، ئەوە عادەتەن ئاست گونجانی ئیجماع كردن لەسەری بە كارێكی مەحاڵ نازانرێت، ئەگەر ئەم بەڵگە (ظني)یە، و ماناكەی ڕۆشن‌و دەلالەتەكەی لەسەر ئەو شتە ڕوون‌و ئاشكرابوو، لەم حاڵەتەدا، ئەو بەڵگە (ظني) یە، بە هۆی ئیجماعەكەوە هێز پەیدا دەكات‌و، دەگاتە ئاستی دەلیلی قطعی.

دووەم: سەبارەت بەو بەڵگەیەیان، كە پێیان وایە ناگونجێت‌و ناكرێت، كە خودی موجتەهیدەكان ئاگادار بكرێنەوە لەسەر ئەو پرسە و زانیارییان پێ بدرێت لەسەری، چونكە بەشارو ناوچەكاندا پەرش‌و بڵاو بوونەتەوە، و هتد.... ئەم قسەیە زیاتر شایانی تیارامان‌و تاوتوێ كردنەو، ئەوەی هەقە لەم بارەیەوە بگوترێت، ئەوەیە كە سەردەمی سەلەف (خوا لێیان ڕازی بێت) دابەش دەبێت، بۆ دوو بەشی ڕوون‌و دیارو ئاشكرا، یەكەمیان سەردەمی هاوەلانە (خوا لێیان ڕازی بێت)و دووەمیان سەردەمی دوای ئەوانە.

جا لەسەر دەمی هاوەڵاندا (خوا لێیان ڕازی بێت)و، بەتایبەتی لەسەر دەمی پێشەوایان ئەبوبكرو عومەردا (ڕەزای خوایان لێ بێت) موجتەهیدەكان كەم بوون‌و، بەتەواوی ناسرابوون، و زۆربەیشیان لە شاری مەدینەدا بوون، و یاخود لە جێگایەكدا بوون، كە

گەیشتنە لایان ئاسان بوو، تا رایان بزانرێت‌و، ئیجتیهاد ئەو کاتە شێوازی راوێژکاری (شوری)ـی، وەرگرتبوو، جا لەو سەردەمەداو لەو حاڵەتەدا، بەرپاکردن‌و کۆکبونی ئیجماع ئاسان بوو، و لە راستیدا روویشیداوە، و بەرپاکراوە، و ئیجماعی زۆریش لێیانەوە گواستراوەتەوە بۆمان، لەوانە ئەو ئیجماعانەی کە جەماوەری زانایان وەك بەڵگە بەکاریان هێناون‌و کەمێك پێش ئێستا باسمان لێوە کردن‌و هێنامانن، بەڵێ! لەوانەیە بگوترێت، کە ئەو ئیجماعانە سەرجەمیان ئیجماعی بەراشکاوانە (صریح) نەبوون، و ئەمەیش راستە و ملکەچی دەبین‌و نکۆڵی لێ ناکەین، بەڵام ئایا ئەمە چی تیایە؟! چونکە ئیجماعی بێدەنگی (سکوتی)، وەك ئیجماعی راشکاوی (صریح) وایە، لەلای چەند گروپێکی زانایان، هەروەك گوتمان‌و، ئەگەر بیشگوترێت، ئیجماعی (سکوتی) لەلای هەندێ لە زانایان بەبەڵگە ئەژمار ناکرێت، کەواتە: ئیجماعی (سکوتی) هاوەڵانیش (خوا لێیان رازی بێت) نابێتە بەڵگە لەسەر بەرپابوون‌و رووداني ئیجماع‌و، نابێتە بەڵگەیش بۆ کەسانی تر، بۆیە ئێمە دەڵێین: پێویستە ئیجماعی (سکوتی) هاوەڵان، لەپلەی ئیجماعی راشکاوانە (صریح)دا، بێتە ئەژمار، لەبەر چەند پێودانگ‌و هۆکارێك، لەوانە، کەمی ژمارەیان‌و، ناسینی یەکەبەیەکەیان وەك گوتمان‌و، هەروەها لەبەر ئەو زانیارییەی کە هەمانە لەسەر پەرێزپاکی ژیانیان‌و هەوڵدان‌و پەلەکردنیان بۆ قسەی هەق‌و ئەو راستییەی کە دیویانەو، بێ ترس لەهیچ کەس درکاندوویانەو، ئەمەش وەك جەختکردنەوەو، سوری ئەوان لەسەر ئەو پەیمانەی کە خوای گەورە لە زانایانی وەرگرتووە، کە دەبێت وابن، لە پابەندبوونیان بەدرکاندن‌و روونکردنەوەی راستی‌و نەشارینەوەی، و لێرەدا ئەوەمان بەسە بۆ بەڵگە هێنانەوە لەسەر ئەو قسەیەمان، کە باسی ئەوە بکەین، کە ئەم خەسڵەت‌و رەوشانەی باسمان کردن، ئەوەندەگشتییە بۆ ئەو سەردەمە تەنانەت تاکە تاکەی مسوڵمانەکانیشیان دەگرێتەوە ئەوەتا رۆژێکیان ئافرەتێ لە ئیمامی عومەر راپەڕی‌و، نکوڵی کرد، لێی، کە ویستی رێژەی مارەیی ئافرەت کەم بکاتەوەو لەسەر دوانگە وتاری دەخوێندەوە، بێ ئەوەی کە ژنەکە ترسی هەبێت، رای خۆی دەربڕی‌و، چیرۆکی بیلال (خوا لێی رازی بێت)، کە لەگەڵ پێشەوا عومەری کوڕی خەطابدا کەوتە تاوتوێ کردن‌و موناقەشە سەبارەت بە پرسی دابەشکردنی زەوییە فەتحکراوەکان، کە ئەمە شتێکی زۆر بڵاوو ناسراوە، کە لێرەدا بیلال پێچەوانەی راکەی پێشەوا عومەری هەبووەو، بە ئاشکرا درکاندی‌و، تەنانەت قسەی توندیشی بەرامبەری کردو، پێشەوایەتی عومەر نەبوویە هۆی رێگری کردن لە بیلال، کە نەتوانێت پێچەوانەی راکەی ببێتەوەو، پێشەوا عومەر تەنها

ئەوەی توانی کە بڵێت: ((خودایا! من لەدەستی بیلالو هاوڕێیانی نەجات بدە!))و لەمەزیاتر هیچی نەگوتو، هیچ توندی بەرامبەری نەنواند، جا ئەمە ڕەوشوشانو شکۆی ئەو پیاو گەلە بوویێت، ئیتر زۆر سەختە، بڕوا بەوە بهێنین، کە بێدەنگ بوونی موجتەهیدەکانیان، لەبەر ناڕازی بوونو کۆك نەبوونیان بوو بێت! و بەڵکو ئەمە پێداگیری لە ئێمەدا لەسەر ئەوە دروست دەکات، کە نزیکە بڵێین، بێدەنگی ئەوان، هی ڕازی بوونو کۆکبوونیانە، مادام ڕایەکە گەیشتبێتە لایانو، هەروەك گوتمان لەبەر ئەوە کەکەم بوون، گەیشتنی ڕاکان بۆلایان، ئاسان بووە، چونکە یان دانیشتووی شاری مەدینە بوون، یان دانیشتووی جێگا نزیکەکانی ئەو شارە بوون.

بەڵام سەبارەت بە سەردەمی دوای هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) ئەوە بەڕاستی زۆر سەختە بڕوا بەوە بهێنین کە ئیجماع ڕووی داوە، بەهۆی پەرشو بڵاوی شەرعزانەکان لە جێگاو دوورە دەستەکانداو، زۆری موسڵمانو زیاتر بوونی ژمارەیانو، جیاوازی هزریی نێوانیانو، بەرپا نەبوونی ئیجتیهاد بەشێوەی شورا، وەك سەردەمە پێشووەکە، ئەمانە هۆکارن، کە ناتوانرێت بگوترێت ئیجماع ڕووی داوەو، بەرپا بووەو، دواجار ئەوەی دەتوانرێت کە بگوترێت، ئەوەیە کە حوکمی ئیجتیهادی لە هەندێ پرسدا بەرپا بووەو، بڵاو بوتەوەو، دژایەتیو پێچەوانە بوونەوە بۆ ئەو ئیجتیهادانە ڕووی نەداوەو، نەزانراوەو، نەدیتراوە، بەلام نەناسینی کابرای نەیارو پێچەوانە – بەپێی ئەو بارودۆخەی کە باسکرا– نابێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە ئیتر کەسی نەیارو پێچەوانە بوونی نییەو، لە دەرەنجامدا ناتوانین ئەمە بە ئیجماعو تەنانەت بە ئیجماعیی بێدەنگی (سکوت)یش، ئەژماری بکەین.

## ١٧٩- بایەخی ئیجماع لەم سەردەمەداو، ئاستی گونجانی ڕوودانو بەرپابوونی:

ئیجماع سەرچاوەیەکی گرنگە لەسەر چاوەکانی شەریعەتی ئیسلام، و بەڵگەیەکە لەو بەڵگانەی ئەحکام، کە شایەتی لەسەر دروستیو خاوەن پێگەییەکەی دراوە، و دەکرێت لە زانینی حوکمی شەرعی پێشهاتە نوێیەکان، کە لەم سەردەمانەدا زۆرن، سودی لێ وەربگیرێت، بەڵام ئەوەندە هەیە، کە ئەو سوود لێ وەرگرتنە کاتێك بە تێرو تەسەلی دەبێت، کە سەرجەمی شەرعزانەکان ئامادەبنو، پرسەکەیان بخرێتەبەردەمو، ڕای ئەوان بزانرێت، لەسەریو، ئەوەش بەڕای ئێمە کاتێك ڕێگای تەواوو دروستی خۆی وەردەگرێت، کە کۆمیتەیەکی فیقهی پێکبهێنرێت، کە سەرجەمی شەرعزانەکانی جیهانی ئیسلامیی لە خۆ

بگرێـت و، ئـەو کۆمیتەیـە جێگایـەکی دیـاری کـراوی هـەبێت و، سـەرجەم ئـەو شـتانەی کـە پێویستین لە ماڵ و دارایی و کتێب و، پێداویستیەکانی تر، بۆ بۆیـان ئامـادە بکرێـت و، بخرێتـە بەردەستیان و، لەکات و خولی دیاریکراودا کۆبوونەوە ساز بدەن بەپێی سیستمێکی دیاریکراو، ئینجا پرسەکان و پێشهاتە نوێیەکان دەخرێنە بەردەمیان، تا تاووتوێیان بکـەن، و تێـرابمێنن بـۆ چەسـپاندنی حـوکم بۆیـان، لەبـەر ڕۆشـنایی دەقـەکانی شـەریعەت و، یاسـا و ڕێـساو، بنچینەگشتیەکانیداو، دواتر ئەو ئەحکامانە لە بڵاوکراوەی خـولی و، یـان لـە پـەڕاوی تایبەتـدا بڵاو بکرێنەوە، تا خەڵك ئاگادار بن، لـە سـەریان و، هـەروەها تێڕوانینـی زانایـان لەسـەر ئـەو پرسـانە تیایانـدا بـڵاو بکرێتـەوە، چـونکە بـۆی هەیـە کـە هەنـدێ لـە شـەرعزانەکان، بۆیـان نەکرابێت کـە لەبـەر هـەر هۆکارێـك بێـت پەیوەنـدی بـەو کۆمیتـە فیقهییـەوە بکـەن، و جـا داوادەکرێت لەو کەسانە کە ڕاکانیان ڕاستەوخۆ بنێرن بۆ ئەو کۆمیتە فیقهییە، یاخود بینێرن بۆ نوسینگەکانیان لە جێگا جیاوازەکاندا، و هەروەها هیچ گرفتێکی تیادانییە، کە ئەو لایەنـە سوود لە ڕادیۆو تەلەفزیۆن و، کەناڵە ئاسمانییەکان وەربگرێت، تا پەیامەکانیان زیـاترو زیـاتر بڵاو ببنەوە و خەڵکی بیانبیستێ، و دواتر کۆمیتەی فیقهی تەماشای ئەو ڕایانە بکـات کـە بـە دەستیان گەیشتووە، لەسەر پەیامە بڵاوکراوەکانیان، جا ئەگەر ئەنـدامانی کۆمیتـەی فیقهـی لەسەر هەر حوکمێ کۆك و هاوڕابوون، ئەوە ئـەو حوکمـە بـەئیجماع ئـەژمار دەکرێـت، و ئـەم ئیجماعەیش نزیکە بەو ئیجماعەی کە زانایانی زانستی ئوصولـی فیقهـ، لەسەری ڕێکەوتوون و، کارکردن بەو حوکمە ئیجماع لەسەر کراوە پێویست و واجبە.

# ﴿بەشی چوارەم﴾

# بەڵگەی چوارەم: ( بەبەرداگرتن : القیاس )

## ١٨٠- پێناسەی (( قیاس )):

قیاس، لە زمانی عەرەبیدا، بریتییە لە ئەندازە گرتنی شتێك بە شتێكی تـرو، بـۆ بـەرگرتن بەیەكتریدا بەكار دەهێنرێت، وەك دەگوترێت، زەوییەكەم بـە مـەتر ئەنـدازە ((قیـاس)) كـرد واتە: بە مەترەكە ئاستو ئەندازەو قیاسیم گرت.

هەروەها بۆ بەرابەری پێكردن ((مقارنة))ـی، شتێك، بە غەیری خۆی بەكار دەهێنرێـت، تـا ئەندازەی هەر یەكێكیان لـە چـاوی ئـەوی تریانـدا بـزانین‌و، بۆمـان دەركـەوێتو، دواتـر ئـەم ووشەیە بڵاو بوویەوەو، زیاتر بۆ رێككردن ((تسوية)) بەكار هـات، لـە نێـوان دووشـتدا، ئـیتر چونكە ئەو دووشتە بەرجەستەو هەستو هەستدار ((حسي)) بن، یان نادیار ((معنوي)) بـن، ((حسيّ))، وەك ئەوەی كەسێك بڵێت: ئەم لاپەڕەیەم بەو لاپـەڕەیـە قیـاس كـرد، واتـە رێكـی یـەكتریم كـردن و نموونـەی مەعنـەوی، وەك ئـەوەی كەسـێك بڵێـت: زانـستی فلانەكـەس، بەزانستی فیسارە كەس قیاس ناكرێت، واتە: لە زانستدا رێك نین‌و، ئەمیان لە ئاسـتی ئـەوی تریاندا نییە.

لە زاراوەی زانایانی ئوصولی فیقهدا، قیاس بریتییە لـە لكانـدن‌و خـستنە سـەری شـتێ لـە رووی حوكمـەوە كـە دەق لەسـەر حوكمەكـەی نـەهاتووە، بـەو شـتەوە كـە دەق لەسـەر حوكمەكەی هاتووە، بەهۆی هاوبەش بوونیان، لە هۆكاری حوكمدا.

یاخود پێشهاتێك كە دەق لەسەر حوكمەكەی نەهاتووە، لەگەڵ پێشهاتێكی تـردا كـە دەق لەسەر حوكمەكەی هاتووە، یەكسانیان بكەینەوە بە هۆی ئـەوەوە كـە ئـەو دوو پێـشهاتە لـە هۆكار (علّة)ـی، حوكمەكەدا یەكسانن[1].

روونكردنەوەی ئەم پرسەیش ئەوەیە كە شەرع، لە پێشهاتی وادا هەیە، كە بەدەق لەسـەر حوكمێكی دیاریكراو دواوە و دیاری كردووە، و موجتەهیدیش هۆكار (علّة)ـی، ئـەو حوكمـە

---

[1] بروانە پێناسەكانی تری ((قیاس)) لە (شرح الورقات في الأصول، للأمام الحرمین، ل ١٩٧-١٩٨، و إرشادت الفحول، ل ١٩٨، والأمدي، ب٣، ل٢٦٣، و دواتریش، المستصفى، للامام الغزالي، ب٢، ل٥٤.)

پـێ دەزانێـتو، دواتـر پێـشهاتێکی تـر ڕوودەدات، کـە دەق نییـە، لەسـەر دیـاریکردنی حوکمەکەی، بەڵام لەڕووی هۆکار (علة)ی حوکمەکەوە، یەکسانە بە حـوکمی ئـەو پێشهاتەی ڕابردوو، جا کەسـی موجتەهیـد ئـەم پێشهاتە دەخاتـە سـەر ئـەو پێشهاتەی ڕابـردووو، لـە حوکمـدا یەکسانیان دەکاتـەوە، ئـەم خـستنە سـەرو یەکسانکردنە بریتییـە لـە (قیـاس)، و زانایـانی ئوصـولی فیقهــ، دەسـتەواژەی تریـشی بـۆ بـەکار دەهێـنن، وەك دەسـتە واژەی، (یەکسان کردنی دوو پێشهات لە حوکمدا)و، یاخود (تێپەڕاندنی حـوکم لـە پێشهاتێکەوە بـۆ پێشهاتێکی تر)، جا ئـەم دەسـتەواژانە (خـستنەسەر: إلحـاق)و، (یەکسان کـردن: تـسوية)و (تێپەڕانـدن: تعديـة) هـەموویان بەڵگـەن، لەسـەر یـەك مانـا کـە بریتییـە لـە تێپەڕانـدنی ئـەو حوکمەی کە سەبارەت بە هەرپێـشهاتێ دەقـی لەسـەرە، بـەو پێشهاتانەی کـە لـە عیللەتـدا یەکسانن پێی، و ئەم کارەیش (قیاس) کردنە.

(قیاس) حوکم ناچەسپێنێت، بەڵکو تەنها ئەو حوکمە ئاشکرا دەکات، کە لەهـەمان کاتـدا، کەلە قیاس لەسەر کراوەکەدا بوونی هەبووە، لە خودی قیـاس پێکراوەکەیـشدا هـەبووە، بـە بەڵگەی بوونی عیللەتی حوکمەکە لە هەردوو کیان (المقيس والمقيس عليه)، و تەنها شتێ کە لەم پرسەدا هەیە، ئەوەیە کە دەرکەوتنی حوکمەکە لەشـتە قیـاس پێکراوەکـەدا (المقـيس)، کـەمێك دواکـەوتووە، تـا لەلایـەن موجتەهیدەکـەوە، عیللـەتی حوکمەکـە لـەو شـتە قیـاس پێکـراوەدا ئاشـکرا کـراوە، کەواتـە: لـەم حاڵەتـەدا (قیـاس) ئاشـکراکاری حوکمەکەیـەو، چەسـپێنەری نییـەو، کـاری موجتەهیـد تـەنیا لـە زانـینو ناسـین عیللـەتی حوکمەکەدایـە،و هەروەها لە ڕوونکردنەوەی هاوبەشـیی قیـاس لەسـەر کـراو (المقـيس عليـه)و قیـاس پێکـراو (المقيس)، لە حوکمەکـەدا، و دوا جـار ئـەوە دەردەخـات، کـە حـوکم لـە هەردووکیانـدا یـەك حوکمە.

**١٨١- پایەکانی ((قیاس)):**

**لـە پێناسـەی زاراوەیـی (إصـطلاحي) قیاسـدا، ئـەوەمان بـۆ ڕوون دەبێتـەوە، کـە پایەکانی قیاس چوارن، بەم شێوەیە:**

یەکەم: ئەسڵەکە، کە بەقیاس لەسەر کراو (المقيس عليه)یش ناوزەد کـراوە، کـە بریتییـە لەو شتەی کە دەق لەسەر حوکمەکەی هاتووە.

دووەم: حوکمی ئەسڵەکە، کە بریتییە لەو حوکمە شەرعییەی کە لەئەسڵدا دەقـی لەسـەر هاتووەو، دەمانەوێت ئەو حوکمە تێبپـەڕێنین لـە ئەسـڵەکەوە بـۆ لـق (فـرع)ـەکە، و لەسـەر

ئەویشی بچەسپێنین.

**سێیەم:** لق (الفرع)، کە بەقیاس پێکراو (المقیس)یش ناو زەد کراوە، کە بریتییە لەو شتەی کە دەق لەسەر حوکمەکە نەهاتووەو، دەمانەوێت لە ڕێگای قیاسەوە، حوکمی ئەسڵەکەی بەسەردا جێگیر بکەین.

**چوارەم:** هۆکارو فاکتەر (العلة)، کە بریتییە لەو خەسڵەتو وەسفەی کە لە ئەسڵەکەدا هەیەو، هەر لەبەر ئەوەیشە شەرع ئەو حوکمەی بەسەردا داوەو، لەبەر ئەوەی کە ئەو هۆمارە لە فەرعەکەشیدا هەیە، بۆیە دەمانەوێت یەکسانی ئەسڵەکەی بکەین، لەو حوکمەدا.

بەڵام ئەو حوکمەی کە بەڕێگای قیاسکردن لەفەرعەکەدا دەیچەسپێنین، ئەوە بەرهەم و دەرەنجامی پرۆسەی قیاسکردنەکەیە، و لە پایەکانی قیاس نییە.

## ١٨٢- نموونە گەلێك لەسەر قیاس:

**یەکەم:** دەق هاتووە لەسەر حەرامی ئارەق، و دەقەکەیش ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارە کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡخَمۡرُ وَٱلۡمَيۡسِرُ وَٱلۡأَنصَابُ وَٱلۡأَزۡلَٰمُ رِجۡسٞ مِّنۡ عَمَلِ ٱلشَّيۡطَٰنِ فَٱجۡتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمۡ تُفۡلِحُونَ ﴿٩٠﴾﴾[١] واتە: پێشتر مانامان کردو تیاید ئەوە هاتووە، کە ئارەقخواردنەوە حەرامەو، ئارەقیش لەلای گوپێ لەزانایان، ناوێکە، بۆ ئەو گیراوە سەرخۆشکەرەی کە لە ترێ دروست دەبێت، نەك لەشتی تر[٢]، کە ئەمە ئەسڵێکە کە دەق لەسەر حوکمەکەی هاتووە، کە حەرام بوونیەتی‌و، پاشان ئاوی خورما، یان ئاوی جۆ، فەرعەو، دەق لەسەر حوکمەکەی نەهاتووە، بەڵام هۆکارو عیللەتی حوکمەکە، کە سەرخۆشکردنە تیایدا هەیە، بۆیە قیاس دەکرێتە سەر ئارەق، چونکە لە عیللەتەکەدا هاوبەشن‌و، بۆیە حوکمی ئارەقی هەیە، کە حەرامبوونە.

**دووەم:** کوشتنی میراتدەر، لەلایەن میرات بەرەوە ئەسڵە، و بنەڕەتو بنەمایە، کە دەق لەسەر حوکمەکەی هاتووە، کە میرات نابات‌و، دەقەکەیش ئەم فەرموودەیەی پێغەمبەریش

---

[١] سورة (المائدة/٩٠).

[٢] لەڕاستیدا (خمر: ئارەق)، ناوە بۆ گشت سەرخۆشکەرێك، هەروەك لە فەرموودەی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرمووێت: (کل مسکر خمر و کل خمر حرام)، واتە: هەموو سەرخۆشکەرێ ئارەقو، هەموو ئارەقێ حەرامە، بەڵام بۆیە قسەی ئەم شەرعزانەمان هێنایەوە،تا پرۆسەی قیاس باشتر ڕوون بکەینەوە.

(ﷺ) كە دەفەرموێت: (لايرث القاتل) بكوژ میرات نابات‌و، هۆكاری حوكمەكە ئەوەیە كە كوشتنی بەدەست ئەنقەست ئامرازە بۆ هێنانە پێشەوەی كارێك پێش هاتنی كاتەكەی، بۆیە ئەو نیازە خراپەی بەسەردا دەدرێتەوەو، بەبێ بەشكردنی لە میراتبردن سزا دەدرێت‌و، جا كوشتنی وەسیەتكار لە لایەن وەسیەت بۆكراوەوە، دەق لەسەر حوكمەكەی نەهاتووە، بەلام لەم پێشهاتەدا هەمان عیللەتی حوكمەكە، لە پێشهاتی یەكەمدا هەیە، كە ئەمەیش هەر هێنانە پێشەوەی كارێكە لە پێش گەیشتنی كاتی خۆیدا، بە ڕێگایەكی تاوانكاری، بۆیە پێشهاتی كوشتنی وەسیەتكار لە لایەن وەسیەت بۆكراوەوە دەخرێتە سەر پێشهاتی كوشتنی میراتدەر، لە لایەن میرات بەرەوە، چونكە لە عیللەتی حوكمەكەدا هاوبەشن‌و، بۆیە حوكمەكە لە نێوانیاندا یەكسان دەكرێت، بۆیە وەسیەت بۆكراو، لە سودەكانی وەسیەتكار بێ بەش دەكرێت.

سێیەم: مامەڵەی مرۆڤ، بەسەر مامەڵەی كەسێكی تردا، یاخود خوازبێنی كەسێك بەسەر كەسێكی تردا، دروست نییە، چونكە دەق هەیە كە ڕێگری لەم كارە دەكات، كە ئەوەیە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: «الْمُؤْمِنُ أَخُو الْمُؤْمِنِ، فَلَا يَحِلُّ لِلْمُؤْمِنِ أَنْ يَبْتَاعَ عَلَى بَيْعِ أَخِيهِ، وَلَا يَخْطُبَ عَلَى خِطْبَةِ أَخِيهِ حَتَّى يَذَرَ» ، واتە: باوەڕدار برای باوەڕدارە، دروست نییە، باوەڕداری مامەڵەی شتێ بكات، كە چی بڕوادارێكی تر بچێت بەسەر مامەڵەكەی ئەودا، و پێش ئەوەی ئەوی تر دەستی لێ هەڵگرتبێ، ئەم مامەڵەی بكات، و هەروەها دروست نییە، بۆ باوەڕدار كە ئافرەتێ برا باوەڕدارەكەی تری داوای كردبێت، و چوبێتە خوازبێنی كردنی، و بێ ئەوەی وەلامی كۆتایی وەرگرتبێت، مسوڵمانێكی تر بچێتە خوازبێنی هەمان ئافرەت، ئەم كارانە دروست نین، تا كەسی یەكەم بەتەواوی لە خوازبێنی یان مامەڵەكە دەپچڕێ، ئینجا دروستە كەسی دووەم بیكات.

عیللەتی ئەم حوكمە، ئەوەیە كە لەم جۆرە هەڵسوكەوتانەدا، زیادەڕەوی كردنی تیادایە، لە مافی كەسانی تر، و ئازاردانی ئەوانەو، لە ڕوانگەی ئەمەیشەوە دوژمنایەتی‌و ڕق‌و قین دروست دەبێت‌و، جا لەم بابەتەدا، بەكرێدان‌و بەكرێ گرتنی كەسێ بەسەر كەسێكی تردا، پێشهاتێكە، كە دەق لەسەر حوكمەكەی نییە، بۆیە قیاس دەكرێت بە پێشهاتی یەكەم، چونكە لە عیللەتی حوكمەكەدا هاوبەشن و بۆیە لە حوكمەكەدا یەكسان دەكرێن، كە نەهی لێكردنە، و كەنەهی لە ئەسڵەكەدا كراوەو، حەرامە، كەواتە بەقیاس كردن، نەهی لە فەرعەكەشی كراوەو، حەرامە.

چوارەم: کڕین و فرۆشتن، لەکاتی بانگی نوێژی هەینیدا ڕێگری لێکراوە، چونکە دەق لەسەر ئەم حوکمە هاتووە، کە ئەم ئایەتەیە کە دەفەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَوٰةِ مِن يَوۡمِ ٱلۡجُمُعَةِ فَٱسۡعَوۡاْ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِ وَذَرُواْ ٱلۡبَيۡعَ﴾[1] واتە: ئەی باوەڕداران، کە لەڕۆژی جومەعەدا بانگ درا، بۆ نوێژی هەینی، بچن بەدەم پەرستشتەکانتان و یادی خوداوە، و واز لە مامەڵە کردن و کڕین و فرۆشتن بهێنن، کە عیللەتی ئەم حوکمە ئەوەیە کە مامەڵەکردن هۆکارە بۆ سستی و بەرتەسکردنەوەی هەوڵەکان بۆ پێڕاگەیشتنی نوێژەکە و بۆیشی هەیە، کە بفەوتێت، و ئەم عیللەتەیش لەپرسی بەکرێدان و بە بارمتەدان و ژن مارە کردن و، ئەوانەداو، لەم کاتەدا هەیە، و لەئارادایە کەواتە ئەم هەڵسوکەوتانەی تریش، نەهییان لێکراوە، بە پێی قیاس کردنیان لەسەر مامەڵەکردن، و کڕین و فرۆشتن.

## ١٨٣- مەرجەکانی قیاس کردن[2]:

پرۆسەی قیاس کردن، تا مەرج گەلێکی تایبەت هەن، تیایدانەیە نەدی، دروست نابێت، ئەومەرجانە هەیانە کە پەیوەستن بە (ئەسل)ـەکانەوە، و هەیانە کە پەیوەستن بە پایەکانی تری قیاسکردنەکەوە جا ئەو مەرجانەی کە لە ئەسڵەکەدا بەمەرج گیراون، ئەوەیە کە ئەو ئەسڵە نەبووبێتە فەرع بۆ ئەسڵێکی تر، واتە حوکمەکەی بەدەق یان بەئیجماع چەسپابێت، بەڵام مەرجەکانی پایەکانی تر، بەتایبەتی مەرجەکانی عیللەت، پێویستی بە ئەندازەیەک درێژکردنەوە هەیە.

## ١٨٤- یەکەم: مەرجەکانی حوکمی ئەسڵەکە:

أ- دەبێت ئەو حوکمە ئەسڵە، حوکمێکی شەرعی کرداری بێت و، بە دەقێکی قورئان، یان فەرمووده چەسپابێت، بەڵام ئەگەر بە ئیجماع چەسپابێت، ئەوا هەندێ لە زانایانی ئوصوڵ ڕایان وایە کە قیاس لەم حاڵەتەدا دروست نییە، چونکە قیاس لەسەر بنەمای زانینی هۆکاری حوکمەکە (علة الحكم) وەستاوە، و بنیات نراوە، و لەسەر بنەمای بوونی عیللەتەکە (هۆکارەکە) لە فەرعەکەدا، ئیدی فەرع و ئەسڵ یەکسان دەکرێنەوەو، ئەمەیش لەو

---

[1] سورة ( الجمعة/ ٩).

[2] فواتح الرحموت بشرح مسلم الثبوت، ب٢، ل٢٥٠ و دواتر، المستصفى للامام الغزالي، ب٢، ل٣٢و دواتریش، الأمدي، ب٣، ل٢٧٧و دواتر.

حوکمانەیدا کەبە ئیجماع جێگیر کراون، ڕوونادات، چونکە لە ئیجماعدا باسی ناوهێنانی بەڵگەکانی بەمەرج نەگیراوەو، کە درکاندنی پاڵپشتو بەڵگەکانیش نەهاتەدی، ئیدی هۆکاری حوکمەکە نازانرێت، بۆیە قیاس لێرەدا بە ئەنجام ناگەیەندرێت، بەڵام زاناگەلێکی تر دەڵێن، دروستە حوکمەکە بگوازرێتەوە بۆ فەرعەکەیش، بەهۆی قیاسەوە، هەرچەندە ئەو حوکمە بەهۆی ئیجماعیشەوە جێگیر کرابێت، چونکە زانینی عیللەتی حوکم چەند ڕێگایەکی هەیە، لەوانە بوونی پەیوەندی (مناسبة) لە نێوان ئەسڵو فەرعەکەدا، هەروەك دواتر لەم بارەیەوە ڕوونکردنەوە دێتو، بۆیە باسنەکردنی پاڵپشتو بەڵگەی ئیجماع لەم بارەیەوە زیانمەندی نییەو، نابێتە ڕێگر لە ناسینو زانینی عیللەتەکەو، ئەم قسەیەش لە پێشترەو (راجح)ـەو جا ئەگەر حوکمەکە تەنهاو تەنها بەقیاس چەسپێنرابوو، ئەوا ناکرێت، وەك ئەسڵ تەماشا بکرێتو، قیاسی لەسەر بکرێت، بەڵکو دەبێت قیاس لەسەر ئەسڵێ ئەنجام بدرێتو، بکرێت، کە بەدەق پاڵپشتی لێوەکرابێت، بە ڕاستەوخۆییو بەبێ پێچو پەنا.

ب- دەبێت ئەو حوکمە خاوەنی مانایەکی وابێت، کە عەقل پەی پێ ببات‌و، هەستی پێ بکاتو، حوکمەکە لەسەر عیللەتێکی وا بنیات نرابێت، کە لە چوار چێوەی ژیری مرۆڤدا جێگای ببێتەوە، چونکە بنەمای قیاس، بریتییە لە هەستکردن بە عیللەتی حوکمەکەو، هەروەها هەست بکرێت، بە هاتنەدی ئەو عیللەتە لە فەرعەکەشیدا تالەم ڕوانگەیەوە بتوانرێت، حوکمی ئەسڵەکە بگوێزرێتەوە بۆ فەرعەکە، بەهۆی ئەوەی کە لە عیللەتەکەدا هاوبەشن، چونکە ئەگەر عەقلّ پەی نەبرد، بەهەستکردن بەو حوکمە، ئەوا قیاسیش بیانووی نەهاتنەدیو بەرپا نەبوونی بۆ دروست دەبێت، بۆیە زانایان فەرموویانە: کە قیاسکردن لە ئەحکامەکانی پەرستندانییە، کە ئەحکامی پەرستن کە ئەوانن کە تەنها پەروەردگار عیللەتی چەسپاندنیان دەزانێتو، کەسی فێری ڕەوتی زانینی ئەو هۆکارانەیان نەکردووە، وەك ژمارەی ڕکاتەکانی نوێژەکانو، دانانی ژمارەی شەلاقەکانی کەسی داوێن پیس، کەسەد شەلاقی لەسەر داناوە، هەروەها ژمارەی شەلاقەکانی کەسی بوختانکارو، سوڕانەوە بەدەوری ماڵی خودا، بەچەند سوڕانەوەیەکی دیاریکراوو، هەروەها هاتوو چۆی نێوان (صفا)و (مروة) کە دیاری کراوە، و چەندەها نموونەی تری لەم شێوەیە.

ئینجا ئەگەر حوکمی ئەسڵەکە مانایەکی وای هەبوو کە عەقڵ پەی پێ دەبرد، واتە: لەسەر عیلەتێك بنیات نرابوو، کە عەقلّ هەستی پێ دەکرد، جا لەم حاڵەتەدا قیاس دروستە، کە عیللەتەکەی زانراو، هەروەها چەسپاندنی لە فەرعەکەدا چەسپێنرا، ئیتر قیاس دروستە، ئیتر

حوكمی ئەسڵەكە لەو ئەحكامانە بێت، كە بە (عزيمة: پێداگیری) ناسراون، واتە: هەر لەسەرەتاوە شەرع دایناون، یاخود لە ئەحكامە (رخصة: دەرفەت پێدراوەكان) بن، كە دواتر بە هەڵاوێر (إستثناء)ی دانراون، هەرچونیەكە، نموونە بۆ یەكەم: وەك حەرامی خواردنەوەی ئارەق، نەدانی میرات، بەو میرات بەرەی كە میرات دەرەكەی خۆیی كوشتووەو، نموونەی دووەم وەك، مامەڵەكردنی دارەدۆخە (العرايا)[1]و، خواردنی گۆشتی مردارەوەبوو، و هاووێنەكانی لەو شتانەی كە حەرامن، لە كاتی پێویستدا ئەو حوكمەیان لەسەر لابراوە[2].

---

[1] العرايا، دارە دۆخە، ئەوەیە كە دەوڵەمەندێك، داری دووان دەدا، بە هەژاری، تا بەرەكەی بخوا، لە دواییدا دارەكە هی خۆیەتی، جا لە پاشا بۆ بارسوكی بەرەكەی لێ دەكرێتەوە، بە خورما ئەگەر هەردوولا هەوەسیان هەبوو، هەروەها فرۆشتنی خورما بەدارەوە، بەهەندێ خورمای گەیشتوو، بەڕازی بوونی هەردوولاو بەقرساندنی نرخەكەی هەربە (عرايا) دانراوەو، ئەم حوكمەیش بەم فەرموودە پیرۆزە جێگیر كراوە، كە دەفەرموێت: (نهى رسول الله (ﷺ) عن بيع الشيئ بجنسة متفاضلاً ورخص في العرايا)، واتە: پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری كردووە لە كڕین و فرۆشتنی دوو شتی وەك یەك، كە یەكێكیان برەكەی لەوی تر زیاتر بێت، بەڵام لە (العرايا)دا، ڕێگەی پێداوە، و هەروەها لە صەحیحی بوخاریدا هاتووە، كە پێغەمبەر (ﷺ) (نهى عن المزابنة، أي: بيع التمر بالتمر، إلا اصحاب العرايا، فأنة أذن لهم) واتە: ڕێگری كردووە، كە مامەڵەی خورما بە خورما كە بە مامەڵەی (موزابەنە) ناو نراوە، بەڵام ڕێگە بەوانە دراوە، كە مامەڵەی (العرايا) دەكەن، جا تری قیاس دەكرێتە سەر ئەم خورمایە، بۆیە دروستە مامەڵەكردنی تری، بەدارەكەیەوە، واتە بە پەرسیلەیی، كە بقرسێنری بە مێوژ، مامەڵەیان پێوە بكرێت.

[2] خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ﴾ (سورة المائدة/ ٣) واتە: خواردنی گۆشتی مردارەوە بووو، هەر خوێنی لە هەر ئەندامێكی ئاژەڵی بێتە دەرێ و بڕوا، حەرامە بۆتان، ئەی بڕواداران و، هەر ئاژەڵێكیش كە لەوەختی سەربڕیندا ناوی غەیری خوای لێ بهێنرێت و، ماڵاتی خنكاوو، و لێدراوی مردارەوە بوو، و هەڵدێراو لە شاخەوە بەرەوە بووو، هەرچی درندە پەلاماری دابێ و مردارەوەبووبێتەوە، مەگەر بەر لەگیان دەرچوونی فریای چەقۆكە كەوتبێ و، سەرتان بڕیبێ، واتە: ئەگەر هەر یەك لەوانە بەر لەگیان دەرچوونی بەردەست كەوت و سەربڕا، خواردنی حەڵاڵ دەبێت، و هەرچی بۆ بتەكانیش سەربڕدرا، خواردنی حەرامە، هەروەها پەروەردگار لە هەمان ئایەتدا دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ اضْطُرَّ فِي مَخْمَصَةٍ غَيْرَ مُتَجَانِفٍ لِّإِثْمٍ فَإِنَّ اللَّهَ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾ واتە: ئینجا لەگەڵ حەرامكردنی ئەو شتانەشیدا، هەر كەسێك لەبرسانا، ناچار بوو، بۆ خواردنی هەریەكێ لە قەدەغەكراوەكان و مەترسی ئەوەی هەبوو، گەر شتێ نەخوا، لە برسا بمرێ. دەتوانێ لێیان بخوات، بە مەرجێ نەیەوێ خۆی

ج- دەبێت عیللەتەکە بتوانرێت لە فەرعەکەدا پراکتیزە بکرێت جا ئەگەر ئەو عیللەتە تەنها لە ئەسڵەکەدا کورت هەڵاتوبووو، نەدەکرا، لە غەیری ئەو ئەسڵەدا جێ بەجێ بکرێت، ئەوە لەم حاڵەتەدا قیاس ڕوونادات، چونکە لە قیاسدا دەبێت، ئەسڵەکەو فەرعەکە لە عیللەتدا هاوبەش بن، جا ئەگەر عیللەتی حوکمەکە هاتنەدی لە فەرعەکەدا بەدی نەدەکرا، ئەوا هاوبەشی نێوان ئەسڵ و فەرع لە عیللەتەکەدا بەدی ناکرێت‌و، دواجار قیاس ئەنجام نادرێت‌و، جێ بەجێ ناکرێت وەك کورت کردنەوەی نوێژ لە سەفەردا، و شکاندنی ڕۆژوو هەر لەسەفەردا، کە عیللەتی ئەم حوکمە لەم دووانەدا سەفەرەکەیە، و مەبەست لێی لابردنی ئارەزوو دژوارییە لەسەر مرۆڤ، بەلام ئەم عیللەتە کە سەفەرەکەیە، تەنها لە کەسی سەفەرکەر (مسافر)دا، دێتەدی، بۆیە ناکرێت کە ئەوانەی کاری سەخت دەکەن، یان پیشەی سەخت‌و، تاقەت پڕوکێنیان هەیە، قیاس بکرێنەسەر کابرای سەفەری.

د- نابێت حوکمی ئەو ئەسڵە تایبەت بێت، بەو تەنها ئەسڵەوە چونکە تایبەتمەندبوونی بەئەسڵەکەوە وای لێ دەکات، کە نەتوانرێت بگوێزرێتەوە بۆسەر فەرعەکەو، بەسەریدا جێ بەجێ بکرێت کە ئەمەیش نەکرا، ئیتر بەهیچ جۆرێك قیاس ئەنجام ناردێت، چونکە قیاسکرن لەم حاڵەتەدا پێچەوانەی ئەو بەڵگەیەیە کە سەلمێنەری تایبەتمەندی ئەو حوکمەیە، بەئەسڵەکەیەوەو قیاسی دژە بەڵگەیش بەتاڵە، نموونەی ئەم جۆرەیش وەك تایبەتمەندی پێغەمبەر (ﷺ) بەوەی کە تەنها ئەو ڕێگاپێدراوە، کە لەچوار ژن زیاتر بهێنێت‌و، هەروەها تایبەتمەندی پێغەمبەر (ﷺ) لەوەیدا، کە حەرامە لەدوای خۆی کەسێکی تر خێزانەکانی بخوازێت، چونکە دایکانی ئیمانداران، بۆیە لەم حەرام بوونو حەڵاڵ بوونەدا دروست نییە کە کەسی تری لەسەر قیاس بکرێت، چونکە تایبەتمەندە بە ئەسڵەکەوەو، هەروەها نموونەی تر وەك، تایبەتمەندی (خوزەیمەی کوڕی ثابت) خوا لێی ڕازی بێت لەوەیدا کە تەنها لە جیاتی دووشایەت، شایەتییەکەی وەردەگیرا، کە ئەمەیش حوکمێکی تایبەتە بەوو، بەم فەرموودەیەیش چەسپێنراوە، کە پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (من شهد له خزيمة، فَهُوَ

---

توشی گوناه بکات‌و زیادە ڕەوی بکات، بەڕاستی پەروەردگاریش زۆر لێبوردەیەو، زۆریش بەمیهرەبان‌و دلۆڤانە.

جا لەم ئایەتەدا دەردەکەوێت، کە کەسی ناچار لە کاتی برسێتیدا بۆی هەیە، کە ئەو شتە حەرامانە بخوات‌و، بۆیە حاڵەتی نەخۆشی‌و هەر پێداویستیەکی تر قیاس دەکرێتە، سەر ئەو حاڵەتە باس کراوانەی سەرەوەو، دەتوانرێت ئەو حەرام گەلە لەکاتی پێویست‌و ناچاریدا بەکار بهێنرێن.

حَسْبُهُ)، واته: هەرکەس خەزیمە شایەتی بۆ بدات، ئەوا تەنها ئەو شایەتییەی بەس و، کەسی تری ناوێت، بۆیە دروست نییە هیچ کەسێکی تری ئەم ئوممەتەی لەسەر قیاس بکرێت، هەرچەندە لە هەر پلەیەکی باڵای شکۆمەندی و خوداناسیدا بێت!

## ١٨٥- دووەم: مەرجەکانی فەرعەکە ((لق)):

أ- دەبێت ئەو فەرعە، دەقی شەرعی لەسەر نەبێت، کە حوکمەکەی دیاری بکات، چونکە کاتێك قیاس دەچێتە سەری، کە لەو پرسەدا دەقێك بوونی نەبێت، کە حوکمەکەی دەربخات، جا قیاسی بۆ بەکار دەهێنرێت و، ئەوەی لەلای زانایانی ئوصولی فیقهـ، چەسپاوە، ئەوەیە کە لە کاتی بوونی دەقی شەرعیدا ئیدی ئیجتیهاد کردن نییە و، نابێت و، کە دەق هەبوو، ئیتر مانایەك بۆ قیاس نامێنێتەوە و، لەسەر ئەم بنەمایە بێت، ئەوانەی کە دەبێژن، ئازادکردنی بەندەیەکی ناموسڵمان، نابێتە کەفارەت دەری سوێندی ناهەق، کە قیاسیان کردووە لەسەر کەفارەتی کوشتنی بەهەڵە، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿وَمَن قَتَلَ مُؤْمِنًا خَطَئًا فَتَحْرِيرُ رَقَبَةٍ مُّؤْمِنَةٍ﴾[1] واتە: هەر کەس موسڵمانێ بەهەڵە بکوژێ، ئەوە ئازادکردنی بەندەیەکی باوەڕداری وەك کەفارەت لەسەرە، ئەمە قیاسێکی نادروستە، چونکە پێچەوانەی ئەو دەقەیە کە سەبارەت بە کەفارەتی سوێند هاتووە، کە پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿لَا يُؤَاخِذُكُمُ اللَّهُ بِاللَّغْوِ فِي أَيْمَٰنِكُمْ وَلَٰكِن يُؤَاخِذُكُم بِمَا عَقَّدتُّمُ الْأَيْمَٰنَ فَكَفَّٰرَتُهُۥٓ إِطْعَامُ عَشَرَةِ مَسَٰكِينَ مِنْ أَوْسَطِ مَا تُطْعِمُونَ أَهْلِيكُمْ أَوْ كِسْوَتُهُمْ أَوْ تَحْرِيرُ رَقَبَةٍ﴾[2] واتە: خودا بەسوێندی زارەکیی و بێ مەبەست و بێ نیاز، وەك بڵێت (ناوەالله، بەڵێ والله، ئەرێ والله،و...) ئەوانە ناتانگرێ و جەزرەبەتان نادات، بەڵام بەو سوێندانە دەتانگرێ و سزاتان دەدات، کە بەدڵ گرێیان دەدەن و، لە ناخی دڵتانەوەن و ناشیانبەنەسەر، جا دەبێ لە کەفارەتی ئەم جۆرە سوێندانەدا خۆراك بە دەکەسی بێ نەواو هەژار بدەن، لەو خۆراکە مامناوەندییە، کە ئێوە ڕۆژانە بەماڵ و منداڵ و خێزانی خۆتانی دەدەن، یان دەبێت دە هەژار پۆشتە بکەن، یان دەبێت کۆیلەیەك ئازاد بکەن، کە لەم ئایەتە پیرۆزەدا (رقبة: کۆیلە) بە ڕەهایی هاتووە، و پاشکۆی باوەڕداربوونی پێوە نەبەستراوەتەوە و تیایدا نەکراوە بە مەرج، بۆیە دروست نییە، کە مەرجی ئیمانداربوونی لەسەر دابنرێت و قیاس بکرێت لەسەر کەفارەتی کوشتنی

---

[1] سورة (النساء/ ٩٢).

[2] سورة (المائدة/٨٩).

بە هەڵە.

ب- دەبێت ئەو عیللەتەی کە لە ئەسڵەکەدا هەیە، لە فەرعەکەشیدا بوونی هەبێت، چونکە مەرجی گواستنەوەی حوکمەکە لە ئەسڵەکەوە بۆ فەرعەکە، ئەوەیە کە دەبێت عیللەتەکەیش بگوێزرێتەوەو، دەبێت ئەو عیللەتەی کە لە فەرعەکەدا هەیە، هەمان ئەو عیللەتە بێتە، کە لە ئەسڵەکەدا بوونی هەیە، کە حوکمەکەی لەسەر بنیات نراوە، چونکە ئەگەر فەرعەکە یەکسان نەبێت، لەگەڵ ئەسڵەکەدا لە عیللەتەکەدا، ئەوا لە حوکمەکەشیدا یەکسان نابن، چونکە ئەم پرۆسەی یەکسان بوونەوەیە، واتە: گواستنەوەو تێپەڕاندنی حوکمەکە لە ئەسڵەکەوە بۆسەر فەرعەکە، لەسەر بنەمای لێکچوون لە عیللەتەکەداو، لە نێوان هەردووکیاندا بنیات نراوەو، کە عیللەتەکە یەکسان نەبوو، ئەوا لە حوکمەکەشیدا یەکسان نابنو، ئەو قیاسەی کە ئەم مەرجەی تیادا نایەتەدی، پێی دەگوترێت، (قیاس مع الفارق)و، نموونەکەیشی وەك پرسی دابەشکردنی ((عەقار)) (زەوی، یان خانوو)، لە نێوان چەند شەریکێکدا، کە بێگومان لەم حاڵەتەدا شەریکەکان مافی لە پێشتریان هەیە، بۆ کڕینەوەی ئەو موڵکیەتە، کە ئەمەیش بە (شفعة) ناو زەد کراوە، کە ئایا بە گوێرەی ژمارەی کە شەریکەکان مافی ئەو بەشکردنەیان هەیەو، ڕێژەی بەشەکەیان حسابی بۆ ناکرێت، یاخود بەسەر نییەو بە گوێرەی بەشەکانیانە؟ لەم بارەیەوە حەنەفیەکان دەڵێن: بە یەکسانی دابەش دەکرێت بەسەریاندا ، بە بێ ڕەچاوکردنی ڕێژەی بەشەکانیانو، زانایانی تر هەن، کە ڕایان وایە کە بە گوێرەی ڕێژەی بەشەکانیان دابەش دەکرێت بەسەریانداو، لێرەدا قیاسیان کردووە، بە بەڵگە، بە پێودانگی ئەوەی کە ئەو سامانەی کە لەم ڕێگای مافی لە پێشتر بوونەوە (شفعة) وەردەگیرێت، وەك سودی ئەو موڵکە وایە، کە لە نێوان چەند کەسێکدا بەشەریکی هەیانەو، چۆن لەم کاتەدا لە سوودو قازانجەکەی موڵکە هاوبەشە، قازانجەکە دابەش دەکرێت، بەسەر شەریکەکانداو، هەر یەکە بەگوێرەی بەشەکەی قازانجی بەشی دەدرێت، ئەمەش ڕاجیاییەکی نێوان شەرعزانانی لەسەر نییە، بۆیە ئەم مافی لەپێش بوونە (شفعة)یەی، لەسەر قیاس دەکرێت، و کەواتە لەمەیشدا هەر یەکەیان بە گوێرەی ڕێژەی بەشەکەی لە موڵکەکەدا بەشە قازانجی هەیەو، هاوبەشە، بەڵام حەنەفییەکان ئەم قسەیەیان وا بەرپەرچ داوەتەوە کە ئەمە (قیاس مع الفارق: قیاسی نەشیاو)ـە، چونکە ئەو سودو قازانجەی کە لەو موڵکە بەدەست دێت، و لە دەرەنجامدا هەر شەریکەو بە گوێرەی قازانجی بەشەکەی خۆی کە بەدەست هاتووە، قازانج دەبات، بەڵام ئەو موڵکەی کە بەڕێگای (شفعە) بەدەست هاتووە، لە موڵکی ئەوان بەدەست

نەهاتووە، چونکە ناگونجێت، کە ماڵی کەسانی تـر سـودو قازانجەکـەی بـۆ کەسانێکی تـری غەیری خاوەنەکەی بێت.

## ١٨٦- مەرجەکانی ((هۆکار: علة ))ـە کە:

((هۆکار: العلة)): بریتییـە لـە بنـەماو بنـەڕەتو چـەقی قیـاسو لـە پایـە مەزنەکانیـەتیو لەسەر بنەمای ناسینی عیللەتو، لە دوای دڵنیا بوون لە هاتنەدی ئەو عیللەتە لە فەرعەکەدا، ئیدی قیاس دێتە جێو بەرهەمەکەی دەردەکەوێتو، دواجار بۆ موجتەهید دەردەکەوێت، کـە ئەو حوکمەی دەقەکەی لەسەر هاتووە، تەنها تایبەت نییە بەوەوە، و لەسەر تەنها ئەو کورت نەکراوەتەوە، و بـەڵکو ئـەو حوکمـە حـوکمی سـەرجەم ئـەو پێشهاتانەیە کـە ئـەو عیللـەتی حوکمەی تیادا هاتبێتەدی.

لەبەر ئەمانە هەموو، لەبەر بایەخی عیللـەت، پێویـستیمان بـە ڕێخۆشـکردنێك هەیـە، کـە مەبەسـتو ئامـانجی عیللـەت تیایـدا ڕوون بکرێتـەوە، واتـە: ڕونکردنـەوەی مانـای زاراوەیـی عیللەتو جیاوازی نێوان عیللەتو، حیکمەتو، جـا کـە ئـەم ڕێخۆشـکردنەمان سـازدا، ئینجـا مەرجەکانی عیللەت کەم دەکەینەوە.

١٨٧- ئەوەی لە لای لێکۆڵەرەوانی نێو جەماوەری زانایان چەسپاوە ئەوەیە کە ئەحکامـە شەرعییەکان بەهەوانتەیی‌و بە بێ ئامانج لەلایەن شەرعەوە دانەنراون، و هۆکـارێ هەیـە، کـە بووەتـە هۆکـاری بەشـەرع کردنیـانو، ئامـانج گـەڵێ لـە پـشتیانەوە هـەن، کـە هاتنـەدییان مەبەستەو، هەروەها لەبەر بەرژەوەندی ئێستاو ئاینـدەی مرۆڤـەکان شـەرع داینـاونو، ئـەو بەرژەوەندییەی کە ڕەچاوکراوە یان بۆ ئەوەیە کە مرۆڤەکان تووشـی سـودو قـازانج بکـاتو، یاخود لەبەر ئەوەیە کە زیانو گەنـدەڵیو سـەختی لەسـەریان دوور بخاتـەوەو، بەرژەوەنـدی بەهەردوو ئـەو شـێوازو ڕەهەندەیـەوە هۆکـاری بنەڕەتییـە، لەسـەر هـەر شـەرعدانانێ، ئـیتر فەرمان کردن بێت، یان بەرگری لێکردن بێت، یان موباح کردن بێت، هەر چونیەکە، و جێگیر بـوونی دەقو ئـەحکامی شـەرعی زۆر بەڵگـەن لەسـەر ئـەو قـسەیەمان، ئـیتر ئـەو ئەحکامـە شـەرعییانە سـەربە پەرستـشەکان بـن، یـان مامەڵـەکان چـونیەکن، زۆرجـار قورئـانی پـیرۆز حیکمـەتو هونـەری بەشـەرع دانـانی حـوکمێکی لـە گـەڵ خـودی حوکمەکـەدا هێنـاوە، کـە سودگەیاندن بووە، یان دورخستنەوەی زیان بووە، بۆیە شـەرعێنراوە لـەو نموونانـەیش وەك

پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ وَلَكُمْ فِي ٱلْقِصَاصِ حَيَوٰةٌ يَـٰٓأُو۟لِى ٱلْأَلْبَـٰبِ ﴾[1] واتە: لە كوشتنەوەدا ژیانمان بۆ مرۆڤەكان ڕەخساندووە، ئەی خاوەن عەقڵەكان، چونكە كەسێك كەسێكی كوشت و، كوژرایەوە، ئیتر خەڵكی تر پیاو كوژی ناكەن و، بەمەیش ژیان بۆ زۆر كەسی تر مسۆگەر دەكرێت.

و هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَعِدُّوا۟ لَهُم مَّا ٱسْتَطَعْتُم مِّن قُوَّةٍ وَمِن رِّبَاطِ ٱلْخَيْلِ تُرْهِبُونَ بِهِۦ عَدُوَّ ٱللَّهِ وَعَدُوَّكُمْ ﴾[2] واتە: هێز و ئەسپی جەنگی باش ئامادە بكەن، بەگوێرەی توانا بۆ بەرامبەری بێ باوەڕان، تا بەم ئامادە سازییە دوژمنانی خوداو موسڵمانان بترسێنن.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّمَا ٱلْخَمْرُ وَٱلْمَيْسِرُ وَٱلْأَنصَابُ وَٱلْأَزْلَـٰمُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ ٱلشَّيْطَـٰنِ فَٱجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٩٠﴾ إِنَّمَا يُرِيدُ ٱلشَّيْطَـٰنُ أَن يُوقِعَ بَيْنَكُمُ ٱلْعَدَٰوَةَ وَٱلْبَغْضَآءَ فِى ٱلْخَمْرِ وَٱلْمَيْسِرِ وَيَصُدَّكُمْ عَن ذِكْرِ ٱللَّهِ وَعَنِ ٱلصَّلَوٰةِ ۖ فَهَلْ أَنتُم مُّنتَهُونَ ﴿٩١﴾﴾[3] واتە: ئەی باوەڕداران ئارەق و قومار بازی و، ئەو بەردەی حەیوانی بتەكانی لەسەر سەر دەبڕدرێت، بۆ بتەكان و، فالگرتنەوە، لەمانە گشت دووربكەونەوە و، ئەمانە لەكاری پیسن و لەكاری شەیتانن، لێیان دووربكەونەوە و، سا بەڵكو خودا سەرتان بخاو، ڕزگار بن، شەیتان دەیەوێت بەم كارانەتان دوژمنایەتی و قین بخاتە ناوتان و لە یادی خواو لە نوێژكردن غافڵتان بكات، ئاخۆ ئیتر ئێوە لەم كارانە دەسبەردار دەبن؟!

هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ إِذَا قَضَوْا۟ مِنْهُنَّ وَطَرًا ۚ وَكَانَ أَمْرُ ٱللَّهِ مَفْعُولًا ﴾[4] واتە: ئینجا كە زەید زەینەبی خواست و بوو بە هاوسەری، پاشان پێكەوە نەیانكراو تەڵاقییداو جیابوونەوە، ئێمە لە تۆمان مارەكرد، خودا ئەو بڕیارەی دا، تا هیچ دڵتەنگی و گرفتێك بۆ بڕواداران لە

---

١ سورة (البقرة/ ١٧٩).

٢ سورة (الأنفال/ ٦٠).

٣ سورة (المائدة/ ٩٠–٩١).

٤ سورة (الأحزاب/ ٣٧).

مارەکردنی ژنی بەکوڕ کراو یان دروست نەبێتو، بەشتێکی ناشرینوناپەسندی دانەنێن، کاتێك ئەو کوڕانە تەمابڕ بن لێیان و تەڵاقیان بدەن، و بڕیاری خودای مەزنیش بڕاوەیەو دەبێ جێ بەجێ ببێت.

– **جا لە ئایەتی یەکەمدا**، ئەوەی درکاندووە، کە مەبەست لە کوشتنەوەی کابرای بکوژە، پاراستنی ژیانو گیانی خەڵکە.

– **لە ئایەتی دووەمدا**: ڕوونی کردۆتەوە، کە مەبەست لە ئامادەکاری هێزی جەنگی، بۆ ترساندنی دوژمنە، تا بەم ترساندنە ڕێگری لێ بکرێت، لە دوژمنکاری کردنو نواندن.

– **لە ئایەتی سێیەمدا**: ئەوەی دەرخستووە، کە مەبەست لە حەرامکردنی ئارەقو قومار بازی، لەبەر ئەوەیە کە چەندەها خراپەو دوژمنایەتیو ڕقو قینی لەسەر دێتە جێو، تیایدا حەشار دراوە.

– **لە ئایەتی چوارەمدا**: ئەوەی دەرخستووە، کە بۆ مارەکردنی ژنی ئەوانەی کە بە پڕوپاگەندە کراون بەکوڕی کابرا بەشەرعی دانراوە، تابەم هۆیەوە سەختیو دژواری لە سەر شانی مسوڵمانان لابدرێت.

نموونەی تری لەم جۆرە ئایەتانە، لەباسی حەجیشدا هاتووە، کە قوڕئان دەفەرموێت: ﴿لِّيَشْهَدُواْ مَنَٰفِعَ لَهُمْ﴾[1] واتە: ئامادەبوون لە حەجدا، زۆر کەڵکی وەك، ئاینیو دنیاییو بازرگانیو کۆمەڵایەتیو ئابوری تێدایەو، هەروەها سەبارەت بە فەرزکردنی نوێژ فەرمویەتی: ﴿إِنَّ ٱلصَّلَوٰةَ تَنْهَىٰ عَنِ ٱلْفَحْشَآءِ وَٱلْمُنكَرِ﴾[2] واتە: سودی نوێژ ئەوەیە کە مرۆڤ لە خراپەو خراپەکاری دووردەخاتەوەو، هەروەها وەك بەشەرعکردنی شەلاقدانی ژنو پیاوی داوێن پیس، لەبەر بەرژەوەندی پاراستنی ڕەچەڵەكو، بڕینی دەستی دز، لەبەر پاراستنی موڵکی خەڵکیو، هتد.... و سوننەتیش هەر ئەم ڕەوتەی گرتۆتە بەرو، لە زۆریاندا بەڕاشکاوی مەبەستی شەرع لەبەر شەرعکردنیدا خراوەتە ڕوو، وەك ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (يَا مَعْشَرَ الشَّبَابِ، مَنِ اسْتَطَاعَ البَاءَةَ فَلْيَتَزَوَّجْ، فَإِنَّهُ أَغَضُّ لِلْبَصَرِ وَأَحْصَنُ لِلْفَرْجِ)، واتە: ئەی کۆمەڵی گەنجان هەر کەس لەئێوە لەتوانایدا هەیە، با پرۆسەی هاوسەر گیری ئەنجام بدات، چونکە ئەم پرۆسەیە پارێزەری چاوە لەنەزەرو

---

١ سورة (الحج/ ٢٨).

٢ سورة (العنكبوت/ ٤٥).

پارێزەری شەرمگایە لە گوناهکردن.

هەروەها دەفەرموێت: (فَمَنْ صَلَّى بِالنَّاسِ فَلْيُخَفِّفْ، فَإِنَّ فِيهِمُ المَرِيضَ، وَالضَّعِيفَ، وَذَا الحَاجَةِ)، واتە: هەر کەستان پێشنوێژی کرد بۆ خەڵکی، با درێژی نەکاتەوە، چونکە لە ناو ئەو خەڵکەدا مرۆڤی نەخۆش و لاوازو کاردار هەیە.

کەواتە مەبەست و ئامانج لە بەشەرعکردنی ئەحکامەکان، بریتییە لە هێنانەدی بەرژەوەندی مرۆڤەکان و، ئەم بەرژەوەندییەیش بەهونەری حوکم یان نیشانەی حوکمەکە ناو زەد کراوە، جاحیکمەتی حوکم بریتییە لەو بەرژەوەندییەی کە بەدیهێنەری سودو قازانجە، یان لابەری زیانە، کە شەرع مەبەستی بووە، بێتەدی، بۆیە ئەو حوکمەی شەرعاندووە.

بەلام لێرەدا تێبینی ئەوە دەکرێت، کە بەزۆری شەرع حوکم و حیکمەتەکەی بە بوون یان نەبوون پێکەوە گرێ نادات و، بەڵکو بە شتێکی ترەوە گرێی دەدات، کە گونجاوەو لەشان و شکۆیدا هەیە، کە حوکمەکەی پێوە ببەسترێت و، لەسەری بنیات بنرێت، تا لە ڕێیەوە حیکمەتی ئەو حوکمە بێەجێ، واتە بەرژەوەندییەکە کە ئامانجمانە بێتەدی، وەك دروستی شکاندنی ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا، کە ئەم حوکمە بە حیکمەتەکەیەوە نەبەستراوەتەوە، کە لادانی ناڕەحەتییەو، بەڵکو بە شتێکی ترەوە بەستراوەتەوە، وەك سەفەرکردن و، نەخۆشی و هتد... چونکە لە تایبەتمەندی و شان و شکۆی ئەم پێکەوە گرێدانە ئەوەیە کە حیکمەتی حوکمەکە دەهێنێتەدی.

هۆکاری ئەم ڕەوت و شێوازەیش ئەوەیە کە جاری وایە، حیکمەتەکە شاراوەیەو، لێکۆڵینەوە لە هاتنەدی بێ ئاکامەو، ناکرێت، حوکمی لەسەر بنیات بنرێت، وەك لە موباحی و دروستی مامەڵەکردن و، سەرەتەقێ کردنەکانی تردا، کە حیکمەت لە دروست بوونیان، بریتییە لە لادانی ناڕەحەتی لەسەر خەڵکی، تا پێداویستییە شەرعییەکانی خۆیان دابین بکەن و، پێداویستیش شتێکی شاراوەیەو، بۆیە شەرع حیکمەتی حوکمەکەی بەستۆتەوە، بە شتێکی ترەوە، کە ئەو شتە پێگەیەکی ڕەچاوکراوە بۆ هاتنەدی پێداویستییەکان، کە بریتییە، لە وەلام وەرگرتن و ڕازی بوون لەسەری، واتە (الأيجاب والقبول)، واتە گۆڕینەوەی پرسیارو وەلامە سەلمێنەری حاڵەتی پێداویستییەکەیەو برایەوەو، جاری وایە کە ئەو حیکمەتە، شتێکی بێ چوار چێوەو سنور نادیارە، واتە: بە پێی گۆڕان و ئەندازەی خەڵکەکە، حیکمەتەکەیش دەگۆڕێت و، ناکرێت حوکمی لەسەر بەرپا بکرێت، چونکە دەبێتە هۆی شڵەقان و شڵەژان لە ئەحکامەکاندا ئەو فەرمانەی کە تەکلیف کراوە، ئەنجام بدرێت، جێ

بەجێ نابێتو، ڕێکخستنو بەدیهاتنی نایەتەدیو، پاساویو بەڵگەی مرۆڤەکان بۆ خۆدزینەوە لە پراکتیزە کردنی ئەحکامەکان زۆر و فەراهەم دەبێت.

کەواتە: بۆ نموونە دروستی شکاندنی ڕۆژوو لە ڕەمەزاندا بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە، کە ناڕەحەتی لەسەر شانی مرۆڤەکان لابەرێت، کە ئەمەیش شتێکی ئەندازەیی ناسنوردارەو، بۆیە شەرع ئەم حوکمەی بەستۆتەوەو، گرێی داوە، بەشتێکی سنوردارو چوار چێوەداری وەك سەفەرکردن، و نەخۆش بوونەوە، چونکە هەردووکی ئەمانە زیاتر جێگای ئەوەنو چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێت، کەلەو دوو حاڵەتەدا زیاتر حیکمەتی ئەو حوکمدانە بێتە جێو، هەروەها نموونەی تر وەك، بەشەرعکردنی مافی لە پێش بوون لە مامەڵە کردندا (شفعة) لەبەر ئەوەیە کە زیان لا بدرێت، لەسەر ئەو کەسانەو، زیانەکەیش نادیارو بێ سنورو بێ چوار چێوەیەو، بۆیە حوکمەکە بەستراوەتەوە، بە مافی شەریکایەتیو دراوسێیەتییەوە، چونکە شەریك یان دراوسێ بۆی هەیە، کە لە کابرای کڕیاری تر زیان ببینن، بۆیە حوکمەکە بەستراوەتەوە بەو دوو شتەوە، کە زیاتر چاوەڕێی ئەوەیان لێ دەکرێت، کە بەرگریکار بن لە زیانەکەو ئەو بەڵایە دوور بخەنەوەو، ئەمەیش ئامانجی شەریعەتە، جا حیکمەت، لەبەر شاراوەییو بێ چوار چێوەییەکەی لە زۆربەی کاتەکاندا بەستراوەتەوە بە ئەحکامەکانەوەو، بەڵکو بەستراوەتەوە بەشێکی ئاشکرای چوار چێوەداری سنوردار کە زیاتر جێگای ئەوە بێتو، چاوەڕێی ئەوەی لێ بکرێت، کە حیکمەتەکەی بەهۆوە بێتە جێو، ئەو شتە ئاشکرا چوار چێوەدارە ئەوەیە کە زانایانی ئوصولی فیقە، ناویان ناوە بە (علة الحکم: هۆکار حوکمەکە) یان (مناط الحکم: شێوازی حوکمەکە) یان (مظنة الحکم: پێگەی زۆر فەراهەم بوونی حوکمەکە).

١٨٨- **لەم ڕوونکردنەوەیەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە** جیاوازی نێوان عیللەتی حوکمو حیکمەتەکەی بریتییە لەوەی کە حیکمەت ئەو بەرژەوەندییەیە کە شەرع لە کاتی بەشەرع کردنی ئەو حوکمەدا ڕەچاوی کردووەو، عیللەتیش بریتییە لەو وەصفە ئاشکراو چوار چێوەدارەی (ناپەرشەو بڵاو) کە حوکمەکەی لەسەر بنیات نراوەو، لە ڕووی بوونو نەبوونەوە پێوەی بەستراوەتەوە، چونکە ئەو جێگا ڕەچاو کراوو زیاتر گونجاوەیە کە مێرگێکە بۆ هاتنەدیو جێ بەجێ کردنی ئەو بەرژەوەندییەی کە ئامانجی شەرعە، لەکاتی شەرعاندنیداو هەر بۆیەش زانایانی ئوصول دەفەرموون، ئەحکامەکان پەیوەستن بە عیللەتەکانیانەوە نەك بە حیکمەتەکانیانەوە، بەو مانایەی کە لەهەر جێگایەك عیللەت هەبوو،

حوكميش هەیە، هەرچەندە حیکمەتەکەیشی لە هەندێ کاتدا دوابکەوێتو، نەیەتەدیو، هەرکات عیللەت نەبوو، حوکمیش نییە، و هەرچەندە لە هەندێ کاتدا تەنانەت حیکمەتەکەیشی هاتبێتەدی، چونکە بەستنەوەی حوکم بە عیللەتەوە دۆخێکی لەبارە بۆ هاتنەدی حیکمەتەکەو، زیاتریش دێتە دیو بەرجەستەو جێ بەجێ دەبێت، و ئەگەر هاتنەدیشی دوا بکەوێت، ئەمە حاڵەتێکی دەگمەنە، و کار بەلایەنی زاڵو زیاتر دەکرێت، تا لایەنی کەمو دەگمەن، وەك بەدەستهێنانی نمرەی سەرکەوتن لە تاقیکردنەوەدا لەلایەن قوتابییەوە زیاتر هۆشداریدەرو مێرگێکی لەبارە بۆ وابیرکردنەوە بەوەی کە ئەو قوتابیە زیاتر شیاوە بۆ زانستو وەدەستهێنانیو شیاوی کۆتایی پێهێنانی ئەو قۆناغەی خوێندنی هەیە هەروەها گرێدانو بەستنەوەی ئەحەکامەکان بە عیللەتەکانەوە فاکتەرێکە بۆ جێگیر بوونیو چەسپاندنی بەردەوامی ئەرکەکانی سەر شانی مرۆڤو، رێکو پێك کردنی ئەحکامەکانو رێکخستنو درێژەپێدانیانو چەسپاندنی فەرمانە گشتییەکانی شەرعو روونکردنەوەیان، و ئەمانەیش سوود گەڵێکی فراوانن، بەپا نەبوونی حیکمەت لە هەندێ شتو پێشهاتی لاوەکیداو لەهەندێ کاتدا، کاریگەری لەسەر ئەو سودە زۆرانە دروست ناکات.

لەم روانگەیەوە، هەرکات مسوڵمان کەوتە گەشتو سەفەری کرد بۆی هەیە، کە رۆژووەکەی بشکێنێت، هەرچەندە نارەحەتیش نەبێتو، هەر کەس گەشتیار نەبووو، نیشتە جێی شوێنی خۆی بوو، ناتوانێت رۆژووەکەی بشکێنێت، هەر چەندە لە کارەکەیدا تووشی سەختیو دژواری دەبووو، هەرکەس هەرکات شەریك بوو، لەزەویو خانویەکدا، دەتوانێت بەزۆر مافی شەریکەکەی تری لەمامەڵەکەدا، بە مافی (شفعة: لەپێش بوونی ئەو کەسە، لە کابرای شەریکی تر) بسەنێتەوە، کە بەکابرایەکی بێگانەی تری فرۆشتبوو، چونکە ئەم شەریکە لە پێشترە، هەرچەندە کابرای کڕیاری تر زیانمەندیش نەبوو، چونکە مافی (شفعة)، بەستراوەتەوە، بەشەریکایەتیو دراوسێیەتیەوە، نەك بەخودی زیانەکەوەو، هەرکەس شەریك نەبوو، یاخود دراوسێ نەبوو، ئەوە مافی موڵکدارێتی ئەو شتەی کابرای نییە، بە بیانووی (شفعة) هەرچەندە زۆرترین زیانی لەکابرای کڕیارەوە پێ بگاتو، شتە فرۆشراوەکە موڵکایەتییەکەی دەگوازرێتەوە بۆ کڕیارەکەو، نرخەکەیش دەبێتە موڵکی کابرای فرۆشیار، ئەمەیش کاتێك دێتەدی کە عیللەتی ئەم گواستنەوەیەی مامەڵەیە، کە (إیجاب و قەبول)ـەکەیە، بێتەدی، هەرچەندە تەنانەت ئەو دوو لایەنە هیچکامیان پێویستیان نە بە مامەڵە فرۆشراوەکە هەبێت، و نە بە پارەکەی!

ئەم قسەیەی ئێمە، بە تێڕوانینی هەندێ لەشەرعزانان هەڵناوەشێتەوە، کە ڕایان وایە کە تەلاقی کەسی زۆر لێ کراو ناکەوێت، و هەروەها مامەڵەیشی دانامەزرێت، چونکە عیللەت بەو پێوەدانگەی کە دۆخێکی لەبارە بۆ هاتنەدی حیکمەتەکە بۆیە هەربەویش ئەڵقەی گرێدراوە بە حوکمەکەوە، و شێوازەکەی دەردەخات، جا هەرکات بەڵگەی یەکلاکەرەوە هاتە ئاراوە لە سەر نەمانی ئەو دۆخە لەبارەی عیللەتەکە، ئیدی عیللەتەکەیش لادەچێت‌و، زۆرلێکردنیش لە تێڕوانینی هەندێ لەشەرعزانانەوە بەڵگەیەکی یەکلاکەرەوەیە بۆلادان‌و لابردنی ئەو مانایەی عیللەتەکەو ئیدی بە عیللەت ئەژمار ناکرێت‌و، بۆیە حوکمەکەیش بەرپانابێت.

١٨٩- دوای ئەوەی کە مانای عیللەتمان ڕوون کردەوەو جیاوازی نێوان عیللەت‌و حیکمەتەمان ڕاڤەکرد، ئیدی لە خوارەوە مەرجەکانی عیللەت باس دەکەین:

### - یەکەم: دەبێت عیللەتەکە وەصفێکی ئاشکرابێت:

مانای ئاشکرابوونی، بریتییە لەوەی کە بکرێت، ئەو عیللەتە هەم لە ئەسڵەکەداو، هەم لەفەرعەکەدا جێ بەجێ بکرێت، چونکە عیللەت نیشانەی حوکمەو هۆکاری ناسین‌و زانینی حوکمەکەیە، واتە، بەبوونی عیللەت لە فەرعەکەدا، ئیتر ئەو فەرعە، حوکمی ئەسڵەکە وەردەگرێت، و حوکمی ئەوی هەیە، جائەگەر عیلەتەکە شاراوە بوو، و بە هەستەکان هەستی پێ نەدەکرا، ناتوانێت ببێتە بەڵگە لەسەر حوکمەکە، کەواتە هەردەبێت عیللەت ئاشکراو، ناشاراوە بێت، وەك سەرخۆشکردن لە ئارەقدا، کە عیللەو هۆکاری حەرام کردنیەتی، کە خۆی لە خۆیدا وەصفێکە کە لە ئارەقدا دەکرێت بێتەدی‌و ڕووبدات، هەوەك دەکرێت بێتەدی‌و ڕووبدات دیسان لە هەموو گیراوەیەکی سەرخۆشکەردا، بۆیە ئەگەر عیللەت وەصفێکی شاراوە بێت، شارع هەستاوە، لە جێگایەکدا شتێکی ئاشکراو ڕوونی بەر پاکردووە، کە جێگای پەی پێ بردنی ڕووە ئاشکراکە بێت‌و، دەلالەتی لەسەر بکات، وەك ڕازی بوونی هەردوولای مامەڵەکار، لە مامەڵەی گۆڕینەوەدا، کە ئەمە بنەمای گواستنەوەی موڵکەکەیە، و عیللەتەکەیش ئەوەیە کە شتێکی شاراوەیەو بەدڵەوەو بە خەیاڵاتە شاراوەکانی دەروونەوە بەستراوەتەوە، و هیچ ڕێگایەك بۆ هەست پێکردنی نییەو، ناکرێت ئەو شاراوانە بە عیللەت دابنرێن، بۆیە شەرع لە جێگەیاندا شتێکی ئاشکرای داناوە، کە دەستەواژە و دەقی گرێبەستەکەیە.

هەروەها کوشتنی دوژمنکارانەی بەتایبەت، کە عیللەتە بۆ کوشتنەوەی کابرای بکوژ، بەڵام بێگومان بەتایبەت‌و دەست ئەنقەست بوون، شتێکی شاراوەیەو لەدەروونیدایە، تەنها

ئەو کەسەی ئەنجامی داوە، پێی دەزانێت، بۆیە شەرع لە جێگایەکدا شتێکی ڕوونو ئاشکرای داناوە، کە پێوەی پەیوەست بێتو، دەلالەتی لەسەر بکات، ئەویش ئەو ئامرازە کوشندەیەیە کە کابرای بکوژ هەڵی گرتووە، وەك شمشێرو دەمانچەو چەك.

هەروەها جێگیر بوونی سپێرمی پیاو لە منداڵدانی ئافرەتدا، بە هۆی کۆبوونەوە لە گەڵیدا، ئەمە عیللەتە بۆ جێگیر بوونی ڕەچەڵەکی ئەو منداڵە بۆ باوکی، بەڵام ئەم کارە شتێکی شاراوەیە، هیچ ڕێگایەك نییە، بۆ زانینیو جەخت کردنەوە لەسەری، بۆیە شەرع لە جێگاکەیدا شتێکی ئاشکرای داناوە، کە دەلالەت بکات لەسەری، کە ئەویش گرێبەستێکی دروستو تەواوی هاوسەرێتییە، یاخود شتە ئاشکراکە ئەم گرێبەستەیە، لەگەڵ بوونی گونجاوی کۆبونەوەی شەرعی ئەو ژنو پیاوە پێکەوە، و یاخود هەر سەرجێی کردنی تەواوی نێوانیان، کە لێرەدا جیاوازی نێوان شەرعزانانی لەسەرە، واتە ئەمانە ئەوشتە ئاشکرایانەن کە شەرع لە جێگای شتە نائاشکراکاندا دایناون.

- **دووەم: دەبێت وەصفەکە چوارچێوەدارو دیارو سنوردار بێت:** مەبەست لە (منضبط) چوار چێوەداربوون، واتە دەبێت وەصفەکە سنووردار بێتو، هەقیقەتێکی دیارو سنورداری هەبێتو، بەگوێرەی کەسەکانو حاڵەتەکان گۆڕانی بەسەردا نەیەت، یاخود ئەگەر ئەو گۆڕانو جیاوازییەی هەبوو دەبێت کەم بێت، وەك ئەوەی کە کوشتن هۆکارە بۆ بێ بەشبوونی بکوژ لە میراتبردن، کە ئەمە هەقیقەتێکی دیارو سنوردارو چوار چێوەداری هەیە، کە بەگوێرەی بکوژو کوژراوە جیاوازەکان ناگۆڕێتو، دەکرێت کە بکوژی وەسیەتکاریش قیاس بکرێتەسەر بکوژی میراتدەر، و هەروەها سەر خۆشبوون عیللەتی حەرامی ئارەقەو، ئەمەیش حەقیقەتێکی دیارو سنور بۆ دانراوی هەیە، کە بریتییە لەو لاڕێیو بێ هۆشییەی کە بەسەر عەقڵدا دێتو، ئەمەیش ڕاستیو حەقیقەتێکی جێگیرە بۆ خودی ئارەقو، گرنگ نییە کە کابرا لەبەر هەر هۆکارێك بێت، سەرخۆش نەبێت! ودەکرێت کە ئەم صیفەتی سەرخۆشکردنە لە هەموو گیراوەیەکی سەرخۆشکەردا پراکتیزە دەبێتو، ئەوەیش هیچ بایەخێکی نییە کە گیراوەکان لە پلەی سەرخۆشکردندا، لە بەهێزیو بێ هێزیدا جیاوازییان هەیە، چونکە ئەو جیاوازییە کەمە، کارناکاتە سەر حەقیقەتی سەرخۆشکردنو بوونی ئەو سەرخۆشییەو بۆیە گوێی پێ نادرێت.

هۆکاری ئەم مەرجەیش ئەوەیە کە بنەمای قیاسکردن، یەکسانی بوونە لە نێوان

فەرعەکەو، ئەسڵەکەدا، لە عیللەتی ئەو حوکمەیدا کە یەکسانییەکەی لەهەمان حوکمدا لەسەر بنیات نراوە، بۆیە ئەگەر عیللەتەکە سنووردار نەبوو، ناتوانرێت حوکمەکە بەسەر یەکسانی نێوان ئەسڵ‌و فەرعەکەدا بدرێت، لە عیللەتەکەدا، بۆیە دەبینین ئەگەر وەصفەکە ناسنووردارو بێ چوار چێوە بوو، شەرع هاتووە، لە جێگاکەیدا شتێکی چوار چێوەداری داناوە، کە جێگای ئەوی تیادا بووەتەوە، وەك نارەحەتی کە عیللەتی دروستی شکاندنی ڕۆژووە لە ڕەمەزانداو، لەبەر ئەوەی کە نارەحەتی بێ سنوور و بێ چوار چێوەیە، شەرع هاتووە لە جێگاکەیدا شتێکی چوار چێوەداری داناوە، کە جێگای لەباری ڕوودانی ئەو نارەحەتییە یە، کە ئەویش سەفەرکردن‌و نەخۆشییە، وەك خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَمَن كَانَ مِنكُم مَّرِيضًا أَوْ عَلَىٰ سَفَرٍ فَعِدَّةٌ مِّنْ أَيَّامٍ أُخَرَ﴾[1] واتە: هەر کەس لە ئێوە نەخۆش بوو، یان لە سەفەردا بوو، با ڕۆژووەکەی بشکێنێت، و دواترو لە ڕۆژانی تردا بیگرێتەوە.

## - سێیەم: دەبێت ئەو وەصفە، گونجاو بێت، لەگەڵ حوکمەکەدا:

واتە: دەبێت وەصفەکەو حوکمەکە پێکەوە شیاوو گونجاوبن، واتە بەستنەوەی حوکمەکە بەو وەصفەوە، زیاتر بیری مرۆڤ بەلای ئەوەدا پشت ڕاست بکاتەوە، کە لەو پێکەوە بەستنەدا هاتنەدی حیکمەتی حوکمەکە لەبارەو هەیەو جێ بەجێ دەکرێت، واتە ئەو بەرژەوەندییەی کە شەرع ڕەچاوی کردووە، لەکاتی بەشەرعکردنی ئەو حوکمەدا، لە کاتی بەستنەوەی بەو وەصفەوە بەرژەوەندییە کە دێتەدی‌و جێ بەجێ دەبێت، وەك کە کوشتنی بەدەست ئەنقەست وەصفێکی شیاوو گونجاوە، بۆ بەستنەوەی کوشتنەوەی بکوژەکە پێیەوە، و یاخود بۆ بەستنەوەی بێ بەشبوونی بکوژ لە میراتی میراتدەرەکەی، ئەگەر کوژراوەکە میراتدەری ئەم بوو، چونکە لە شان‌و شکۆی ئەم پێکەوە بەستنەوەیەوە حیکمەتی بەشەرع کردنی ئەو حوکمە دێتەدی‌و بەرجەستە دەبێت، کە ئەو حیکماتەیش دەستهەڵگرتنی خەڵکە لە دوژمنکاری‌و تاوان‌و، پاراستنی گیانی خەڵك لە لەناوچوون‌و، هەروەها سەرخۆشبوون وەصفێکی گونجاوە بۆ حەرامکردنی ئارەق، چونکە لەبەر پاکردنی ئەم حوکمەدا، بەو وەصفەی کە کراوە، عەقڵ دەپارێزێت لە خراپ بوون‌و، دزی وەصفێکی گونجاوە، بۆ دانانی یاسای پێویستی بڕینی دەستی دزی پیاوو ژن کە شەرع دایناوە، چونکە

---

[1] سورة (البقرة/ ١٨٤).

بەستنەوەی ئەو برینە بەدزییەوە خۆی لە خۆیدا پارێزەری ماڵو سامانی خەڵکەو، هەروەها سەفەر کردن لە مانگی پیرۆزی ڕەمەزاندا، وەصفێکی گونجاوە بۆ حوکمدان لەسەر دروستی شکاندنی ڕۆژووەکە تیایدا، چونکە بەهۆی ئەم پێکەوە بەستنەوە زیاترو زیاتر لایەنی هاتنەدی حیکمەتی حوکمەکە بەرجەستە دەبێت، کە حیکمەتەکەیشی لادانی نارەحەتیو سەختی سەرشانی مرۆڤە.

کەواتە هۆکاری ڕاستەقینەی بەشەرع کردنی هەر حوکمێك بریتییە لە هاتنەدیو بەرجەستە بوونی حیکمەتەکەی، و ئەگەر ئەم حیکمەتە لەسەر جەمی ئەحکامەکاندا دیارو چوار چێوەدار دەبوو، ئیتر خودی حیکمەتەکە دەبووە عیللەت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە دیار نییەو، چوار چێوەدار نییە، ئەوا لە جێگایاندا کۆمەڵە وەصفێکی دیارو چوار چێوەدار دانراوە، کە هەم گونجاونو هەم جێگای لە بارو شیاو هاتنەدی ئەو وەصفانەن.

جا لەسەر بنەمای ئەم مەرجە دروست نییە، کە عیللەتێك بەرپا بکرێت، بۆ ئەو حوکمە کە نەشیاوو نەگونجاوو نەساز بن پێکەوە، کە ئەمەیش بە (الأوصاف الطردية) یان (الأوصاف الأتفاقية) واتە: وەصف گەلی پێوە پچڕاو یان وەصفی خۆڕسکی، ناونراون، وەك ڕەنگی ئارەقو ئاستی شلیو تامەکەی ناگونجێن کە ببنە وەصفی گونجاوی حەرامی ئارەق، و هەروەها ئەگەر دز دەوڵەمەند بوو، یان کەسایەتی بوو، یان دەشتەکی بوو، یاخود دزی لێکراو هەژار بوو، یان کرێکار بوو، کە هیچکام لەم وەصفانە ناتوانن ببنەوەصفی گونجاوی حوکمەکە، کە حوکمی برینی دەستی دزی ژنو پیاوو، هەروەها بکوژی دەست ئەنقەست هەر کەسێ بێ، پیاو بێت یان ژن بێت، یان عێراقی بێت، یان ڕۆشنبیر بێت، یان نەزان بێت، ئەمان هیچکام ناگونجێن، کە وەصفێکی شیاوو گونجاوبن، بۆ واجب بوونی کوشتنەوەی بکوژەکە، یاخود بۆ حوکمدان بۆ بێ بەشکردنی لە میرات بردن، ئەگەر کوژراوەکە میراتدەری بوو.

– **چوارەم: دەبێت ئەو عیللەتە وەصفێکی تێپەڕی هەبێت**، واتە، نابێت ئەو وەصفە تەنها لەسەر ئەسڵەکە کورت هەڵهاتبێ، چونکە بنەمای قیاسکردن، بریتییە لە بەشداری کردنی فەرعەکە لە عیللەتی حوکمەکەدا، لەگەڵ ئەسڵەکەی خۆی، چونکە بەم بەشداری کردنو یەکسانبوونەوەیە دەکرێت کە حوکمی ئەسڵەکە بگوازرێتەوەو تێپەڕی پێ بکرێت بۆسەر فەرعەکە، چونکە ئەگەر عیللەتەکە عیللەتێکی وابوو، کە تەنها لەسەر ئەسڵەکە

دەمایەوەو، لەسەر غەیری خۆی نەدەبینرا، ئەوە قیاس ناکرێت و نییە، چونکە لەو کاتەدا عیللەتەکە لە فەرعەکەدا بوونی نابێت، بۆیە دواجار قیاس بەرپا نابێت، وەك ئەوەی کە سەفەرکردن عیللەتێکە بۆ دروستی شکاندنی ڕۆژوو لەلایەن کابرای سەفەری یان نەخۆشەوەو ئەم عیللەتەیش تەنها لە گەشتیارو نەخۆشدا بوونی هەیەو، کەواتە بەس لەواندا کورت کراوەتەوەو لەواندا هەیەو تێپەڕ ناکاتە سەر غەیری ئەمانو ناگوازرێتەوە بۆ سەریان وەك کرێکاری کانزا، یان خزمەتکاری ناو کەشتی هەر چەندە لە کارەکانیدا تووشی ناڕەحەتی زۆر دێن بۆیە هەر لەسەر ئەسڵەکە کورت کراوەتەوە، و نەچووەتە سەر فەرعەکان، ئەمە بەپێچەوانەی سەرخۆشکردنەوە، کە عیللەتی حەرامی ئارەقە، کە ئەمەیش وەصفێکە لەسەر جەم گیراوەی سەرخۆشکاردا هەیە، بۆیە لەسەر ئەسڵەکە کورت هەڵنەهێنراوە.

## - پێنجەم: دەبێت عیللەتەکە لەو وەصفانە بێت، کە شەرع پێودانگ (إعتبار)ی، هەڵنەوەشاندونەتەوە:

واتە: بەڵگەیەکی شەرعی نەهاتبێ کە ئەو وەصفە بسڕێتەوەو لە کاری بخات، بۆیە هەر لەسەرەتادا وا بۆ موجتەهید دەر دەکەوێتو، وا گومان دەبات، کە ئەو وەصفە دیاریکراوە، دەگونجێت ببێتە وەصفێکی گونجاو بۆ حوکمێکی دیاریکراو، بەڵام لە ڕاستیدا لە گەڵ دەقدا پێکدادەدەنو، پێچەوانەی بەڵگەیەکی شەرعی دەبێتەوەو، ئیتر ئەو وەصفە هیچ پێودانگو گونجانێکی لە گەڵ حوکمەکەدا بۆ نامێنێتەوە، چونکە هەر شتێ پێچەوانەی بەڵگە ببێتەوە، ئەوە بە یەکلاییو قەطعی بەتاڵەو کاری پێ ناکرێت، نموونەیش بۆ ئەمە وەك ئەوەی کە کابرای موجتەهید هەر لەسەرەتادا وا گومان بەرێت، کە ئەگەر کەسێك بە هۆی سەرجێی کردن لە مانگی ڕەمەزاندا ڕۆژووەکەی خۆیی بەتاڵکردەوەو، توانای ئازاد کردنی کۆیلەیەکی هەبوو، ئەوا لە سەرەتادا لەسەری پێویستە کە شەست ڕۆژ بەسەریەکەوە بەڕۆژووبێت، (چونکە ئازاد کردنی کۆیلەیەك بۆی ئاسانە، بۆیە دەبێت لە سەرەتادا کارە سەختەکە بکات)، ئەمە گونجاوە بۆ هاتنەدی حیکمەتی کەفارەت دانەکە، کە سزادانو سەختی پێ چەشتنە، بەڵام ئەم ڕایە بەتەواوەتی هەڵەیە، و لە دەرەنجامدا توانا بوونی کابرای ڕۆژوو شکێن لەسەر ئازاد کردنی بەندەیەك، وەصفێکی گونجاو نییە، بۆ ئەوەی لەسەرەتادا ڕۆژووەکەی لەسەر فەرز بکرێت، چونکە ئەم قسەیە پێچەوانەی ئەو دەقە شەرعییەیە کە لەم

بارەیەوە هاتووە، کە ڕیزبەندی کەفارەتەکەی کردووە، لە سەرەتادا ئازادکردنی بەندە، و پاشان بەڕۆژوو بوونی شەست ڕۆژ کەسێ کە توانای ئازادکردنی بەندەی نەبووو، دواتر نان دانی شەست هەژار، بۆ کەسێ کە توانای بەڕۆژووبونەکەیشی نەبووو، هەر لەبەر ئەمەیش بوو، کە شەرعزانان ئەو فتوایەی قازی ئەندەلوسیان بەهەڵە دانا، کە فتوای بۆ یەکێك لە خەلیفەکان دابوو، کە کەفارەتی ئەو سەرجێی کردنەی لە ڕەمەزاندا بریتییە لە ڕۆژووگرتنی شەست ڕۆژ بە بەڵگەی ئەوەی کە خەلیفە توانای ئازادکردنی بەندەی هەیە، و کە کەفارەتی ئاسانی لەم جۆرە تووشی سەختیو ئازار چێژی ناکات، بۆیە فەتوای بە سەختەکەیان پێدابوو، کە ئەمە هەڵەیە، و هەروەها دانانی هاوبەشایەتی کوڕوکچ لەوەیدا کە هەردوکیان وەچەی بەرەبابێکن، ئەمە بکرێت بە پێوەرو وەصفێکی گونجاو بۆ حوکمدان لەسەر ئەوەی کە یەکسانن لە میراتیشدا، ئەمە هەڵەیەکی تەواوە، چونکە شەرع گونجاوی ئەم وەصفەی بۆ ئەو حوکمە پێشنیار کراوە لەباربردووە، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿ يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِيٓ أَوۡلَٰدِكُمۡۖ لِلذَّكَرِ مِثۡلُ حَظِّ ٱلۡأُنثَيَيۡنِۚ فَإِن كُنَّ نِسَآءٗ فَوۡقَ ٱثۡنَتَيۡنِ فَلَهُنَّ ثُلُثَا مَا تَرَكَۖ وَإِن كَانَتۡ وَٰحِدَةٗ فَلَهَا ٱلنِّصۡفُۚ وَلِأَبَوَيۡهِ لِكُلِّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا ٱلسُّدُسُ مِمَّا تَرَكَ إِن كَانَ لَهُۥ وَلَدٞۚ فَإِن لَّمۡ يَكُن لَّهُۥ وَلَدٞ وَوَرِثَهُۥٓ أَبَوَاهُ فَلِأُمِّهِ ٱلثُّلُثُۚ فَإِن كَانَ لَهُۥٓ إِخۡوَةٞ فَلِأُمِّهِ ٱلسُّدُسُۚ مِنۢ بَعۡدِ وَصِيَّةٖ يُوصِي بِهَآ أَوۡ دَيۡنٍۗ ءَابَآؤُكُمۡ وَأَبۡنَآؤُكُمۡ لَا تَدۡرُونَ أَيُّهُمۡ أَقۡرَبُ لَكُمۡ نَفۡعٗاۚ فَرِيضَةٗ مِّنَ ٱللَّهِ ﴾[1] کە بەشی کوڕی، بە دوو هێندەی بەشی کچ داناوە.

جا ئەگەر هەندێ خەڵکیش بڵێن: هاوبەشی ژنو پیاو لە گرێبەستی هاوسەرێتیدا وەصفێکی گونجاوە بۆ ئەوەی کە بگوترێت واجبە هاوبەش بن، لە مافی تەڵاقیشدا، ئەم قسەیە قسەیەکی بەتاڵە، چونکە بەڵگە شەرعییەکان، لەسەر ئەوەن کە تەڵاق بەدەستی پیاوەوەیە، نەك ئافرەت، بەڵام دروستە کە مافی تەڵاقی هەبێت، ئەگەر لە گرێبەستەکەدا بە مەرج ئەو مافەی بۆ خۆی دەستە بەر کردبێت، کە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە شەرع ئەو وەصفە گونجاوەی سڕیوەتەوە، کە واگومان دەبات، پیاوو ژن لەبەر ئەوەی کە لە گرێبەستی مارەکردندا هاوبەشن، کەواتە لە مافی تەڵاقیشدا یەکسانن، ئەم حوکمە دووەمینە پێشنیار کراوە بەتاڵە، چونکە پێچەوانەی بەڵگە شەرعییەکانە.

---

[1] سورة (النساء: ١١).

## ١٩٠- ئاستی گونجان‌و پەیوەندی نێوان حوکم و عیللەت[1]:

پێشتر گوتمان، کە لە مەرجەکانی عیللەت ئەوەیە کە وەصفێکی گونجاو بێت بۆ حوکمەکە، واتە جێگاو پێگەیەکی هاتنەدی حوکمەکەی تیادا چاوەڕوان بکرێت‌و، هەروەها ئامانج‌و مەبەستی شەرعدانانی ئەو حوکمەی تیادا بێتە جێ‌و، ئەو گونجان‌و پەیوەندییەش نەبەستراوەتەوە بە حەزو ئارەزووی دەروون‌و نەفسی مرۆڤەوە، بەڵکو یاساو ڕێسا گەلێکی ڕێکخراوی بۆ دانراوە، کاتێك ئەو گونجان‌و پەیوەندییە دەچەسپێت کە شەرع بە جۆرێك لە جۆرەکانی ئیعتیبارو حسابی بۆ دانابێت، بۆیە زانایانی ئوصولی فیقە، وەصفی گونجاویان، لە ڕووی حساب بۆ کردن‌و نەکردنیەوە لە شەرعدا، دابەشکردووە، بۆ ئەم بەشانەی لای خوارەوە:

### ١٩١- یەکەم: ((المناسب المؤثر: گونجانی کاریگەر)):

کە بریتییە لەو وەصفەی کە شەرع وای داناوە، کە خودی ئەو شتەی کردووەتە عیللەتی هەمان حوکم، واتە ئەو حوکمەی کە لەسەر ئەو گونجانە بنیات نراوە، ئەم جۆرە تەواوترین جۆری حساب کردنە بۆ وەصف‌و، بۆیە بە (المناسب المؤثر) ناونراوە، چونکە شەرع لەبەر ئەوەی کە بەکامڵ‌و تەواوترین جۆری حساب بۆ کردن تەماشای کردووە، بۆیە وەك ئەوە وایە کە دەلالەتی کردبێت، لەسەر ئەوەی کە وەك بڵێیت ئەو حوکمە لەوەوە سەرچاوەی گرتووە، یاخود شوێنەوارێکە لە کاریگەری شوێنەواری ئەو گونجانەوە بەرپابووەو، ئەمەیش بەرزترین جۆرەکانی گونجانەو، لەلای ئەوانەی کە حیسابیان بۆ قیاس کردووە، هیچ ڕاجیاییەك نییە لەوەیدا کە دروستە قیاسکردنی لەسەر ئەنجام بدرێت، و نموونەکەیشی وەك ئایەتی: ﴿وَيَسْـَٔلُونَكَ عَنِ ٱلْمَحِيضِ ۖ قُلْ هُوَ أَذًى فَٱعْتَزِلُوا۟ ٱلنِّسَآءَ فِى ٱلْمَحِيضِ﴾[2] واتە: پرسیارت لێ دەکەن، لەسەر سەرجێی کردن لە گەڵ ئافرەتی بێ نوێژدا، پێیان بڵێ لەو حاڵەتەدا دەربکەونەوە، و سەرجێیی لە گەڵ نەکەن، چونکە لەو دەمەدا بەئازارە.

کە حوکم لێرەدا دراوە بە واجبی دوورکەوتنەوە لەژنی بێ نوێژ، کە بەودەقە جێگیر بووەو، دەستەواژەیەکی ڕاشکاوانەیە کە ئەو ئازارەی بە هۆی بێ نوێژییەوە دروست دەبێت، عیللەتی حوکمەکەیەو، کەواتە ئازارەکە وەصفێکی کاریگەرە لەسەر پرۆسەکە.

---

[1] الآمدي ب٣، ل٤٠٥، و دواتر، فواتح الرحموت، ب٢، ل٢٥٥و دواتر.

[2] سورة (البقرة / ٢٢٢).

هەروەها وەك فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (إِنَّمَا نَهَيْتُكُمْ مِنْ أَجْلِ الدَّافَّةِ)، واتە: بەرگریم لێکردوون لە پاشەکەوتکردنی گۆشتی قوربانی، لەبەر خاتری ئەو عەرەبانەی دەرەوەی شاری مەدینە، کە سەردانی ئەم شارە دەکەن، کە پێویستیان بەخواردنە! کە ئەم دەقە ڕاشکاوانەیە لەسەر ئەوەی کە عیللەتی بەرگرتن لە پاشە کەوت کردنی گۆشتەکە، هاتنی ئەو خەڵکەیە، کەبە (الدافة) دەربڕدراوە، کەواتە ئەو عیللەتە وەصفێکی کاریگەرو شوێنەواردارە لەسەر حوکمەکە.

هەروەها وەك ئایەتی: ﴿وَٱبْتَلُوا۟ ٱلْيَتَـٰمَىٰ وَعَلَى ٱلْمَوْلُودِ لَهُۥ رِزْقُهُنَّ وَكِسْوَتُهُنَّ بِٱلْمَعْرُوفِ ۚ لَا تُكَلَّفُ نَفْسٌ إِلَّا وُسْعَهَا حَتَّىٰٓ إِذَا بَلَغُوا۟ ٱلنِّكَاحَ فَإِنْ ءَانَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَٱدْفَعُوٓا۟ إِلَيْهِمْ أَمْوَٰلَهُمْ﴾[1] کە ئەم دەقە قورئانییە ئاماژە بەوە دەکات کە چاو دێری بەسەر ماڵو سامانی کەسێکەوە کە هێشتا باڵغ نەبوبێت،ئەمە حوکمێکی چەسپاوە بۆ خاوەنەکەیو چاودێرەکەیو عیللەتی ئەم حوکمەیش منداڵ بوونیەتیو، ئەمەیش ئیجماعی لەسەرە، واتە منداڵی عیللەتی حوکمدانە، بەسەر چاودێری کردنی سامانەکەیدا.

## ١٩٢- گونجانی سازاو ((المناسب الملائم)):

بریتییە لەو وەصفەی کە بەڵگەیەکی شەرعیی نەهاتووە، کە خودی ئەو وەصفە دابنێت، بەعیللەتی حوکمەکەو، بەڵکو بەڵگەیەکی شەرعی لە قورئان یان ئیجماع هاتووە، کە خودی ئەو وەصفەی داناوە، بە عیللەت بۆ جینسی حوکمەکە، یاخود دانانی جینسی ئەو وەصفەی وەك عیللەتێك بۆ خودی حوکمەکە داناوە، یاخود جینسی وەصفەکەی داناوە وەك عیللەتێك بۆ جینسی حوکمەکە، واتە: ئەم حاڵەتە ڕاستەو خۆو ڕاشکاوانە نییەو، بەڵکو سازانی لەسەر کراوە.

جا ئەگەر کەسی موجتەهید گونجانی لەم جۆرەی کردە عیللەتی هەر حوکمێکی شەرعیی، ئەوە ئەو عیللەت دانانەی گونجاوو سازە لەگەڵ پەیڕەوو میتۆدی شەرع، لە عیللەت داناندا، لە بەرپاکردنی ئەحکامەکاندا، بۆیە پرۆسەی بە عیللەت کردنەکەی لێ وەردەگیرێتو، قیاسکردن لەسەریشی دروستە، و **لێرەدا چەند نموونەیەك لەسەر ڕووە جۆراو جۆرەکانی ئەم جۆرە گونجانە دەخەینە ڕوو:**

---

[1] سورة (النساء/ ٦).

أ- نموونە بۆ ئەو وەصفەی کە شەرع خودی وەصفەکەی کردۆتە عیللەت بۆ جینسی حوکمەکە، وەك چەسپاندنی ویلایەتو سەرپەرشتیاری بۆ باوك لەسەر پرۆسەی مارەکردنی کچە بچووکەکەی، کە عیللەت لەم حوکمەدا لەسەر رای حەنەفییەکان بریتییە لە بچوکی تەمەنی کچەکە، نەوەك کچایەتی بوونی، بە بەڵگەی ئەوەی کە شەرع شایەتی داوە، لەسەر حساب بۆ کردنو ئیعتیبار بۆ دانانی ئەم وەصفە، وەك ئەوەی کە ئەم وەصفەی بەعیللەت داناوە، بۆ ویلایەتو چاودێری کردنی سەر موڵكو سامانو، لەبەر ئەوەی کە ئەم جۆرە ویلایەتەو ویلایەتی مارەکردنی کچەکە لەیەك جینسن، واتە ویلایەتی رەها (مطلق)ـن، بۆیە شەرع کەم تەمەن بوونو بچوك بوونی بەعیللەت داناوە، بۆ هەرشتێ کە لە جینسی ویلایەت بێت، واتە: کەم تەمەن بوونی، بۆ سەرجەم جۆرەکانی ویلایەت وەك عیللەتی ئەژمار کردووە، کەواتە بچوکیو کەم تەمەنی ئەو وەصفە شیاوو گونجاوەیە کە پەیوەستە بەو حوکمەوە کە دراوە، لە سەر ئەوەی کە دەبێت مارەکردنی ئافرەت، کچ بێت، یان بێوەژن کە منداڵ بوو، هەر دەبێت بە چاودێریو ویلایەتی سەرپەرشتیارەکەی ئەنجام بدرێت.

ب- نموونە بۆ ئەو وەصفەی کە شەرع جینسی وەصفەکەی وەك عیللەتێك بۆ خودی حوکمەکە ئەژمار کردووەو، داناوە، وەك کۆکردنەوەی نوێژەکان لەرۆژی باراناویدا، لەلایەن ئەو شەرعزانانەی کە بڕیاریان لەم بارەیەوە داوە، وەك پێشەوا مالیك، کە سوننەت مۆڵەتی داوە، بە کۆکردنەوەی نوێژەکان لە رۆژی باراناویدا، بەڵام بەراشکاوی عیللەتی ئەم حوکمەی دیاری نەکردووە، بەڵام بینراوە کە شەرع وەصفێکی هاو جنسی ئەم وەصفەی کە (بارانە)، بەعیللەت داناوە، بۆ حوکمی کۆکردنەوەکە، کە هاوجنسیەکەیش (سەفەرکردنە) چونکە بارانو سەفەر هەردووکیان، لەیەك جینسن، چونکە هەردووکیان جێگاو دۆخێکی لەبارن، بۆ ئەوەی کە تیایاندا مرۆڤ تووشی نارەحەتیو دژواری دەبێتو، ئەم حاڵەتەیش شیاوە بۆ ئەوەی کە ئاسانکاریو ئەرك لەسەر شان کەم کردنەوەی تیادا بکرێت، لەسەر شانی مرۆڤە موکەللەفەکانو، هەروەها حوکمی دروستی کۆکردنەوەی نوێژەکان لە سەفەردا، هەر هەمان ئەو حوکمەیە کە لەبارانیشدا هاتووەو، دراوە، جا کە شەرع سەفەری کردۆتە عیللەت بۆ دروست بونی کۆ کردنەوەی نوێژەکان، ئەمە بۆ کەمکردنەوەی ئەرکی سەرشانی کابرای سەفەرکارە، و ئەمەش بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەرشتێ لە هەمان جینسی ئەم بێت، وەك (باران) دەبێتە هۆی موباحو دروستکردنی ئەو حاڵەتی کەم کردنەوەی ئەرکەو ئاسانکاری کردنەو دروستی کۆ کردنەوەی دوو نوێژەکان، کەواتە باران عیللەتی حوکمی دروستی

کۆکردنەوەکانە بۆیە دروستی کۆکردنەوەی نوێژەکانی لە کاتی بەفرو تەرزە بارینددا لەسەری قیاس دەکرێت‌و، نموونەکانی تریش هەروان .

ج- نموونە بۆ ئەو وەصفەی کە شەرع جینسی وەصفەکەی وەك عیللەت داناوە، بۆ جینسی حوکمەکە، وەك ئەوەی کە بێ نوێژی ئافرەت کە هۆکارە بۆ لابردنی نوێژکردن لەسەر شانی ئافرەتە بێ نوێژەکە چونکە حوکمی شەرعیی لەسەر ئەوە هەیە، کە ئافرەتی بێ نوێژ ڕۆژووی لەسەر نییەو نایگرێت‌و، لە کاتی بێ نوێژیدا نوێژی لەسەر نییەو نایکات جا کە پاك بوویەوە، گرتنەوەی ڕۆژووەکەی لەسەرە، بەڵام کردنەوەی نوێژەکانی لەسەر نییەو، عیللەتی ئەم حوکمەیش لەوە دایە کە پابەندکردنی ئافرەتی بێ نوێژ، کە پاك بوویەوە، بەکردنەوەی نوێژە فەوتاوەکانی‌و، لە کاتی دووبارە بوونەوەی کاتەکانیدا، ئەمە کارێکی سەخت‌و دژوارە بۆی، بۆیە شەرع ئەو بێ نوێژییەی لە جێگای ئەو سەختی‌و دژوارییە داناوەو ئەژمار کردووە، و بۆتە ئەلتەرناتیف بۆی، و کردوویەتییە عیللەتی ئەوەی کە حوکم بدات کە گێڕانەوەی نوێژەکانی لەسەر نییەو، لە شەریعەتدا شتی لەو شێوازە هەیە کە دەلالەت دەکات، لەسەر ئەوەی کە ئەو شتەی وەك بێ نوێژی وایەو لە جینسی ئەوەو، پێگەی سەختی‌و ئازار چەشتنە، شەرع ئیعتیباری بۆ داناوەو، کردوویەتییە عیللەتێك، بۆ ئەو شتەی کە لەجینسی لادانی نوێژە لەسەر ئافرەتی بێ نوێژ، بۆ نمونە، کە سەفەرکردن پێگەو سەخت‌و دژواری چەشتنەو، حوکمی کورتکردنەوەو کۆکردنەوەی نوێژەکان‌و دروستی شکاندنی ڕۆژوو لە مانگی ڕەمەزانداو، لەو حاڵەتەدا، لەسەر ئەو سەفەرو سەختییە بنیات نراوەو، ئەندازەی هاوبەشی نێوان سەرجەمی ئەم ئەحکامانە، لەگەڵ حوکمی لادانی نوێژ لەسەر ئافرەتی بێ نوێژ، بریتییە لە ئاسانکاری کردن لەسەر شانی کەسی موکەللەف، و لادانی دژواری لەسەر شانی، و کەواتە دواجار هەموویان لەیەك جینسن، هەوەك چۆن سەفەر کردن کە عیللەتی ئەم ئەحکامانەیەو، جێگای سەختی‌و دژواری چەشتنە، بۆیە سەفەر کردن و لە بێ نوێژیدا بوون، هەردووکیان جێگای سەخت‌و ئازار چەشتنن‌و کەواتە هەردووکیان یەك جینسن.

نموونەیەکی تر وەك حەرامی خواردنەوەی کەمێ ئارەق، هەر چەندە بخۆریش سەر خۆش نەکات، جا کەسی موجتەهید وای دەبینێ کە عیللەتی حەرام کردنی ئەم بڕەکەمە بریتییە لە بەر بەست دانان بۆ ئەو پاساوو بیانوو ڕێگانەی کە دەبنە هۆکاری خواردنەوەی زۆری ئارەق کە مرۆڤ سەر خۆش دەکات، و لە نێوان ئەحکامەکانی شەریعەتیشدا بەڵگە لەسەر ئەم

قسەیە هەیە، کە ئەویش ئەوەیە کە بەتەنها بوون لەگەڵ ئافرەتی بێگانەداو، عیللەتەکەیش بریتییە لە بڕینەوەی پاساوو بیانوو زیاترو بەرگرتنە لە کردەوە خراپە گەورەکە، جا خواردنەوەی ئارەقی کەمو، مانەوەی تەنیایی لەگەڵ ئافرەتی بێگانە، دوو وەصفن لە یەك جینس، کە ئەویش پاساو دروست کردنە بۆ حەرامکاریو، حەرامی هەردوو کیشیان یەك شتە، کە حەرامکردنی ڕەها (مطلق)ـە، بۆیە کەمێ لە گیراوەی سەرخۆشکار (نبیذ)، وەك (بیرە) قیاس دەکرێتە سەر کەمە ئارەقەکەو ئەویش حەرامە.

هەروەها نموونەیەکی تر وەكو ئەوەی کە پاشماوەی (خواردنو خواردنەوەی) پشلیلە پاکەو پیس نییە، و پێغەمبەریش (ﷺ) عیللەتی ئەم حوکمەی بەوە دەر بڕیوە، کە فەرموویەتی: (إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ)، واتە: پاشماوەی یاخود بەرماوەی خواردنو خواردنەوەی پشیلە پیس نییە، چونکە پشیلە وەك خزمەتکارو دانیشتوانی دیکەی ماڵ، دوورو نزیك بەسەرتاندا دەگەڕێنو دێنو دەچن، کە ئەم بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عیللەتی پاکبوونەکەی بریتییە لەوەی کە لەگەڕیدەکانی هاتوو چۆی دەورو بەری ماڵانە، چونکە شتێ زۆر هاتوچۆ بکات، چاوەڕێی سەختیو دژواری لێ دەکرێت، کە بڕیار لەسەر پیسی بەرماوەکەی بدەین، و وەك وایە کە حوکم دراوە لەسەر پاکی بوونەکەی لەبەر ئەوەیە کە ئاسانکاری لەسەر شانی کەسی موکللەف دروست بکاتو، سەختی لەسەر شانی لا ببات بۆیە دەکرێت، بینینی شەرمگای ئافرەت لە لایەن دکتۆرەوە قیاس بکرێت بە پاکی ئەو بەرماوەیە، و بە دروست دابنرێت، بە پێی ئەوەی کە لە هەردوو پرسەکەدا مەبەست لادانی دژواریو سەختییە لەسەر شانی کەسی موکەللەف، و هەردووکیشیان لەیەك جینسن، کە هەردووکیان چاوەڕێی سەختیو دژوارییان لێ دەکرێت، چونکە ئەگەر بڵێین دروست نییە کە دکتۆر شەرمگای ئافرەت ببینێ، لە کاتی پێویستیدا، ئەمە دیسان سەختی دێنێتە کایەوەو، کەواتە بەقیاس لەسەر ئەوەی سەرەوە بێت، دروستە.

### ١٩٣- سێیەم: (المناسب المرسل: گونجانی بەرەڵاکراو):

ئەمیش بریتییە لەو وەصفەی کە بەڵگەیەکی تایبەت نەهاتووە، حساب بۆ کردن یان نەکردنی ڕابگەیەنێت بۆمان، بەڵام بەرپاکردنی حوکم لەسەری، بەرژەوەندییەك دەهێنێتە کایەوە کە بەشێوەیەکی، گشتی، سەرا پای شەریعەت پشت ڕاستی دەکاتەوەو ئەم جۆرە لەو ڕووەوە کە بەرژەوەندییەك لە بەرژەوەندییەکانی شەیعەت دەچەسپێنێت، بە شتێکی

گونجاوو موناسب دێتە ئەژمارو، دواتر لەو ڕوانگەیەوە کە هیچ بەڵگەیەك سەبارەت بەدروستیو نا دروستی ئەو لە ئارادا نییە، بۆیە بە (مرسل: بەرەڵاکراو)، ناوزەد کراوە، و ئەمەیشە کە بە (المصلحة المرسلة) ناو نراوە، و لە لای مالکی و حەنبەلیو هاوڕاکانیان بە بەڵگە دانراون، و لە لای غەیری ئەوان، وەك حەنەفیو شافعییەکان، بە بەڵگە دانەنراوە، نموونەیش وەك، کۆکردنەوەی قورئانی پیرۆزو، لێدانی دراوو، دانانی زیندانو، دانانی باج لەسەر زەوییە کشتوکاڵییە فەتح کراوەکانو، هتد.....

## ١٩٤- چوارەم: (المناسب الملغى: گونجاوی هەڵوەشاوە):

کە ئەمیش بریتییە لەو وەصفەی کە وادەردەکەوێت، کە گونجاوە، بۆ بنیاتنانی حوکمێکی دیاریکراو لەسەری، ئەمە بە پێی خەیاڵو بیر کردنەوەی مرۆڤەکان، بەڵام شەرع ئیعتیبارو حساب بۆ کردنی ئەمەی هەڵوەشاندۆتەوە، وەك چۆن کەسێ وا بیر دەکاتەوە، کە کابرایەك کە دەمرێ و کورو کچێ بەجێ دەهێڵێ کە هەردووکیان لەیەك بەرەبابنو، بەچکەی یەك کەسن کە واتە دەبێت لە میرات بردنیشدا یەکسانبن، ئەمە تەنها خەیاڵو بیرکردنەوەیەو، گونجاو نییە، چونکە شەرع ئەو گونجانو موناسب بوونەی هەڵوەشاندۆتەوە، بە دەقی قورئان، کە هەروەك پێشتریش باسمان کرد، کوڕ دوو هێندەی کچ بەشە میراتی پێ دەبڕدرێ و دەیبات، و بۆیە ئەمە بنیاتنانی ئەحکامی لەسەر دروست نییە، چونکە بە تەواویو قطعی بیرکردنەوەکەوبنیات نانی حوکمی لەو جۆرە هەڵەیە و بەتاڵە.

## ١٩٥- ڕەوشو ڕێبازەکانی عیللەت:-[1]

مەبەست لەڕەوشو ڕێبازەکانی عیللەت (مسالك العلة) بریتییە لەو ڕێگایانەی کە بەهۆیانەوە دەگەینە ناسینی بوونی عیللەت لە ئەسڵەکەداو، عیللەتیش بەچەند ڕێگاو ڕێبازێك دەناسرێتەوە، کە ناسراترینیان، بریتییە لە، (دەقی شەرعیو، کۆڕای زانایانو، تاقیکردنەوەو، دابەشکردن).

---

[1] الآمدي ب٣، ل٢٦٤و دواتر، فواتح الرحموت، ب٢، ل٢٣٩و دواتر التلويح والتوضيح، ب٢، ل٦٨و دواتر.

## ١٩٦- يەكەم: دەقی شەرعی:

جاری وا هەیە، کە دەقی شەرعی دەبێتە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە وەصفێکی دیاریکراو، عیللەتە، بۆ ئەو حوکمەی کە دەقەکەی لەسەر هاتووەو، لە دەرەنجامدا چەسپانی عیللەتەکە، لەگەڵ دەقەکەدا دێتە دی‌و، لەم حاڵەتەدا عیللەتەکە بە (دەق لە سەر هاتوو: المنصوص علیه)، ناوزەد دەکرێت.

بەڵام ئەوەندە هەیە، کە دەلالەت کردنی دەقەکە لەسەر عیللەتەکە هەموو جارێ بە ڕاشکاوانەو ڕاستەو خۆ نییە، چونکە جاری واهەیە کە بەتیلە چاوو ئاماژە هاتووەو، هەرکاتیش ڕاستەوخۆ بوو، ئەوا دەلالەت کردنەکەی لەسەر ئەو عیللەتە، بە دووجۆر دەبێت، یان (یەکلاکەرەوە: قطعي)یەو، یان (تەمومژاوی: ظني)یەو، لەخوارەوە لەسەر هەموو جۆرەکان بە نموونەوە دەدوێین:

أ- دەلالەت کردن، لەسەر عیللەت، بە دەقی ڕاشکاوانەی قەطعی، کە لەغەیری عیللەت هیچ شتێکی تر لە خۆ نەگرێت، کە لەم حاڵەتەدا دەلالەتی دەقە ڕاشکاوانەکە لەسەر عیللەتەکە قەطعی و یەکلاییە، و ئەمەیش بەدەستە واژەو دەربڕین گەلێك دەبێت، کە لە زمانی عەرەبیداو هەر لەبنەڕەتدا بۆ (عیللەت) دانراون، وەك: (لکیلا: تانەبێتە....)و، (لأجل کذا، لەبەر فلان هۆکار..کَيْ لا، تا نەبێتە ...)، و هتد.... وەك فەرمایشتی قورئان کە دەفەرموێت ﴿رُّسُلًا مُّبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌۢ بَعْدَ ٱلرُّسُلِ﴾[1] کە ئەم دەقە بە ڕاستەوخۆو ڕاشکاوانە ئەوەی درکاندووە کە عیللەتی ناردنی پێغەمبەران (علیهم السلام) بریتییە لە: ﴿لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى ٱللَّهِ حُجَّةٌ﴾ خەڵکی پاساوو بیانوو نەهێننەوە، لەبەر دەم پەروەردگاردا کە پەیامیان پێ نەگەیشتووە! هەروەها فەرمایشتی پەروەردگار کە لە قورئانی پیرۆزدا دەفەرموێت: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةًۢ بَيْنَ ٱلْأَغْنِيَآءِ مِنكُمْ﴾[2] واتە: گرتنەبەری ئەم ڕێ‌و شوێنانە، لەبەر ئەوەیە کە موڵك‌و ماڵ تەنها لەلای دەوڵەمەندەکان مۆنۆپۆڵ و قۆرخ نەکرێت، و ئێوە دەستتان پێی نەگات، جا دوای ئەوەی کە خوای گەورە باسی چۆنیەتی بەگەڕخستنی دەسکەوتەکانی کرد، بۆ هەژارو کەم دەستەکان‌و هتد... ئەم

---

١ سورة (النساء/ ١٦٥).

٢ سورة (الحشر/ ٧).

دەقە بەڕاشکاوانە ئەوەی دەر خستووە، کە عیللەت تیایدا بەر گرتنە لەوەی کە ماڵو سامان تەنها لەلای دەوڵەمەندەکان بێتو، غەیری ئەوان هیچیان نەبێت.

هــەروەها قورئــان دەفــەرموێت: ﴿فَلَمَّا قَضَىٰ زَيْدٌ مِّنْهَا وَطَرًا زَوَّجْنَـٰكَهَا لِكَىْ لَا يَكُونَ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ حَرَجٌ فِىٓ أَزْوَٰجِ أَدْعِيَآئِهِمْ﴾[1] واتــە: ئینجــا کــە زەیــد زەینەبــەی خواســتو، پاشــان پێکەوە نەیانکراو تەلاقیداو جیا بوونەوە، ئێمە لەتۆمان مارەکرد، خودا ئەو بڕیارەی بـەهۆی ئەوەوە دا، تا هیچ دڵتەنگی و گرفتێك بۆ بڕواداران لە مارەکردنی ژنی بەکوڕ کراویان دروست نەبێ و، بەشتێکی ناشرینو ناپەسندی دانەنێن.

ئەم دەقە ڕاشکاوانەیە، لە دەلالەتکردنیدا بە دەلالەتێکی یەکلاییو قەطعی، لەسەر ئەوەی کە عیللەتی هاوسەرگیری پێغەمبەر (ﷺ) لەگەڵ خاتوو زەینەبدا، لەدوای ئـەوەی کـە زەیـد (خو لێی ڕازی بێت) تەلاقیدا، بریتی بوو، لـە لابردنـی دژواری لەسـەر شـانی موسـڵمانان، لـە پرسی مارەکردنی ژنی بەکوڕ کراوەکانیاندا.

هــەروەها فەرمایشتی پێغەمبـەر (ﷺ) سـەبارەت بـە مۆڵەتـدانی بـە پاشـەکەوت کردنـی گۆشتی قوربانی، کە پێشتر ڕێی لێ گرتبوو، کە فەرموویەتی: (إنمـا نهيـتكم عـن إدخـار لُحُـومُ الأضاحي، لأجل الدَّافَّة ، فَكُلُوا وَادَّخِرُوا)، واتە: من تەنها لەبەر خـاتری پێداویـستی هــەژاران، ئێوەم لە پاشە کەوت کردنی گۆشتی قوربانی بەر پێ گرتبوو، لێرە بەدوا لێی بخۆنو، لێشی پاشــەکەوت بکــەن، کــە عیللــەتی نــەهی کردنەکــە یەکــەمجار بریتــی بــوو، لــە پێداویــستی گەشتیارانی شاری مەدینە بەو خۆراکە، جا کە عیللەتەکە نـەما، حوکمەکـەیش نامێنێـت، کـە حەرامی پاشە کەوت کردنییەتی.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفـەرموێت: (إِنَّمَـا جُعِـلَ الِاسْـتِئْذَانُ مِـنْ أَجْـلِ الْبَـصَرِ)، واتــە: مۆڵەت وەرگرتن لە چوونە ماڵاندا، تەنها لەبەر خاتری چاو پارێزی دانراوە، تا شت گەلێك کـە نهێنین، و نابێت ببینرێن، بەر چاو نەکەون، کە ئەم دەقە ڕاستەوخۆو ڕاشکاوانە قەطعی یـە، لەوەیدا کە درکاندویەتی کە عیللەتی موڵەت وەرگرتن، بریتییە لەبەر گرتن لـە ئاگـایی مرۆڤــ بەسەر شتێکدا کە دروست نییە، ئاگایی هەبێت بەسەریدا ، بۆیە سەیرکردنو ئاگایی مرۆڤ لـە پەنجەرەوە بۆ ناو ماڵی کەسانی تر قیـاس لەسـەر ئـەوەی سـەرەوە کراوەو، ئەمـەیش هـەر

---

١ سورة (الأحزاب/ ٣٧).

حەرامە.

ب- دەلالەت کردن لەسەر عیللەتێك بە دەقێکی ڕاشکاوانە، بەڵام لەدەلالەت کردنیدا، لە بەعیللەت بوونی ئەو عیللەتەدا (ناقەطعی)یە، واتە دەقەکە دەلالەت لەسەر عیللەتەکە دەکات بەڵام لەلایەکی تریشەوە بۆی هەیە، دەلالەتی لەسەر شتی ترو لایەنی تر بکات، کە ئەو دەلالەت کردنەی تر، نابێتە ڕێگر لە دەرکەوتنی دەقەکە لە عیللەتەکەدا، بۆیە دەلالەت کردنەکەی لەسەر عیلەتەکە بەڕاشکاوی تەمومژاوی (الصریح الظني) دێتە ئەژمار، وەك فەرمایشتی پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا کە دەفەرموێت ﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ لِتُخۡرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ﴾[1] کە پیتی (لام) لە (لتخرج)دا، بۆ هۆکار (عیللەت دانانە)، هەرچەندە ئەویش هەڵدەگرێت بۆ ئاییندە (عاقبة) بێت نەك بۆ عیللەت (تعلیل).

ج- دەلالەتکردن لەسەر عیللەت بە دەقێکی ناڕاشکاوانە لە عیللەتەکەدا، بەڵام هەر ئاماژە دەکات، بە عیللەتەکەو ئاگادارمان دەکاتەوە لەسەری، بە جۆرێك کە نیشانەیەك لە ئارادا هەبێت، کە وای لێ بکات، دەلالەت بکات، لەسەر عیللەتەکە، و نموونەی ئاشکرای لەم جۆرە، وەك، هاتنی ڕستەی جەخت کەرەوە (مؤكّدة) بە (أنّ)، لە دوای ڕستەیەك کە هاتبێت، سەراپای حوکمەکە ڕەنگ ڕێژ بکاتو بگرێتەوە، وەك فەرمایشتی پێغەمبەر (ﷺ)، کە لە وەڵامی پرسیاری کەسێك سەبارەت بە بەرماوەی خواردنو خواردنەوەی پشیلە فەرمووی: «إِنَّهَا لَيْسَتْ بِنَجَسٍ، إِنَّهَا مِنَ الطَّوَّافِينَ عَلَيْكُمْ وَالطَّوَّافَاتِ»، یاخود وەك ئەوەی کە کەلامەکە لە جێگای (وەڵام)دا، دابنیشێت، وەك پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (أعتق رَقَبة) بەندەیەك ئازاد بکە، کە ئەمە وەڵامە بۆ کەسێ وتراوە کە لە ڕەمەزانداو بەزمانی ڕۆژوو لەگەڵ ژنەکەیدا سەرجێیی کردبێت.

یاخود وەصفەکە ببەسرێتەوە بە حوکمەکەوە، کە ئەم پێکەوە بەستنو کۆنتاکتەو پێکەوە گرێدانە دەلالەت دەکات لەسەر ئەوەی کە ئەو وەصفەی بەستراوەتەوە بە حوکمەکەوە، کە ئەوە عیللەتەکەیە، ئەمەیش هەمان ئەو شتەیە کە زانایانی ئوصول دەری دەبڕنو دەڵێن، هەڵپەساردنی حوکم بەو شتەیدا کە حوکمەکەی لێ هەڵهێنجراوە، ئەوەی لێ دەفامرێتەوە کە عیللەتەکە هەمان ئەو ڕستەیە، کە حوکمەکەی لێ وەرگیراوە، وەك قورئان

---

[1] سورة إبراهیم (١).

دەفەرموێت: ﴿وَٱلسَّارِقُ وَٱلسَّارِقَةُ فَٱقۡطَعُوٓاْ أَيۡدِيَهُمَا﴾[1] واتە: دەستی دزی پیاو ژن ببڕنو، هەروەها دەفەرموێت: ﴿ٱلزَّانِيَةُ وَٱلزَّانِي فَٱجۡلِدُواْ كُلَّ وَٰحِدٖ مِّنۡهُمَا مِاْئَةَ جَلۡدَةٖ﴾[2] واتە: کچو کوڕی داوێن پیس، هەر یەکەو سەد شەلاقیان لێ بدەنو، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (القَاتِلُ لَا يَرِثُ)، بکوژ میرات نابات، و هەروەها دەفەرموێت: (لاَ وَصِيَّةَ لِوَارِثٍ)، واتە: هیچ وەسیەتێکی موڵکو سامانی کاریگەری نییە، بۆ هیچ میرات بەرێ، و هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) فەرموویەتی: (لا يَقْضِي القَاضِي وَ هُوَ غَضْبَانٌ)، با دادوەر لە کاتی تووڕەیدا بڕیار دەر نەکات.

## ١٩٧- دووەم: کۆڕای زانایان: (الأجماع):

جاری وا هەیە، کە بە عیللەت بوونی وەصفێك بەڕێگای ئیجماع دەچەسپێت، وەك ئیجماع کردن لەسەر ئەوەی کە (برا) لەبەر ئەوەی کە لەسەری باوكو لەسەری داکیشەوە تێکەڵەو، سەرچاوەی ڕەچەڵەکی یەکێکە بۆیە پێش دەخرێت، بەسەر (برا)ـی، تەنها باوکیدا، لە میرات بردندا، واتە، ئەو تێکەڵی دوو سەرییە کراوەتە عیللەت، بۆ پێشخستنی بەسەر تێکەڵی یەك سەرەدا، بۆیە لە سەرپەرشتیاری کردنیشدا، هەروایەو، قیاس دەکرێت لەسەر میرات بردنەکەیو، هەروەها برازا، لەبرای دایکیو باوکیو، ئامۆزا، لە مامی دایكو باوکی پێش دەخرێن بەسەر برازا، لەبرای باوکیو، ئامۆزا، لە مامی باوکیو، بەو شێوەیە تا دێت..... لە میرات برندا، قیاس کراوە لەسەر ئەو حاڵەتەی کە لەسەرەتاوە هێنامان.

## ١٩٨- ((تاقیکردنەوە و دابەشکردن: السَّبر والتَّقسیم)):

ئەگەر عیللەت بەدەقی قورئانو فەرمودەو ئیجماع نەچەسپا، ئەوا کەسی موجتەهید پەنا دەباتە سەر هەڵێنجانی عیللەت لە ڕێی تاقی کردنەوەو دابەشکردنەوەو، (السَّبر) بە مانای (الأختبار: تاقیکردنەوە) دێت، و مانای (تقسیم: دابەشکردن) ئەوەیە کە کەسی موجتەهید ئەو وەصفانەی کە بەگونجاویان دەزانێت، کە ببنە عیللەت بۆ حوکمەکە ڕیزبەندیان دەکات، و دواتر هەر یەکەیان یەك لەدوای یەك تاقی دەکاتەوەو سەرنجیان دەدات، هەر کامیان بەشیاوی مانەوە نەزانێت، بەتاڵی دەکاتەوەو، لای دەبات، هەرکامیان بە گونجاو بزانێت کە ببێتە عیللەت، دەیهێڵێتەوە تا دوای ئەم لابردنو هێشتنەوەیە، کەبزانێت کام لەو وەصفانە

---
[1] سورة المائدة (٣٨).

[2] سورة النور (٢).

خـودی عیللەتەکەیـەو، جیـای بکاتــەوە، جـا کەسـی موجتەهیـد لـەم پرۆسـەیەدا سـود لەمەرجەکانی عیللەت وەردەگرێت کە پێشتر باسمان کردو، تەنها وەصـفێك دەهێڵێتـەوە کـە ئاشکراو چوار چێوەدارو گونجاوو شـیاوی گواسـتنەوەیە، بـۆ نموونـە دەق هـاتووە، لەسـەر حـەرامی ئـارەق‌و، تەنانـەت هەنـدێ لـە موجتەهیـدەکانیش ئـەو فەرمایـشتەی پێغەمبـەریان (ﷺ) لا نەگەیشتووە، کە دەفـەرموێت: (کـل مـسکر خمـر: گـشت سەرخۆشـکەرێ ئارەقـە) یاخود گەیشۆتە لای، بەڵام بە صەحیحی نەزانیوە بۆیە دەگەڕێت بەشوێن عیللـەتی حـەرامی ئارەقدا، لە رێی تاقیکردنەوەو، دابەشکردنەوە، جا ئەو وەصفانەی کە دەکرێت عیللـەت بـن بۆ حەرامی ئارەق، ڕیزبەندیان دەکات‌و، کۆیان دەکاتـەوە، وەك ئـەوەی کـە ئـارەق لـە تـرێ دروست دەکرێت‌و، یان ئارەق گیراوەو شلە مەنییەو، یان ئارەق سەرخۆشکەرەو، دواتـر بـەر لەچاوگرتنی مەرجەکانی عیللەت، دەبێت توێژینەوە لەسەر ئەم وەصفانە بکرێـت‌و، وەصـفی یەکـەم، کـە لێـرەدا کـورتی هێنـاوەو، ناچـێتە سـەر غـەیری خـۆی‌و تـەنها لەسـەر خـۆی دەمێنێتەوە، بۆیە لای دەبات‌و، مەرجی عیللەتیش ئەوەیە کە وەصفەکە لە ئەصڵەوە بچێتە سەر فەرعەکە، واتە موتەعەددی بێت، و دواتر وەصفی دووەمیش لا دەبات، ئەویش ئەوەیـە کە ئارەق شلەمەنییە، چونکە وەصفە و خۆرسکە و وا ڕێککەوتووە و هیچ پەیوەندییەکی بـە حوکمەکــەوە نییــە، و کاریگەریـشی لەســەر دروســت ناکـات، و دواتــر وەصــفی ســێیەم دەمێنێتــەوە، کــە سەرخۆشــکردنەکەیە چــونکە وەصــفێکی ئاشــکرای گونجــاوە لەگــەڵ حومکەکەدا، هەروەها نموونەیەکی تر، وەك ئەوەی کە دەق هاتووە، لەسەر ئەوەی کە بـاوك مافی سەرپەرشتی کردنی کچە بچووکەکەی هەیە، لە پرۆسـەی مارەکردنیـداو، عیللـەتی ئـەم حوکمەیش بەدەق، یاخود بە ئیجماع نەچەسپاوە، بۆیـە کەسـی موجتەهیـد تەماشـای دەق دەکات‌و، عیللەتەکەی لە دووشتدا کـورت دەکاتـەوە، یـان لەبـەر ئەوەیـە کـە کـچەو، یـاخود لەبەر ئەوەیە کە منداڵە، و لە هـەردووکیان ڕادەمێنـێ‌و، لـەدوای سـەرەنجدان، وەصـفی کـچ بوونەکە دوور دەخاتەوە، چـونکە بـە هـیچ جـۆرێ لـە جۆرەکـانی ئیعتیبـار دانـان، ئـەژماری نـەکردووە، و دواجـار ئـەو وەصـفی (منـداڵ بوونـە)ـی، دەمێنێتـەوە، چـونکە شـەرع، لـە سەرپەرشتی موڵکدا حـسابی بـۆ ئـەو عیللەتـەی منداڵیەتیـە کـردووە، و ئەمـەیش بەڵگەیـە لەسەر ئەوەی کە شەرع وەصفێکی دیاریکراوی کـە (منـداڵ بوونـە)، بـە عیللـەت دانـاوە، بـۆ جینسی حوکمەکە کە ئەویش بوونی ویلایەتی ڕەها (مطلق)ـە، چـونکەبوونی ویلایـەت‌و سـەر پەرشتیاری لەسەر ماڵ‌و سامان‌و هەروەها بوونی سەرپەرشتیاری لەسـەر مـارەکردن، لەیـەك جینسن، بۆیە موجتەهیدەکە وا بڕیار دەدات، کـە ئـەو عیللەتـەی ئـەو بـە دوایـدا دەگـەڕێت،

منداڵیەتییە، نەك کچایەتی، بۆیە دواجار بێوەژنی کەم تەمەن قیاس دەکرێت لەسەر کچی کەم تەمەن‌و، ئەوە بەسەر ئەویشدا دەچەسپێت کە هەر چەندە بێوەژنیشە هەر دەبێت، لەسەر پەرشتیارەکەی لەکەسێکی مارە بکات‌و بەخۆ سەرێتی شوونەکات.

بێگومان لەپرۆسەی تاقیکردنەوەو بەشکردندا، ڕوانگەی موجتەهیدەکان جیاوازە، موجتەهید هەیە، کە وەصفێك بەگونجاو دەزانێت‌و، کەچی موجتەهیدێی تر بەگونجاوی دانانێت، بۆ نموونە حەنەفیەکان وای دەبینن، کە عیللەتی سەرپەرشتیار بوونی باوك لە مارەکردنی کچە بچوکەکەیدا بچووکیەتی، نەوەك کچایەتی، بەڵام شافیعییەکان کچایەتی بەعیللەتی بڕیارەکە دەزانن، نەك بچووکی‌و منداڵی.

هەروەها نموونەی تر لەڕا جیایی نێوان شەرعزانەکان، سەبارەت بە هەڵێنجانی‌و دەست نیشانکرنی عیللەت، وەك ئەوەی کە فەرموودەهاتووە، کە گۆڕینەوەی هەندێ شت‌و کەل‌و پەلی وەك یەك، بەڵام بە نرخی جیاوازو زیاتر حەرام کردووە، وەك ئاڵتون‌و زیوو جۆو، گەنم‌و خورماو، کشمیش‌و، لە گێڕانەوەیەکدا (خوێ)یشی، تیادایە، و هیچ بەڵگەیەکی شەرعی لە دەق‌و ئیجماع لەسەر عیللەتی ئەم حوکمە نەهاتووە، بۆیە کەسی موجتەهید لەسەر عیللەتی ئەم حوکمە دەکۆڵێتەوەو، بۆی هەیە، بە ئیجتیهادکردنی خۆی‌و، لەڕێی تاقیکردنەوەو دابەشکردنەوە، بەوە بگات کە عیللەتی ئەو حوکمە بریتییە لەوەی کە جینسی ئەو کاڵایانە هەموویان یەك شتە، و ئەو کەل‌و پەلانە هەموویان کێشانە دەکرێن، و ئەمەیش ڕای حەنەفییەکان‌و هاوڕێکانیانەو، یاخود عیللەتی حوکمەکە ئەوەیە کە جینسی ئەم شتانە یەکێکە، و هاوشانی ئەمەیش ئەوەیە کە ئەم کەل‌و پەلانە خواردەمەنین‌و، هەروەها بەمەزەندە مامەڵەیان لەسەر کراوە، و ئەمەیش ڕای شافعییەکان‌و هاوڕاکانیانە، یاخود عیللەتی حوکمەکە ئەوەیە کە ئەو کاڵایانە خواردەمەنین‌و، شیاوی پاشە کەوت کردنن‌و، نرخ‌و مەزەندە دارن‌و، ئەمەیش ڕای مالکی‌و هاوڕاکانیانە، و قیاس لەسەر بنەمای جۆری ئەو عیللەتەی کە شەرعزانان دەریان هێناوە، بەر پادەکرێت، بۆیە لەسەر ڕای حەنەفییەکان، سەرجەم ئەو شتانەی کە دەکرێت، کێشانە بکرێت هەر چەندە خواردەمەنی نەبن، یاخود خواردەمەنی پاشەکەوت کراو نەبن، ئەوا هەر قیاس دەکرێن، لەسەر ئەو دەقەو،، بۆیە لەسەر ڕای شافعییەکان، تەنها ئەو شتانە قیاس دەکرێن، کە خواردەمەنین، یان نرخدارو مەزەندە کراون، و لەسەر ڕای مالکییەکان واجبە کە ئەو شتەی لەسەر خۆراك‌و شتە خواردەمەنییەکان قیاس دەکرێت، دەبێت بگونجێت پاشە کەوت بکرێت، یاخود نرخی لەسەر دابنرێت‌و مەزەندە بکرێت.

## ١٩٩- ( چوارەم: باســـی تنقيح المناط )):

ئەم بابەتەیش لە سەر ڕای هەندێك لە زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ سـەر بـە ڕەوگـەی ئەم باسی عیللەتەیە کە باسمان کرد، و بەلاّم لە لای هەندێکی تر لە زانایانی ئەم زانستە بـە پەلوپۆی سەر ئەم ڕەوگەیە هەژماریان نەکردووە.

(التنقيح): لە زمانی عەرەبیدا بە مانـای پاکلەمـە و پالّفتـەکردن و جیاکردنـەوەی چـاك و خراپ و پـاك و پـیس هـاتووە، و(المنـاط)یش، هـەر لـە زمـانی عەرەبیدا بـە مانـای خـودی عیللەتەکـە هـاتووە، و لـە زاراوەی زانایـانی زانسـتی ئوصـولی فیقهـــدا مەبەسـت لـە (تنقـيح المناط)، پاکلەمەکردنی عیللەتـە لـەو خەسـلّەت و خـەوش و خۆلاّنـەی کـە لکـاون پێیـەوە و کەچی پەیوەندیدار نین پێیەوە، و ناچنە چوارچێوەی عیللەتەکەوە، واتە بە جۆرێك بێت کـە دەقەکە عیللەتەکە لە خۆ بگرێت و بیگرێتەوە، و بـەلاّم هەنـدێ خەسـلّەت و خـەوش و خـۆلّ هـەبن کـە لکـابن پێیـەوە، و کەچـی پەیوەندیـداریش نـەبن پێیـەوە، و هـەروەها نەچـنە نـاو چوارچێوەی ئەو پرسی عیللەتەوە کە هەیەتی و هەلّگریەتی، بە بـێ ئـەوەی کـە دەقەکـە بـە زەقی گوزارشت بکات لە سەر خودی عیللەتەکە.

و نموونەیشی وەك ئەوەی کە کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی بەتایبەتیو دەشت ئەنقەسـت لە مانگی ڕەمەزاندا سەرجێیی لە گەلّ ژنەکـەی خـۆی کـرد، دواتـر هاتـە خزمـەتی پێغەمبـەر (ﷺ)و هەوالّی لەسەر ئەم کردەوەیەی پێداو، ئەویش فەرمانی پێ کرد، بە کەفارەت دان[١].

---

[١] ئەمـە دەقـی فەرموودەکەیـە، کـە دەفـەرموێت، ئـەبو هـورەیرە (خـوا لێـی ڕازی بێـت) گێڕاویەتیـەوەو، گوتویەتی: کابرایەك هات بۆلای پێغەمبەر (ﷺ)و گوتی: ئەی پێغەمبـەری خـوا، تیاچـووم! پێغەمبـەریش (ﷺ) فەرمووی: چی تیایدا بردووی؟! گوتی: سـەرجێییم لەگـەلّ ژنەکـەم بـەزمانی بـەڕۆژوو ئەنجامـداوەو پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دەتوانی بەندەیەك ڕزگاری بکەی لـە کۆیلایـەتی؟ ئـەویش وتـی: نـەخێر لـە توانامدا نییەو پاشان فەرمووی: دەتوانی دوومانگ لەسەر یەك بە ڕۆژوو بیت؟ گـوتی: ئـەویش نـاتوانم، جـا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: دەی دانیـشە، جـا ئـەبووهورەیرە دەلّێـت لـەم کـەینو بەینـەدا کـە ئێمـە لـە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) دانیشتبووین پێغەمبـەر (ﷺ) چـنگەلّەیێ خورمـای هێنـا، و فـەرمووی: کـابرای پرسیار کار کوا؟ کابرا وتی: من بووم! پێغەمبەر(ﷺ) فەرمووی: دەی ئەمـە بگـرەو، بیکـە بـەخێر، کـابرا گووتی: ئایا ئەو خورمایانە بە کاسانێك بدەم، کە لەخۆم هەژارو کەم دەسـت تـرن؟! و دەی سـوێند بـەخوا لەم سەرزەوییەی (شاری مەدینە)دا، لە ئێمە هەژارتری تیادا نییە، جا پێغەمبەر (ﷺ) پێکەنیو فەرمووی: دەی بیـدە بـە خێزانەکـەت! رواه البخـاريّ، و مـسلم، و أبـوداود، و الترمـذي، و إبـن ماجـة، بڕوانـە تیـسیر الوصول، ب٢، ل٣٤٠.

جا ئەم فەرموودەیە دەلالەت دەکات لەسەر هۆکارو عیللەتی حوکمەکە بەڵام دەلالەت ناکات، لەسەر وەصفێکی دیایکراو، بەڵگە بێت، لەسەر خودی عیللەتەکە، واتە: دەقەکە لە خۆگری عیللەتەکەیە، بەڵام لە خۆگری وەصفێکی دیاریکراو نییە، کە دەلالەت لەسەر خودی عیللەتەکە بکات، جا دەقەکە عیللەتەکەی لە خۆگرتووە، بەڵام پوخت کراوو پاڵفتەکراو نییە، لەو شەخەڵ‌و خەسڵەتانەی کە پەیوەندییان نییە، بە پرسی عیللەت بوونەکەیەوە، بۆیە کەسی موجتەهید دێت‌و، عیللەتە ڕاستەقینەکە پاڵفتە دەکات، لەو شەخەڵ‌و شتانەی پێوەی لکاون، یان خۆیان پێوەی هەڵواسیوە، وەك ئەوەی کە ئەنجامدەری کردارە سێکسییەکە کابرایەکی عەرەبی دەشتەکی بووە، و ئەو ڕووداوەیش کە لەشاری مەدینەدا ڕوویداوە و کردەوە سێکسییەکەیش لە مانگی ڕەمەزانی هەمانساڵدا ڕوویداوە، جا کابرای موجتەهید سەرجەمی ئەو خەسڵەتانە لادەبات‌و دوور دەخاتەوەو، دواجار بەو بڕیارە دەگات کە پێشهاتی بەدەست ئەنقەستی لەو جۆرە لە مانگی ڕەمەزاندا ئەوە خودی عیللەتی حوکمەکەیە، و واجب کاری کەفارەتەکەیە، ئەم ڕایە شافعییەکان‌و هاوڕاکانیان لەسەری دەڕۆن بەڵام حەنەفی‌و هاوڕاکانیان ڕوانگەیەکی دوورتریان ڕەچاو کردووە، لە پرسی پاڵفتە کردنی عیللەتدا، و عیللەتەکە لەلای ئەوان تەنها کردەوە سێکسیەکە نییە، بەڵکو عیللەتەکە (لە دوای پاڵفتە کردنی تەواوەتی) بریتییە لە شکاندنی دەست ئەنقەستی شان‌و شکۆی مانگی ڕەمەزان، بەوەی کە کابرا کردەوەیەکی ئەنجامداوە، کە شکێنەری ڕۆژووەکەیە، کە سەرجێیی کردنە، یان خواردن‌و خواردنەوەیەو، لەم کاتەدا سەر جێی کردن وەك شکێنەرێکی ڕۆژوو، بە (دەستەواژەی دەق: عبارة النص)ـەکە، چەسپاوە، بەڵام خواردن‌و خواردنەوە، وەك شکێنەری ڕۆژوو بە (گوزارشتی دەق: دلالة النص) جێگیر بووە، و چەسپاوە[1].

---

[1] مەبەست لە (عبارە النص) دەلالەت کردنی دەستە واژەی دەقەکەیە لەسەر ئەو مانایەی کە لە دەقەکە دەفامرێتەوە، ئیتر ئەو مانایە بەشێوەی ئەصڵی یان شوێنکەوتەیی (تبعي) لە دەقەکە بفامرێتەوە، هەر چونیەکە، وەك پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَحَلَّ ٱللَّهُ ٱلۡبَيۡعَ وَحَرَّمَ ٱلرِّبَوٰاْ﴾ (سورة البقرة / ٢٧٥) کە لەم دەقەدا مانای ئەوەی تیادا دەفامرێتەوە، کە مامەڵە (بيع)و (ربا: سوو) یەکسان نین، و ئەمەیش مانای ئەسڵی دەقەکەیەو، هەروەها حوکمی دەربڕدراو (منطوق)ـەکەی، چەسپاندووە، بەسەر دەرنەبڕدراو (مسکوت عنه)دا، بە بەڵگەی ئەوەی کە هەردووکیان لەیەك عیللەتدا هاوبەشن، و مانای دووەمی ئەم دەقە ئەوەیە کە حوکمی مامەڵە (بيع) حەڵاڵ بوونەبیەتی‌و، حوکمی سوخواردن (ڕیبا) حەرام بوونیەتی، بەڵام (دلالة النص) بە مانای دەلالەتی لەفزەکەیە لەسەر حوکمەکە، و إن شاء الله ئەم باسە لە بەشی چوارەمدا دێت.

پاشان لەم پرسی (تنقيح المناط)ـەدا، ڕوانگەی زانایانی موجتەهید لە یەکتری جیاوازە، جا هەندێکیان وەصفێك دادەنێن بە عیللەت، لە کاتێکدا کە گروپێکی تر وەصفێکی تر، وەك عیللەت دەهێننە ئەژمار، هەروەك لە چیرۆکی کابرای عەرەبی دەشتەکیدا بینیمانو، تێڕوانینی جیاوازی شافعیو حەنەفییەکانمان لەمەڕ ئەو برسە بەرچاو کەوت!

## ٢٠٠- ( تخريج المناط ) یاخود ( تحقيق المناط ) هەڵهێنجان و توێژینەوەی عیللەتەکان:

**لەو زاراوە ئوصوڵیانەی کە جارو بار لە گەڵ زاراوەی ئوصوڵی تردا تێکەڵاوی پەیدا دەکەن، ئەم زاراوەی (تخريج المناط) و زاراوەی (تحقيق المناط)ـەیە.**

- ( **تخريج المناط** ): بەمانای هەڵهێنجانو دەرهێنانی عیللەتی حوکمەکە دێت، کە دەقو ئیجماع دەلالەتی لەسەر نەکردووە، بە سوود وەرگرتن لە هەر کام لە ئامرازەکانی، وەك تاقی کردنەوەو دابەشکردن، کە سەر بەڕەوشو ڕێگاکانی عیللەتن، کەواتە (تخريج المناط) بە مانای دەرهێنانی عیللەتی ئەو حوکمە دێت، کەنە دەقی لەسەر هاتووە، و نە ئیجماعی لەسەر کراوە، بەو ڕێگایانەی کە دەمانگەیەننە زانینی ئەو عیللەتانەی کە دەقی لەسەر نییەو، ئیجماعی لەسەر نەکراوە، وەك گەیشتن بەوەی کە عیللەتی حەرامی ئارەق خواردنەوە، سەرخۆشکردنەکەیەتیو، عیللەتی سەرپەرشتیاری باوك، لە بەشوودانی کچەکەیدا، بچوکی کچەکەیەتیو، عیللەتی واجب بوونی کوشتنەوەی بکوژی بەدەست ئەنقەست، ئەوەیە کە بکوژ کابرای کوژراوی بە ئامراز و چەکێ کوشتووە، کە زیاتر چاوەڕوانی ئەوەی لێ دەکرێت، کە کوشندەیە، بۆیە حوکمی کوشتنەوە لە سەرجەم ئەو کوشتنانەدا دەچەسپێت، کە بە ئامرازێ ئەنجامدرابن، کە زیاتر چاوەڕێی لەناوبردنی گیانی کابراکەیان لێ چاوەڕێ بکرێت، و ئامرازی کوشندە بن، ئیتر ئەو ئامرازە لە ئامرازە کوشندە کۆنەکان بێت، وەك شمشێر، یاخود لە ئامرازە ئەفرێندراوەکانی ئەم چەرخە بن، وەك کلاشینکۆفو هتد.... بەڵام سەبارەت بە (تحقيق المناط) بریتییە لە تێڕوانینو توێژینەوە لە جێگیر کردنو هاتنەدی ئەو عیللەتەی کە بەدەق یان ئیجماع یان هەڵهێنجان چەسپاوە، لەو پێشهاتانەیدا، کە دەقی لەسەر نییە، وەك ئەوەی کە عیللەتی دوورکەوتنەوەلە ژنو، سەرجێیی نەکردن لە گەڵیدا، لە کاتی بێ نوێژیدا بریتییە، لەوەی تووشی ئازار دەبێت، بۆیە کەسی موجتەهید تەماشای ئەوە دەکات، بزانێت ئەو عیللەتە لە خوێنی منداڵ بوونیشدا (نفاس) دێتە دی؟! کەبینی لەویشدا هەمان عیللەت لە ئارادا هەیە، ئەوا قیاسی بەسەردا جێ

بەجێ دەکات، و حوکمی ئەسڵەکە دەگوێزرێتەوە، بۆ سەر فەرعەکە، کە ئەو حوکمەیش واجبی سەر جێیی نەکردنە لە گەڵ ئافرەتدا، و لە کاتی بوونی خوێنی منداڵ بووندا.

- هەروەها وەك، ئەوەی کە عیللەتی حەرامی ئارەق، کە سەرخۆش کردنەکەیەتی، جا کابرای موجتەهید لەوە ڕادەمێنێ و، تەماشای ئاستی هاتنەدی ئەو عیللەتە لەهەر گیراوەیەکی تردا دەکات، کە بینی لە گیراوەیەکی تریشدا هاتەدی، ئەوا حوکمە ئەسڵە کە بەسەر ئەو فەرعەیشدا جێ بەجێ دەکاتو، خواردنەوەی ئەویش حەرام دەکات.

بەکورتیو پوختی، (تنقیح المناط)، بریتییە لە پاکژ کردنەوەو پاڵفتە کردنی عیللەت لەو شەخەڵو پەلو پۆیانەی کە پێوەی لکاونو خۆیان پێوەی هەڵواسیوەو، لە هەمان کاتیشدا هیچ کاریگەییەکیان لەسەر ئەو پرسی عیللەت بوونەی نییە.

ئینجا (تخریج المناط) بریتییە لە دەرهێنانی عیللەتێك، کە نەدەقی لەسەرەو، نە ئیجماعی لەسەرکراوە، بەهەر ڕێگایەك بێت، لەو ڕێگایانەی کە دەمانگەیەنێت، بەو دەرهێنانە.

و پاشان (تحقیق المناط)، بریتییە لە ڕامانو توێژینەوە لە بوونی عیللەتی ئەسڵەکە ((لەدوای چەسپانیو زانینی))، لە فەرعەکەدا.

## ٢٠١- بەشەکان، یاخود جۆرەکانی قیاس:

هەروەك گوتمان، قیاس لەسەر هاوبەش بوونی فەرعەکە وەستاوە لە عیللەتەکەداو، لەگەڵ ئەسڵەکەداو، ئەمیش بە (قیاس الأولی)، واتە قیاسی لە پێشتر ناوزەد کراوە، و جاری وا هەیە، کە ئاستی ئەو عیللەتە لە فەرعەکەداو ئاستەکەی لە ئەسڵەکەدا یەکسانن و، ئەمیش بە (القیاس المساوي) واتە، قیاسی یەکسان ناونراوەو، جاری وا هەیە، کە عیللەتەکە لە فەرعەکەدا لاواز ترە، وەك لە ئەسڵەکەداو، ئەمەیش بە (قیاس الأدنی) واتە قیاسی نزمتر ناوزەد کراوە.

### - یەکەم:- ((قیاس الأولـی)):

بریتییە لەو جۆرە قیاسەی کە عیللەتەکە لە فەرعەکەدا، بەهێزترە وەك لە ئەسڵەکەداو، بۆیە چەسپاندنی حوکمی ئەو ئەسڵە، بەسەر فەرعەکەدا لەپێشترە، لە چەسپاندنی بەسەر ئەسڵەکەداو، بە ڕێگەی لە پێشترو شیاو تر ئەم کارە دەکرێت، نموونەیش وەك ئەم فەرمایشتەی پەروەردگار کە سەبارەت بە ڕاسپاردەی چاکەکاری بەرامبەر بە دایكو باوك

دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَآ أُفٍّ﴾[1] واتە: هێندە لەگەڵ دایكو باوكتاندا، چاك بن كە تەنانەت ووشەی ئازاراوی (ئۆف)یش، لە بەرامبەریاندا بەكار مەهێنن، كە ئەم دەقە تەنانەت (ئۆف) كردنیش لە بەرامبەر دایكو باوكدا حەرام دەكاتو، عیللەتیش تیایدا، ئەوەیە كە ئەو لەفزە ئازاردانی لێ دەفامرێتەوەو، ئەم عیللەتەیش لە لێدانی دایكو باوكدا بوونی هەیە، بەشێوەیەكی بەهێز ترو توند لەوەی كە لە ئەسڵەكەدا هەیە، واتە: لە لێدانەكەدا ئازار زۆر زۆر زیاترە، و وەك لە ئۆف كردنەكەدا، كەواتە دواجار لێدانی دایكو باوكیش هەر حەرامە، بە قیاس كردنی لەسەر ڕەوشی دەقە قورئانییە كە، بەڵام بەڕێگای (القیاس الأولی)[2] ئەم كارەمان كرد، واتە كە ئۆف كردن حەرام بوو، كەواتە لێدان زۆر لە پێشترە بۆ ئەوەی كە چەند قات لەو زیاتر حەرام بێت.

## دووەم: القیاس المساوي: قیاسی یەكسان:

ئەمیش بریتییە لەو قیاسەی كە ئەو عیللەتەی حوكمەكەی بنیات لەسەر نراوە، لە ئەسڵەكەدا چەندێكەو ئاستەكەی چۆنەو چەندی لێ هاتۆتەدی، لە فەرعەكەشیدا هەر ئەوەندە لە عیللەتەكە هاتووەتەدیو هەیەو یەكسانن، هەروەك لە حەرامكردنی خواردنی ماڵی هەتیواندا، بەستەمكاری بەم ئایەتە چەسپاوە كە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ ٱلَّذِينَ يَأۡكُلُونَ أَمۡوَٰلَ ٱلۡيَتَٰمَىٰ ظُلۡمًا إِنَّمَا يَأۡكُلُونَ فِي بُطُونِهِمۡ نَارٗاۖ وَسَيَصۡلَوۡنَ سَعِيرٗا ١٠﴾[3] واتە: ئەوانەی كە بەستەم كاری ماڵی هەتیوان دەخۆن، ئەوانە ئاگر دەكەنە سكی خۆیانەوەو، لە دوا ڕۆژیشدا دەخرێنە ئاگری بەتینی دۆزەخەوە، كە عیللەتی ئەم حوكمە بریتییە لە دەست

---

[1] سورة (الأسراء: ٢٣).

[2] هەندێ لە زانایانی ئوصولْ بەلای ئەوەدا چوون، كە حەرامی لێدانی دایكو باوك بەدەق حەرامكراوە، نەوەك بەقیاسكردن، چونكە عیللەتی دەقی حەرامكردنی ئۆف كردن، بەرگرتنە لە ئازاردانیانو، ئەم مانایەش ڕوونەو مانای خۆیی لێ دەفامرێتەوەو، پێویستی بە هەڵێنجان نییەو، هەر كەس عەرەبی بزانێت ئەو مانایە دەزانێتو تێ دەگاتو، ئەم مانایەش ڕوونە، و ئەم مانا ڕوونە لە بابەتاكانی تری لەم جۆرە دا بەڕوونتریش هاتووەو، پێویستی بە هەوڵو دەرهێنان نییە، بۆیە ئۆف كردن بە (عبارة النص) حەرامكراوە، و لێدان بە (دلالة النص) حەرامە.

[3] سورة (النساء/ ١٠).

درێژی کردنـه سـەر مـاڵی هـەتیو بەستەمکاری یەکسانە لەگـەڵ ڕەوشـی ئـەو دەقـەداو، لـە عیللەتەکـەدا بۆیـە حـوکمی سـوتاندنەکەو حـوکمی خواردنـە سـتەمکارانە کـە هەریـەکێکن‌و هەردووکیان حەرامن.

## سێیەم: ((القیاس الأدنی)):

بریتییە لەو جۆرە قیاسەی کە هاتنەدی عیللەتەکە لە فەرعەکەدا لاوازتـر و کـەمتر دیـارەو دەرکـەوتووە، وەك ئـەوەی لـە ئەسـڵەکەدا هەیـە، هەرچـەندە هـەردووکیان یەکـسانن، لـە هاتنەدی ئەسڵی ماناکەدا، ئەو مانایەی بەهۆیەوە وەصفەکە بووەتە عیللەتی پرۆسەکە، وەك ئـەوەی کـە سەرخۆشـکردن عیللـەتی حـەرامبوونی ئارەقـە، بـەڵام ئـەم سەرخۆشـکردنە بـە شـێوەیەك‌و ئەندازەیـەکی کـەمتر لـە گیراوەیـەکی تـری، وەك بـیرەدا هەیـە، هەرچـەندەلە هەردووکیاندا صیفەتی سەر خۆشکردنەکە بوونی هەیە، بەڵام لە دووەمدا کەمترە، بەڵام هـەر هەمان حوکمی بەسەردا جێ بەجێ دەکرێت.

# ٢٠٢- ئاستی بە بەڵگە بوونی قیاس:

پێشتر گوتمان کە قیاس بە بەڵگەیەکی شـەرعی‌و بەڵگەیـەك لـە بەڵگـەکانی ئـەحکام دێتـە ئەژمار، لەسەر ڕای جەماوەری شەرعزانان، بەڵام لەم ڕایەدا، ظاهری‌و، هەندێ لـە موعتەزیلـە و جەعفەرییەکان[1] پێچەوانەیانن، و ئێستا ئێمە حەقیقـەتی قیـاس‌و پایـەکانی‌و مەرجـەکانی‌و یاساو ڕێساکانیمان ڕوونکردەوە، جا ئێستا ئەو بەڵگانەی ئەو گروپانـە ڕوون دەکەینـەوە کـە قیاس بە بەڵگە دەزانن، لەگەڵ ڕوونکردنەوەی بەڵگەی ئەوانەیش کە قیاس بە بەڵگە نـازانن‌و ڕەتی دەکەنەوە.

---

[1] لێرەدا ئەوەنـدە هەیـە کـە زانایـانی جەعفـەری ئـەو قیاسـە بـە قیـاس دەزانـن کـە عیللەتەکـەی دەقـی لەسەرەو، بە بەڵگەی دەزانن‌و، لەم جۆرە داو لەم حاڵەتـەدا، چەسپاندنی حوکمەکە بـۆ فەرعەکـە بـەدەق جێگیری دەکەن، نەوەك بەقیاس، هەروەك ئەمانـە (قیـاس الأولی) قبـوڵ دەکـەن، بـەڵام بـە (قیـاس) نـاوی ناوزەدی ناکەن‌و، هەندێ لەمانە هەبەر بە (منصوص العلة)ـی، دەزانن، وەك حـەرامی لێدانی دایـك‌و بـاوك، کە لە ئایەتی (فلا تقل لهما أف) دەفامرێتەوە، بۆیە زانایـانی جەعفـەری جگـە لـەم جـۆرە، جۆرەکـانی تـر قبوڵ ناکەن‌و، ئەم ڕایەش لە زۆرینـەی زانـا مەزنـەکانی ئـەوان وەرگـیراوە، جگـە لـە (إبـن الجنیـد)، بڕوانـە (أصول الأستنباط)، دانراوی علي تقي الحیدری، ل ٢٥٨-٢٥٩.

## ٢٠٣- بەڵگەی ئەوانەی کە قیاسیان وەك بەڵگەی شەرعی چەسپاندووە:

ئەوانەی کە قیاسیان وەك بەڵگەی شەرعی زانیوەو، جێگیر کردووە برێك لە بەڵگەی قورئانو فەرموودەو کارو کردەوەی هاوەڵانو بەڵگەی عەقڵییان هێناوەو، ئێمە گرنگترین ئەو بەڵگانە لێرەدا کورت دەکەینەوەو، تەنها پوختەیەکیان لێ باس دەکەین:

-یەکەم: لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە کە دەفەرموێت: ﴿فَٱعۡتَبِرُواْ يَٰٓأُوْلِي ٱلۡأَبۡصَٰرِ﴾[1] واتە: پەند وەربگرن ئەی خاوەن فامەکان کە خوای گەورە ئەم برگەیەی لە دوای ئەو پێشهاتانە باس کردووە، کە لەسەر هۆزی (بني نضير) ڕوویاندا، کە بەهۆی کافر بوونیانەوەو فێڵکردنیان لە پێغەمبەر (ﷺ)و موسڵمانان تووشی ڕسوایی دنیابوونو، مانای ئەم ئایەتەیش ئەوەیە کە، تێ ڕابمێننو سەرەنج بدەن، ئەی خاوەن عەقڵە ساغەکان، و خۆ دوور بگرن لەوە، نەبادا، بەهۆی ئەوەی ئەوان کردیان، ئێوەش بچن کاری لەو شێوەیە ئەنجام بدەن، تا تووشی ئەو ئایندە ڕەشە ببن، کە ئەوان تووشی بوون، چونکە بێگومان نەریتو سوننەتی پەروەردگار یەك ڕەهەندی هەیەو بەسەر گشت لایەکدا بەیەك شێوە دەچەسپێتو، هەرشتێ هات بەسەر شتێکدا، ئەوا بەسەر هاوشێوەی ئەو شتەیشدا هەردێت، و ئەمەیش مانای پراوپڕی قیاسە، و ئەوە ڕوون دەکاتەوە کە (الأعتبار: پەند وەرگرتن)، واتە: گواستنەوە لەسەر شتێکەوە بۆ سەر شتێکی تر، چونکە (الأعتبار) لە (عبور: گواستنەوەو تێپەڕ بوون) وەرگیراوە وەك دەگوترێت، (عبرت النهر) واتە تێپەڕم کرد، لە ڕووبارەکەو لێی دوورکەوتمەوەو، ئاراستەکەیم ڕووەو ئاراستەیەکی تر بەجێهێشتو، قیاسیش بریتییە لە گواستنەوەی حوکمەکە لە شتە قیاس لەسەر کراوەکەوە، بۆ شتە قیاس پێکراوەکە، واتە دووەمینەکە و لەبەر ئەوەی کە (الأعتبار) بە دەقی ئەو ئایەتە پیرۆزەی سەرەوە فەرمانی پێ کراوەو، قیاسیش تاکێکە لە تاکەکەنی (إعتبار)، بۆیە قیاسیش هەروەك ئەو فەرمانی پێکراوە، و بێگومان فەرمان پێکراویش واجبە، و شتی واجبیش شەرعییەو حەرام نییە کەواتە دواجار قیاس بەڵگەیەکی شەرعییەو، برواپێکراوە، و کارکردن بەدەرهاویشتەکانیو داواکانی پێویستە، و نابێت بگوترێت، کە ئەم پرۆسەی بە بەڵگەکردنەی کە باسمان کرد وانییە، و نەپێکاوەو وەرنەگیراوە، چونکە (إعتبار) بە مانای پەند وەرگرتن هاتووە، نابێت ئەمە بگوترێت، چونکە ماناکردنی (إعتبار) بە (پەند وەرگرتن)ئەو بە بەڵگە کردنەی

---

[1] سورة (الحشر/ ٢).

سەرەوەی ئایەتەکەمان لە دەست نادات، چونکە (پەند وەرگرتن) کاتێك دەبێت کە ئەو شتەی کە هاوشێوەی شتەکەی ترە، حوکمی هەمان شتە هاوشێوەکەی وەرگرتبێت، وەك ئەوەی کە چۆن بگوترێت، کە فلانە کەس لە کارەکەی دەرکراوە، چونکە ناپاکی کردووە، دەی پەند وەربگرن ئەی فەرمانبەران، یاخود فلان قوتابی، لەبەر تەمبەڵی دەرنەچووە، دەی کەواتە ئەی قوتابییەکان پەند وەربگرن، ئەم قسانە مانایان نییە ئەگەر ئەو مانایە نەخرێتە سەر ئەو رەهەندەیەوە، کە هەر فەرمانبەرێك ناپاکی بکات وەك ئەو فەرمانبەرە دەردەکرێت لەکارەکەی‌و، هەروەها هەر قوتابییەك تەمبەڵی بکات لە وانەکانیدا دەکەوێت.

دووەم: لە فەرمووده ناسراوەکەی (موعاز)دا، هاتووە کە پێغەمبەر (ﷺ) کاتێك وەك دادوەر ناردی بۆ وڵاتی یەمەن‌و، پرسیاری لێکرد، بەچی قەزاوەتی خەڵکی دەکەیت‌و بڕیاریان بۆ دەر دەکەیت؟ موعاز (خوا لێی ڕازی بێت) لە وەڵامدا گوتی: بە قورئان‌و، پاشان بە سونەت‌و، پاشان بە ئیجتیهاد، جا پێغەمبەر (ﷺ) لەسەر ئەم ڕێزبەندییەی ڕازی بووو، پەسەندی کردو، قیاسیش هەر جۆرێکە لە جۆرەکانی ئیجتیهاد بەڕەئی، کەواتە شەرعییەو، بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی ئەحکام.

- سێیەم: لە سوننەتی پێغەمبەردا (ﷺ) شوێنەواری زۆر هەن کە بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بێداری داوە لەسەر قیاس‌و، دەلالەتی هەن، لەسەر ئەوەی کە دروستەو دەکرێت قیاس بۆ هەڵێنجانی ئەحکام بەکار بهێنرێت، نموونەی لەم جۆرەیش وەك ئەوەی کە گێڕدراوەتەوە کە پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب (خوا لێی ڕازی بێت) هات بۆ لای پێغەمبەر (ﷺ)و، گوتی ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) ئەمڕۆ کارێکی زۆر گەورەی ناپەسندم ئەنجام داوەو، بەزمانی بەڕۆژووەوە ماچی ژنەکەمم کردووە جا پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەڵامیدا فەرمووی: ئایا ئەگەر بەزمانی ڕۆژوو ئاو لەدەمت ڕابدەیت، ڕۆژووت دەشکێت؟ ئەویش گوتی: نەخێر جا پێغەمبەریش (ﷺ) فەرمووی: جا ئیتر چی؟! کەواتە ئەم کارەیش هەروایەو، ڕۆژووەکەت بەتاڵ ناکاتەوە[1]و لێرەدا پێغەمبەریش (ﷺ) قیاسی ماچی کرد، لەسەر ئاو لە دەم دان‌و حوکمی نەشکانی ڕۆژووی لە یەکەمدا، چەسپاند بەسەر دووەمیندا.

هەروەها لە (ئیبن عەبباسەوە)، (خوا لێی ڕازی بێت)، گێڕدراوەتەوە کە ئافرەتێکی هۆزی

---

[1] تیسیر الوصول، ب٢، ل٢٢٧.

(خثعم)، هات بۆ خزمەتی پێغەمبەر (ﷺ) تا بریارێکی بۆ بداتو، بە پێغەمبەری (ﷺ) گوت: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) باوکم پیرو ئوفتادەیەو، ناتوانێت لەسەر ولاخ خۆی بگرێت، لەم حاڵەتەدا، فەرزی پەروەردگار لەسەر بەندەکانی خۆی، واتە حەج، لەسەری فەرز بووە، ئایا من دەتوانم لە جیاتی ئەو حەج بکەم؟ پێغەمبەریش (ﷺ) لە وەلامدا ، فەرمووی: بەڵێ.

پاشان لە گێرانەوەیەکی تردا هاتووە، کە کابرایەك هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ) گوتی: دایکم نەزری کرد، کە حەج بکاتو، دواتر فریا نەکەوتو کۆچی دوایی کرد، ئایا من لەجیاتی ئەودا حەج بکەم؟ جا پێغەمبەر (ﷺ)فەرمووی: ئەرێ ! ئەگەر قەرزێکی لەسەر بێت، نابێت تۆ بیدەیتەوە؟! گوتی: بەڵێ، دەی قەرزی خوای گەورە لەپێشترە، کە بۆی بدەیتەوە[1].

هەروەها لە فەرموودەی صەحیحدا هاتووە، کە کابرایەکی دەشتەکی هاتە خزمەت پێغەمبەر (ﷺ)و گوتی: ژنەکەم منداڵێکی ڕەشی بووە، و بەهی خۆمی نازانم! جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: حوشترت هەیە؟ گوتی: بەڵێ، گوتی: چ ڕەنگێکن؟ گوتی سورە حوشترن، گوتی: ئەی ڕەنگی خاکییان تیادایە؟ گوتی بەڵێ، جاپێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: جا بەڕای تۆ ئەم وشترە ڕەنگ خاکییانە لەکوێوە هاتوون؟کابرا گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا (ﷺ) جا کێ دەڵێ لە ڕەچەڵەکەوە نەیانهێناوەتەوە، واتە لە ڕەچەڵەکدا ئەو ڕەنگەیان هەبوو بێتو، دواتر لەوەچەدا ڕەنگی دابێتەوە[2]، جا پێغەمبەر (ﷺ) فەرمووی: دەی ئەمیش کێ دەڵێ لە ڕەچەڵەکەوە نەیهێناوەتەوەو، تەواو، چ لە دایکەوە بێت، یان لە باوکەوەو، دواجار ئەم منداڵە ڕەشە لە جینەکانی ڕەچەڵەك کاریگەری وەرگرتبێت، و ڕەش دەرچوبێت.

– چوارەم: بێگومان هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت) لە پێشهات و ڕووداوەکاندا ئیجتیهادیان کردووەو، هەندێ ئەحکامیان قیاس کردووە، لەسەر هەندێکی تر، و دوو هاوشێوەکە هەبوون، حوکمی یەکێکیانیان گواستۆتەوە بۆ سەر ئەوەی تریانو، یەکەمیان کردۆتە ڕوانگە، تا دووەم پەندی لێ وەربگرێت، لەوانە، ئەو فەرمایشتەی ئیبن عەبباس (خوا لێی ڕازی بێت) کە بیستی پێغەمبەر (ﷺ) نەهی کردووە، لە فرۆشتنی خۆراك، پێش وەرگرتنیو گەیشتە دەستی فرۆشیار، جا فەرمووی: هەموو شتێ وەك خۆراك ئەژمار

---

[1] تیسر الوصول، ب١، ل٣٣.

[2] إعلام الموقعين، ب١، ل ١٣٧.

دەکەم‌و، مامەڵە کردنی لەپێش گەیشتنە دەستی کاڵاکە بە دروست نازانم.

پرسی (عَوْل) واتە: زیادکردنی ژمارەی بەشی بەشە میراتەکان‌و کەم بوونەوەی ئەندازەی بەشی میرات بەرەکان، بە مانایەکی تر زیاد کردنی ئەسڵی مەسئەلە، کە ئەم زیاد کردنە لە ئەنجامی زۆری ژمارەی بەشی خاوەن بەشەکانەوە پەیدا دەبێت، و دەبێت بە هۆی کەمبوونەوەی بەشی خاوەن بەشەکان، کە ئەم پرۆسەیە بە قیاس کردن کراوە، لەسەر ئەو پرسەی قەرز، کە ئەگەر خاوەن قەرزەکان قەرزەکەیان لەسەر کابرای قەرزار لەو ڕێژەیە زیاتر بوو، کە کابرای قەرزار لە دوای بەجێماوەو هەیەتی، ئەوا لەبەشی سەرجەم خاوەن قەرزەکان کەم دەکرێتەوە تا بەشی هەموویان بکات، کە ئەم دوو پرۆسەی (عول)و (قەرز)ـە، لەسەر یەکتری قیاس کراون، و هەروەها ئیبن عەبباس، (خوا لێی ڕازی بێت)، باپیری لە مەسەلەی حەجب کردنی براکاندا قیاس کردووە لەسەر کوڕەزاو، گوتویەتی: ئایا زەیدی کوڕی ثابت لە خوا ناترسێت؟!کە کوڕەزای بە کوڕ ئەژمار کردووەو، کەچی باپیری بە باوك ئەژمار نەکردووە[1]؟!!

و لە نامەکەی پێشەوا عومەری کوڕی خەطابدا، ئەبوو موسای ئەشعەری (خوا لێیان ڕازی بێت) هاتووە، کە نووسیویەتی((..... لەو پرسانەیدا کە دەهێنرێتە لات، تێگەیشتنی خۆت بەکار بهێنە، لەو شتانەیدا کە قورئان‌و فەرموودە لەسەری هیچ حوکمێکیان نەدرکاندووەو، دوای ئەم حاڵەتە شتەکان لەسەر یەکتری قیاس بکەو، هاو وێنەکانیان بناسەو بزانەو، دواتر ئەوەی کە لەلای خودا خۆشەویستە و لە هەقەوە نزیکترە، ئەوەیان جێ بەجێ بکە[2].

ئەم هەواڵ گەلە و هاو وێنەکانیان بەڵگەن لەسەر کارکردن بە قیاس بە بێ ئەوەی کەس نکۆڵی لێوە بکات‌و، ئەمەیش مانای موتەواتیر بوونی مەعنەوی لێ دەفامرێتەوە، کە بەڵگەیە لەسەر کارکردن بە قیاس.

**پێنجەم**: ئامانجی لە دانانی ئەحکامە شەرعییەکان‌و بەشەرع کردنیاندا بریتییە لە بەجێهێنانی بەرژەوەندی مرۆڤەکان، و هەر ئەمەیشە کە ئەو حیکمەتە کە مەبەست بووە، لە شەرعداناندا‌و، لە نموونەی ئەو شتانەی کە لەگەڵ ئەم ئامانجەدا کۆکن، هەموویان سەلمێنەری دروستی کارکردنن بەقیاس، چونکە قیاس تەنیا بریتییە لە گواستنەوەی هەر

---

[1] إعلام الموقعين، ب١، ل ١٨٢، دواتر.

٢ سەیری تەواوی نامەکە بکە، لە کتێبی (إعلام الموقعين)، ب١، ل٧٧و دواتریش.

حوکمێك كه له پێشهاتێكی دیاریكراودا هاتووه، بۆ پێشهات گەلێكی هاو بەش‌و وەك ئەو كەلـه عیللەتـدا وەك یـەك‌و هاوبەشـبن‌و، ئـەم پرۆسـەیەش دادو حیكمـەتی پـەروەردگار خوازیاریەتی‌و لە گەڵیدا كۆكن‌و، میتـۆدی شـەریعەتیش، لـە بەشـەرع كردنـی ئەحكامەكانـدا هاوڕایه لەسەری، چونكه ڕەوشی شەرع وانییه، كه شتێ حەرام بكات‌و، كەچی هاو وێنەكەی به حەڵاڵ بزانێت، یاخود شتێ حەڵاڵ بكات‌و، هاو وێنەكەی به حەرام بزانێت.

شەشـەم: دەقـەكانی قورئـان‌و سـوننەت بـەڕەهایی سـنورداروو كۆتـایی دارن، بـەڵام پێشهاتەكانی خەڵكی بێ كۆتایین‌و بـێ سـنورن‌و، بۆیـه ناكرێـت، كـه شـتی بـێ كۆتـایی، بـه شتێكی كۆتایی دارو سـنوردار دەوره بـدرێت،‌و دەبێـت ڕەچـاوی عیللەتـەكان‌و ئـەو مانایانـه بكرێت، كه دەقەكان له خۆیان گرتوون، یان ئامارەیان پێ كردوون یاخود دەگونجێت كه ئەو مانایه لەو دەقانەوە دەربهێنرێن، و دواتر ئەو حوكمەی لەسەر هاتووه، جێ بـەجێ بكرێـت‌و، كه ئەم میتۆده پراكتیزه كرا، ئیتر شەریعەت سەبارەت به هیچ پێشهات‌و ڕووداوێكی نوێ كه پێشتر ڕووی نەدابێت، و دەقی لەسەر نەهاتبێت، بێ وەڵام‌و هەگبه خاڵی نابێت‌و، تەنگی پێ هەڵناچنرێت، و چارەسەری سەرجەم گرفت‌و قەیرانەكان له هەر سەردەمێكدا بێت، دەكات.

## ٢٠٤- بەڵگەی ئەو گروپانەی كار به قیاس ناكەن:

**ئەوانەی پێچەوانەی كاركردنن، به قیاس، كۆمەڵێك بەڵگەیان هەن كه به پوختی گرنگترین بەڵگەكانیان دەخەینەڕوو:**

- یەكـەم: خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ لَا تُقَدِّمُوا۟ بَيْنَ يَدَيِ ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ﴾[1] واته: ئەی بـاوەڕداران، دەستپێشخەری بەسـەر فەرمایـشتی خـوداو پێغەمبـەردا (ﷺ) مەكەن، ئەوانەی كـار بـەقیاس دەكـەن‌و، بانگەشـەی بـۆ دەكـەن، پێچەوانەی مانـاو دەلالەتی ئەم ئایەتەن، چونكه قیاس دەست پێشخەرییه بەسـەر خـوداو پێغەمبـەری خـوادا (ﷺ)، كه قسه كردن‌و حوكمدانه لەسـەر پێشهاتێك كـه دەقـی قورئـان‌و سـوننەتی لەسـەر نـەهاتووه هـەروەها پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَقْفُ مَا لَيْسَ لَكَ بِهِۦ عِلْمٌ﴾[2] مەكەونـه

---

١ سورة (الحجرات/ ١).

٢ سورة (الأسراء/ ٣٦).

شوێن کاریَ کە زانستت پیَ نییەو، پەیڕەوی لێوە مەکەن‌و، قیاسیش شتێکی پڕ لە گومانە، (ظني)یەو، تەمومژاوییە، بۆیە کارکردن پێی کارکردنێکی بیَ زانستەو، سەر بەو گومانەیە، کە هیچ لە پاشخانی هەق‌و ڕاستی زیاد ناکات، کە ئەو پاشخانەی هەقیقەتەیش ئەوەیە کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ تِبْيَـٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ﴾[1] واتە: قورئانمان ناردۆتە سەرت کە ڕوونکردنەوەو ڕافیاری هەموو شتێکە، بۆیە لە قورئانی پیرۆزدا ڕوونکردنەوە لەسەر هەموو حوکمێك هەیە، ئیتر پێویست بە قیاسکردن ناکات، چونکە ئەگەر قیاسێك لەسەر کارێك کرابێت کە لە قورئاندا هەبێت، ئیتر قورئان بەسە، و یەکلاکەرەوەیە، و ئەگەر قیاس لەسەر شتێکی پێچەوانەی قورئان کرابێت، ئەوە بەرپەرچدراوەیە و وەرنەگیراوە.

- دووەم: شوێنەواری زۆر لە هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە، کە سەرزەنشتی (ڕەئی) یان کردووە، و نکۆڵییان لە کار پێکردنی کردووە، لە وانەیش فەرمایشتی پێشەوا عومەر، کە فەرموویەتی: (دەخیلتان بم، لە کەسانی ڕەئی! واتە، لێیان دوور بکەونەوە، چونکە ئەو خاوەن ڕایانە دوژمنی سوننەتن، چونکە توانای لەبەر کردنی فەرمودەیان نییە بۆیە ڕای خۆیان دەر دەبڕن، ئەوانە گومڕان‌و خەڵکیش گومڕادەکەن)، و هەروەها فەرموویەتی: (دەخیلتان بم، دووربن لە (المكايلة)، گوترا(المكايلة)، یانی چی، ئەی پێشەوا؟! فەرمووی (المكالية) واتە: (مقايسة: قیاس کردن)، و پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طاليب (خوا لێی ڕازی بێت) دەفەرموێت: ئەگەر ئایین لە ڕەئی‌و عەقڵ وەربگیرایەت، ئەوە ناوەوەی گوێرەوی‌و خوفەکان لە مەسحکردندا لە ڕووی دەرەوەی لە پێشتر بوو، ئەم شوێنەوارانەیش بەڵگەن لەسەر سەرزەنشتکردنی قیاسکردن و بە بەڵگە ئەژمار ناکرێت و بۆیە دواجار کاری پیَ ناکرێت.

- سێیەم: قیاس دەبێتە هۆی ڕاجیایی‌و گرفت لە نێوان گەلدا، چونکە لەسەر فەرمانگەلێکی گومانـاوی بنیات نراوە، کە عیللەتی ئەسڵەکان دەردەهێنێت‌و، بەسەر فەرعەکاندا جێبەجێیان دەکات، و ڕوانگەکانیشی بۆ ئەم کارانە جیاوازن، بۆیە ئەحکامەکانیش کە دەرهاویشتەی ئەو ڕوانگانەن، ئەوانیش جیاواز دەردەچن‌و، دواجار

---

[1] سورة (النحل/ ٨٩).

لەسەر تەنها پێشهاتێك چەندەها ئەحكامی جۆراو جۆر بەرپا دەكرێت‌و، بەمەیش گەڵێ ڕاجیایی تێ دەكەوێت، و جیاوازی‌و ڕاجیایش كارێكی سەرزەنشت كراوو سوپاس نەكراوەو، قیاسیش كە هۆكارێكە بۆ ڕاپێچكردن بەرەو جیاوازی‌و ڕاجیایی، بۆیە ئەویش هەر سەرزەنشتكراوە.

– **چوارەم:** ئەحكامەكانی شەرع لەسەر بنەمای یەكسانی لە نێوان دووشتی هاو وێنەدا یاخود جیاواز بوون، لە نێوان دووشتی دژ بەیەكدا، بنیات نەنراون، هەر بۆیە لە شەرعدا حوكم گەلێكی جیاواز دەبینین، بۆ فەرمانگەلێكی هاو شێوەو، یاخود ئەحكامی هاوشێوە بەدی دەكەین، بۆ فەرمانگەلێكی جیاواز لە یەكتری، نموونە بۆیەكەمیان وەك، لادانی نوێژو ڕۆژوو لەسەر ئافرەتی بێ نوێژ، لە كاتی بێ نوێژییەكەیداو دواتر لەسەری دانراوە، كە ڕۆژوەكە بگرێتەوە، بەڵام قەزاكردنەوەی نوێژەكانی لەسەر نییە، لەدوای پاكبوونەوەی‌و هەروەها پێویستی بڕینی دەستی دز، بەڵام بڕیار دراوە بە نەبڕینی دەستی كەسێك، كە بە ئاشكرا شتێ لە كەسێك بەزۆر دەسێنێت‌و دەیبات‌و، هیچ جیاوازیش لە نێوان ئەم دوانەدا نییەو، هەروەها نوونەی تر وەك، دانانی شەلاقدان لەسەر كەسێ بوختان بكات، بۆیە كەسێكی تر كە گوایا داوێن پیسی كردووە، بەڵام بوختانكار بەوەی كە كوفری كردووە، شەلاقدانی لەسەر نییە، هەر چەندە كوفر زۆر ناشرینترو خراپترە لە داوێن پیسی.

نموونە بۆ دووەمیشیان، وەك، خۆڵ وەك ئاو بەپاك كەرەوە دانراوەو، كەچی دوو شتی لە یەكتری جیاوازیشن.

جا كە شەریعەت ڕەچاوی هاو شێوەی نەكرد، لە نێوان شتەكانداو، لە كاتی بەشەرع كردنی ئەحكامەكاندا ئیتر قیاس نابێتە بەڵگە، چونكە قیاس پشت بە یەكسانی‌و هاوشێوە بوون دەبەستێت‌و، هەروەك باسیش كرا، شەریعەت حساب بۆ ئەم دووانە ناكات.

## ٢٠٥- قسەی لە پێشتر (الراجح) لەم بارەیەوە:

لە ڕاستیدا، مەبەستی ئەوانەی كە قیاس بەفەرمی ناناسێنن‌و، بە بەڵگەی ناهێننە ئەژمار، ئەوەیە كە دەیانەوێت وابەستەی دەقەكان بن‌و، شەریعەت بپارێزن لە شڵەقان‌و تێكچون، و بە ڕێكردنی كارو بار بە پێی داواكردنی ئارەزووەكان، و كۆمەڵە بەڵگەیەكیشیان دەستكەوتووە، كە پاڵپشتی لەو ڕایە دەكەن، كە بەلایدا چوون‌و، هەروەها ئەوانەیش كە قیاس بە بەڵگە دەزانن، مەبەستیان لەم كارەیان ئەوە نییە، كە پێچەوانەی دەقەكان

بینەوە، یان لە بەرامبەریانو بەسەر ئەواندا بڕیاری تربدەنو، یاخود دووربکەونەوە لێیانو، بەشپرزەیی ڕوو لە ئەحکامەکانی شەریعەت بکەنو، بێ ئامانج سەیریان بکەنو، لایەنی ئارەزووی خۆیان زاڵ بکەن، بەسەر لایەنی ئەحکامە شەرعییەکانداو، بینیمان کە مەرج گەلێکیان دانان، بۆ دروستی قیاس، تا نەکەونە ناو شتی نادروستەوە، جا بەڕاستی هەردوو گروپەکە لە هەوڵەکانی خۆیداو، لە نیازپاکیدا پێکاویەتی بەلام سەرەڕای ئەمەیش، دەبێت ئەوەی کە لە پێشترەو (راجح)ە لە ڕای ئەم دووگروپە، بیخەینەڕوو.

لە کاتی تێڕامان لە بەڵگەکانی هەردوو گروپەکەو، لەکاتی سەرنجدان لە بنەمای ئەحکامە شەرعییەکانو ئامانجی شەرعدانان، لە ڕوانگەی سەراپای هەموو ئەمانەوە، سەرمان لەوەوە دەردەچێت کە قیاس بەڵگەیە و ڕای ئەو گروپە لە پێشترەو، (ڕاجح)ـە، کە وەك بەڵگەیەکی شەرعی تەماشای دەکەن.

درێژە باسی ئەم پرسەیش ئەوەیە کە، سەرجەم ئەحکامەکانی شەریعەت خاوەنی عیللەتی تایبەتی خۆیانن، واتە ئەو ئەحکامانە لەسەر عیللەتو وەصف گەلێك بنیات نراون، کە ئەو ئەحکامانە ئەو عیللەتو وەصفانە دەخوازن، ئیتر ئەحکامی پەرستن بن، یان مامەڵەکردن، چونیەکە، بەلام ئەوەندە هەیە کە ئەحکامەکانی پەرستن، بۆ ئێمە داپۆشراونو، ڕێگامان نییە، کە بە درێژی پەی ببەین پێیان، هەر چەندە کە دڵمان یەکلاییە، لەسەر ئەوەی کە ئەو عیللەتانە لەو ئەحکامانەی پەرستندا هەنو، ئەحکامە دیاریکراوەکانیش خۆیان خوازیاری ئەو عیللەتانەن لە ئەحکامەکانی پەرستندا، واتە: هەر دەبێت هەبنو بوونیان هەبێت.

بەلام لە ئەحکامەکانی مامەڵەکردندا دەکرێت هەست بکەینو پەی ببەین بە عیللەتەکانو، کە توانرا هەست بکەین، بە عیللەتەکان بە ڕێگایەکی دروستی وەرگیراو، ئیتر دەکرێت، ئەحکامەکانی ئەو عیللەتانە بەسەر سەرجەم ئەو پێشهاتانەدا گشتاندنی بۆ بکرێت، کە ئەو عیللەتەیان هەیە، ئەمەیش بەپێی ئەو ڕەوشە دەکرێتو، ئەنجام دەدرێت، کە لەپشت میتۆدی شەریعەتەوەیە، بۆ بە شەرعکردنی ئەحکامەکانو، هەروەها کارکردن بەپێی ئەو لێکچوونو وەك یەك بوونەی کە قورئانی پیرۆز لە زۆر لە دەقەکانیدا دەلالەتی لەسەر دەکات، چونکە قیاسکردن لەسەر بنەمای ئەوە بەرپاکراوە، کە ئەحکامەکانی شەریعەت خاوەنی عیللەتی خۆیانو بێ عیللەت نینو، دواجار یەکسان کردنی دووشتی وەك یەكو لێکچوو، جیاکردنەوەی دووشتی لە یەکتری جیاواز، کارێکی دروستەو، هیچ نەنگییەکی تیادانییە، و ئیعتیباری خۆیی هەیە، و سروشتی مرۆڤیش خودا لەسەر ئەو جیاکردنەوەیە

دروستی کردووەو، دەقێکی زۆری قورئان هەن، کە ئاماژە بەمە دەکەن، لەو بەڵگانەیش کە ئەو گروپەی قیاس بە بەڵگەی دەزانن، هێناویانەتەوە، وەك ئەوەی کە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَاعْتَبِرُوا يَا أُولِي الْأَبْصَارِ﴾[1] کە پێشتر مانامان کردو، نموونەی ئەمەیش زۆرە، وەك ئەو فەرمایشتەی پەروەردگار کە دەفەرموێت: ﴿أَكُفَّارُكُمْ خَيْرٌ مِنْ أُولَٰئِكُمْ أَمْ لَكُمْ بَرَاءَةٌ فِي الزُّبُرِ (٤٣)﴾[2] واتە: ئایا بێ باوەڕەکانی ئێوە، ئەی عەرەبەکان! باشترن لە بێ باوەڕەکانی گەلی نوح و عادو سەمود؟! تاهیوای ڕزگار بوونیان ببێ؟! یاخود بەرائەتتان بۆ هەیە، لە سزا، لە کتێبە ئاسمانییەکاندا، واتە، پسوڵەی ڕزگاربوونتان بۆ هاتووە؟ کە تووشتی ئەو بەڵایانە نەبن؟!

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَفَلَمْ يَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَيَنْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ ۚ دَمَّرَ اللَّهُ عَلَيْهِمْ ۖ وَلِلْكَافِرِينَ أَمْثَالُهَا (١٠)﴾[3] واتە: ئایا ئەو بێ باوەڕانە بەڕووی زەویدا نەچوون؟ تاسەیر بکەن، چۆن بووە، پاشە ڕۆژی ئەوانەی پێشیان؟! هەرچییەکیان هەبوو، خودا لەناوی بردو ناوچەو وڵاتی وێران کردن و تاقی ماڵ و منداڵی نەهێشتن و، بۆ هەموو بێ باوەڕەکانیش وێنەو ئەمثالی ئەو دوا ڕۆژە هەیە.

هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَكَذَٰلِكَ نَجْزِي الْمُجْرِمِينَ﴾[4] هەر ئا بەو شێوازەیش سزای تاوانباران دەدەین، جا دوای ئەوەی کە خوای پەروەردگار باسی ئەو بەڵا سەختانەو ئەو سزا ئازاراوییانەی بۆ گێڕاینەوە، کە یەخەی گەلی عادیان گرت و بەسەر یاندا هات، ئەم ئایەتانەو هاو وێنەکانیان دەلالەت لەسەر ئەوە دەکەن، کە حوکمی هەرشتێ بەسەر هاو وێنەکەیشیدا هەمان حوکم دەچەسپێت، و ئەمەیش سوننەت و ڕەوشی خوای پەروەردگارە لە بوونەوەرداو، ئەگەر بەم شێوازە نەبووایەت، ئەوا لە دەستەواژەی ئایەتەکاندا هیچ مانایەك بەدی نەدەکراو، هیچ دەلالەت و پەندێکیان لەخۆ نەدەگرت، و نەدەکرانە بەڵگەیش، و هەروەها ئەو دەقە قورئانییانە ئەوەیان ڕوون کردۆتەوە، کە حوکمی

---

١ سورة (الحشر/ ٢).

٢ سورة (القمر/ ٤٣).

٣ سورة (محمد/ ١٠).

٤ سورة (الأعراف/ ٤٠).

خودا یەکسانی لە نێوان دووشتی جیاوازدا ناچەسپێنێتو، هەر کەس بە دروستی بزانێت، و زانیبێتی کە خودا لە نێوان دووشتی جیاوازدا، یەك جۆر حوکمی چەسپاندووە، ئەوە ئەو کەسە شتێکی داوەتە پاڵ خوای پەروەردگارە کە شایستەی خودا نییە، ئیتر زانیبێتی بەم نالایەقیەو تایبەتی کردبێتی، یان نەیزانیبێتو، لە خۆوە کردبێتی، هەر چۆنیەکە، جا پەروەردگار دەفەرموێت:﴿أَفَنَجْعَلُ ٱلْمُسْلِمِينَ كَٱلْمُجْرِمِينَ ﴿٣٥﴾ مَا لَكُمْ كَيْفَ تَحْكُمُونَ ﴿٣٦﴾﴾[1] واتە: ئایا موسڵمانان وەك تاوانباران لێ دەکەین؟ چیتانە حوکمو بڕیاری وا دەدەن؟ چونکە هیچ کاتێك نابێت، چاکە کارو خراپە کار چونیەك مامەڵەیان لە گەڵدا بکرێت، هەروەها قورئان دەفـــــــــەرموێت: ﴿أَمْ حَسِبَ ٱلَّذِينَ ٱجْتَرَحُوا۟ ٱلسَّيِّـَٔاتِ أَن نَّجْعَلَهُمْ كَٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ سَوَآءً مَّحْيَاهُمْ وَمَمَاتُهُمْ ۚ سَآءَ مَا يَحْكُمُونَ ﴿٢١﴾﴾[2] واتە: ئاخو ئەوانەی بروایان نییەو گوناحو تاوانیش دەکەن، پێیان وایە، کە وەك ئەوانەیان دادەنێین بڕوایان هێناوەو کارە چاکەکانیان ئەنجامداوە؟ هەرگیز شتی وا نابێت، ئینجا پێیان وایە، کە ژیانو مردنیان یەکسانە؟ واتە پێیان وایە وەك یەك دەژینو دەمرن؟! بەڕاستی خراپە ئەو دادوەرییەی دەیکەین! ئەگەر پێیان وابێت کە هەردوولا یەکسان دەبن.

و هەروەها پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿أَمْ نَجْعَلُ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ وَعَمِلُوا۟ ٱلصَّٰلِحَٰتِ كَٱلْمُفْسِدِينَ فِى ٱلْأَرْضِ أَمْ نَجْعَلُ ٱلْمُتَّقِينَ كَٱلْفُجَّارِ ﴿٢٨﴾﴾[3] واتە: ئایا دەکرێت ئەوانەی کە باوەڕیان هێناوەو کارە چاکەکانیان کردووە، وەکو بەدکارانو ئاژاوەگێڕان لە زەویدا دابنێینو وەك یەك حسابیان بۆ بکەین؟! یاخود دەبێت خەڵکانی پارێزکار، لە گوناحو تاوان، وەکو خەڵکانی خراپەکار دابنێین؟!

کەواتە: قورئانی پیرۆز شایەتە لەسەر دروستی یاسای یەکسان کردنی نێوان دووشتی لێکچووو، جیاکردنەوەی نێوان دووشتی لەیەکتری جیاواز، و قیاسیش هەر ئەمەیەو پراکتیزە کردنیەتی بەسەر ئەو پێشهاتانەیدا، کە دەق نەهاتووە، لەسەر چۆنییەتی حوکمەکەیان، بەلکاندنیان بەو حوکمانەوە کە دەقیان لەسەر هاتووە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو دوو پێشهاتە

---

١ سورة ( القلم/ ٣٥-٣٦).

٢ سورة (الجاثية/ ٢١).

٣ سورة (ص/ ٢٨).

هـاو وێنـەنو، یەکسانن لـەو عیللەتەیدا، کـە حوکمەکـە داوای دەکـات، بۆیـە دواجـار یـەك حوکمیشیان دەبێت.

بەڵام ئەوەی کە نکۆڵی کارانی قیـاس بـە بەڵگـەی دەکـەن، ئـەوە هـیچ بنەمایـەکی بەڵگـە ئامێزی نییەو، دەلالەت ناکات، لەسـەر بانگەشـەکانیان، چـونکە قیـاس بـۆ شـتێکە کـە دەق لەسەری نەبێت، لەو پرسەداو، ئەمەیش پێچەوانەی ئەم ئایەتە نییە، کە دەفـەرموێت: ﴿وَلَا تَقۡفُ مَا لَيۡسَ لَكَ بِهِۦ عِلۡمٌ﴾[1] و هـەروەها دژی ئـەم ئایەتـەیش نییـە، کـە دەفـەرموێت: ﴿وَإِنَّ ٱلظَّنَّ لَا يُغۡنِي مِنَ ٱلۡحَقِّ شَيۡـًٔا﴾[2] کـە سـەرجەمی ئـەم ئایەتـە پیرۆزانـەمان مانـاکردن، هـەروەها لەبـەر ئەوەیـە کـە قورئـان ڕوونکـەرەوەی هـەموو شـتێکە، واتـە لـەڕووی لـەفزو مانایـشەوە حوکمەکان ڕوون دەکاتەوەو، مانای ئەوە نییە، کە سەرجەمی حوکمەکان، دەقی ڕاشـکاویان لەسەر بێتو قیاسیش پەیوەندی بەدەلالەتی قورئانەوە هەیـە، لەسـەر مانـای ئەحکامـەکان، بۆیە ناتوانین دەسبەرداری قیاس ببین.

ئینجـا سـەبارەت بـەو شـوێنەوارانەی کـە لـە هاوەڵانـەوە (خـوا لێیـان ڕای بێـت) پێمـان گەیشتووە، کە سەرزەنشتی ڕا و قیـاس کـردن دەکـەن، ئەمـە مەبەسـت پێـی ڕای خـراپ، و قیاسی خراپە، و ئێمـە ملکەچـی ئـەوەین کـە لـە قیاسیـشدا، هەیـە چاکەو هەیـە خراپـە، و قیاسی خراپ ئەوەیە کە ئەو پایەو مەرجانەی کە باسمان کردن، تیایدا نەهاتونەتەدی.

ئینجا قیاسی خراپ ئەوەیە کە پێچەوانەی ئەمە بێت، وەك قیاسـی ئـەو بـەتاڵکارو هـەرزە گۆیانەی کە دەڵێن: ﴿قَالُوٓاْ إِنَّمَا ٱلۡبَيۡعُ مِثۡلُ ٱلرِّبَوٰاْ﴾[3] لە کاتێکدا کـە هەقیقـەتی مامەڵـە کـردن جیاوازەو دژە لەگەڵ حەقیقەتی سووخۆریداو، هەروەها وەك ئەوەی کە خودای پـەروەردگار لەسەر زمانی براکانی (سیدنا یوسف) سڵاوی خودای لەسـەر بێـت، بۆمـان دەگێڕێتـەوە، کـە دەفەرموێت ﴿إِن يَسۡرِقۡ فَقَدۡ سَرَقَ أَخٞ لَّهُۥ مِن قَبۡلُ﴾[4] واتە: ئەگەر بنیامینی برای یوسـف دزی بکات جێی سەر سوڕمان نییە، چونکە یوسفی برایشی پێـشتر دزی کـردووەو، هـەروەها

---

١ سورة (الأسراء/ ٣٦).

٢ سورة (النجم/ ٢٨).

٣ سورة (البقرة/ ٢٧٥).

٤ سورة (يوسف/ ٧٧).

وەك قیاسی بەتاڵی شەیتان، كە لەسەر ئەو بنەمایە قیاسی كردووە كە ئاگر بەڕێزترە لە قوڕو، لەبەر ئەوەی كە لە ئاگر دروست كراوە، ئەوە بە بانگەشەی شەیتان خۆی، بەڕێزترە لە ئادەم كە لە قوڕو گڵ دروست كراوە، بۆیە ئەو شیاوی كڕنوش بۆ بردنە، نەوەك ئادەم! جا ئەمە قیاسێكی بەتاڵە، یاخود بە بەڵگە كردنی قیاسێكی بەتاڵو بۆشە و پاشان بوونی قیاسی خراپ، ئەمە لە بەبەڵگە بوونی قیاسی دروست كەم ناكاتەوە، چونكە ئێمە دەبینین تەنانەت شت گەلێكی تەواو نادروست دەدرێتە پاڵ سوننەتی پێغەمبەر (ﷺ)و ئەم دانە پاڵ خراپەیش لە واجبی پەیڕەوی كردنی سوننەتو ئەژمار كردنی وەك بەڵگەیەكی شەرعی كەم ناكاتەوە، جا لەقیاسیشدا هەر بەم شێوازەیە، ئەگەر قیاسی خراپ بینرا، ئەمە مانای ئەوە نییە، كە ئیتر دەبێت بە تەواوەتی دەست لە قیاس كردن هەڵبگرین و بە بەڵگەیەكی شەرعی نەهێنینە ئەژمار.

ئینجا سەبارەت بەوەی كە گوتویانە قیاس، جێگای قوت بوونەوەی ڕاجیایی‌و گرژییە، ئەوە بەڕاستی ڕاجیایی لە هەڵێنجانی ئەحكام تەنانەت لە سوننەتو قورئانیشدا هەیەو، هەروەها ڕاجیایی لە مەرجەكانی دروستی سوننەتو دەلالەت كردنیان لەسەر ئەحكامەكان هەیە، و هەروەها ڕاجیایی لە شێوازی تێگەیشتنی هەندێ لە دەقەكانی قورئانیشدا هەیەو، كەسیش بەم هۆیەوەو بەهۆی ڕاجیایی بوونەوە بانگەشەی ئەوەی نەكردووە، كە ئیتر دەبێت واز لە سوننەت بهێنین‌و ئەحكامی لێوە دەرنەهێنین! كرۆكی ئەم پرسە، ئەوەیە كە ڕاجیایی لە هەڵێنجانی ئەحكامی شەرعی كرداریدا شتێكی وەرگیراو و دروستە، مادام ئەو ڕاجیاییانە لە تێڕوانینە جیاوازەكانی كاروبارە ئیجتیهادییەكاندا دروست بووەو، هیچ دەقێكی ڕاشكاوی یەكلایی (صريح قطعي)، نییە، سەبارەت بە حوكمی پرسێكی وادا، كە ڕاجیایی تیادا هەبێت، و شەرعزانان هەر لە سەردەمی هاوەڵانەوە (خوا لێیان ڕازی بێت) تا ئێستا هەر ڕاجیاییان هەبووە، و تەنانەت بگرە نكۆڵی كارانی قیاس، خۆیشیان ڕاجیایی لە نێوانیاندا هەیە، لە زۆر لەو ئەحكامانەیدا كە تەنانەت ئەگەر سەربەیەك مەزهەبی دیاریكراویش بن، جا ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە ڕاجیایی بوون، شتێكی ئاسایی‌و بەڵگە نەویستەو، وەرگیراوە لەسەر جەم پرسە ئیجتیهادیەكانداو، ڕاجیایی هۆكار نییە، بۆ كاركردن یان كار نەكردن بە قیاس!

دواجار، ڕاجیایی سەرزەنشت كراو، ئەوەیە كە لە پرسەكانی پەیوەندیدار بە بیرو باوەڕو بنەماكانی ئایینداا بێت، نەك لە پرسە لاوەكی‌و فەرعییەكاندا، و هەروەها ڕاجیایی خراپ ئەوەیە كە لە ئەحكامە قەطعی‌و ئیجماع لەسەر كراوەكاندا بێت، نەك لە ئەحكامە

تەومژاوییەکاندا (الأحكام الظنية) ئینجا سەبارەت بەوەی کە هەندێ لە زانایان دەڵێن: شەریعەت هاتووە، شتە لێکچووەکانی جیاکردۆتەوەو شتە جیاوازەکانی یەکسان کردووە، و ئەمەیش بنەڕەتی قیاس دەڕوخێنێت و ئیدی بەبەڵگە ئەژمار ناکرێت، بەڕاستی ئەمە قسەیەك نییە، بە ڕەهایی پێکابێتی و لە شارەزاییەکی ئەوتۆوە بەسەر چاوگەکانی شەریعەتەوە سەرچاوەی نەگرتووە و نەهاتووە، و هەروەها لەسەر بنەمای ئەو زانینەوە نەگوتراوە، کە حیکمەتە درەوشاوەکانو نهێنیە فراوانەکانو بەرژەوەندیە حەقیقەتەکانی لەسەر بەر پاکراوەو، هەروەها ئەو گوتەیەی سەرەوە ڕەچاوی ئەوەی تیادا نەکراوە، کە ئەحکامی شەریعەت لەسەر بنەمای مانادارییو عیللەتداری بەر پاکراونو، بنیات نراون، کە هەر ئەو ماناو عیللەتانەخوازیارو هۆکاری بەرپا بوونی ئەحکامەکانن، و هەروەها شەریعەت هەرگیز شتێکی نەدرکاندووە، کە پێچەوانەی ئەوە بێت، کە لەسروشتی زگماکیو دروستی مرۆڤدا هەیە، لە جیا کردنەوەی نێوان شتە جیاکانو یەکسان کردنی شتە هاو وێنەکانداو، ئەحکامی شەرعیی زۆریش هەن، کە دەلالەت لەسەر ئەم هەقیقەتە دەکەن.

بەڵام ئەگەر شەریعەت، هەندێ لە جۆرەکانی حوکمی تایبەت کرد، و جیایی کردەوە لە هاوشێوەکانی، هەر دەبێت ئەو جۆرە جیاکراوەیە وەصفێکی وای بۆ تایبەت کردبێتو دانابێت، کە پێویستی ئەو تایبەت کردنەی حوکمەکەی تیادا دەربخاتو، هەروەها هۆکاری نایەکسان کردنی لە گەڵ هاو شێوەکانیدا ئاشکرا بکاتو، جاری وا هەیە، کە هەندێ لە خەڵکی ئەو وەصفە تایبەت کراوە پێ دەزانن، و دەکرێت هەندێکی تر پێی نەزاننو، مەرجی قیاسی دروست ئەوە نییە، کە هەموو کەسێ ئەو صەحیح بوونەی پێ بزانێت، جا هەر کەس شتێکی لە شەریعەتدا بینی کە پێچەوانەی قیاسی صەحیح بوو، واتە ئەو قیاسەی کە شتە لێکچووەکان یەکسان دەکاتەوەو شتە جیاوازەکان جودا دەکاتەوە، ئەوە ئەو قیاسە، پێچەوانەی ئەو پێناسەی قیاسەیە کە ئەو کابرایە لە دەروونی خۆیدا نەخشاندوویەتیو پێچەوانەی ئەو قیاسە دروست نییە کە لەو جێگایەدا بوونی هەیە[1].

جا لە شەریعەتدا، حوکم گەلی لەو جۆرە بوونی نییە، کە پێچەوانەی یاساکانی لێکچوون بێت، بۆیە جیاکاری ئافرەتی بێ نوێژ لە دوای پاکبوونەوەی لە حوکمی گرتنەوەی ڕۆژووە فەوتاوەکانیداو نەکردنەوەی نوێژەکانیدا لەسەر بنەمای ئەو ڕێسایە دامەزراوە، کە پێشتر

---

[1] بڕوانە (رسالة القياس، لشيخ الأسلام إبن تيمية) في مجموعة رسائله الكبرى ل ٢٧١-٢٨١.

ڕوونمان کردەوەو، چونکە کاتەکانی زۆر زۆرترن‌و شەرعیش سەختی لەسەرشان لاداوە.

هەروەها وەك واجبی شەلاقدانی کەسی بوختان کار، بەداوێن پیسی، نەوەك بوختانکار بەکوفر کردن، چونکە کەسی بوختانکار بە داوێن پیسی، هیچ ڕێگایەك لە بەردەم خەڵکیدا نییە، تا ڕووی کابرای بوختانکار ئاشکرا بکات‌و پێی بزانن، کە درۆی کردووە لەو بوختانەیدا، بۆیە شەلاقدانەکە، بە درۆخستنەوەیەتی‌و هێنانەوەی شەرەف‌و ناموسی بوختان بۆکراوەکەیەو، لادانی عەیبەیەلەسەری، بەتایبەتی ئەگەر ئافرەت بێت، بەڵام کوفردانە پاڵ کەسێك‌و، بوختان بۆ کردنی، ئەمەیان بە بینینی کابرا لەلایەن موسڵمانانەوەو، لە ناو گروپی موسڵماناندا‌و، بەئاگاداری موسڵمانان لەسەری، ئەمانە بەسن بۆ بەدرۆ خستنەوەی بوختانەکەی‌و کابرای بوختان بۆ کراویش دەتوانێت کە ووشەکانی باوەڕ بدرکێنێت‌و، ئیتر درۆی کابرای بوختانکار ئاشکرا بکات، بەڵام بوختانکردن بە داوێن پیسی، دەبێت کابرای بوختان بۆکراو چی بکات؟ تا درۆی بوختانکاری پێ ئاشکرا بکات؟!

هەروەها پێویستی بڕینی دەستی دز، لەبەر ئەوەیە کە ئەم دزە هەتکی شوێنی پارێزەرانی موڵکەکەی کردووە، و لەناو ماڵەکاندا تونێلی لێداوە، بۆ ڕاپەڕاندنی کارەکەی، و کابرای خاوەن ماڵ ناتوانێت لەو ڕێ‌و شوێنە ئاسایشیانە زیاتر بگرێتەبەر بۆ پاراستنی موڵکەکەی، کەواتە پێویستە ئەم بەڵایە لەناو خەڵکیدا ڕیشەکێش بکرێت‌و، سزای دەست بڕینی بە سەردا جێ بەجێ بکرێت، ئەمە بە پێچەوانەی کەسی (المنتهب)، واتە: ئەو کەسەی کە شتێ بە ئاشکراو بەزۆر دەبات، چونکە لە کاتی ئەو بردنەدا بەئاشکرا دەتوانرێت شوێنی بکەوێت، و ماڵەکەی لێ بسێنرێتەوە، و هەروەها دەکرێت لەلای دادوەر شایەتی لەسەر بدرێت‌و مافەکەی لێ بسەنرێتەوە، سەرەڕای ئەمەیش کەسی (المنتهب) بە تەمێ کردن سزا دەدرێت‌و حەقیقەتی دزی کردن‌و حەقیقەتی (المنتهب) لەیەکتری جیاوازن، بۆیە لە حوکمیشدا هەر جیاوازن‌و هەروەها وەك ئەوەی کە خۆڵ پاك‌و پاکەوەکەرەو لابەری پیسیە، لە کاتی نەبوونی ئاودا، و ئەمەیش حوکمە شەرعی لەسەرەو، ئەمە حوکمێکی پەرستشییە، هەر وەك گوتمان درێژەی عیللەتەکەی پێ نازانین.

بەکورتی‌و پوختی، بێگومان کە قیاسی دروست بەڵگەیەکە لە بەڵگەکانی ئەحکام، و جەماوەری زانایان لەسەر ئەوەن کە بەڵگەیەکی شەرعییە، و ئەمەیش ڕای لەپێشتر (الراجح)ی، نێوان ئەو دوو ڕایەی ڕابردووە، و کار بە قیاس دەکرێت، و لە دوای قورئان‌و سوننەت‌و ئیجماع پەنا دەبردرێتە بەری.

# ﴿بەشی پێنجەم﴾

## ((بەڵگەی پێنجەم: ئیستیحسان))

**الأِستِحسان**، لە زمانی عەرەبیدا، بەمانای بەچاكو جوان زانینی شتێ دێتو، هەروەها بەكار دەهێنرێت، بۆ ئەو شتەی كە حەزی مرۆڤ بۆی دەچێتو، پێی خۆشە بیكات، هەرچەندە لەلای خەڵكی تریش ناشرین بێت، لەلای زاراوەی زانایانی ئوصولی فیقه، پێناسەی زۆری لێوەكراوە[1]، لەو پێناسانە وەك ئەوەی كە پێشەوا بەزدەوی دەفەرموێت، ئیستیحسان، بریتییە لە لادانو ڕوو وەرگێڕان لە قیاسێكی پێویست بۆلای قیاسێكی لەو بەهێزتر، یاخود بریتییە لە تایبەتمەند كردنی قیاس بە بەڵگەیەكی بەهێزتر.

شەرعزانی مەزن (الحلواني الحنفي) دەڵێت: ئیستیحسان بریتییە لە وازهێنان لە كار كردن بەقیاس، بەهۆی بەڵگەیەكی بەهێزتر كە لە قورئان، یان سوننەت، یان ئیجماعدا هەبێت، و هەروەها پێشەوا كەرخی حەنەفی لە پێناسەیدا فەرموویەتی: ئیستیحسان بریتییە لەوەی كە مرۆڤ بە شێوازێك كە لە هاو وێنەكانی پرسێكدا بڕیارو حوكمی داوە، كەچی بۆ خودی پرسەكە حوكمەكە نەدات، بەڵكو بە پێچەوانەی حوكمی ئەو هاوشێوانە، بۆ پرسەكە حوكم جێگیر بكات، ئەمەیش بەشت بەستن بە بەڵگەیەك، كە دەبێتە هۆی لادانو خوازیاری لادانە لە جێگیر كردنی ئەو حوكمە لەسەر یەكەمینەكە. پاشان (ئیبن عەرەبي مالكی) وای پێناسە كردووە، كە ئیستیحسان، بەمانای لە پێشتر دانانی واز هێنانە لە دەرهاویشتەی بەڵگەیەك، لە ڕێگای هەڵاوێركردنو دەرفەتدان، بەهۆی بوونی بەڵگەیەكەوە كە لە گەڵ هەندێ لە دەرهاویشتەكانی بەڵگەی یەكەمدا دژایەتی هەیە.

پاشان هەندێ لە حەنبەلییەكان وایان پێناسە كردووە، كە ئیستحسان بریتییە لە خستنەوەلای حوكمی پرسێكە، لەناو هاوشێوەكانیدا بەهۆی بوونی بەڵگەیەكی شەرعی تایبەتەوە.

٢٠٧- لەسەراپای ئەم پێناسانەوە ئەوەمان دەست دەكەوێت كە مەبەست لە ئیستحسان بریتییە لە كاركردن بە قیاسێكی وردو شاراوە، لە بەرامبەر قیاسێكی دیارو ئاشكرادا، یاخود

---

[1] روضـة النـاظر و جنـة المنـاظر، ب١، ل٤٠٧، و دواتـریش، الآمـدي ب٤، ل٢٠٩و دواتـر، كـشف الاسرار ب٤، ل١١٣٢، و المسودة، ل٤٥٥.

جیاکردنەوەی پرسێکی لاوەکییە لەناو یاسایەکی گشتیدا.

بەهۆی بوونی بەڵگەیەك کە دڵو دەروونی کابرای موجتەهید بەهۆیەوە ئۆقرەی گرتووەو، سەرەڕای ئەوەیش هۆکاری هێنانەدی ئەو هەڵاوێرکردن یاخود لادانەیە.

جا ئەگەر پرسێك خرایە بەردەم موجتەهدێك‌و، دوو قیاس لەسەر ئەو پرسە لە کێشمە کێشمدا بوون، قیاسی یەکەمیان ئاشکرا بووو، داواکاری حوکمێکی دیاریکراو بوو، بەڵام قیاسی دووەم‌و، ووردو شاراوە بووو، داواکاری جۆرە حومکێکی تر بووو،و لە دڵو دەروونی کابرای موجتەهیدا بەڵگەیەك پەیدا بوو، کە داواکاری بە لە پێشتر دانانی قیاسی دووەم بوو، بەسەر قیاسی یەکەمدا، یاخود داواکاری لادان بوو، لە دەرهاویشتەی قیاسە ئاشکراکەوە، بۆلای دەرهاویشتەی قیاسە نائاشکراکە، ئەوا لەم حاڵەتەدا، ئەم لادانە، یاخود ئەو بە لەپێشتر دانانە (الترجیح)، بە پرۆسەی ئیستیحسان ئەژمار کراوە[1].

جا ئەو بەڵگەیەی کە خوازیارو پاڵپشتی ئەم لادانەیە، بەرووو ڕەهەندو پاڵپشتی ئیستیحسان ناوزەد کراوە، و ئەو حوکمەی کە بە هۆی ئیستیحسانەوە دەچەسپێت، بە حوکمی بەچاك دانراو (مُستَحسَن)، یاخود حوکمی چەسپاو بە پێچەوانەی قیاسی ئاشکراوە ناونراوە.

هەروەها ئەگەر پرسێك خرایە بەردەم کەسی موجتەهید، کە ئەو پرسە لە ژێر بنەماو ڕێسایەکی گشتیدا جێگیر بووبوو، و یاخود ئەسڵێکی گشتی زاڵ بوو، بەسەریداو، کابرای موجتەهید بەڵگەیەکی تایبەتی هەبوو، کە ئەو بەڵگە تایبەتە داواکاری هەڵاوێرکردنی ئەو پرسە لاوەکییە بوو، لەناو ئەسڵە گشتییەکەدا یاخود داواکاری بەر کەنارکردنی ئەو پرسە بوو، لە حوکمە چەسپاوەکەدا بۆ هاو شێوەکانی، بە حوکمێکی تر بەهۆی بوونی ئەو بەڵگە تایبەتەوە، کە لە هزری موجتەهیدەکەدا هەیە، جا ئەم لادانە هەڵاوێر ئامێزە (العدول الأستثنائي)یە، بە (ئیستیحسان) ناو زەد کراوە، و ئەو بەڵگەیەی کە خوازیاری ئەم پرۆسەیەیە، ئەو بەڕەهەندو پاڵپشتی ئیستیحسان ناونراوەو، ئەو حوکمەی کە بەم هۆیەوە چەسپێنراوە، بە حوکمی چاك کراو (مُستَحسَن) ناونراوە، واتە حوکمە چەسپاوەکە پێچەوانەی قیاسە، و قیاس لێرەدا بریتییە لە ئەسڵە گشتییەکە، یاخود یاساو بنەما گشتییەکە.

---

[1] حەنەفییەکان، دانانی قیاسی ئاشکرا لە بەرامبەر قیاسی نائاشکرادا بە ئیستیحسان ناو دەبەن، و هۆکاری ئەمەیش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە کە ئەم جۆرە قیاسە لە قیاسی ئاشکرا بەهێزترە، بۆیە کار کردن پێی جوانو چاکە بڕوانە (التوضیح) ب٢، ل٨٢، کشف الأسرار، ب٤، ل١١٢٣.

## ٢٠٨- نموونەگەلێك لەم بارەیەوە:

یەكێك لە حوكمە چەسپاوەكانی مەزهەبی حەنەفی، بریتییە لە مافە سازش لەسەر كراوەكانی، وەك مافی ئاوی خواردنەوەو مافی ئاوەڕۆو مافی هاتوچۆ، بۆ زەوییە كشتوكاڵییەكان، ئەم مافانە ئەگەر لەدەقی گرێبەستی مامەڵەكەدا ناویان نەهێنرێت، ئەوا ناچنە چوار چێوەی مامەڵەكەوەو بە بەشێك لەمامەڵەكە ئەژمار ناكرێن، جا ئەگەر ئەو زەوییە وەقف بكرێت، بەبێ ئەوەی لە گرێبەستەكەدا ئەم مافە ناوی هێنرابێت، ئایا لەم كاتەدا ئەم حوكمە دیسان بوونی هەیە؟! یان بوونی نییە؟! حەنەفییەكان دەڵێن: لەسەر بنەمای قیاسكردن، ئەم مافانە ناچنە ناو چوار چێوەی گرێبەستی مامەڵەكەوە، بەلام لەسەر بنەمای ئیستیحسان دەچنە ناو گرێبەستەكەوەو ئەژمار دەكرێن.

ڕوونكردنەوەی ئەم پرسەیش بەم جۆرەیە كە وەقف كردنی زەوییە كشتوكاڵییەكان لە ژێر ڕەحمەتی دوو جۆر قیاسدا جێگایان بۆتەوە، یەكەمیان قیاسكردنیانە لەسەر مامەڵە كردن، و دووەمیان، قیاس كردنیانە لەسەر (بەكرێدان)، كە ڕوانگەی یەكەم ئاشكراترو نزیكترە لەهزری مرۆڤەوە، چونكە ئەندازەی هاوبەشی مامەڵەو وەقف ئەوەیە كە لە هەردووكیاندا موڵكەكە لە خاوەندارێتی خاوەنەكەی دەچێتە دەرەوەو، داواكاریو خوازیاری بوونی ئەم قیاسە ئاشكرایە ئەوەیە كە ئەگەر ئەو مافە سازش لەسەر كراوانە لە گرێبەستەكەدا باس نەكرێن، ئەوا ئەم مافانە هەروەك ئەو حاڵەتەی لە گرێبەستی مامەڵەدا هەیە، وا دەبێتو، هەروا لە وەقفیشدا وەك پاشكۆی زەوییەكە ناچنە چوار چێوەی موڵكە وەقف كراوەكەوە.

قیاسی دووەم، واتە قیاسكردنی لەسەر (بەكرێدان) لەسەر بنەمای ئەوە بەرپاكراوە وەقفو بەكرێدانیش هەردووكیان دەبنە هۆی ئەوەی كە بتوانرێت خاوەن موڵك سود لە خودی ماڵەكە وەربگرێت، بەلام هەر نابنە خاوەنی ئەسڵی ئەو موڵكە، جا ئەمە قیاسی نائاشكرایە، (خفي) یە، و نایەن بە هزری مرۆڤدا، و بەڵكو پێویستی بە بڕێك تێڕامان هەیەو، دەرهاویشتەو داواكاری ئەوەیە كە ئەمەیش هەروەك گرێبەستی بەكرێدان مافە سازش لەسەر كراوەكان، بەشێوەی پاشكۆیی دەچنە چوار چێوەی پرۆسەی وەقفەوە، بەپێی ئەوەی كە پێویستمان بەوە هەبێت، كە بەدەق لەناو گرێبەستەكەدا ئەم خاڵە بنووسین.

لێرەدا، ئەگەر موجتەهید قیاسی نائاشكرا پێش بخات بەسەر قیاسی ئاشكرادا، ئەمە ئیستیحسانەو، ڕەهەندی پاڵپشتەكەی ئەوەیە كە قیاسی نائاشكرا (خفي) كاریگەری بەهێزتری هەیە لەقیاسی ئاشكرا (جلي)، چونكە هەروەك گوترا مەبەست لە وەقف، سوود وەرگرتنە لە ماڵە وەقف كراوەكە، نەك بوونە خاوەن ماڵی تەواوی موڵكەكە، و لەبەر ئەوەی كە

سوود وەرگرتن بەبێ مافە سازش لەسەر کراوەکان هیچ مانایەکی نییە، ئەوا پێویستە کە ئەم مافانەیش، هەروەك بەکرێدان، بەشێوەی پاشکۆ، بچنە ناو بازنەی وەقفەکەوە.

٣- لە نموونە گەلی هەڵاوێرکردنی پرسێکی تایبەت (جزئي) لە ئەسڵێکی گشتی، بریتییە لە دروستی وەسیەتکردن لەکارە باشەکاندا، لەلایەن کەسێکەوە سانسۆری لەسەر بێت، بە هۆی کەودەنی بوونییەوە، کە ئەم وەسیەتکردنە لە ڕووی ئیستیحسانەوە دروستە، لە کاتێکدا کە قیاس دەلالەت دەکات، لەسەر نادروستی ئەو پرسەی سەرەوەو، هەروەها وەقف کردنی ئەم جۆرە کەسە لەسەر خۆی دیسان لە ڕووی ئیستیحسانەوە دروستە، بەڵام قیاس بەدروستی نازانێت، جا ڕوونکردنەوەی ئیستیحسان لەم دوو پرسەدا بەم جۆرەیە کە یاسای گشتی، واتە پاراستنی موڵکی کەسی سانسۆر لەسەر دانراو، وا خوازیارەو حوکم دەدات، کە بەخششەکانی ئەم کەسە دروستن، بەڵام وەسیتکردنی ئەم کەسە لە کاروبارە چاکەکاندا لەم یاسا گشتییەی سەرەوە هەڵاوێر دەکرێت، چونکە وەسیەت بۆ دوای مردنی کابرای وەسیەتکارەو، مانای خاوەندارییەتی تیادا بەرجەستەیە، و وەقفیش هەروەك وەسیەت وایە، و موڵکی کابرای کەودەن بۆ خۆی دەپارێزرێت، بۆیە ئەم هەڵاوێرکردنە کاریگەری لەسەر ئامانجی ئەم یاسا گشتییە نابێت!

## ٢٠٩- جۆرەکانی ئیستیحسان:

هەروەك لە نموونەکانی پێشەوەدا دەردەکەوێت، جاری واهەیە کە ئیستیحسان هەڵاوێرکردنی بابەتێکی تایبەتە لە یاسایەکی گشتی، یاخود بە لەپێشتر دانانی قیاسێکی نائاشکراو وردە بەسەر قیاسێکی ئاشکراداو، ئەم دابەشکردنەی ئیستیحسان، بەرەچاوکردنو لەبەر چاو گرتنی ئەو شتە بووە کە ئیستیحسان لێی لایداوە، یان لادراوە بۆلایی‌و جاری وایش هەیە، کە لە ڕووی پاڵ پشتو بەڵگەوە تەماشای ئیستیحسان دەکرێت، یاخود لە ڕووی ئەوەوە سەیر دەکرێت، کە لە پەراوەکانی شەرعدا بەڕووی ئیستیحسان ناوزەد کراوە، و دواجار ئیستیحسان دەبێت بەم چەند جۆرەی لای خوارەوە:

### ٢١٠- یەکەم: ئیستیحسان بە پێی دەق، واتە ئەوەی کە بەدەق پاڵپشتی لێوە کراوە:

ئەمەیش بریتییە لەوەی کە لەلایەن شەرعەوە دەقێکی تایبەت لەسەر پرسێکی تایبەت (جزئي) بێتە کایەوە، کە داواکاری حوکمێکی وابێت، بۆ ئەو پرسە جوزئیە، کە ئەو حوکمە پێچەوانەی ئەو حومکە بێت، کە بەپێی دەرهاویشتەی یاسا گشتییەکان، بۆ هاو وێنەکانی ئەو پرسە چەسپێنراوە، کە لەم حاڵەتەدا دەقەکە ئەم پرسە جوزئیە، هەڵاوێر دەکات، لەو حوکمەی کە بە پێی دەرهاویشتەی یاساگشتیەکە، بۆ هاو وێنەکانی ئەو پرسە چەسپێنراوە،

بۆ نموونە، یاسای گشتیو ئەسلّو بنەمای گشتی لە مامەڵە کردندا لەسەر ئەوەیە کە مامەڵەی شتی نادیار دروست نییە، بەڵام لێرەدا مامەڵەی (سەلەم) جیاکراوەتەوە، کە مامەڵەی سەلەم واتە پێش فرۆشی دەغڵو دان، بە پارەیەکی نەقد، واتە لەو کاتی مامەڵەیەدا، کاڵای حازر نییە، بەڵام کاتێك پێغەمبەری خوا (ﷺ) چووە مەدینەو بینی ئەم مامەڵەیە لە ناویاندا باوەو هیچ زیانو خراپەیەکی لێ ناکەوێتەوە، بەدەقێکی تایبەتو روونو ئاشکرا مۆڵەتی پێداو بەرەوای داناو، فەرمووی: «مَنْ أَسْلَفَ فَلْيُسْلِفْ فِي كَيْلٍ مَعْلُومٍ وَوَزْنٍ مَعْلُومٍ إِلَى أَجَلٍ مَعْلُومٍ»، واتە: هەر کەس لەئێوە لەم جۆرە مامەڵەیەی ئەنجامدا، باوا ئەنجامی بدات، کە پێوانەو کێشانەو کاتەکەی دیاریکراو بێتو، هەروەها پەشیمان بوونەوە بەمەرج، کە لەرووی ئیستیحسانەوە دروستەو بە بەڵگەی هاتنی دەق لە سوننەتدا، لەسەر دروستی پەشیمان بوونەوە، تا ماوەی سێ ڕۆژ، ئەم پەشیمان بوونەوەیە هەڵاوێر کرا، لەو یاسا گشتییەی کە لە گرێبەستەکاندا هەیە، کە مامەڵەکار پابەند دەکەن بەمامەڵەکەوە، بە پابەند بوونێکی رەها.

## ٢١١- دووەم: ئیستیحسان بە پێی ئیجماع:

بۆ نموونە گرێبەست لە گەڵ دارتاشو ئاسنگەرو، هەموو ئەو پیشە گەرانەی کە پێشتر مامەڵەیان لە گەڵدا دەکرێت، لەسەر دروستکردنی شتێکی دیاریکراو، لەکاتی گرێبەستەکەدا بوونی نییە، کە ئەم کارە بە ئیستیحسان بە دروست زانراوەو، بە پێی قیاسکردن دروست نییە چونکە گرێبەستە لەسەر شتێکی نادیارو، ئەمەیش بۆیە دروست بووە، چونکە لە یاسایەکی گشتی هەڵاوێر کراوە، و رەهەندو رووی ئیستیحسانە کە لێرەدا ئەوەیە کە ئەم جۆرە مامەڵەیە لەناو خەڵکیدا، و لە نەریتی خەڵکیدا، باوە، و کەس نکۆڵی لێ نەکردووە، و بۆیە ئەمە ئیجماعە.

هەروەها وەك چوونە ناو گەرماوی گشتی بەنرخێکی دیاریکراو، کە یاسای گشتی دژی ئەم کارەیەو بەدروستی نازانێت، چونکە ماوەی مانەوەی کابرا لە گەرماوەکەداو، ئەندازەی ئەو ئاوەی کە لە گەرماوەکەدا بەکاری دەهێنێت نادیارە، بەڵام چونکە لە نەریتدا باوەو، کەس نکۆڵی لێ نەکردووە، ئەوە لە رووی ئیستیحسانەوە دروستەو، لە یاسا گشتییەکان هەڵاوێر دەکرێتو، هەروەها تا سەختی لەسەر شانی خەڵکی لا ببرێتو، دواجار وەك ئیجماعی لێ هاتووەو بۆتە ئیجماع.

## ٢١٢- سێیەم: ئیستیحسان بە پێی عورف:

وەك دروست بوونی ئەو موڵكانەی كە دەكرێت بگوازرێنەوە وەك كتێبو قاپو قاچاغو ئەوانە... كە لە عورفدا وەقف دەكرێن، لەسەر رای گروپێك لە شەرعزانانو بە پێی هەڵوێركردنی ئەم بابەتە لەو یاساگشتییەی كە سەبارەت بە پرسی وەقف هەیە، كە دەبێژێت، دەبێت وەقف شتێكی هەتا هەتایی بێتو، بۆیە وەقف تەنها لە موڵكە جێگیرو نەگواستراوەكاندا دروستە، نەك وەك لە موڵكە گواستراوەكانداو، بەڵگەی دروست بوونی وەقف كردنی ئەو شتە گواستراوەنەی باسمان كردن، تەنها بوونی ئەو شتەیە لە نەریتو عورفی خەڵكیدا.

## ٢١٣- ئیستیحسان بە پێی پێویست بوون:

وەك چاو پۆشی كردن لەپرژەی میز بەسەر پۆشاكداو، هەروەها چاو پۆشی كردن لە زیانمەندی كەم لە مامەڵەدا، چونكە ئەو جۆرە شتانە ئەستەمە مرۆڤ بتوانێت خۆیی لێیان بپارێزێتو، هەروەها بریاردان بە پاكیی ئاوی بیرەكان، هەرچەندپیسایشیان تێ كەوتبێت، بەدەرهێنانی ئەندازەیەكی دیاریكراو لەئاوی ناو بیرەكە، پاك دەبێتەوە، ئەمەیش لەبەر پێویستیو زەرورەت وایە.

## ٢١٤- ئیستیحسان بە پێی بەرژەوەندی:

بۆ نموونە، وەك ئەو كەسەی بەكرێ كارێكت بۆ دەكات، وەك (بەرگدوور)، كە سەبارەت بەو كاڵایەی كە لەلایەتی بۆ دوورین، لەلای ئەو خراپ دەبن، یان تیادەچن، ئەوە بژاردنی لە گەردنیدایە، مەگەر ئەو لەناو چوونە بەهۆی دەسەڵاتێكی باڵای واوە بووبێت، كە خۆلێ پەنادانو خۆ لێ پاراستنی مەحاڵ بوو، هەر چەندە كە یاسای گشتی بریاری لەسەر ئەوە داوە كە ئەو كەسە كرێ وەرگرە، تەنها لە كاتی زیادەرەوی یان خەمساردیدا بژاردنی لەسەرە، چونكە ئەو كەسێكی ئەمینە، و بەڵام زۆرێك لە شەرعزانان وا فەتوایان داوە، كە لەرووی ئیستیحسانەوە، بژاردنی لەسەر واجبە، و هەروەها وەك رەچاوكردنی بەرژەوەندی خەڵكی بۆ پاراستنی موڵكو سامانیان بەهۆی لاواز بوونی پابەند بوون بە پەیمانەكانو بڵاو بوونەوەی ناپاكیو لاوازی هەستی بەرگری ئاینی لەم سەردەمەدا.

## ٢١٥- شەشەم:- ئیستیحسان بە پێی قیاسی شاراوە:

وەك نموونەكەی پێشوو سەبارەت بە وەقفكردنی زەوییە كشتوكاڵییەكان بە بێ هێنانی دەق لە گرێبەستەكەدا لەسەر مافە سازش لەسەر كراوەكان و هەروەها وەك بڕیاردان بە پاكی بەرماوەی ئاو و خواردنی باڵندە ڕاوكەرەكان، جا لێرەدا قیاسی ئاشكرا لەسەر ئەوەیە كە قیاسی كردووە، لەسەر پاشخوانی ئاژەڵی درندەو بەپیسی داناوە، بەڵام دواتر بەقیاسكردنی لەسەر پاشخوانی مرۆڤ بە پاك دانراوە، چونكە ئەم باڵندانە بەدەنوكی خۆیان ئاو دەخۆن، كە ئێسكێكی پاكەو، قیاسێكی شاراوەیەو، بۆیە ئەم جۆرە حوكمە بە ئیستیحسان دانراوە[1].

## - بە بەڵگە بوونی ئیستیحسان :

زۆرێك لە زانایان ئیستیحسانیان بە بەڵگە زانییوەو، داناوەو كاریان پێكردووەو، بە بەڵگەیەك لە بەڵگەكانی ئەحكامیان داناوەو، هەندێكی تر وەك شافعییەكان پێچەوانەی ئەمە بوونو، تەنانەت لە پێشەوا شافعییەوە ئەوە گێڕدراوەتەوە، كە فەرمویەتی: (ئیستیحسان چێژ وەرگرتنەو قسەكردن بە پێی هەواو ئارەزوو)و، هەروەها فەرموویەتی: (هەر كەس ئیستیحسان بكات، ئەوە شەرعی داناوە!)[2].

بەڵام وادیارە، كە بەكار هێنانی زاراوەی ئیستیحسان لەلای هەندێ لە زانایان ئەو مانایەی بۆ دەرخستوون، كە واتای شەرعدانانە بە پێی ئارەزوو، بۆیە نكوڵییان لێكردووەو، حەقیقەتی ئیستیحسان لەلای ئەوانەی كە بڕوایان پێی هەبووە، بۆ ئەو چینە نكوڵی كارە دەرنەكەوتووەو، نەیانزانیوە مەبەستیان پێی چییە؟! بۆیە وا گومانیان بردووە، كە ئیستیحسان شەرعدانانی بێ بەڵگەیە، بۆیە داویانە بەسەریدا، و ئەوەی گوتراوە لەو بارەیەوە گوتویانە، بۆیە ئیستیحسان بە پێی ئارەزوو، بە بێ بەڵگە، بە بێ ڕاجیایی نێوان زانایان بە بەڵگە ئەژمار نەكراوەو، ئەو دژایەتییەی زانایان بۆی، بۆ ئەم جۆرە ئیستیحسانەیە - كە ئەگەر دروست بێت، بە ئیستیحسان ناو زەد بكرێت- نەك بۆ جۆرە دروستەكەی،

---

[1] هەندێك لە زانایان ئەم نموونەیە بۆ ئیستیحسان بە پێی زەرورەت دەهێننەوەو، ئەم قسەیەش ڕەهەندێكی بەهێزی هەیە.

[2] الآمدي ب٤، ل٢٠٩.

چونکە ئیستیحسان لەلای ئەوانەی کە کاری پێ دەکەن، هەر وەك حەقیقەتەکەیمان زانی، تەنها پێش خستن‌و تەرجیحدانی بەڵگەیەك نییە، بەسەر بەڵگەیەکی ترداو، شتی لەم جۆرەیش شیاوی ئەوە نییە، کە ببێتە هۆی ڕاجیایی نێوان زانایانو، (لە ئیستیحساندا شتێکی وا بوونی نییە، کە مافی ئەوەی هەبێت، کە ببێتە هۆکاری ڕاجیایی)[1].

سەرەڕای ئەمانەیش، ئێمە پێمان وایە، کە ئەو حوکمەی کە بە پێی ئیستیحسان، لەسەر بنەمای دەق جێگیر بووە، بە حوکمێکی بەدەق چەسپاو ناوزەدی بکەین، نەوەك بە ئیستیحسان، بەڵام حەنەفییەکان، ئەمە لەڕووی زاراوەوە بە ئیستیحسان ناوزەدی دەکەن، و گرفت لە زاراوەیشدا نییە!

[1] التلويح على التوضيح، ب٢، ل٨١.

# ﴿بەشی شەشەم﴾

## (( بەڵگەی شەشەم: الـمَصلحة الـمُرسلة ))

### ٢١٧- پێناسەی ( الـمصلحة الـمرسلة: بەرژەوەندی ڕەها ):

– بەرژەوەندی (المصلحة): بریتییە لە بەدەستهێنانی سوودو لادانی زیانو خراپەکاری[1]، کە ڕەهەندێکی پۆزەتیفی هەیە، کە بەدیهێنانی سوودوقازانجە، و ڕەهەندێکی نێگە تیفیشی هەیە، کە لادانی زیانو خراپەیە، و جاری وا هەیە کە ((بەرژەوەندی)) تەنها بۆ ڕەهەندو لایەنە پۆزەتیفەکەی (إیجابي) یەکەی، بەکار دەهێنرێت، بەڵام لادانی زیانو خراپەیشی پێوە دەلکێنرێت، هەروەك لە فەرمایشتی شەرعزاناندا هاتووە، کە دەفەرموێت: (لادانی زیانو خراپە لە پێشترە بەسەر هێنانەدی بەرژەوەندیدا)[2].

٢١٨- بەرژەوەندی هەیە، کە شەرع دانی پیاناوەو، هەیانە کە شەرع ڕەتی کردۆتەوەو، هەیانە کە شەرع بێدەنگ بووە، لە سەری، کە یەکەمیان بە (المصالح المعتبرة: بەرژەوەندییە دان پیانراوەکان) دووەمیان: بە (المصالح الملغاة: بەرژەوەندییە ڕەتکراوەکان)و سێیەمیان بە (المصالح المرسلة: بەرژەوەندی ڕەها) ناوزەد کراون.

### ٢١٩- ( الـمصالح الـمعتَبرة: بەرژەوەندییە دانپیانراوەکان )

ئەمانەیش بریتین لەو بەرژەوەندیانەی کە شەرع دانی پیاناونو، کۆمەڵە ئەحکامێکی شەرعییانەی بۆ ئەو بەرژەوەندیانە داناوە کە هۆکارن بۆ گەیشتنمان بەو بەرژەوەندیانە، وەك پاراستنی ئاینو، پاراستنی گیانو پاراستنی ژیریو شەرەفوماڵو موڵکی خەڵکی، کە شەرع هاتووە، جیهادکردنی وەك حوکمێکی شەرعی داناوە، تا بەهۆیەوە ئایینی ئیسلام بپارێزرێت، و کوشتنەوەی بکوژی داناوە، تا بەهۆیەوە گیانی خەڵکی بپارێزرێت لە تیاچوون، و شەلاقدانی داناوە لەسەر کەسێك ئارەق بخواتەوە، تا عەقڵ بپارێزرێت، و شەلاقدانی لەسەر داوێن پیسیو بوختان کردن داناوە، تا ناموسو شەرەفی خەڵك بپارێزرێتو سزای دەست برینی دزی داناوە، تا ماڵو موڵکی خەڵکی بپارێزرێت، لە تیاچوون.

جا لەسەر بنەمای ئەم بەرژەوەندییە دانپیانراوانەداو، پاشان بەستنەوەیان بە

---

[1] المستصفى، ب٢، ل١٣٩.

[2] المصلحة في التشريع الأسلامي، للأستاذ مصطفى زيد، ل٢٠.

عیللەتەکانیانەوە، بە بوون، یان نەبوون لێرەوە قیاس وەك بەڵگەیەك سەرچاوەی گرتووە، بۆیە هەر پێشهاتێك کە شەرع دەقی نەهێنابێت، لەسەر حوکمەکەی و سەرەرای ئەوەیش یەکسان بێت و، هاو وێنەی پێشهاتێکی تر بێت، کە شەرع بەدەق حوکمەکەی درکاندبێت و، عیللەتی حوکمەکەیی ئاشکرا کردبێت، ئەوا لەم حاڵەتەدا پێشهاتە حوکم لەسەر نەدراوەکە پڕاو پڕ وەك حوکمی پێشهاتە دەق لەسەر هاتووەکە وایە.

## ٢٢٠- ((المصالح الملغاة: بەرژەوەندییە ڕەتکراوەکان)):

لە پاڵ بەرژەوەندییە دانپیانراوەکاندا، بەرژەوەندی وەهمی و نا حەقیقی، بە لە پاشتر دانراو، کە شەرع وێڵی کردوون و، لەو حوکمانەیدا کە شەرع دەری کردوون ، دانپیانەنانی ئەو بەرژەوەندییە ڕەتکراوانەی درکاندووە، و هیچ حسابێکی بۆ نەکردوون و، وێنەی ئەمە وەك بەرژەوەندی ئافرەت لەوەیدا، کە یەکسان وەك براکەی بەشە میرات ببات، بەڵام شەرع ئەم بەرژەوەندییەی ڕەتکردۆتەوە، بە بەڵگەی ئایەتی ﴿يُوصِيكُمُ ٱللَّهُ فِىٓ أَوْلَـٰدِكُمْ ۖ لِلذَّكَرِ مِثْلُ حَظِّ ٱلْأُنثَيَيْنِ﴾[1] واتە: خودای گەورە لە میرات بردندا موسڵمانانی ڕاسپاردووە، کە نێرینە دوو ئەوەندەی مێینە بەشە میرات ببات، هەروەها وەك بەرژەوەندی سووخۆر، لەوەیدا کە سامانەکەی زیاددەکات، لە ڕێگای سووخۆرییەوە، کە ئەم بەرژەوەندییە، بەدەق لەسەر حەرامی سووخواردن ڕەتی کردۆتەوە، وەك قورئان دەفەرموێت: (وأحل الله البيع وحرم الربوا)، کە مامەڵەی حەڵاڵ کردووە و، سووخواردنی حەرام کردووە، بۆیە سوو وەك ڕێگایەك بۆ وەبەرهێنانی سامان و زیادکردنی ناشێت.

هەروەها نموونەیەکی تر، وەك بەرژەوەندی ئەوانەی کە ترسنۆکن وجیهاد ناکەن، لەوەیدا کە گیانی خۆیان دەپارێزن لە مەرگ و، تیاچوون کە شەرع ئەم بەرژەوەندییەی ڕەت کردۆتەوە و، ئەحکامی جیهادی هەموار کردوون، کە جیهادەکە لە پێشترە بەسەر خۆ پاراستنەکەی ترسنۆکەکاندا، و ئەم خۆپاراستنە بە لە پاشتر دانراوە، هەروەها چەندەها نموونەی تریش هەن.

پاشان ڕاجیایش لە نێوانیاندا نییە، کە بەرژەوەندییە ڕەتکراوەکان، نابێت حوکمیان لەسەر بنیات بنرێت.

---

[1] سورة (النساء/ ١١).

## ٢٢١- (المصالح المرسلة: بەرژەوەندییە ڕەهاكان):

لە پاڵ بەرژەوەندییە دانپیانراوەكانو بەرژەوەندییە ڕەتكراوەكاندا بەرژەوەندی سێیەمیش هەیە، كە شەرع بەدەق ڕەتكردنەوەیانی نەدركاندووەو، هەروەها دانیشی پیادا نەناوون، ئەمانەیش بریتین لە بەرژەوەندییە ڕەهاكان، لەلای زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ، بۆیە بەرژەوەندین، چونكە سوودو قازانج بەدەست دەهێننو، زیان لادەدەنو، بۆیە (ڕەها كراون)، چونكە شەرع لە ڕوانگەی دانپیانانو ڕەتكردنەوەوە ڕەهای كردوون، كەواتە ئەم جۆرە لە پێشهاتە قسە لەسەر نەكراوەكاندایە، و هەروەها لەوانەدایە كە حوكمێكی هاو شێوەی دەق لەسەر هاتووی نییە، تا قیاسی لەسەر بكەین، بەڵام وەصف گەلێكی گونجاوی وای تیادایە، كە شەرع حوكمێكی دیاری كراوی لەسەر بەرپا بكاتو، ئەم حوكمە دەتوانێت، كە قازانجێك بەدی بهێنێتو، یاخود زیانێك لابداتو دوور بخاتەوە وەك ئەو بەرژەوەندییەی كە هۆكارە بۆ جێ بەجێ كردنی پرۆسەی كۆكردنەوەی قورئانو، كۆكردنەوەی دیوانەكانو، گەرەنتی كردنی پیشە كارانو، كوشتنەوەی كۆمەڵێك كەس لە بەرامبەر كوشتنی تەنها كەسێكدا.

## ٢٢٢- بە بەڵگە بوونی بەرژەوەندییەكان:

لەوەدا ڕاجیایی نییە، لە نێوان زانایاندا، كە لە پەرستشەكاندا، كاركردن بە (المصالح المرسلة) كاری پێ ناكرێت، چونكە كاروباری پەرستش، كۆنكرێتینو شەرع چوار چێوەی بۆ داناونو، بواری ئیجتیهادو ڕەئی تیادانییەو، زیاد لەسەر كردنیشیان، بە بیدعە لە ئایندا دێتە ئەژمارو، بیدعەیش كارێكی سەرزەنشت كراوە، و هەموو بیدعەیەكیش ڕووەو گومراییمان دەبات، و سەرەنجامی گوڕایشو كابرای گومڕا ئاگری دۆزەخە، بەڵام لەپرسی مامەڵەو كڕینو فرۆشتندا، زانایان ڕاجیاییان هەیە، لەسەر ئاستی بە بەڵگە بوونی (المصالح المرسلة)و، ئەژمار كردنی وەك بەڵگەیەك لە بەڵگەكانی ئەحكامو، ئەم ڕاجیاییەش لە پەڕاوەكانی زانستی ئوصولی فیقهدا. بەشێوەیەكی فراوان هاتووەو باسكراوە، بەڵام لە پەڕاوەكانی شەرعدا، بەو بەرفراوانییە نابینین، باس كرابێت! بەڵام ئەوەی دراوەتە پاڵ شەرعزانەكان كە گوایا كار بە (المصالح المرسلة) ناكەن، هەر ئەو زانایانە ئیجتیهادیان هەیە، كە لەسەر بنەمای (المصالح المرسلة) بنیات نراوە، هەروەك لە فیقهی ئیمامی شافعیو حەنەفیدا دەبینین، بەهەرحاڵ ئەوەی كە گومانی تیادانییە، ئەوەیە كە گروپێك لە زانایان نكۆڵییان كردووە، لە بە بەڵگە

بوونی (المصالح المرسلة)، لەوانەیش ظاهیرییەکان، کە نکۆڵی لە قیاس دەکەن‌و، هەروەها قسەیش لە شافعی‌و حەنەفییەکان گێڕدراوەوەتەوە، کە نکۆڵییان لە (المصالح المرسلة) کردووە، بەڵام سەرەڕای ئەوەیش لە پەڕاوە شەرعییەکاندا بەرچاومان دەکەوێت کە ئیجتیهادیان هەن، کە لەسەر بنەمای (المصالح المرسلة) بنیات نراون، وەك دواتریش باسیان دەکەین.

گروپێکی تر لە زانایان، کاریە (المصالح المرسلة) دەکەن‌و، بەڵگەیەکی شەرعی دادەنێن‌و، بەسەر چاوەیەك لەسەر چاوەکانی شەرعدانانی ئەژمار دەکەن‌و، بەناوبانگ ترین ئەو کەسانەی کەبەم ئاراستەیە ناسراوە، پێشەوا مالیکەو دواتر ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلەو، لە نێوان ئەم دوو گروپەیشدا هەن، کە دان بە (المصلحة المرسلة) دا، دەنێن، بەڵام بە مەرج، واتە مەرجی ئەوەی کە ئەو بەرژەوەندییە ڕەهایە، لە گروپی بابەتە ضەروری‌و پێویستەکان بێت، کە لێرەدا زانایان ڕاجیاییان نییە، کە دەبێت لە کاتی زەرورەتدا، کاری پێ بکرێت، وەك ئیمامی غەزالی، کە کاری بە بەرژەوەندی کردووە، بەمەرجی ئەوەی کە (ضەروری: پێویست)و (یەکلایی: قطعي)و (کلية: گشتی) بێت.

لەمەودوا بەڵگەی نکۆڵی کارانی (المصالح المرسلة) دەهێنین‌و، هەروەها بەڵگەی کارکەران پێی دەخەینەڕووو، دواتریش ڕای لەپێشتر (الراجح) لە نێوان ئەم دووڕایەدا، دیاری دەکەین‌و، پاشان هەندێ لەو پرسانە باس دەکەین، کە زانایان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بەرپایان کردوون.

## ٢٢٣- بەڵگەی نکۆڵی کارانی (المصلحة المرسلة)، و توێژینەوەی ئەو بەڵگانە:

ا- خودای کار بەجێ لە دانانی شەرعەکەیدا، ئەو شتانەی کردوون بەشەرع بۆ بەندەکانی، کە بەرژەوەندی ئەوانی تیادایە، بۆیە هەرگیز بەرژەوەندی ئەوانەی لەبیر نەکردووەو، هەرچی بەرژەوەندی هەیە، لە سنوری شەرعدا ڕەچاوی کردوون‌و جێگای کردوونەتەوە بۆیە داننان بە (المصلحة المرسلة)دا، دواجار بەمانای ئەوەدێت، کە شەرع هەندێ لە بەرژەوەندییەکانی بەندەکانی خودای لە بیرکردووەو، حوکم گەلێکی وای دانەناون، کە ببنە هۆکاری هاتنەدی ئەو بەرژەوەندییانە ! و ئەمەیش پێچەوانەی ئەم فەرمایشتەی پەروەردگارە کە دەفەرموێت:

﴿أَيَحۡسَبُ ٱلۡإِنسَٰنُ أَن يُتۡرَكَ سُدًى ﴿٣٦﴾﴾[1] واته ئایا ئادەمی وادەزانێ، کە وازی لێ دەهێنرێ، بە پشت گوێ خراوی‌و بێهودەیی؟و خۆ بەخۆرەهاو بەرەڵاکراو بێت؟!

لە ڕاستیدا، ئەم بەڵگەیە لە ڕووکەشی خۆیدا بەهێزە، بەڵام لە کاتی تێرامان لەسەری‌و سەرنج لێدانی بە لاواز دێتە پێش چاو، لەڕاستیدا شەرع ڕەچاوی بەرژەوەندی بەندەکانی خودای کردووەو، ئەوەندە حوکمی بەر پاکردوون، کە هۆکاری گەیشتن بن، بەو بەرژەوەندییانە، بەڵام لە سەر سەرجەمی بەرژەوەندییەکان‌و، تایبەتمەندیەتی‌و جوزئییەتی ئەو بەرژەوەندییانە بۆ هەمیشەیی‌و تا ڕۆژی دوایی دەقی نەهێناوە لەسەریان‌و، بەڵکو دەقی شەرعی لەسەر هەندێکیان هێناوە، بەڵام لەسەراپای ئەحکامەکان‌و میتۆدەکانیاندا ئاماژەی بەوەداوە، کە بەرژەوەندی، ئامانج‌و مەبەستی ڕەچاوکراوی شەریعەتە، لەبەرپاکردنی ئەحکامەکانداو، ئەم ڕەوشەی شەریعەت – کە نەهێنانی دەقە لەسەر سەرجەمی بەرژەوەندییەکان– لە جوانییەکانی شەریعەتە، نەوەك لەلایەنە نێگەتیڤەکانی‌و، هەر ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر گونجانی‌و شیاوی شەریعەت بۆ مانەوەی بەردەوام و گشتگیری هەمیشەیی، چونکە بەرژەوەندییە تایبەتەکان (جزئیات) دەگۆڕێن، و ئاڵوگۆڕیان بەسەردا دێت، هەرچەندە کە ڕەچاوکردنی ئەم جوزئیاتانە لە بنەمادا چەسپاوەو گۆڕانی بەسەردا نایەت، بۆیە لە تواناداننییەو پێویستیش ناکات، کەهەر لەسەرەتادا سەرجەم بەرژەوەندییە جوزئیەکان ئەژمار بکرێن، و بۆ هەر یەکەیان حوکمێکی تایبەت‌و سەربەخۆ دەربکرێت، لەم ڕوانگەیەوە هەرکات بەرژەوەندییەك قوت بویەوە، کە لە شەرعدا حوکمێکی تایبەتی لەسەر نەهاتبوو، و شیاو گونجاو بوو، لە گەڵ هەڵسوکەوتە شەرعییەکاندا، و هەروەها شیاو بوو، لەگەڵ ئاڕاستەی شەرعدا، لە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکانداو، پێچەوانەی ئەحکامەکانی شەرع نەبوو، ئەوە ئاساییەو دروستە کە حوکمێك بەرپا بکرێت بۆی، کە هۆکاری هێنانەدی ئەو بەرژەوەندییە بێت‌و، ئەمەیش دەست وەردان نییە، لە مافی پەروەردگاردا لە دانانی شەرعدا، کە تەنها ئەو دانەری ڕاستەقینەی شەرعەو تەنها ئەو ئەو مافەی هەیە، و هەروەها بەڵگەیش نییە لەسەر ئەوەی کە خودا بەندەکانی خۆیی لاشەخەر کردبێت، چونکە هەر زاتی پەروەردگارە کە ڕێنموونیمان دەکات بۆ ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکان‌و دەست گرتن پێیانەوە.

ب– بەرژەوەندییەڕەهاکان، لە نێو بەندی بەرژەوەندیی دانپیانراوەکان‌و بەرژەوەندییە

[1] سورة (القيامة/ ٣٦).

ڕەتكراوەكاندان، بۆیە لكاندنیان بە بەرژەوەندییە دانپیانراوەكان ڕاستروو لە پێشتر نییە بەسەر بەرژەوەندییە ڕەتكراوەكانداو، ناكرێت بكرێنە بەڵگە، بە بێ بوونی بەڵگەیەك لەسەر ئەوەی كە لە دانپیانراوەكانە، و سەر بە بەرژەوەندییە ڕەتكراوەكان نییە[1].

ئەم بەڵگەیەش دیسان لاوازە، چونكە ئەو بنەمایەی كە شەریعەتی لەسەر بنیات نراوە، بریتییە لە ڕەچاوكردنی بەرژەوەندی، جا بەرپەرچدانەوەو ڕەتكردنەوەی بەرژەوەندی، حاڵەتێكی هەڵاوێر (إستثناء) كردنە، بۆیە لكاندنی ئەو بەرژەوەندییانەی كە شەرع قسەی لەسەر نەكردوون، و لە ڕووكەشدا چاكنو باشن، لكاندنیان بە بەرژەوەندییە دانپیانراوەكان، لە پێشترە، لە لكاندنیان بەو بەرژەوەندییانەوەی كە ڕەتكراوەن.

ج- دەست گرتن بە بەرژەوەندییەكانەوە، خەڵكانی نەزان چاوقایم دەكات، كە بتوانن ئەحكام گەلی تر دابنێن، بۆیە تێكەڵیو پێكەڵی لە ئەحكامەكانی شەریعەتدا دروست دەبێتو، دەرگا بۆ خەڵكانی ئارەزوو پەرست دەكرێتەوە، لەكەسانی دەسەڵاتدارو قازیو دەستەڵاتداری لەم جۆرەی تر كە ئەوەی دەیانەوێت بەم بیانووەوە بیكەن، بۆیە حوكم لەسەر بنەمای ئارەزووی خۆیان بنیات دەنێن، دوای ئەوەی كە بەرگی بەرژەوەندییان لەبەر كردو، بۆیاخی ئاینیشی دەكەنو، ئەمەیش تانەدانە لە ئاینو، تۆمەتباركردنییەتی بە پاڵپشتی كردنی ستەمكارانو خراپەكاران دەكرێت، بەرپەرچی ئەم ڕەخنەیە بەوە بدەینەوە، كە دەست گرتن بەبەرژەوەندییە ڕەهاكانەوە، پێویستی بە هەڵوێستەكردن هەیەلەسەر بەڵگە شەرعییەكانو دڵنیابوون لەكارپێكردنیانو ڕەت نەكردنەوەیانو، ئەمەیش بۆ كەسانێ كە شارەزانەبن، لەزانستە ئیسلامییەكانو موجتەهید نەبن، كارێكی ئەستەمو سەختە، جا كەنەزانەكان هەر چاو قایم بوون، و ئەمەیان كرد، ئەوا كەسانی خاوەن زانست نەزانییەنەكەیان ئاشكرا دەكەنو بەم هۆیەوە خەڵكی لەخراپەیان دەپارێزرێت، بەڵام دەسەڵاتدارە خراپەكان بە بەستنی دەرگای بەرژەوەندییەكان بە سەریاندا تەمبێ ناكرێن، و ناگەڕێندرێنەوە بۆسەر خەتی شەرع، بەڵكو گەڕاندنەوەی ئەوان بۆسەر ڕێی ڕاست بە هەڵسانی گەلی ئیسلام دەبێت بە ئەركی سەرشانی بەرامبەر ئەو دەسەڵاتدارانە، كە یان دەبێت بیاهێننەوە سەر ڕێی ڕاست، یان لەكاریان بخەن و لەسەر تەختی دەسەڵات لایان ببەن.

---

[1] الآمدي، ئەم بەڵگەیەی لە پەڕاوی (الأحكام)دا، هێناوە، ب٤، ٢١٦.

**٢٢٤- بەڵگەی ئەوانەی کە کار بە (المصالح المرسلة) دەکەن، و دانی پیادا دەنێن:**

أ- شەریعەت تەنها بۆ هێنانەدی بەرژەوەندییەکانی مرۆڤ دانراوەو، دەقەکانی شەریعەتو ئەحکامە جۆراو جۆرەکانی سەلمێنەری ئەم راستیەن، بۆیە کارکردن بە (المصلحة المرسلة) کۆکو تەبایە، لەگەڵ سروشتی مرۆڤ، و ئەو بنەمایەی شەریعەتی لەسەر بنیات نراوە، و هەروەها کۆکە لەگەڵ ئەو مەبەستەیشدا کە شەریعەت لە پێناویدا هاتووە، و بەرپا کراوە.

ئەمەیش قسەیەکی راستەو، ژمارەیەکی بەرچاو لەزانایان دەریان بڕیوە، بۆ نموونە ئیمامی شاطبی دەفەرموێت: شەریعەت تەنها بۆ هێنانەدی بەرژەوەندی بەندەکان هاتووە، لەئێستاو ئایندەداو، هەروەها بۆ لادانی خراپە لەسەریان[1].

هەروەها شەرعزانانی بوێر (عیززی کوڕی عبدالسلام) دەفەرموێت: سەرجەمی شەریعەت بەرژەوەندییە، ئیتر ئەو بەرژەوەندییە یان بۆ لادانی خراپەیە یان بۆ بەدەستهێنانی بەرژەوەندیو چاکەیە[2].

هەروەها پێشەوا ئیبن قەییمی جەوزی دەفەرموێت: بنەماو بنەڕەتی شەریعەت لەسەر حیکمەتو بەرژەوەندی بەندەکان لە دنیاو دوارۆژدا بنیات نراوە، و شەریعەت سەراپای دادگەرانەیەو سەراپای بەرژەوەندییەو سەراپای حیکمەتەو، هەر پرسێك لە دادپەروەرییەوە رووەو ستەم ملی نا، یاخود لە رەحمەتەوە بوو بە پێچەوانەکەی‌و، یان لەبەرژەوەندییەوە بوو بەخراپە کاری، و یان لە حیکمەتەوە بوو بە پوچی‌و بێ ماناییو شپرزەیی، ئەوە ئیتر شەریعەت نییە، هەرچەندە بە راڤەی جۆراو جۆرو دروستکراویش ئاخێنرابێتە ناو شەریعەتەوە، چونکە شەریعەت دادگەری‌و رەحمەتی خودایە، لە نێو بەندەکانیدا، و دروستکراوەکانیدا.

ئینجا جێگیر بوونو چەسپانی دەقەکانی شەریعەت، و رۆشنایی ئەو دەقانە بەڵگەن لەسەر راستی‌و دروستی ئەوەی کە ئەو زانایانە درکاندویانەو دەریانبڕیوە.

٢- بێگومان بەرژەوەندییەکانی خەڵکی‌و ئامرازی گەیشتنیان بەو بەرژەوەندییانە بەپێی بارو دۆخو کات دەگۆڕێتو، ناکرێت پێش رووداوەکان بکەوینو، پێش کاتی خۆی دۆزەکان

---

[1] الموافقات، للأمام الشاطبي، ب٢، ل٦، ٣٧.

[2] قواعد الأحكام، للأمام عز بن عبدالسلام، ب١، ل٩.

یەکلایی بکەینەوەو، ئەو تەنگ پێهەڵچنینو یەکلایی کردنەوەیەی پێشوەخت کارێکی پێویست نییە، چونکە شەریعەت بەڵگەی داوە بەدەستەوە لەسەر ڕەچاوکردنی بەرژەوەندییەکان، بۆیە ئەگەر لەم نێوەندەدا تەنها ئەو شتانەبە دروست بزانین، کە بەڵگەیەکی تایبەت لەسەر دروستییەکەی هاتبێت، ئەوە بە ڕاستی دۆزێکی بەرفراوانمان تەنگو سەخت کردۆتەوەو، بەرژەوەندی زۆری خەڵکیمان تیادا بردووە، و ئەمەیش لەگەڵ گشت گیریو هەمیشەیی بوونی شەریعەتدا ناگونجێت، و دەرەنجامەکەی نادروستە.

٣- موجتەهیدەکانی هاوەڵان (خوا لێیان ڕازی بێت)، و دوای ئەوانیش، لە ئیجتیهادەکانیاندا لەسەر بنەمای ڕەچاوکردنی بەرژەوەندیو بنیات نانی لەسەر ئەو بنەمایە کاریان کردووەو، هیچ کامیشیان نکۆڵییان لەمە نەکردووە، کە ئەمەیش بەڵگەیە لەسەر دروستی ئەو یاسا بنەماییەی، و پێکانی ئەو ئاڕاستە دروستەو، کە دواجار ئەمە بۆتە ئیجماع، جا لەو پرسانەی کە موجتەهیدەکانمان لە چینی پیاو چاکانی ڕابردوو (السلف الصالح) کە هەستاون ئیجتیهادەکانیان لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بنیات ناوەو بەرپاکردووە، وەك کۆکردنەوەی بەشە پەڕاگەندەکانی قورئان لە پەڕاوێکی سەربەخۆداو، دوا جار کۆکردنەوەی سەرجەمی موسڵمانان لەسەر ئەو پەڕاوەو، هەروەها وەك بڕیاردان بەمیرات بردنی ئەو ژنەی کە مێردەکەی بۆیە تەڵاقی داوە، تا میراتی نەداتێ، بەڵام هەر میرات دەبات، وەك ڕەچاوکردنێ بۆ بەرژەوەندی ئافرەتەکە، و هەروەها وەك ئەوەی کە پیشەکاران ئەوەی لەدەستیاندا خراپ دەبێت، لە موڵكو ماڵی خەڵکی لەسەریانە کە بیبژێرن، مەگەر ئەو خراپ بوونو لەناو چوونە بەهۆی شتێکەوە بووبێت، کە لەدەسەڵاتی کابرای پیشەکار زیاتر بووبێت، هەرچەندە دەستی پیشەکاران، دەستێکی ئەمینە، بەڵام لەبەر بەرژەوەندی ئەم حوکمە چەسپێنراوە، تا خەمسارد نەبن، سەبارەت بە پاراستنی موڵكو ماڵی خەڵکیو، لەم بارەیەوەیش پێشەوا عەلی کوڕی ئەبو طالیب دەفەرموێت: (تەنها بڕیارێکی لەم جۆرە هۆکاری چاکسازییە لە نێو خەڵکیدا)[1]، کە پارێزەری بەرژەوەندی ئەوانەو، هەروەها وەك بڕیاری کوشتنەوەی کۆمەڵێك کەس لەجیاتی یەك کەسو، هەر لەم بارەیەوەیش پێشەوا عومەری کوڕی خەطاب چەندەها بڕیاری هەن، کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی مرۆڤەکان بنیاتی ناونو دەری کردوون، وەك بڕیاردان بە سوتاندنی ماڵی

[1] کتاب المالك، للشیخ ابو زهرة، ل٤٠٠.

سەعدی کوڕی ئەبی وەقاص، لەبەر ئەوەی کە لە ماڵەکەیدا کەنارگیری کردبوو لە خەڵکی، و هەروەها تاشینی سەری (نەصری کوڕی حەججاج)، و دوورخستنەوەی لەشاری مەدینە، بەهۆی ئەوەوە کە بەریگرێت، لەشەیدابوونی ژنان پێی، چونکە گەنجێکی زۆر جوان بوو، و ئافرەتان حەیرانی دەبوون، بۆیە پێشەوا عومەر لەترسی ئەم فیتنەیە دوری خستەوە، و هەروەها وەك دەست بەسەرداگرتنی نیوەی ئەو سامانەی کرێکارەکانی خۆی، کە بە هۆی قۆزینەوەی پێگەو دەسەڵاتەکەیانەوە، بەدەستیان هێنابوو، و هەروەها چەندەها جێگای تر هەن، کە زۆر زۆرن‌و، ئەژمار کردن‌و باسکردنیان درێژە دەکێشێ، کە هەموویان تایبەتن بەم بوارە، کە ڕەچاوکردنی بەرژەوەندی مرۆڤەکانە.

## ٢٢٥- قسەی لە پێشتر ((الراجح)) لەم بارەیەوە:

لە پیشاندانی بەڵگەی هەردوو گروپەکەوە، قسەی ئەو گروپە بە لەپێشتر دەزانین، کە دان بە (المصالح المرسلة)دا، دەنێن، و کاری پێدەکەن، و حوکمی لەسەر بنیات دەنێن، و بە یەکێك لە بەڵگەکانی ئەحکامی ئەژمار دەکەن، و بە ڕای ئێمە ئەم سەرچاوەیەی شەرعدانان، سەرچاوەیەکی دەوڵەمەند و بەپیتە، و ئەحکامی پێویستمان فریا دەخات، بۆ ڕووبەڕووبونەوەی بارودۆخە گۆڕاوەکانی ژیان، بە بێ دەرچوون لە سنووری میتۆدەکانی شەریعەت و زیادەڕەوی کردن بەسەر ئەحکامە قەطعی یەکانیدا، بەڵام سەرەڕای ئەمەیش، ئەم تەرجیح دانەی ئێمە بەشێوازێکە کە هەرکات کۆڕابوونی موجتەهیدەکان هاتەدی، ئەوا گەڕانەوەو پەنابردنە بەر ئەم بەرژەوەندییە دەبێت، بە شێوەیەکی دەستە جەمعی بێت، نەك بە تاك لایەنانە.

## ٢٢٦- مەرجەکانی کار کردن بە ((المصلحة المرسلة)):

زۆرینەی ئەو شەرعزانانەی کە کار بە (المصلحة المرسلة) دەکەن، مالکییەکان، کە هەر ئەمانیش کۆمەڵێك مەرجیان بۆ داناوە، کە دەبێت لە (المصلحة المرسلة)دا، بێنەدی، تا بکرێت‌و بگونجێت پشتی پێ ببەسترێت‌و متمانەی بخرێتەسەر و ئەو مەرجانەیش بریتین لە:

**یەکەم:** گونجاوی‌و شیاوی، واتە دەبێت ئەو بەرژەوەندییە گونجاوو شیاو بێت، لەگەڵ ئامانجەکانی شەریعەتدا، پێچەوانەی هیچ بنەمایەك لە بنەماکانی شەریعەت نەبێت‌و دژی بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی ئەحکام نەبێت، بەڵکو دەبێت لە جینسی خودی ئەو بەرژەوەندییە بێت، کە شەرع مەبەستی بووە بێتەدی‌و، یاخود نزیك بێت لەو مەبەستەوە‌و، نامۆ نەبێت پێی.

دووەم: دەبێت لەخودی خۆیدا لەگەڵ ژیریدا بگونجێت، بە جۆرێك کە خرایە بەردەم عەقڵەساغەکان، وەری بگرن.

سێیەم: دەبێت کارکردن بە (المصلحة المرسلة)، لەبەر پاراستنێکی زۆر پێویست بێت، یاخود بۆلادانی نارەحەتییەك بێت، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَمَا جَعَلَ عَلَيْكُمْ فِي الدِّينِ مِنْ حَرَجٍ﴾[1] واتە: خوای پەروەردگار لە ئاینی ئیسلامدا هیچ سەختیو دژوارییەکی لەسەر شانتان دانەناوە[2].

لە راستیدا ئەم مەرجانە کۆمەڵە یاساو رێ و شوێنێکن بۆ (المصلحة المرسلة) کە دەیپارێزن، لە هەڵخلیسکانی حەزەکانو داواکارییە نادروستەکانی دەروون، بەڵام پێویستە کە دوو مەرجی تری بۆ زیاد بکرێن، لەوەی کە ئەو بەرژەوەندییەی کە بەشەرعکردنی حوکمەکەی لەسەر بنیات دەنرێت دەبێت

بەرژەوەندییەکی راستەقینە بێ، و خەیاڵی نەبێ، و دەبێت بەرژەوەندییەکە گشتی بێت، نەوەك تایبەت، واتە حوکمەکە لە بەرژەوەندی گشتی بەرپا بکرێت، نەوەك لە بەرژەوەندی تاکەکەسێکی دیاریکراو یان گروپێکی دیاریکراو.

## ٢٢٧- هەندێ لەو ئیجتیهادانەی کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی بەرپاکراون:

لەمەزهەبە جۆراو جۆرەکانی ئیسلامدا، ئیجتیهادی زۆر هەن، کە لەسەر بنەمای بەرژەوەندی رەها بنیات نراون، لەوانە:

زانایانی مەزهەبی مالکی وا فەتوایان داوە، کە دروستە، ئەگەر موجتەهید بوونی نەبوو، باشترین کەسی ناو غەیرە موجتەهیدەکان وەك پێشەوا دیاری بکرێتو هەروەها سەرەرای بوونی کەسی خاوەن شکۆ، بەدروستیان زانیوە، کە بەیعەت بدرێت، بەکەسێکی ئاسایی، بێ شانو شکۆ، هەروەها دروستی دانانی باج لەسەر دەوڵەمەندەکان، ئەگەر گەنجینەی گشتی (بیت المال) خاڵی بوو، و ئەوەی تیایدا بوو بەشی خەرجییە پێویستیەکانی دەوڵەتی نەدەکرد، وەك بەرێکردنی پێداویستی سەربازەکان، ئەم باجە تاکاتێکە کە سامانو دارایی لە

---

[1] سورة (الحج/٧٨).

[2] الأعتصام، للأمام الشاطبي، ب٢،ل٣٠٧-٣١٢.

(بێت المال)دا، زیاد دەکاتەوە، یاخود بەشی خەرجییەکانی تێ دێتەوە[1]، و هەروەها بەدروستیان زانیوە، کە منداڵان ببنە شایەت بەسەر یەکترییەوە، لەبریندارکردنی یەکتریدا، لەبەر بەرژەوەندی، چونکە عادەتەن یاری منداڵان خۆیان زیاتر ئاگادارن پێی، و کەمتر خەڵکی تر دەیانبینێت، هەرچەندە مەرجی باڵغ بوون تیایاندا نەهاتۆتەدی، کە لەمەرجەکانی بوونی عەدالەتە، لەکەسی شایەتدا[2]،و شافعییەکان دەفەرموون: دروستە ئەو ئاژەڵانە لەناو ببرێن، کە بێ باوەڕان بە سواری ئەو ئاژەڵانەوە لەگەڵ مسوڵمانان دەجەنگێن، و هەروەها دروستە دارو درەختیان لەناو ببرێت، ئەگەر پێداویستی جەنگو زەفەر بردن بە دوژمنانو سەرکەوتن بەسەریاندا ئەمەی دەخواست[3].

پاشان لە لای حەنەفییەکان، دروستە کە ئەوەی موسڵمانان لە جەنگدا دەیگرنو، ناتوانن، لەگەڵ خۆیان ببەن، بیسوتێنن، لەکەل و پەلو ڕانەمەڕ، جا مەڕەکان سەردەبڕنو گۆشتەکەیان دەسوتێننو، هەروەها کەلو پەلەکان دەسوتێنن، تا دوژمنان سودی لێ وەرنەگرن[4].

پاشانیش یەکێك لەجۆرەکانی (ئیستیحسان)، لەلای حەنەفییەکان، بریتییە لە ئیستیحسانی بەرژەوەندی، واتە لەبەر بەرژەوەندییەك بەچاكو باش دانراوە، کە پێشتر قسەی لەسەر کرا.

هەروەها پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل، فەتوای داوە، بەدەرکردنو دوورخستنەوەی خەڵکانی گەندەڵو خراپەکار بۆ جێگایەك، تاخەڵکی لە خراپەکارییان پارێزراوبێو، هەروەها فەتوای داوە، بە دروستی تایبەتکردنی دیاری بە هەندێ لە منداڵانییەوە، لە لایەن باوکیانەوە، لەبەر بەرژەوەندییەکی دیاریکراو، وەك ئەوەی کە خەڵاتکراوەکە نەخۆشبێت یان هەژار بێت، یان خێزانو کڵفەتدار بێت، یاخود قوتابی زانستی شەرعی بێت[5].

شەرعزانانی مەزهەبی حەنبەلی دەڵێن، دەسەڵاتداری سەردەم بۆی هەیە، کە بەتۆبزی کەسانی قۆرخکار ناچار بکات، کە ئەو شتەی قۆرخیان کردووەو، (إحتكار)یان کردووە، بەنرخی بازاڕ بیفرۆشنەوە، لە کاتی پێداویستی خەڵکدا بەو شتە قۆرخ کراوەو، هەروەها

---

[1] مالك، للشيخ أبو زهرة، ل٤٠٢.

[2] بداية المجتهد، ب٢، ل٣٨٤.

[3] الأشباه والنظائر، للأمام السيوطي، ل٦٠-٦١.

[4] الرّد على سير الأوزاعي، للأمام أبي يوسف، ل٣.

[5] المغني، ب٦، ل١٠٧.

لەسەریەتی کە کەسانی پیشەکارو خاوەن پیشە سازی کە خەڵکی پێویستی بە پیشەو کاروبارەکانیان هەیە، ناچار بکات، کە لە کاتی مانگرتنو کارنەکردنیاندا، بە نرخی بازاڕدەست بکەنەوە بەکار کردنو بەزۆر ئەم کارەیان پێ بکات دروستە[1]، و هەروەها هەرکەس پێویستی بەوە هەبوو، کە ئاوی زەوییەکەی، لەزەوی کەسێکی ترەوە ببات، بەبێ ئەوەی زیان بگەیەنێت، بەزەوی کەسی دووەم، ئەوە دەبێت بیبات، هەرچەندە بەزۆریش بێتو، کابرای دووەم ناچار بکرێت ڕێگا بدات، کە ئاوەکە ببرێتو، ئەمەیش لە پێشەوا عومەری کوڕی خەطابەوە گێڕدراوەتەوەو، پێشەوا ئەحمەدی کوڕی حەنبەل لە یەکێك لە دوو گێڕانەوانەی لەوەوە بەدەستمان گەیشتوون، کاری پێکردووە، و گروپێك لە حەنبەلییەکانیش کاریان پێ کردووەو، هەر ئەمەیش ئەو دەرەنجامە دروستەیە، کە دەبێت ئێمە بەرەو ڕووی بڕۆینوکاری پێ بکەین، و کار پێکردنیشی پێویستە، چونکە تاکرەویو یەکلایەنەیی لەبەکار هێنانی حەقدا، لە شەریعەتی ئیسلامدا قەدەغەیەو، ئەم پرسەی باسمان کرد، یەکێکە لە ڕاهێنانەکان لەسەر ئەو یاسا بنەڕەتییە و فەتوای تری حەنبەلییەکان وەك، ئەوەی کە گوتویانە، هەر کەس بەناچاری ڕۆیشتە ماڵ و خانووێ کەسێکەوە نیشتەجێ بوو، کە کەسی تری تیادا نەبوو، و خانووەکەیش فراوان بووو، جێگای لێقەوماوەکەو خاوەن خانووی بەئاسانیو فراوانی تیادا دەبوویەوە، ئەوە لەسەر کابرای خاوەن ماڵ پێویستە کە بەنرخی کرێ خانووی هاو وێنەی ئەو کاتە بیداتە بەوکەسە ناچارو لێقەوماوە، ئەمە لەسەر ڕای گروپێك لە شەرعزانانی مەزهەبی حەنبەلی، و لەسەر ڕای هەندێکی تریان دەبێت، هەر بێ بەرامبەر خانووەکە بدات بە کابرای لێقەوماو[2].

---

[1] الطرق الحكيمة، ل٢٢٢، ٢٢٦.

[2] الطريق الحكيمة، ل٢٣٩-٢٤٠.

# ﴿بەشی حەوتەم﴾

## بەڵگەی حەوتەم - ( سدالذرائع: ڕێگرتن لەحەرام )

(الذرائع)، بەمانای ئامڕازەکان دێت، و (الذريعة)، بریتییە لەو ئامڕاز و ڕێبازەی کە دەتگەیەنێت بە شتێك، ئیتر ئەو شتە گەندەڵی هێنەرو خراپ بێت، یان باش و بەرژەوەندیدار بێت، چونیەکە، و دیسان زارەکی بێت، یان کرداری هەر چونیەکە، بەڵام زیاتر ناوی (الذرائع) بەکار دەهێنرێت، بۆئەو ئامرازانەی کە دەمانگەیەنن بەشتەخراپەکان، جا کە گوترا، (فلانەشت سەر بەسد الذرائع)ـە، مانای ئەوەیە کە سەر بەودەروازەیەیە کە ڕێگری دەکات، بەگەیشتن بەشتە خراپەکان.

٢٢٩- هەروەها ئەو کردارانەی کە هۆکارن بەگەیشتن بەشتە خراپەکان (المفاسد)، یان ئەوەیە کە هەر لەخودی خۆیاندا خراپو حەرامن، یاخود ئەوەیە کە هەر لەخودی خۆیاندا موباحو دروستو ڕێگە پێدراون، جا ئەوانەی یەکەم هەر سروشتیان وایە، کە دەبنە هۆکاری شەڕو زیانو خراپە وەك ئەوەی کە خواردنەوەی ئارەق، هۆکارە بۆ خراپ بوونی عەقڵو، بوختان کردن شەرەفو ناموسی خەڵکی لەکەدار دەکاتو، داوێن پیسی هۆکارە بۆ تێکەڵبوونی سپێرمی مرۆڤەکانو دواجار تێکەڵ بوونی وەچەکان.

ئینجا ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا نییە، کە سەراپایان ڕێگرن لەم جۆرە کارانەو، لە ڕاستیدا ئەمانە ناچنە نێو بازنەی ئەو (سد الذرائع)ـەی، کە ئێمە قسەی لەسەر دەکەین، چونکە هەر لە خودی خۆیاندا حەرامن، بەڵام کردەوە موباحە ڕێگەپێدراوەکان کە هۆکارن بۆ خراپە کاری، دەبنە چەند جۆرێکەوە :

- **جۆری یەکەم:**

ئەوەی کە هۆکار بوونی بۆ خراپە، دەگمەنو کەمە بۆیە ڕەچاو کردنی لەلایەنی بەرژەوەندییەکەی لەپێشترە و گرتنەبەری لایەنە خراپەکەی خراوەتە دواترەوە، وەك سەیرکردنی ئافرەتێك کە دەتەوێت، بیخوازیت، هەروەها سەیرکردنی ئەو ئافرەتەی کە شایەتی لەسەر دەدرێتو، ناشتنی ڕەز و مێو، بۆیە ئەم جۆرە کردەوانە قەدەغەنەکراون، بە بەڵگەو بیانووی ئەو شتە خراپانەی کە دەگونجێت لەکردنیاندا بەرپابن چونکە خراپەی

ئەمانە، لەناو بەرژەوەندیو چاکە بەلەپێشتر دانراوەکەیاندا شاردراوەتەوەو، ئاراستەی دانانی ئەحکامە شەرعییەکان، بەڵگەن لەسەر ئەم ڕاستیەو ڕاجیاییش لەم بارەیەوە لە نێوان زانایاندا نییە، جا بۆیە شەرع هەواڵدانی ئافرەتی لەسەر تەواو بوونی ماوەی بێ نوێژی یان تەواو نەبوونی وەرگرتووە، سەرەڕای ئەوەی کە بۆی هەیە، ڕاست نەکاتو، هەروەها شەرع دانی ناوە، بە بڕیاردان لە سەر وەرگرتنی قسەی شایەت، سەرەڕای ئەوەی کە بۆی هەیە، درۆ بکات، و هەروەها هەواڵو قسەی تەنها کەسێکی دادگەری وەرگرتووە، کە بۆی هەیە، پلەی لەبەر کردنیشی باش نەبێت، بەڵام لەبەر ئەوەی کە ئەم ئەگەرانە بە لەپێشتر دانەنراون، بۆیە شەرع گوێی پێ نەداونو کاری پێ نەکردوون.

## – جۆری دووەم:

ئەو شتانەی کە ئەگەریان زیاترە، ببنە هۆکاری خراپەو، لایەنی خراپەیان زاڵترە، بەسەر لایەنی بەرژەوەندیو چاکەکەیاندا وەك فرۆشتنی چەك لەکاتی ئاژاوەداو، بەکرێدانی خانووبەرە بە کەسێك کە بۆخراپەو حەرام بەکاری دەهێنێ، وەك ئەوەی کە بیکات بەجێگای قومار کردنو، جنێودان بەخودای هاوەڵ بڕیار دەرەکان، لەکاتی ئامادە بوونی کەسێك لەو هاوەڵ بڕیاردەرانە کە بەوە ناسرابێت، کە ئەو جنێوەی بیست، ئەویش جنێو بەخودای مەزن (عزوجل) بدات، و هەروەها وەك فرۆشتنی ترێ بەکەسێك کە وا ناسراوە ئارەقی لێ دروست دەکات، و ئەوە پیشەیەتی!

## – جۆری سێیەم:

ئەوەی کە دەبێتە هۆکاری خراپە، بەهۆی ئەوەوە کە ئەو کەسە موکەللەفە ئەو جۆرە شتە بەکار دەهێنێت، لەغەیری جێگای خۆیدا، و دەرەنجام خراپە بەم هۆیەوە بەرپا دەبێت، وەك ئەو کەسەی کە ئافرەتێك مارە دەکات، و ئەم مارەکردنە دەکاتە هۆکار، بۆ حەڵاڵ بوونەوەی ئەو ژنە لەمێردە پێشووەکە، کە بە هۆی تەڵاقدانی سێ بەسێ تەڵاقی داوە، یاخود وەك ئەوەی کە کەسێك مامەڵەکردن دەکاتە هۆکارو ئامراز بۆ گەیشتن بە سووخواردن، وەك ئەوەی کە کەسێك پاڵتاوێ بە هەزار (درهەم بێت، یان دینارو، دۆلار) بفرۆشێت، بەپارەی قەرز کە دواتر بیدات، و پاشان لە کابرای کڕیاری بکڕێتەوە، بە نۆ سەدی حازر، کە لەم حاڵەتەدا لایەنە خراپەکەی کارەکە بە لەپێشتر دانراوە.

**٢٣٠– ڕاجیایی نێوان زانایان لەسەر دەستگرتنو کارکردن بە (سد الذرائع):**

لەسەر کردەوەی دووجۆرەکەی دووەمو سێیەم ڕاجیایی تێکەوتووە، کە ئایا لەبەر ئەوەی

که دەبنە هۆکاری خراپە، ئیتر قەدەغە دەبن، یان نا.....؟!

حەنبەلییەکان‌و مالکییەکان دەڵێن: قەدەغە دەکرێن‌و غەیری ئەمانە وەك شافعی‌و ظاهیرییەکان، دەڵێن:قەدەغە ناکرێن[1].

بەڵگەی ئەم گروپە ئەوەیە کە ئەم کردەوەگەلە حەڵاڵن‌و، قەدەغە ناکرێن، بەهۆی ئەگەری بوونە هۆکاریان بۆ خراپەکاری.

ئینجا بەڵگەی گروپی یەکەم: ئەوەیە کە (سد الذرائع) بنەمایەکە لە بنەماکانی شەرعدانان‌و، خۆرسکە، و لەسەر پێی خۆی وەستاوەو، بەڵگەیەکی باوەڕ پێکراوە، لە بەڵگەکانی ئەحکام، کە بنیاتی ئەحکامی لەسەر دەنرێت، جا مادام کردەوەکە زیاتر دەبێتە پاساو بۆ خراپەکاری و شەریعەتیش بۆ ئەوە هاتووە، کە رێگری لە خراپە بکات‌و، دەرگاو دەروازەکانی خراپەکاری دابخات، بۆیە هەر دەبێت ئەو کردەوەیە قەدەغەبکرێت، بۆیە ئەم گروپە تەماشای ئامانج‌و مەبەست‌و دەرەنجامی ئەم کردەوانەیان کردووە، بۆیە گوتویانە کە قەدەغەن‌و، بە موباح ئەژماریان نەکردوون، بەڵام گروپی دووەم تەماشای لایەنی موباح بوونی کردەوەکانیان کردووە، و گوێیان بە دەرەنجامەکەی نەداوە، و هەر بە هۆی ئەم بەڵگەیەشەوە بە قەدەغەیان نەزانیوە، و ئەوەڵۆڵەتە گشتییەی شەرعیان وەرگرتووە، کەلەم بارەیەوە هاتووە، و وەرگرتنەکەیان بە ڕاستر داناوە بەسەر ئەو زیانەدا کە بۆی هەیە، بە هۆیەوە ڕووبدات‌و بەرپا ببێت.

ڕای گروپی یەکەم، کە قەدەغەکارەکانن، بەهێزترە چونکە ئامرازەکان کاتێك حساب بۆکراوان، کە هاوشان‌و گونجاو بن، لەگەڵ ئامانجەکاندا‌و (ئیبن قەیمی جەوزی)، لەم بارەیەوە دەڵێت: لەبەر ئەوەی کە تەنها لە ڕێگای هۆکارەکان‌و ڕێبازەکانەوە دەتوانین بگەین بەئامانجەکان، بۆیە کەواتە ئامرازو ڕێبازەکانی ئامانجەکانیش پاشکۆی ئامانجەکانن‌و، لەوەوە پلەی حساب بۆ کردن وەردەگرن، و لەم ڕوانگەیەوە ئامرازەکانی حەرامیی‌و سەرپێچی کردن، لە کەراهەت بوونیاندا، پەیرەوی لە ئامانجەکان دەکەن‌و، بۆیە قەدەغەکردنیشیان هەر لەسەر بنەمای لێژبوونەوەیانە بۆلای ئامانجەکان‌و ئاستی پەیوەندییان بەو ئامانجانەوە دەبێت‌و، هەروەها ئامرازەکانی گوێڕایەڵی خودای گەورەو، نزیك کەوتنەوە لێی‌و، خۆشوسیتنی‌و دروست بوونی ئەمە بەپێی ئاستی دەگەڵ کەوتنی ئەم

---

[1] الأم، للامام الشافعي، ب٣،ل٦٩، بدايةالمجتهد، ب٢، ل١١٧-١١٩ المغني ب٤، ل١٧٤و دواتر، المدونة الكبرى، ب٢، ل١٧١، وب٣، ل٣٩٩، مختصر الطحاوي، ل٢٨٠.

ئامرازانەیە بۆلای ئامانجەکانیان، وەك چۆن کە ئامرای گەیشتن بە هەر مەبەستێك، پاشکۆی ئەو مەبەستەیەو، هەردووکیشیان هەر مەبەستن، بەڵام ئەو شتەی کە مەبەستەکەمان بووە، هاوشانو هاو ئاستی هەیە، لەگەڵ ئامانجەکاندا، و پاشان ئامرازی کارە مەبەستەکەمان، هاوشانە لەگەڵ ئامانجی ئامرازەکاندا[1].

## ٢٣١- قسەی لە پێشتر((الراجح)) لەم بارەیەوە:

ئەوانەی کە (سد الذرائع)، یان وەك بەڵگەیەکی سەربەخۆ لەناو بەڵگەکانی ئەحکامدا ئەژمار نەکردووە و دانەناوە، و بەڵگە بەوە دەهێننەوە کە کردەوە مادام موباح بوو، ئیتر قەدەغەکردنی دروست نییە، بە بیانووی ئەگەر دانان بۆ ئەوەی کە گوایا سەری لەخراپەوە دەردەچێت، چونکە ئەم گەڕانە بۆی هەیە بێنەدیو بۆیشی هەیە، کە نەیەنەدیو، سەر بەپێی گومانەکانن، و گومانیش کاریگەری لەسەر ڕاستی و حەقیقەت دروست ناکاتو، لەڕاستیدا ئەم بەڵگەیە لاوازە، بێگومان ئێمە گوتمان، کە ئەگەری ڕوودانی خراپە، ئەگەر دەگمەنو کەم بوو، یاخود بۆی هەبوو ڕووبداتو، لایەنی ڕوودانی خراپەکە زاڵتر بوو، بەسەر لایەنی ڕوونەدانیدا، ئەمانە نابنە پاساوی قەدەغەکردنی کردەوەکەو، ئێمە قسەمان لەسەر ئەوەیە کە ئەگەری ڕاپێچ بوونی ڕووەو، خراپە، ئەگەرێکی زۆرو بەهێز بێت، کە لایەنی زۆری گومانی مرۆڤ بەو لایەدا بڕوات، کە کەوتنە ناو خراپەکەوە زاڵترە، و گومانی لە پێشتر (الراجح)، واتە، گومان زیاتر بە لای ئەوەدا بوو کە ئەو کردەوەیە سەری لە خراپەوە دەردەچێت، ئەمە لە ئەحکامە شەرعییە کردارییەکاندا بڕواپێکراوە، و بۆ چەسپاندنیان لایەنی یەقین بوون، بە مەرج نەگیراوە، هەروەك پێشتریش لەو ئەحکامانەیدا کە شەرع لەسەر بنەمای گومانی زیاد (الظن الغالب) بنیاتی ناون نموونە گەلێك باسکران، وەك لەوەرگرتنی هەواڵو فەرموودەی تاکە کەسو، شایەتیدانو، هەواڵدانی ئافرەت خۆی، لەسەر تەواوبوونی کاتی بێ نوێژیو عیددەکەیو، ئەم ئەحکامانەیش بۆیە، بەرپاکراون، بۆ هێنانەدی ئەو بەرژەوەندییەی مرۆڤەکان، (کە بە لایەنی لەپێشتر بە بەرژەوەندی دانراون، کە بۆی هەیە، وانەبێت، بەڵام لایەنی بەرژەوەندی بوونەکەی زاڵترە)، جا سەر ڕای ئەوەی کە لەم بەرژەوەندییانەدا بۆی هەیە، خراپە هەبێت، بەڵام ئەگەرەکەی لاوازە، واتە بوونی بەرژەوەندییەکە (راجح)ـە، و بوونی خراپەکە (مرجوح)ـە، چونکە بۆی هەیە، کە کابرای هەواڵدەر، لە فەرموودەی ئاحاددا، درۆی کردبێتو، ئەگەری هەیە کە شایەتە کە درۆی

---

[1] إعلام الموقعين، ب٣، ل١١-١٢.

کردبێت، یان ئافرەتەکە لە هەواڵدانی بە تەواوبوونی عیددەکەی درۆ بکات، و دواتر باسی ئەو بڕیارانە دەکەین کە شەرع دەری کردوون‌و، کردوونی بەیاسا، بۆ لادانی ئەو خراپەیەی کە ئەگەری ڕوودانی هەیە، ئەمەیش لە کاتی باسکردنی بەڵگەی گروپەکەی تردا باس دەکەین.

پاشان بەڕاستی ڕەوا نییە، کە شەرع شتێك حەرام بکات‌و، دواتر هۆکارو ئامرازەکانی ڕێگا پێ بدات، و دواجار کردەوەکە حەڵاڵ ببێت، یاخود ئەو ئامرازانە لەسەر موباح بوونی ئەسڵی خۆیان بهێڵێتەوە، کەواتە لەم حاڵەتەدا مەرجی موباح بوونی هەر شتێك ئەوەیە کە ڕووەو خراپەیەك مل نەنێت، کە گومانی ڕوودانی ئەو خراپەیە لە کردنیدا زیاتر بێت، بەسەر لایەنی ڕوونەدانیدا، جاکە بە ڕەچاوکردنی مەرج گەل‌و بارو دۆخێکی تایبەت، بوویە هۆکار بۆ ڕوودانی خراپەیەکی لەم شێوازە، ئەوا لەم حاڵەتەدا قەدەغە دەکرێت، و حەرام دەبێت، بۆ نموونە مامەڵە کردن موباحە، بەڵام لەکاتی بانگدان بۆ نوێژی جومعە حەرامەو، هەروەها جنێودان بەخودای هاوەڵ بڕیاردەرەکان موباحە، بەڵام قەدەغە دەبێت، ئەگەر هاتوو، بوویە هۆی جنێودان بە خودای مەزن (جل وعلا)، هەروەك پێشتریش گوتمان‌و، هەروەها بڕینی دەستی دز پێویستە، بەڵام دەبێت لەکاتی شەڕو جیهاددا دوا بخرێت، پێغەمبەر (ﷺ) دەفەرموێت: (لاتقطع الأيدي في الغزو: دەستی دز لەکاتی جەنگ‌و جیهاددا نابڕدرێت) تا نەبێتە بیانوو، بۆ کابرای دزەو ڕابکات بۆ ناو ڕیزەکانی دوژمن‌و، هەروەها خەڵات‌و دیاری موباحەو، تەنانەت سوننەتیشە، کە لە فەرموودەدا هاتووە دەفەرموێت: (تهادوا تحابوا) خەڵات‌و دیاری یەکتری بکەن، ئەمە دەبێتە هۆکاری خۆشەویستی لە نێوانتاندا، بەڵام خەڵاتی قەرزار بۆ خاوەن قەرز قەدەغەیە، ئەگەر پێشتر نەریتی ئەو خەڵاتکردنە لە نێوانیاندا نەبووبێت، تاوەك‌و ئەمە نەبێتە هۆی پاساو بۆ خراپەیەك، کە سووخۆرییە، و هەروەها بەرگرتن لە خراپە ئەرکە، بەڵام ئەگەر بوویە هۆکاری خراپەی گەورەتر، ئەوە دەست لێهەڵگرتنی دروستە.

٢٣٢- لەسەرڕاپای ئەم درێژە باسەوە، دەرکەوت کە ئەسڵ‌و بنەڕەتی (سد الذرائع)، و ئەژمار بوونی وەك بەڵگەیەك لەبەڵگەکانی ئەحکام ڕاستییەکی وەرگیراو و دانپیانراوە، چونکە بنەمایەکە کە قورئان‌و سوننەت، لەسەر بڕوا پێکراوییەکەی کۆکن، لەو بەڵگانە[1]:

---

[1] بڕوانە إعلام الموقعين، ب٣، ل١٢١-١٤٠.

١- خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقُولُواْ رَٰعِنَا وَقُولُواْ ٱنظُرْنَا ﴾[1] واتە: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە، لەکاتی قسەکردن لەگەڵ پێغەمبەردا (ﷺ) مەڵێن، (رَٰعِنَا )، بەو مانایە کە گوایا باش گوێبیستمان بە، تا ئێمە مەبەستی خۆمانت پـێ ڕادەگەیەنین، تۆیش وەری بگریت، چونکە ووشەی (راعنا) هـەر لـەو ووشـەیە دەچـێت، کـە جولەکە بۆمانای بـەدکارو لای خۆیـان بـەکاری دەهێنن، چـونکە بـە زمـانی عیـبری جولەکـە (راعِنو) واتە، ئەی بەدکارو ساویلکەو، لە جیاتی ئەوە بڵێن، (أنظرنا، تەماشامان بکـە)، یـان (اسمعوا: هۆشت پێمانەوە بێت)!

کەلەم ئایەتـە پـیرۆزەدا، خـوای پـەروەردگار ڕێگـری کـردووە، لـە بـاوەڕداران، کـە بڵـێن، (رَٰعِنَا )، هەرچەندە نیازیـشیان بـاش و پـاك بێـت، ئەمـە وەك بـەرگرتنێك بـۆ ئـەو بیـانوو پاساوەی کە هاو لێکچوون دروست دەکات، لەگەڵ جولەکەکان، کە مەبەسـتیان بـەدەربڕینی ئەم ووشەیە، جنێودان بوو، بە پێغەمبەری ئازیز (ﷺ).

٢- حەرامکردنی دڵۆپێك لە ئـارەق، بـۆ ئـەوەی نەبێتـە بیـانووو پاسـاو بـۆ خواردنـەوەی قومێكو، خواردنەوەی قومێکیش پاساوە بـۆ خواردنـەوەی ئەوەنـدە ئـارەق کـە بخۆرەکـەی سەرخۆش بکاتو، دواجار بکەوێتە نـاو حەرامـەوە، هەربۆیـەش لـە فـەرمودەدا هـاتووە، کـە دەفـەرموێت: «مَـا أَسْـكَرَ كَـثِيرُهُ، فَقَلِيلُـهُ حَـرَامٌ»، ئـەوەی خواردنـەوەی زۆرەکـەی مرۆڤــ سەرخۆش بکات، کەواتە کەمەکەیشی هەر حەرامەو، هۆکارەکەیشی ئەوەیە کە گوتمان.

٣- حەرامی مانەوە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا و لـە چـۆڵەوانیدا، بـۆ ئـەوەی سـەری لـە حەرامەوە دەرنەچێت.

٤- حـەرامی گرێبەسـتی هاوسـەر گـیری، لـە کاتێکـدا کـە ژنەکـە لـە عیـددەدا بێـت، هەرچەندە پرۆسەکەیش دوا بکەوێت، ئەمـەیش وەك بـەرگرتنێك بـۆ پاسـاوی گواسـتنەوەیو چوونە لای پێش تەواو بوونی عیددەکەی.

٥- پێغەمبەر (ﷺ) ڕێگری کردووە لە کۆکردنەوەی نێوان قەرزی ڕابردووی بێ سوو، لەگـەڵ مامەڵەدا، تا کۆکردنەوەیان نەبێتە هۆکاری پاساو پەیدا بوون بۆ سووخۆری.

٦- شەرع قەدەغەی کردووە، کـە کاربەدەسـتانو قـازیو دادوەرەکـان خـەڵاتو دیـاری وەربگرن، لەو کەسانەی کە نەریتیان وا نەبووە، کە پێشتر خـەڵاتو دیاریـان دابێـت، تـا ئـەو خەڵاتو دیاریانە نەبنە پاساو بۆ لایەنگیری نادروستی کابرای خەڵاتکارو خۆشەویست بـوونی

---

[1] سورة (البقرة/ ١٠٤).

لای قازیو کاربەدەستەکان.

٧- ئەو ئافرەتە تەڵاقدراوەی کە کابرا بۆیە تەڵاقی داوە تا لە میرات پێدانی خۆی دەرباز بکات، میرات هەر دەبات، بۆ ئەوەی کە تەڵاقدان نەبێت بیانووو پاساوێك بۆ بێبەش بوونی لە میرات بردنو ئەمەش ڕای جەماوەری شەرعزانانەو، بنەماکەی لەسەر ئەو فەتوایە هاتووە، کە هەندێ لە موجتەهیدەکانی هاوەڵان (ڕەزای خوایان لێ بێت) فەتوایان پێ داوەو، ئەوەی کە ئەم گروپە لەسەری چوون، لەسەر بنەمای (سد الذرائع) دامەزراوە، کە بە دەقی قورئانو فەرمووده ڕاستیو دروستیەکەی چەسپێنراوە.

٨- پێغەمبەر (ﷺ) فەرمانی کردووە کە کەسێك شتێکی دۆزیەوە هەرچەندە ئەو کەسە بڕواپێکراویشە بەڵام با هەر شایەت بگرێت لەسەر شتە دۆزراوەکە، نەبادا پاساوی شاردنەوەی بە هۆی تەماعەوە لە دواتردا لە لا دروست ببێت.

٩- شەرع ڕێگری کردووە، کە کەسێك بچێت ئافرەتێك بخوازێت، کە کەسێکی تر خواستوویەتی، و هێشتا وەڵام نەدراوەتەوە، یاخود سەوداو مامەڵە بەسەر هی برا مسوڵمانەکەیدا بکات، یاخود شتێك بفرۆشێت کە کەسێکی تر خەریکە هاکا دەیفرۆشێت بە کابرای کڕیار، و ئەم مامەڵەکەی خۆی پێش بخات بەسەریدا، ئەمانەیش هەموو بۆ بڕینی ئەو پاساو و بیانووانەن کە دەبنە هۆکاری ڕقو قینو لێکترازان لە نێوان شیرازەی کۆمەڵگا و مسوڵماناندا.

١٠- شەرع ڕێگری کردووە لە قۆرخکردنی شتومەكو شاردنەوەی، تا بە گرانتر بفرۆشرێت، واتا (اِحتکار) کردن، و دەربارەی مرۆڤی خراپی لەم جۆرە وتراوە: «لَا يَحْتَكِرُ إِلَّا خَاطِئٌ»، واتە: تەنها مرۆڤی هەڵەکارو تاوانکار، دەچێت قۆرخکردن (اِحتکار) ئەنجام دەدات، چونکە کردنی ئەم کارە پاساوو هۆکارو بیانووە بۆ خراپەو بەرتەسککردنەوەی نانو خواردنی خەڵکیو سەختکردنی ژیان لەسەریان.

١١- ئەگەر کەسێك شتێك وەك زەکات بدات بە خەڵکی، شەرع قەدەغەی کردووە لەو کەسە کە بیکڕێتەوە، تەنانەت ئەگەر ئەو شتە لە بازاڕیشدا دانرابێتەوە بۆ فرۆشتن، چونکە نەبادا ئەم کارە ببێتە هۆکاری ئەوەی کە ئەو کابرا زەکاتدەرە ئەو شتومەکە بە نرخێکی هەرزان لە کابرای هەژار بسەنێتەوە.

١٢- شەرع ڕێگری کردووە لە خاوەن قەرز، کە خەڵات لە خاوەن قەرزەکە وەربگرێت، مەگەر کاتێك دروستە کە ئەو خەڵاتە لەسەر قەرزەکە دابشکێنێت.

١٣٣- ئەم بەڵگانەو هی تریش بەڵگەیەکی ئەوتۆ پێك دەهێننو بەرپا دەکەن، کە (سد

الذرائع)، وەك بەڵگەیەك لە بەڵگەكانی ئەحكام، دەچەسپێننو بە بڕواپێكراوی ئەژمار دەكەن، جا ئەوانەی كە وەك بنەمایەك لە بنەماكانی شەرع دانانی ئەژمار ناكەن، تەنانەت لە هەندێ لە ئیجتیهادەكانیاندا بە پێی ناواخنو هەژموونی (سد الذرائع) كاریان كردووە، و لە ناو بازنەی بنەمایەكی تردا، یاخود یاسایەكی تردا، جێگایان كردۆتەوە.

وەك ئەوەی كە (ظاهیرییەكان) ڕایان وایە فرۆشتنی چەك بە كەسێك كە دڵنیاین بۆ دژایەتیو تێكدانی ئاساییشی بەكار دەهێنێت، مامەڵەیەكی بەتاڵەو هەروەها فرۆشتنی ترێ بە كەسێك كە دڵنیاین ئارەقی لێ دروست دەكات، دیسان مامەڵەیەكی بەتاڵە، چونكە كردەوەی لەم جۆرە هاوكاری كردنە لەسەر خراپەكاریو تاوانو ئەمەیش بە پێی ئایەتی قورئانی پیرۆز دروست نیە، كە دەفەرمووێت: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[1]، واتە: لەسەر چاكەو لەخواترسان هاوكاری یەكتری بكەن، نەوەك لەسەر خراپەو دوژمنكاری.[2]

حەنەفییەكان ڕایان وایە كە ئافرەتێك بۆیە تەڵاق درابێت، تا میرات نەبات، دەبێت هەر میرات ببات، و دەڵێن ئەمە مەزهەبی هاوەڵانە، كە ئێمە كاری پێ دەكەینو كەس نەبینراوە كە پێچەوانەی بووبێتو.....هتد.

لەم ڕوانگەیەوە هەروەك گوتراوە: تەنها مالیكیەكان نین كە كار بەم بنەمایە دەكەن، بەڵكو تەنها مالكییەكان زیاتر لە خەڵكی تر كاریان بەم بنەمایە كردووەو زاناو شەرعزانی مالكییەكان (القرافي) لەم بارەیەوە دەڵێت: سەبارەت بە (ذرائع) زانایان كۆڕان، لەسەر ئەوەی كە دەبێتە سێ بەشەوە: **یەكەمیان**، بە كۆڕا بڕواپێكراوە وەك هەڵكەندنی بیری ئاو لەسەر ڕێگای مسوڵمانان، و ژەهراوی كردنی خواردنیان، و جنێودان بە بتەكانیان، لە لای كەسێكی هاوەڵ بڕیاردەردا كە چاوەڕێی ئەوەی لێ بكرێت، كە بە بیستنی جنێوەكە، ئەویش "پەنا بە خوا" جنێو بە خوای (جلّ وعلا) بدات، **دووەمیان**، بە كۆڕای زانایان كارپێنەكراوە، وەك ناشتنی ڕەزو ترێ كە بە هۆی ترسی ئەوەی كە بكرێت بە ئارەق، ئەو چاندنەی قەدەغە ناكرێت، **سێیەمیان**، ڕاجیایی لەسەرە، وەك مامەڵەی ئایندە، واتە لەسەر شتێك كە ئێستا لەبەر دەستدا نەبێتو دواتر ئامادە ببێت، كە ئێمە (بیانوو: ذریعة) لەمانەدا بە بڕواپێكراو دەزانین، بەڵام خەڵكانی تر لەم باسەدا، لەگەڵ ئێمە ڕاجیان، و لەم ڕوانگەیەوە دەرەنجامی

---

[1] المائدة (٢).

[2] المحلی، ب٩، ل ٣٤٨.

ئەم پرسە ئەوەیە کە ئێمە زیاتر لەو خەڵکانە ملکەچی (سدّ الذرائع)ین، و ئەم ملکەچبوون و بڕوا پێ بوونە تایبەت نییە بە ئێمەوە.[1]

بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا، تەنها مالکیو حەنبەلییەکان (سدّ الذرائع)، وەك بنەمایەکی سەربەخۆ لەناو بنەماکانی ئەحکامدا تەماشا دەکەن، و هەر بەم هۆیەوەیش، زیاتر لە خەڵکانی تر کاریان پێکردووە، هەروەها زیاتر لە گروپەکانی تر ئەحکامەکانی خۆیان لەسەر ئەم (سدّ الذرائع)ـە، بنیات ناوەو بەرپاکردووە.

## ٢٣٤- ((سد الذرائع)) و ((المصالح المرسلة))

بنەمای (سد الذرائع) جەخت کەرەوەیە لەسەر بنەمای (المصالح المرسلة) و توندکەرەوەو تۆکمەکەرەوەیەتی، چونکە ئەو ئامرازو فاکتەرانە قەدەغە دەکات، کە هۆکارن بۆ مل نان ڕووەو خراپە، ئەمەیش ڕەهەندێکی جەخت لەسەر کراوەی بەرژەوەندییەکانەو، کەواتە دواجار تەواوکەرو کامڵکاری بنەمای بەرژەوەندییەکانەو تەنانەت هەندێك شێوازی (سد الذرائع)، وەك شێوازو بەشی (المصالح المرسلة) دانراونو ئەژمار کراون، و هەر بەم هۆیەشەوە دەبینین کە ئەوانەی کار بە بنەمای (المصالح المرسلة) دەکەن، وەك بەڵگە وەریان گرتووەو، ئالاهەڵگری ئەم گروپەن، واتە مالکیو پەیڕەوانیان بڕوایان بە (سد الذرائع) یش هەیە، و هەروەها ڕایشیان وایە کە ئەگەر ئەو پاساوو بیانووە بوویە هۆکار بۆ مل نان ڕووەو خراپە، ئیتر قەدەغەی دەکەن، و هەرکات زیاتر بوویە هۆکاری بەرژەوندی، ئیتر کاری پێدەکەن، هەر چەندە خودی ئامرازەکانیش حەرام بن، بۆیە ڕێگایان داوە بە دەوڵەتی ئیسلامیی، کە موڵك و سامان بدات بە دەوڵەتی دوژمن تا بەم هۆیەوە خۆی لە شەڕیان بپارێزێت، ئەگەر دەوڵەتە ئیسلامییەکە لاواز بوو، و هەروەها بە دروستیان زانیوە، کە هەندێ ماڵو سامان، وەك بەرتیل بدرێت، ئەگەر بەرتیلدان تەنها ڕێگایەك بوو کە لە بەردەم ئەو کەسەدا مابوویەوە، تا خۆی لەستەمو تاوانێك بپارێزێت، کە زیانی تاوانەکە زیاتر بوو، لە زیانی دانی ئەو بڕەسامانەو، هەروەها بە دروستیان زانیوە، کە موڵكو سامان بدرێت، بە دەوڵەتی شەڕکەر، وەك برێتییەك بۆ ئازاد کردنی گیراوانی مسوڵمانان، سەرەڕای ئەوەی کە دانی سامان بە دەوڵەتی شەڕکەر دروست نییە، کە بەڵام لێرەدا دروستە بۆ لادانی زیانێکی گەورەتر، یان بۆ وەدەست هێنانی بەرژەوەندییەکی مەزنتر[2].

---

[1] تنقيح الفصول، للقرافي، ل ٢٠٠، لە پەراوێزی ل ٤١٦ لە کتێبی (مالك)ـی، شیخ أبوزەهرە وەرگیراوە.

[2] الفروق، للقرافي، ب٢، ل٣٢-٣٣.

## ﴿بەشی هەشتەم﴾

## (( بەڵگەی هەشتەم: نەریت: العرف ))

عورف ((نەریت)) بریتییە لەو شتەی کە کۆمەڵگە خووی پێوە گرتووەو، کردوویەتیە نەریت بۆ خۆیو، لە ژیانی ڕۆژانەیدا، لەسەری دەڕوات، چ گوفتاری بێت، یان کرداری چونیەکە.

عورفو عادەت ((نەریت)) لەلای شەرعزانەکان یەك مانایان هەیە، جا کە دەڵێین، فلانە شت، بە عورف چەسپاوە، مانای ئەوە نییە، کە عادەت شتێکی تربێت، و لە عورف جیاواز بێتو، بەڵکو هەمان شتەو هاومانانو، لەسەر بنەمای جەخت کردنەوە لەسەر مانای عورف بەو شێوازە هێنراوە، نەك وەك ووشەیەکی سەربەخۆ.

جا عورف، هەر وەك لە پێناسەکەیەوە ڕوون دەبێتەوە، جاری وا هەیە، کە گوفتارییەو، جاری واهەیە، کە کردارییەو، جاری وا هەیە، کە تایبەتو، جارو باریش گشتییەو، لەسەر جەم ئەم شێوازانەیشەوە، یان دروستە یان نادروستە.

٢٣٦- **نەریتی کرداری**: بریتییە لەو کردەوانەی کە بوونەتە نەریت لەلای خەڵکی، وەك مامەڵەی دەستاو دەست، واتەبێ بوونی گرێبەستو، دابەشکردنی مارەیی ئافرەت، بۆ مارەیی حازرو مارەیی قەرز، و چوونە گەرماوی گشتی بە بێ دیاری کردنی ماوەی مانەوە تیایدا، و ئەندازەی ئەو ئاوەی کە بەکاری دەهێنیتو، هەروەها دروست کردنی قاپو قاچاغی ناو ماڵو دروست کردنی پێڵاو.

- **نەریتی گوفتاری**: بریتییە لەو دەربڕینە زمانەوانییانەی کە خەڵکی لە هەندێ لە گوفتارییاندا لەسەری ڕاهاتوونو، بووەتە نەریت بۆیان، بەوەی کە مەبەستیان پێی مانایەکی دیاریکراوە، لە غەیری ئەو مانایەی کە لەبنەمادا دانراوە بۆی، وەك ئەوەی کە لەفزی (ولد: منداڵ) بەکار دەهێنن، بۆ کوڕو پیاو نەوەك بۆ مێینە، وەك لە هەندێ وڵاتی کوردەواریشدا، وشەی (زەلام) تەنها بۆ پیاو بەکار دەهێنرێت، و هەروەها ووشەی (گۆشت)، بۆ غەیری (ماسی) بەکار دەهێنرێت، لەکاتێکدا (ماسی) یش گۆشتی هەیەو، هەروەها ناوی (دابە) ئاژەڵ تەنها بۆ ئاژەڵانی چوار پێ بەکار دەهێنن، لە کاتێکدا ئەم ووشەیە لەبنەمادا دانراوە،

بۆ هەر گیانەوەریێ کە بەسەر زەویدا ڕێ بکات.

جا عورف بەهەردوو جۆرە گوفتاریو کرادارییەکەیەوە، جاری وا هەیە، کە گشتییە، ئەگەر هاتوو بەسەرجەم وڵاتی ئیسلامدا بڵاو بووبویەوە، و تەواوی خەڵکی لەم وڵاتانەدا کردبوویانە نەریت بۆ خۆیانو لەسەری دەڕۆیشتن، و عورفی تایبەت ئەوەیە کە هەندێ وڵات بەکاری بهێنن، هەندێکی تر بەکاری نەهێنن، و لە لای هەندێ خاوەن پیشەی تایبەت بەکار بێت، و لە لای هەندێکی تریان بەکار نەیەت.

نموونەی عورفی کرداری تایبەت لە عێراقدا، وەك دابەشکردنی مارەیی بۆ حازرو قەرزو، هەروەها لە هەندێ ناوچەی پارێزگای (دیالە) کاتێك کەسێك پرتەقاڵ دەکڕێت، کابرای فرۆشیار چەند پرتەقاڵێکی زیادە دەکاتە ناو عەلاگەی کابرای کڕیارەوە.

ئینجا نموونەی عورفی زارەکی گشتی، وەك بەکار هێنانی لەفزی (دابة: ئاژەڵ) بۆ ئاژەلانی چوار پێ، و بۆ مرۆڤ بە کاری ناهێنن، و هەروەها وەك بەنەریت کردنی بەکار هێنانی لەفزی (طلاق) بۆ لابردنی پەیوەندییەکانی هاوسەرایەتی پاشان نموونەی عورفی زارەکی تایبەت، وەك ئەو زاراوانەی کە خەڵکانی زانستیو ئەکادیمیو پیشەوەرو پیشە سازەکان لەسەری ڕا هاتوون، و لە کاتی بەکار هێنانیاندا مەبەستیان پێیان، زاراوەی تایبەتی خۆیانە، کەلەلای ئەوان باوە نەوەك مانا زمانەوانییەکانی خۆیان.

٢٣٧- عورفی دروست ئەوەیە کە پێچەوانەی دەقێکی شەرعی نەبێتو، بەرژەوەندییەکی تەندروستو حساب بۆ کراو لەناو نەبات، و نەبێتە هۆکاری هێنانەدی خراپەیەك، کە بەلایەنی زۆری بەو هۆیەوە هاتنەدییەکەی پشت ڕاست بکرێتەوە، وەك بەنەریت بوونی ئەو حاڵەتە لەلای خەڵکی، کە دەچن ئەوەی داواکار دەیکات بۆ ژنە داواکراوەکە، لە جلو بەرگو ئەو شتانە بەخەڵاتو دیاری ئەژماری دەکەن، و ناچێتە ناو بازنەی مارەییەوەو، هەروەها وەك نەریتی ئەوەی کە لەکاتی گرێبەستی ژن مارەکردندا خەڵکی کۆ دەکەنەوەو شیرینیان دەدەنێو، هەروەها وەك ئەوەی کە خەڵکی شاری بەغدا پێش پەنجا ساڵ نەریتیان وابووە، کە خاوەن ماڵ کاتێك خانووی دروست دەکرد، نانو خوانی دەدا بەکرێکارەکان، و هەروەها خاوەن چایخانەکان نانیان دەدا بەکرێکارەکانیان لە نیوەڕۆو ئێوارەدا، هەروەها وەك ئەوە کە لە عێراقدا وا نەریتە، کە مارەیی قەرز بۆژنەکە ناکرێت، مەگەر لە کاتی تەڵاقدانیدا یان مردنی مێردەکەیدا.

عورفی خراپ، ئەوەیە کە پێچەوانەی دەقی شەرعیی بێت، یاخود بەدیهێنەری زیانێك بێك،

یاخود لەناوبەری بەرژەوەندی بێت، وەك نەریتی خەڵكی لەوەیدا كە دەچن گرێبەستی بەتاڵ ئەنجام دەدەن، بەهێنانی قەرزی سوودار لە بانكەكان، یاخود لە خەڵكی تر، هەروەها خووگرتن بە قومار كردن، بە یانسیبو پێشبڕكێی ئەسپو وەرەقێن، و تاوڵەو هتد......

## ٢٣٨- بە بەڵگەبوونی عورف:

زانایان عورفیان بە بنەمایەك زانیوە لە بنەماكانی هەڵهێنجانی ئەحكام، كە حوكمەكانی لەسەر بنیات دەنرێت، لەو قسانەی زانستمەنذان كە بەڵگەیە لەسەر بە بەڵگەبوونی عورف، ئەوانەیە كە دەڵێن: (العادة محكمة، لە ڕووی شەرعەوە كار بە عورف دەكرێت، یاخود عورفو عادەت لەشەرعدا پێگەدارە)، هەروەها دەڵێن: (المعروف عرفاً، كالمشروط شرطاً، ئەو شتەی كە لە عورفدا ناسرابێت، وەك ئەوە وایە كە لە گرێبەستدا وەك مەرج دانرابێت، یاخود مەرجی عورفی بوون، وەك مەرجی لەفزی وایە !).

هەندێ لە زانایان،[1] ئایەتی: ﴿ خُذِ ٱلْعَفْوَ وَأْمُرْ بِٱلْعُرْفِ ﴾[2] واتە: لێبوردە بەو فەرمان بە چاكە بكە، بە بەڵگەی (بە بەڵگەبوون)ـی، عورفی دادەنێن، بەوەیشیان زانیوە كە عورف بەڵگەیەكە لە بەڵگە بڕواپێكراوەكانی شەریعەت، بەڵام بە ڕاستی ئەم بەڵگەیە لاوازە، چونكە ئەو عورفەی لە ئایەتەكەدا هاتووە، مەبەست پێی (معروف، چاكە)یە، مەعروفیش ئەوەیە كە كردنی بە باش دانراوەو كردنی پێویستكراوە لەسەر شان، ئەمەش هەمان ئەو شتەیە كە شەرع فەرمانی پێكردووەو هەندێكیش ئەم فەرموودەیەیان كردووە بە بەڵگە:[3] (ما رآه المسلمون حسناً، فهو عند الله حسن، ئەوەی كە مسوڵمانان بە چاكی دەزانن، ئەوە لە لای خودایش چاكە)، كە ئەم فەرموودەیەیان بە بەڵگە داناوەلەسەر (بەبەڵگە)بوونی عورف، دیسان ئەم بەڵگەیەش هەر لاوازە، چونكە ژمارەیەكی زۆر لە زانایان وتوویانە كە ئەو فەرموودەیە لەسەر ئیبن مەسعود وەستێنراوە، لەسەر بەبەڵگەبوونی ئیجماع دەلالەت دەكات، نەوەك لەسەر عورف،[4] مەگەر لە كاتێكدا نەبێت كە عورفێكی دروست پاڵپشتی لە

---

[1] الفروق، للقرافي، ب٣، ل١٤٩.

[2] الاعراف (١٩٩).

[3] الكاساني في (بدايع الصنايع)، ب٥، ل٢٢٣، والمبسوط، للسرخسي، ب١٢، ل ١٣٨.

[4] الآمـــدي ب٣، ل١١٢.

ئیجماعەکە بکات، کەواتە دواجار ئەم فەرموودەیە بەلگەیە لەسەر جۆرێك لە جۆرەکانی عورف، نەوەك عورف بە ڕەهایی.

لە ڕاستیدا، عورف لە شەرعدا بڕواپێکراوەو خاوەنی پێگەی خۆیەتی‌و دروستە ئەحکامی لەسەر بنیات بنرێت، لە ڕاستیدا بەلگەیەکی سەربەخۆ نییە، بەلام دەگەڕێتەوە سەر ئەمەی کە ئێمە دەیڵێین لە چەند ڕوویەکەوەیە لەوانە:

یەکەم: دەبینین خودای کاربەجێ، ڕەچاوی عورفە تەندروستەکانی عەرەبی کردووە، لەوانە داننانی شەرع بە بازرگانییە جۆراوجۆرەکان‌و هاوبەشییە دروستەکان لە نێوانیانداو لەناو عەرەبەکاندا، وەك شەریکی دوو کەس لە کاسپییەکدا، و کڕین‌و فرۆشتن، و بە کرێدانە دوور لە خراپەکان،[1] لێرەدا تێبینی ئەوە دەکەین کە شەرع، مامەڵەی (سەلەم)ـی، لە بەر هۆکاری بە عورف بوونی لەناو خەلکی مەدینەدا هەلاوێرکردووە لەناو ئەو نەهییە گشتیەدا کە هاتووە سەبارەت بە نادروستی مامەڵەی شتی نادیار، هەروەها مامەڵەی فرۆشتنی خورما بە خورما ڕێگری کردووە، بەلام سەبارەت بە (عرایا) مۆڵەت‌و دەرفەتی داوە، کە (عرایا: بریتیە لەو خورمایانەی کە بە درەختەکەوەن، کە بە شێوەی گوتره دەفرۆشرێن و ئەندازەیان هەر بە درەختەکەوە بۆ دادەنرێت)، چونکە ئەم جۆرە مامەڵەیە لەناو خەلکیدا عورف بووەو پێویستیان هەبووە بە کردنی مامەڵەی لەم جۆرە، جا ئەم هەڵسوکەوتەی خودای کاربەجێ لە دانانی شەرعدا، بەلگەیە لەسەر ڕەچاوکردنی عورفی دروست، کە خەلکی مامەڵەکانیانیان لەسەر بنیات ناوە، بەلام سەبارەت بە عورفی خراپ دەبینین کە شەرع ڕەچاوی ئەمەیانی نەکردووەو بە بەتاڵ‌و هەڵوەشاوە ئەژماری کردووە، هەروەك لە عورفی بە کوڕدانانی منداڵی خەلکیدا ئەم کارەی کردووە، کە یەکێك بووە لە عورف‌و عادەتەکانی سەردەمی نەفامی، هەروەها سەبارەت بە عورفی میرات نەدان بە ئافرەتان، کە شەرع هات ئەمەیشی هەڵوەشاندەوەو بەشێك میراتی بۆ ئافرەتان دیاری کرد.

دووەم: لە ڕاستیدا عورف دەگەڕێتەوە بۆ لای بەلگەیەك لە بەلگەبڕواپێکراوەکانی شەریعەت، وەکو ئیجماع و (المصلحة المرسلة)و (الذرائع)، نموونەی ئەو عورفەی کە دەگەڕێتەوە بۆ لای ئیجماع، وەك دروستکردنی کەلوپەل‌و پێداویستیەکان‌و چوونە گەرماوی

---

[1] بڕوانە (شرح الكنز للزيلعي، کە لە بەرگی ٥، ل ٥٢ دا دەڵێت: خەلکی لە سەردەمی پێغەمبەردا (ﷺ) لێکدانی مامەڵە (مضاربة: قازانج بەهاوبەشی)یان، دەکرد، و پێغەمبەریش (ﷺ) نکوڵی لێ نەدەکردن.

گشتی، که عورف بەبێ نکۆڵی کردن لەسەر ئەمانە چووە، بۆیە لێرەدا سەر بە ئیجماعەو بێگومان ئیجماعیش بڕواپێکراوەو نموونەی عورفیش هەیە، که دەگەڕێتەوە بۆ لای (المصلحة المرسلة)، چونکە عورف دەسەڵاتی بەسەر دڵو دەروونی مرۆڤەکاندا هەیە، بۆیە ڕەچاوکردنی وەك ئاسانکاری وایە لەسەریانو لادانی ناڕەحەتیو دژوارییە لەسەر شانیان، ئەمە لە کاتێکدایە که عورفەکە دروست بێت،نەك نادروستو خراپ.

هەروەها وەرچەرخاندنی ئەو خەڵکە لەو عورفە سەختیو ناڕەحەتی بە دوادا دێت، و ناڕەحەتیش لابراوە، چونکە خۆی لە خۆیدا خراپەو نادروستی تیادایە، پێشەوا (سەرەخسی) لە کتێبی (المبسوط)دا، ئاماژەی بەمە داوە، کە دەفەرمووێت: (.... چونکە ئەو شتەی کە لە عورفدا چەسپاوە لە واقیعیشدا بە بەڵگەی شەرعی جێگیر بووەو چەسپاوە، هەروەها بە بەڵگەی ئەوەی کە وەرچەرخاندنی خەڵکی لە عورفێکی ئاشکرا، بێگومان سەختیو دژوارییەکی ئاشکرا بە دوای خۆیدا دەهێنێت).[1]

سێیەم: شەرعزانان کە عورفیان وەك بەڵگە داناوە، لە سەردەمە جیاوازەکانداو لە ئیجتیهادەکانیاندا وەك پاڵپشتێکی بڕواپێکراو تەماشایان کردووە، ئەمە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە عورف بڕواپێکراوە، چونکە ئەم کارەی ئەو شەرعزانانە وەك ئیجماعی بێدەنگ وایە، سەرەڕای ئەوەی کە تەنانەت هەندێکیان هەر بە ڕاشکاوی ئاماژەیان بەم ڕاستیە داوەو هەندێکیش قرتقپیان لێکردووە، کەواتە دواجار بڕواپێکراوی عورف، بە بەڵگەی ئیجماع چەسپاوە.

## ٢٣٩- مەرجەکانی بڕوا پێکراوی عورف، بۆ بنیاتنانی ئەحکامەکان لە سەری:

بۆ بڕواپێکراوی عورفو بنیاتنانی ئەحکامەکان لەسەری، چەند مەرجێك هەن، کە دەبێت بێنەدی، لەوانە:

یەکەم: نابێت ئەو عورفە پێچەوانەی دەقی شەرعی بێتو دەبێت عورفێکی دروست بێت، وەك لەو نموونانەدا هێنامانەوە سەبارەت بە عورفی دروست، و هەروەها وەك ڕاهاتنو خوگرتنی خەڵکی بەوەوە کە کەسێك ئەمانەتو بارمتەی لە لابێت، دروستە بۆی بیداتەوە بەو کەسانەی کە عادەتەن دروستە لێی وەری بگرن، وەك ژنو منداڵو خزمەتکاری کابرای

---

[1] المبسوط، ب١٣، ل١٤.

خاوەن ئەمانەت، هەروەها وەك وەقف کردنی شتی گواستراوەو هەروەها ئەو مەرجانەی کە پەیوەستن بەو گرێبەستانەوە کە عورفی دروست لەسەریان دەڕۆن، جا ئەگەر ئەو عورفە پێچەوانەی دەقی شەرعی بوو، ئەوە بڕواپێنەکراوە، وەك مامەڵەی سووخۆریو دابەشکردنی خواردنەوە کهولیەکان لە زەماوەندەکانداو، دەرخستنی جێگا یاساغەکانی جەستە، ئەمانەو هاوێنەکانیان بەبێ ڕاجیایی نێوان زانایان هەموویان بڕواپێنەکراوو بەتاڵن،[1] مەبەستیش لە عورفی پێچەوانەی دەقی شەرعی ئەوەیە کە لە سەرجەم ڕەهەندەکانەوە پێچەوانە بێت، بە جۆرێك ئەنجامدانی ئەو عورفە کارکردن بە دەقەکە بە گشتی بەتاڵ بکاتەوە، وەك لەو نموونانەدا کە هێناومانەوە دەرکەوت، بەڵام ئەگەر بەم شێوازە نەبوو، ئەوە بە دژی دەقی شەرعی ئەژمار ناکرێتو، لە چوارچێوەی خۆیدا کاری پێدەکرێتو، کاریش بە دەقەکە دەکرێت، بەڵام لە غەیری ئەو جێگایەدا کە عورفەکە خوازیاری بووە، وەك لە گرێبەستی دروستکردنی کەلوپەلەکاندا کە لە ڕاستیدا ئەوە مامەڵەی شتی نادیارەو لە شەریعەتیشدا مامەڵەی شتی نادیار دروست نییە، بەڵام دروستکردنی کەلوپەل دروستە لەبەر ئەوەی کە خەڵکی بەبێ نکۆڵی کردن کاریان پێکردووەو بۆیە دواجار لەبەر خاتری عوف کاری پێدەکرێت، بەڵام غەیری ئەم جۆرە لە دروستکردنی کەلوپەلو پێداویستی، لە مامەڵەکردن بە شتی نادیار بە حەرام دانراوە، واتە تەنها ئەم جۆرە مامەڵەیە لە گرێبەستی دروستکردن (الأستصناع)دا، دروستە، ئەمەیش بە پێی یاسای: (بیع المعدوم لا یجوز) کڕینو فرۆشتن بە شتی نادیارەوە وەك ماسی لە دەریادا دروست نیە.

دووەم: دەبێت عورفەکە (مطرّد) گشتی یان زاڵ (غالب) بێت، مانای (إطراد)یش، واتە: عادەتێکی گشتی بێتو پاشکەوتە نەبێت، جاری وا هەیە کە بە (عموم) گشتاندن دەردەبڕدرێت، واتە ئەو عورفە بڵاو بێت لەناو خەڵکەکەیداو ناسراو بێت لە لایانو پێش ئەوانیش لەناویاندا کاری پێکرابێت، مەبەست لە زاڵبوون (الغلبة) ئەوەیە کە زۆرینە کاری پێکردبێت، واتە مەگەر تەنها کەمێك لەو خەڵکە گوێی نەدابێت پێی، ئینجا ئەم زاڵبوونو گشتی بوونە (الغلبة)و (إطراد) کاتێك لە لای ئەهلی ئەو عورفە بینران، بڕواپێکراون، نەك لە پەڕاوەکانی شەرعدا، چونکە بۆی هەیە ئەو عورفانە لەو پەڕاوانەدا بگۆڕدرێن.

---

[1] لە کتێبی (المبسوط)دا، ب١٢، ل١٩٦، هاتووە کە دەڵێت: هەموو عورفێك کە دەقی شەرعی بە پێچەوانەیەوە هاتبێت، ئەوە بڕواپێنەکراوە.

سێیەم: ئـەو عورفـەی کـە خـەڵکی کـاری پێـدەکات، دەبێـت هـەر لەسـەرەتای ئـەو هەڵسوکەوتو کارپێکردنەوەوە هەبوبێت، واتە بەرپابوونو ڕوودانی عورفەکە لە پێشتر بێت، بەسەر کاتی هەڵسوکەوتەکەداو، دواتر بەردەوام بووبێت، تائەو کاتی ڕوودانەو، ئیدی لەگـەڵ بەرابـەری (مقارنـة) بکرێـت، و لـەم ڕوانگەیـەوە بەڵگـە هێنـاوەی پرسـی وەقفـەکانو ڕاسپاردەکانو مامەڵـەکانو گرێبەسـتەکانی هاوسـەرایەتیو، مـەرجو زاراوە پەیوەسـتەکان پێیانەوە، هەموویان دەبێت، لەسەر بنـەمای عـورفی کەسـانێك ڕاڤـە بکـرێن، کـە ڕوویـان لـە ئەنجامدانی ئەو کارانە کردووە، و ئەو عورفە لـە سـەردەمی ئەوانـدا بـوونی هـەبووە، نـەوەك لەسەر بنەمای ئـەو عورفـەی کـە لـەدوای ئـەوان سـەرهەڵدەدات، بـۆ نموونـە ئەگـەر کەسـێك سـودوقازانجی موڵـكو مـاڵی خـۆی وەقـف بکـات، لەسـەر زانایـان، یـاخود لەسـەر فـەقێو قوتابیانی زانستو ئەو عورفەی لە کاتی ئەنجامدانی ئەو وەقفەدا، وابوو، کـە مانـای زانایـانی والێك دەدایەوە، کە بریتییە لـەو کەسـەی کـە شـارەزایی لـەکاروباری ئاینیـدا هەیـە، بـە بـێ مـەرجی تـر، و مەبەسـتی لـە قوتابیـانی زانسـت، ئـەو قوتابیانـە بـوو، کـە قوتـابی زانسـتی شەرعین، ئەوا سود و قازانجی ئەو موڵكو ماڵـە بـەو جـۆرە زانایانـە دەدرێـت، بـە بـێ مـەرج لەسەر دانانی بوونی بڕوانامەی تایبەت لەم بـوارەدا، جائەگـەر لـەدوای ئـەو وەقفـە، عورفێـك داهات، کە داوای بڕوانامەی لەو بوارەدا دەرکرد، لەو زاناو قوتابیانە، ئەوە بوونی ئەو مەرجە بۆ ئەو زانایانە لەو وەقفـەدا کـارپێکراو نییـە، و هـەر تـەنها بـۆ قوتابیـانی شـەریعەت خـەرج دەکرێت، و بە هیچ کەسێکی تـر نادرێـت، کـە خـەرێکی دەستخسـتنی زانسـتی جـۆری تـرە، هەرچەندە ئەو عورفەی کە دواتر داهاتووەو، لەدوای وەقفەکە خەڵك خووی پێوەگرتـووە، وا دەربڕدراوە کە جگە لە قوتابیانی زانستی شەرعی، قوتابیانی تریش هـەر دەگرێتـەوە، بـەڵام ئێمە هەر کار بەپێشینەکە دەکەین.

– چوارەم: نابێت گوفتار یان کردارێکی وا لە ئارادا بێت، کە دژی نـاوا خنـی عورفەکـە بێت، وەك بۆ نموونە لە بازاڕدا عورف وابێت، کە بـە بـەش بـەش نرخەکـە ڕادەسـت بکرێـت، بەڵام کڕیار و فرۆشیار لەسەر ئەوە ڕێك بکەون، کە بە ڕاشکاوی و ڕاستەوخۆیی نرخەکـە بـە بێ بەشکردن بدەن، یاخود عورف لەسەر ئەوە بێت، کـە بـڕی تێـچونی نـاردن لەسـەر کڕیـار بێت، بەڵام ڕێـك بکـەون، کـە لەسـەر فرۆشـیار بێـت، یـاخود عـورف لەسـەر ئـەوە بێـت، کـە تێچوونی تۆمارکردنی خانووبەرە لە بەڕێوبەرایەتی تاپۆ لەسـەر کڕیـار بێـت، بـەڵام هـەردوولا لەسەر ئەوە ڕێك بکەون، کە بیخەنە گەردنی فرۆشـیار، و یاسـا لێـرەدا لەسـەر ئەوەیـە کـە:

(مايثبت بالعرف، بدون ذكر، لا يثبت، إذا نص على خلافه: ئەو شتەی کە بە عورف و بە بێ ناوبردنی لە گرێبەستی مامەڵەدا دەچەسپێت، لە کاتێکدا کە هەردوو لای مامەڵەکە، لەسەر شتێکی پێچەوانەی ئەو گرێبەستە ڕێك بکەون، ئەوە ئەمەیان جێگیر نابێتو ناچەسپێت))[1].

## ٢٤٠- عورف، وێستگەی پراکتیزە کردنی ئەحکامەکانە:

هەروەها عورفیش وەك دواوێستگە (مرجع) یێك، دادەنرێت، بۆ پراکتزەکردنی ئەحکامەکان، بەسەر ڕووداوو پێشهاتە تایبەتەکاندا، وەك ئەوەی کە دادگەری ((العدالة)) مەرجێکە، بۆ وەرگرتنی شایەتی دانی دروست، بەبەڵگەی ئایەتی قورئانی پیرۆز کە دەفەرموێت: ﴿وَأَشۡهِدُواْ ذَوَيۡ عَدۡلٖ مِّنكُمۡ﴾[2] واتە: دوو پیاوی دادگەر بەسەریانەوە بکەن، بەشایەتو، دەدگەری (العدالة)یش، لە لای شەرعزانان، ئەو خولیایەیە، کەوا لە خاوەنەکەی دەکات بەردەوام لەخواترس بێو، پابەند بێت بەڕێو شوێنەکانی مەردایەتییەوەو، هەرچی کاریگەری لەسەر پیاوەتی مرۆڤ هەبێت، ئەوا کاریگەریشی لەسەر دادگەرییەکەی دەبێتو، ئەو فاکتەرانەیش کە کاریگەری نێگەتیڤیان لەسەر دادگەری هەیە، بەپێی کاتو شوێن گۆڕانیان بەسەر دادێت، وەك ئەوەی کە پێشەوا شاطبي باسی کردووە، و دەفەرموێت: سەر ڕووتی بۆ پیاوان، (واتە: نەپێچانەوەی جامانە، و مشکیو مەندیلو مێزەرو ئەو جۆرە شتانە)، کە ئەم کردەوەیە لەواقیعدا، بە گوێرەی جێگا جیاوازەکان، ئەمیش جیاوازی بۆ دروست دەبێت، کە بێگومان ئەم کارە لە ڕۆژهەڵاتی خۆماندا، بۆ پیاوانی خاوەن مەقامو پایە، کارێکی ناشیرینە، و جوانتر وایە، سەریان ڕووت نەبێت، بەڵام بۆ ڕۆژئاوا شتێکی ئاساییە و ناشیرین نییە، کەواتە حوکمی شەرعیی، بە پێی ناوچەیش گۆڕانکاری بەسەردا دێت، و لەدەرەنجامدا، لە لای خەڵکی ڕۆژهەڵات، کاریگەری خراپی لەسەر دادگەری کابرا دەبێت، بەڵام لە لای ڕۆژئاواییەکان وا نییە!

هەر بەم شێوازەیش، لەکاتی پراکتیزە کردنی ئەم حوکمەی ناو ئەم دەقە قورئانییەدا کە دەفەرموێت: ﴿وَعَلَى ٱلۡمَوۡلُودِ لَهُۥ رِزۡقُهُنَّ وَكِسۡوَتُهُنَّ بِٱلۡمَعۡرُوفِ﴾[3] واتە: لەسەر خاوەن منداڵ ((باوك))

---

[1] القواعد، الأمام عز بن عبد السلام، ب٢، ل١٧٨.

[2] سورة (الطلاق/ ٢).

[3] سورة (البقرة/ ٢٣٣).

پێویستە کە قوتو جلو بەرگی دایکیان، بەشێوەیەکی شایستە بۆیان فەراهەم بکات، کە ئەم حوکمە دەگەڕێتەوە بۆ عورف، بۆ چەسپاندنی ئەندازەی ئەو نەفەقەیەی کە بڕیاری لەسەر دراوە، چونکە ئەم دەقە، ئەندازەکەیی دیاری نەکردووە.

پێشەوا (جەصاص)، لە کتێبەکەیدا، (أحكام القران) دەفەرموێت: ئەگەر ژن پێداگیریو زیادەڕەوی کرد، و داوای نەفەقەی زیاتری کرد، کە عورفو عادەت وا نەبوو، ئەوە نایدرێتێو، هەروەها ئەگەر پیاوەکەیشی کەمو کوڕی کرد، لەدانی نەفەقەکەداو، کەمتر لە عورفو عادەتی دابین کرد، ئەمیش دیسان بۆی دروست نییە، و لەسەری پێویست دەکرێت، کە بڕی نەفەقەکە لە عورفی ئەو جێگاو سەردەمەدا چەندە، دەبێت ئەوەندەی بۆ فەراهەم بکات[1].

هەروەها هەر شتێ کە شەرع پێویستی کردبووو، ئەندازەیەکی دیاری نەکردبوو، ئەوا دەچین بەپێی عورف دیاری دەکەین.

## ٢٤١- گۆڕانی حوکمەکان، بە پێی گۆڕانی سەردەمەکان:

ئەو حوکمانەی کە لەسەر بنەمای عورفو عادەت بنیات نراون، بەپێی گۆڕانی عادەتەکان، ئەوانیش دەگۆڕێن، ئەمەیش هەمان ئەو مەبەستەیە کە شەرعزانان لە فەرمایشتەکانیاندا درکاندویانە، کە فەرمویانە: نکۆڵی ناکرێ، لە گۆڕانی حوکمەکان، بەپێی گۆڕانی کاتو سەردەمەکانو، لەم بارەیەوە ((پێشەوا شەهاب الدین القرافی)) دەفەرموێت: ئەو حوکمانەی کە لەسەر بنەمای عورفو عادەتەکان بنیات نراون، تا عورفەکە هەبێت حوکمەکەیش هەیەو، هەر کە عورفەکەیش نەماو هەڵوەشایەوە، ئەوا حوکمەکەیش هەڵدەوەشێتەوە، وەك پارە لەمامەڵەکاندا، و بوونی کەمو کوڕی لەو شتانەیدا کە ئاڵو گۆڕیان لە مامەڵەدا پێوە دەکرێت، و نموونەی تری وەك ئەمانە، جا کە عادەت، لەو پارەیەدا گۆڕدرا، بۆ جۆرێکی تری پارە، ئەوا نرخەکە بەو پارە نوێیە دەبێت، کە عادەتی پێوە گیراوەو، کار ئیتر بەپارە کۆنو ئێکسپایەر بووەکە ناکرێت، و هەروەها ئەگەر بوونی شتێك، لەجلو بەرگێکدا بەکەمو کوڕی ئەژمار کراو، بەم بیانووەوە بڕیمانەوە بەسەر کابرای فرۆشیاردا، بەڵام ئەگەر دواتر ئەم عورفە گۆڕدراو، ئەو کەمو کوڕییە، بە شتێکی ئاسایی جوان تەماشاکراو، بوویە هۆکاری زیادی نرخەکەیشی، ئیتر بەهۆی بوونی ئەو شتەوە (کە پێشتر بەکەمو کوڕی سەیر دەکرا)

---

[1] الجصاص، ب١، ل٤٧٨.

ناتوانین جلو بەرگەکە بدەینەوە بەسەر کابرای فرۆشیاردا، جا سەرجەمی ئەو حوکمانەی کە لەسەر بنەمای عورف‌و عادەت بنیات نراون بەپێی ئەم یاسایە بەڕێوە دەچن، و ئەم یاسایەیش بووەتە حەقیقەتێك، کە ئیجماعی شەرعزانانی لەسەرە، و بە درێژایی مێژوو فەتوای زانایان لەسەر ئەم یاسایە دەرچوون، و بەرپا کراون، جا هەر کات عورف گۆڕانی بەسەردا هات‌و نوێ بوویەوە، دەبێت کەسی موجتەهید ئەو عورفە نوێیە بە بڕوا پێکراو بزانێت، و هەر کاتیش عورفەکە لەکار کەوت، ئەوا دەبێت موجتەهیدیش ئاستی بڕوا پێکراوی‌و کارپێکردنی عورفەکە ئیدی لە کار بخات[١].

هەر لەسەر ئەم بنەمایەش حوکمەکان جیاوازییان هەیە، بۆ نموونە پێشەوا ئەبو حەنیفە، دادگەری ڕوکەشی بەهێند وەرگرتووەو، لەپەرسی سزادان لەسەر تاوانەکان‌و کوشتنەوەدا نەبێت، ئیتر ئەستۆپاکی شایەتەکانی بەمەرج نەگرتووە چونکە لەسەر دەمی جەنابیاندا، خەڵکی زیاتر چاك‌و خواناس بوون‌و، لەگەڵ یەکتریدا ڕاستگۆیانە مامەڵەیان دەکرد، بەڵام لەسەردەمی (ئەبو یوسف)و(موحەمەدی کوڕی حەسەن)دا، درۆ زیادی کردو پەرەی سەند، بۆیە کارکردن بەدادگەری ڕووکەشی دەبوویە هۆی گەندەڵی‌و تیاچوونی مافی خەڵکی، بۆیە لەبەر ئەم هۆکارە، ئەم دووانە ناچار بوون بڕیار بدەن، بە بوونی ئەستۆپاکی شایەتەکان‌و، دواجار شەرعزانەکان سەبارەت بەم ڕا جیاییەی نێوان پێشەوا ئەبو حەنیفەو قوتابییەکانی دەڵێن: (( ئەمە ڕاجیایی سەردەم‌و کاتە، نەك ڕاجیایی لەسەر بەڵگەکان))و هەروەها وەك ئەوەی کە حەنەفییەکان فەتوایان داوە، کە کڕیار کە ڕووکەشی خانووەکەو هەندێ لە بەردەکانی خانووەکەی بینی، بە مەبستی کڕینی، ئیتر دواتر مافی پەشیمان بوونەوەی نییە، کە بڵێت خانووەکەم نەدیوەو، ئەو ڕووکەش دیتنەی لەسەر ئەژمار دەکرێت، چونکە بەردەکان هەموویان لەسەر یەك شێواز لە دیوارەکەدا دادەنرێن، بەڵام کە دواتر عادەتی خەڵکی سەبارەت بە کردنەوەی خانوو گۆڕدرا، ئیتر زانایانی دواینەی حەنەفی فەتوایان بەو جۆرە دا، کە دەبێت کڕیاری خانوو، سەرجەمی خانووەکە تەماشا بکات‌و، ببینێت، دەنا هێشتا مافی پەشیمان بوونەوەی دەبێت، ئەگەر ڕوکەشەکەی‌و هەندێکی ببینێت، و هەروەها وەك وەرگرتنی پارە لەسەر فێرکردنی وانەی قورئان بە قوتابیان، کە شەرعزانانی دوایینە بە دروستیان زانیوە، چونکە عادەتەکان گۆڕدرا بوون، کە ئەگەر لە ڕابردوودا برێك مووچە بۆ

---

[١] القرافي، ب١، ل١٧٦، إعلام الموقعين، ب٣، ل٩.

ئەو مامۆستایانە لە دارایی دەوڵەت (بیت المال) دیاری کرابوو، کە دواتر پچڕاو نان بڕاو کران، ئیتر زانایانی دواییینە فەتوایان دا، کە دروستە کرێ وەربگرن، نەبادا خەڵکی پشت لە قورئان خوێندن بکەن، و فێربوونی فەرامۆش بکەنو، هەروەها وەك، ئەوەی کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ سەرفیترە ساعێك[1] خورما یان جۆ، یان کشمیش، یان کەشکی داناوە، کە بدرێت، چونکە ئەمە خواردنی زۆرینەی خەڵکی شاری مەدینە بوو، بۆیە ئەم خواردنە بەخواردنی تر بگۆڕدرێت، ئەوا ئەم زەکاتی سەرفیترەیەش بەپێی خواردنە نوێیەکانی تر دەگۆڕدرێتو، دەکرێت بدرێت.

٢٤- ئەم گۆڕانە، لە حوکمەکاندا، بێگومان تەنها ئەو ژمارە ئەحکامانە دەگرێتەوە کە لەسەر بنەمای عورف بنیات نراون، هەر وەك گوتمانو، ئەحکامە یەکلایی (قطعي)ییەکانی، شەرع ناگرێتەوە، هەر وەك ئەم گۆڕانە، بە نەسخو سڕەرەوەی ئەحکامی شەرعی نایەتە ئەژمار، چونکە حوکمەکە هەر ماوەتەوە، بەڵام مەرجەکانی پراکتیزە بوونی تیادا بەرجەستە نەبووە، و ناچار شتێکی تر پراکتیزە کراوە، لێرەدا دەردەکەوێت، کە عادەت هەرکات گۆڕدرا، ئەمە بەو مانایەیە کە ئەوە حاڵەتێکی نوێ تر هاتۆتە ئاراوە کە هۆکارە بۆ پراکتیزە کردنی حوکمێکی تر، یاخود ئەوەیە کە حوکمە ئەسڵییەکە هەر ماوەتەوە، بەڵام گۆڕانی عورفەکە بووەتە هۆکاری ئەوەی کە وا پێویست بکات، کە مەرجی دیاریکراوی تر بە دوای خۆیدا بهێنێت، بۆ پراکتیزە کردنی وەك ئەوەی کە بۆ نموونە مەرج لەشایەتەکاندا، دادپەروەری بوونیانەو، دەبێت دادگەربنو، پێشتر دادگەرییەکی رووکەشی بۆیان بەس بوو، بەڵام دواتر لەبەر ئەوەی کە درۆکردن لەناو خەڵکیدا زیادی کرد، ئەم مەرجە بوویە هۆکاری ئەوەی کە وا پێویست بکات، کە شاهیدەکان ئەستۆ پاکبنو، لەناواخندا دادگەربن.

((پێشەوا شاطبي)) لەم بارەیەوە دەفەرموێت: مانای راجیایی ئەوەیە کە عورفەکان جیاواز بوون، ئەوا هەر عورفێك دەگەڕێندرێتەوە بۆسەر ئەسڵێکی شەرعی، و بە پێی ئەو ئەسڵە بۆ ئەو عورفە، حوکم بەرپا دەکرێت[2].

---

[1] صاع: لە لای حەنەفییەکان کێشەکەی سێ هەزارو شەشسەدو سی گرامە، واتە سێ کیلۆو شەشسەدو سی گرام.

[2] الموافقات، ب٢، ل٢٨٦.

## ﴿بەشی نۆیەم﴾

# بەڵگەی نۆیەم: ((قول الصحابي: فەرمایشتی هاوەڵان))

### ٢٤٣- ڕێخۆشکردن:

هاوەڵی پێغەمبەر (ﷺ) لەلای جەماوەری زانایانی زانستی ئوصولی فیقهـ، ئەو کەسەیە کە چاوی بە پێغەمبەر (ﷺ) کەوتبێت، بڕوای پێ هێنابێت، ئەوەندەیش لە گەڵیدا بووبێت و مابێتەوە، کە لە ڕووی عورفەوە ووشەی هاوڕێیەتی بۆ بەکار بهێنرێت، وەك خەلیفەکانی ڕاشیدینو عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس، و عەبدوڵڵای کوڕی مەسعود، و هی تریش، کە بڕوایان پێی هێناوە و پاڵپشتییان لێ کردووە، و گوێیان بۆ گرتووە، و شوێن ڕێبازی هیدایەتی ئەو زاتە کەوتوون.

لە دوای کۆچی دوای پێغەمبەر (ﷺ) هاوەڵە بەڕێزەکانی، ئەوانەیان کە بە خاوەن زانستو شەرعزانی ناسرابوون، هەستان بە فەتوادان، و دادگەری کردن لە نێوان خەڵکیدا، و فەتوا و قەزاوەتەکانیان گێڕدراونەتەوە بۆ ئێمە جا ئایا دروستە کە ئەو فەتوا و بڕیارانەیان وەك سەرچاوەیەك لە سەر چاوەکانی شەرع سەیر بکەین، و دەبێت موجتەهید پێیانەوە پابەند بێت؟ ئەگەر لە قورئانو فەرموودە و ئیجماعدا حوکمێکی دەست نەکەوت، کار بەگوتەی هاوەڵان دەکات؟ زانایان لەسەر وەڵامی پرسیارێکی لەم جۆرە ڕاجیاییان هەیە.

### ٢٤٤- جێگای ڕاجیاییەکان:

ڕاجیایی لەسەر گوتەی هاوەڵان ((خوا لێیان ڕازی بێت)) بە شێوەیەکی ڕەها نییە، بەڵکو لەم بارەیەوە درێژە باسێك بەم شێوازەی لای خوارەوە هەیە:

- یەکەم: زانایان ڕایان وایە کە فەرمایشتی هاوەڵان لەو شتانەیدا کە بەڕاو ئیجتیهادکردن نازانرێت، دەبێتە بەڵگە، چونکە وەك حوکمێکی بیستراو لە پێغەمبەرەوە (ﷺ) تەماشا دەکرێتو، دواجار وەك فەرموودە وایە، و بێگومان سوننەتو فەرموودەیش سەرچاوەی شەرعدانانە، حەنەفیەکان نموونەیان بۆ ئەمە بەو گێڕانەوەیە هێناوەتەوە کە لە عەبدوڵڵای کوڕی مەسعوودەوە (خوا لێی ڕازی بێت) گێڕدراوەتەوە، کە فەرمویەتی: لای کەمی کاتی بێ نوێژی ئافرەت سێ ڕۆژەو، هەروەها نمونەیەکی تری بایەخدار لەو گێڕانەوانەی کە هەن، ئەوەیە کە لە فەرمایشتی هەندێك لە هاوەڵانەوە وەرگیراوە، کە وایان داناوە، لای کەمی مارەیی ئافرەت دە درهەمە.

- دووەم: ئەو فەرمایشتەی هاوەڵان، کە کۆکبوونی گشتی لەسەر دروست بووە، بە

بەڵگەیەکی شەرعی دادەنرێت، چونکە لەم حاڵەتەدا ئیجماعە، هەروەها فەرمایشتی ئەو هاوەڵەی کە ڕای پێچەوانەی لەسەر نەهاتووە، ئەمیش وەك ئیجماعی بێدەنگ (الأجماع السكوتي) دادەنرێت، و ئەمیش دیسان بەڵگەیەکی شەرعییە لە لای ئەوانەی کە بڕوایان بە ئیجماعی بێدەنگی هەیە.

- **سێیەم:** فەرمایشتی هاوەڵێك بەسەر هاوەڵێکی تری وەك خۆیەوە، وەك بەڵگەیەکی پابەند (ملزم) تەماشا ناکرێت، چونکە دەبینین کە هاوەڵان لە نێوان خۆیاندا ڕاجیاییان هەبووە، بەڵام هیچکامیان ئەوی تری ناچار نەکردووە، کە پابەند بێت بە ڕای ئەمەوە.
- **چوارەم:** ئەگەر فەرمایشتی هەر هاوەڵێك ((خوا لێیان ڕازی بێت)) لە ڕا و ئیجتیهادی خۆیەوە سەرچاوەی گرتبێت، ئەمە ئەوەیانە کە ڕاجیایی لەسەرە، ئایا ئەم جۆرەیان دەبێتە بەڵگە بەسەر ئەوانەی لەدوای ئەمانەوە هاتوون، یان نابێتە بەڵگە[1]؟!
- ٢٤٥- هەندێ لە زانایان ڕایان وایە، کە بە بەڵگەی شەرعی دادەنرێت، و لەسەر کەسی موجتەهید پێویستە کە کار بەفەرمایشتی هاوەڵان بکات، ئەگەر ئەو حوکمە لە قورئانو سوننەتو ئیجماعدا دەست نەکەتو، ئەگەر هاوەڵانیش لەسەر ئەو حوکمە ڕاجیاییان هەبوو، ئەوا دەکرێت، کە لەناو ڕا جیاوازەکانیاندا، ڕایەك هەڵبژێرێت.

ئینجا گروپێکی تر لە زانایان ڕایان وایە کە بە بەڵگەی شەرعی دانانرێت،و موجتەهید لەسەری پێویست نییە، کە کار بە فەرمایشتی هاوەڵان بکات، بەڵکو لەسەری پێویستە کە بە داخوازی بەڵگە شەرعییەکان کار بکات.

**گروپی یەکەم:** بەڵگەیان ئەوەیە کە لایەنی پێکان لە ئیجتیهاد کردنی هاوەڵاندا زۆر زیاترەو، لایەنی هەڵەکردن زۆر کەمترە، چونکە هاوەڵان شایەتحاڵی هاتنە خوارەوەی قورئانی پیرۆز بوونو، لەسەر حیکمەتی تەشریع، و هۆکاری هاتنە خوارەوەی ئایەتەکانی قورئان هەڵوەستەی هەیە، و ماوەیەکی زۆر لە خزمەت پێغەمبەردا (ﷺ) بوونو، بەو هۆیەوە زانیاریان لەسەر شەریعەت دەست کەوتووە، و لەسەر ماناکانی توانای تێگەیشتنیان بۆ دروست بووە، بۆیە لەبەر هەموو ئەمانە ڕای هاوەڵان پلەیەکی باڵاتری هەیە، لە ڕای کەسانی ترو، ئیجتیهادی ئەوانیش زۆر نزیکترە لەڕاستیو پێکانەوە، لە ئیجتیهادی کەسانی تر!

گروپەکەی تر بەڵگەیان ئەوەیە کە ئێمە پابەند کراوین، بە گوێڕایەڵی قورئانو سوننەت، و

---

[1] شرح مسلم الثبوت، ب٢، ل١٨٥و دواتریش.

ئەو بەڵگانەوە کە دەقی قورئانو سووننەت ئێمە ڕێنموونی دەکەن بۆ لایانو، فەرمایشتی هاوەڵانیش سەر بەهیچ کام لەم بابەتانە نییە، و ئیجتیهاد کردن بە بیروڕا، شایەنی پێکانو هەڵەکردنیشەو، لەم پرسەدا جیاوازی لە نێوان هاوەڵانو کەسانی تردا نییە، هەرچەندە ئەگەری هەڵەکردنی هاوەڵان کەمترە.

ئەوەی ئێمە بەڕای لە پێشتری دەزانینو (ترجیح)ـی، دەکەین، ئەوەیە کە فەرمایشتی هاوەڵان (خوا لێیان ڕای بێت) بەڵگەیەکی وانییە، کە ئێمە ناچار بکات، پابەندبین پێیەوە، بەڵام زیاتر بەلای ئەوەدا دەڕۆین، کە کاری پێبکەین، لە پرسێکدا کە دەقی قورئانو سوننەتو ئیجماعی لەسەر نەبوو، یاخود هەر لەو پرسەدا بەڵگەیەکی بایەخداری تر بوونی نەبوو، ئەوە لەم حاڵەتەدا دەبینین کە کار کردن بە فەرمایشتی هاوەڵان لە پێشترە.

# ﴿بەشی دەیەم﴾

## بەڵگەی دەیەم:

## شەریعەتەکانی گەلانی پێش ئێمە ((شرع من قبلنا))

مەبەست لەشەریعەتەکانی پێشین، ئەوئەحکامانەیە کە خودا کردوونی بەشەریعەت بۆ گەلانی پێش ئێمەو ناردویەتییە سەر پێغەمبەرانی خۆی، تا ئەوانیش ئەو ئەحکامانە وەك پەیام، بدەن بە گوێی ئەو گەلانەدا.

زانایان لەسەر ئاستی پەیوەندی ئەو ئەحکامانەی ئەو گەلانە بەشەریعەتی ئێمەوەو ئاستی بەڵگە بوونیان سەبارەت بە ئێمە، ڕاجیاییان هەیە، جا پێش باسکردنی ڕاو قسەکانیان، پێویستە پێگەی ڕاجیاییەکە باس بکەین، چونکە ئەم پرسی ((شرع من قبلنا))یە، چەندەها جۆری هەیە، جۆری هەیە، کە کۆکی لە نێوان زانایاندا هەیە، لەسەر بە بەڵگە بوونی سەبارەت بە ئێمەو، هەیانە کە کۆکی هەیە، لەسەر ئەوەی کە لەو حوکمانەدا هەیە، کە سەبارەت بە ئێمە نەسخ کراوەتەوەو، هەیشیانە کە هێشتا ڕاجیایی لەسەرە.

### جۆرەکانی شەریعەتەکانی پێشین:

٢٤٧- جۆری یەکەم: ئەو ئەحکامانەن کە لە قورئان یان لە سوننەتدا هاتوونو لەشەریعەتی ئێمەدا بەڵگەیان لەسەر هاتووە، کە فەرزن لەسەر ئێمەیش، هەر وەك چۆن لەسەر گەلانی پێش ئێمەیش فەرزبوون، جا ئەم جۆرەی ئەحکامەکان ڕاجیایی لەسەر نییە،

که شەرعە بۆ ئێمەیش‌و، سەرچاوەی شەرع بوونی، و بە بەڵگە بوونی سەبارەت بە ئێمە، هەر هەمان ئەو دەقانەیە کە بەو جۆرە لە شەریعەتی ئێمەیشدا هاتوون، وەك فەرزبوونی ڕۆژوو خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ لَعَلَّكُمۡ تَتَّقُونَ ﴿١٨٣﴾ ﴾[1] واتە:ئەی باوەڕداران، ڕۆژوو لەسەرتان پێویست کراوە، هەر وەك لەسەر گەلانی پێش ئێوەیش پێویست کرابوو، بەهۆی ئەم پەرستشەوە، لەخودا بترسن.

٢٤٨- **جۆری دووەم:** ئەو ئەحکامانەن کە خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا باسی کردوون‌و، گێڕاونیەتییەوە، یاخود پێغەمبەر (ﷺ) لە سوننەتی خۆیدا ڕوونی کردوونەتەوەو، لە شەریعەتی خۆیشماندا بەڵگە هەیە، لەسەر ئەوەی کە نەسخ کراوەتەوەو، لەسەر ئێمە نییە، پێوەیانەوە پابەند بین، واتە:ئەو ئەحکامانە تایبەتین، بەو گەلانەی پێشووەوە، ئەم جۆرە هیچ ڕاجیاییەکی لەسەر نییە، کە شەرع نین بۆ ئێمە، لەوانەیش وەك ئەوەی کە لە قورئانی پیرۆزدا هاتووە، کە دەفەرموێت: ﴿قُل لَّآ أَجِدُ فِي مَآ أُوحِيَ إِلَيَّ مُحَرَّمًا عَلَىٰ طَاعِمٖ يَطۡعَمُهُۥٓ إِلَّآ أَن يَكُونَ مَيۡتَةً أَوۡ دَمٗا مَّسۡفُوحًا أَوۡ لَحۡمَ خِنزِيرٖ فَإِنَّهُۥ رِجۡسٌ أَوۡ فِسۡقًا أُهِلَّ لِغَيۡرِ ٱللَّهِ بِهِۦۚ فَمَنِ ٱضۡطُرَّ غَيۡرَ بَاغٖ وَلَا عَادٖ فَإِنَّ رَبَّكَ غَفُورٞ رَّحِيمٞ ﴿١٤٥﴾ وَعَلَى ٱلَّذِينَ هَادُواْ حَرَّمۡنَا كُلَّ ذِي ظُفُرٖۖ وَمِنَ ٱلۡبَقَرِ وَٱلۡغَنَمِ حَرَّمۡنَا عَلَيۡهِمۡ شُحُومَهُمَآ إِلَّا مَا حَمَلَتۡ ظُهُورُهُمَآ أَوِ ٱلۡحَوَايَآ أَوۡ مَا ٱخۡتَلَطَ بِعَظۡمٖۚ ذَٰلِكَ جَزَيۡنَٰهُم بِبَغۡيِهِمۡۖ وَإِنَّا لَصَٰدِقُونَ ﴿١٤٦﴾﴾[2] واتە: بەوانە کە لەخۆیانەوە ئەو ئاژەڵ‌و مەڕ و ماڵاتە یاساغ دەکەن، بڵێ، لەو شتانەدا خوای گەورە بەوەحی بۆی ناردووم، شتێك نابینمەوە خواردنی لە کەسێك حەرام بێت، باشە! ئێوە ئەو هەمووشتانەتان چۆن حەرامکرد؟! بێجگە لە مردارەوە بوو، یان خوێنێکی ڕژێندراو، یان گۆشتی بەراز، کە بێگومانە ئەو بەرازە هەموو گیانی پیس و قێزەونە، یان مەگەر ئاژەڵێ کە بە ناوی غەیری خوداوە سەربڕا بێت، دیارە ئەو جۆرە سەربڕینەیش فیسق‌و لە سنور دەرچوونە، و خواردنی یاساغە، دەسا چاك بزانن کە هەر ئەو جۆرە شتانە حەرامن، نەك ئەوانەی وا ئێوە بە ئارەزووی خۆتان حەرامیان دەکەن، ئینجا هەر کەسێك بە ناچاری و بە بێ ئارەزوو ئەو حەرامانە بخوات، و لە ئەندازەی پێویست نەچێتەدەر، هیچ گوناهێکی ناگات، چونکە بەڕاستی پەروەردگارت لێبوردە و میهرەبانە، ئینجا گۆشتی هەموو ئاژەڵێکی

---

[1] البقرة (١٨٣).

[2] سورة (ألانعام/ ١٤٥-١٤٦).

چـرنووكدار، باڵـدار بـێ یـان ئـاژەڵ، لەسـەر جوولەكـەكان حـەراممان كـرد، و لـە گۆشـتی ڕەشەوڵاخ و مەڕ و بزنیش پیوو چەوری سەرپشتو ڕیخۆڵـەكانیان نـەبێت، یـان ئـەو پیـوەی تێكەڵی ئێسك بووبێت، واتە: چەوری قەبرغەو دووگ، لێمان حەرام كردن، جا ئەم تۆڵەیـەمان لەبـەر سەركەشـی و یـاخی بوونیـان بـوو، بێگومـان ڕاسـتگۆو دادپـەروەریش بـووین، لـە بڕیارەكانماندا.

هەروەها پێغەمبەر (ﷺ) دەفەموێت: (وَأُحِلَّتْ لِي المَغَانِمُ وَلَمْ تَحِلَّ لِأَحَدٍ قَبْلِي)، واتـە: دەست كەوتی جەنگ بۆمن حەڵاڵكراوەو، بۆ هیچ پەیامبەرێكی پێش من حـەڵاڵ نـەبووە، كـە لەم بەڵگانەدا ئایەتەكە دركاندنی حەرامبوونی شتگەلێكی تیادابوو، كـە لەسـەر ئێمـە حـەرام نییەو، تەنانەت حەڵاڵیش كراوە بۆمانو، فەرمودەكەیش بەڵگەیە لەسەر حەڵاڵی دەسـكەوتی جەنگ بۆ مسوڵمانان، كەچی لەسەر گەلانی پێشوو حەڵاڵ نەبووە !

٢٤٩- **جۆری سێیەم**: ئەو ئەحكامانـەن، كـە لـە قورئـانو سـوننەتی پێغەمبەرەكەمانـدا (ﷺ) باسیان لێوە نەكراوەو، ئەم جۆرەیش بەبێ بوونی هـیچ جـۆرە ڕاجیاییـەك لـە نێـوان زانایاندا، نابنەشەریعەت بۆ ئێمە.

٢٥٠- **جۆری چوارەم**: ئەو ئەحكامانەن، كە دەقی قورئانو سوننەتیان لەسەر هاتوون، بەلام لەدووتوێی ئەو دەقانەدا بەڵگەیەك بەرپا نەبووە كەدەلالەت بكات لەسەر مانەوە یاخود نەمانەوەی ئەو حوكمە سـەبارەت بـە ئێمـە، وەك خـوای پـەروەردگار دەفـەرموێت: ﴿ وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ وَٱلْأَنفَ بِٱلْأَنفِ وَٱلْأُذُنَ بِٱلْأُذُنِ وَٱلسِّنَّ بِٱلسِّنِّ وَٱلْجُرُوحَ قِصَاصٌ ﴾[1] واتـە: ئێمـە لـە تەوراتـدا لەسـەر بـەنی ئیـسرائیلمان نووسیو بڕیارماندا، كە تۆڵەی كوشتنی گیانێك گیانێكە، واتـە ئەگـەر كەسـێك كـوژرا، تـەنها بكوژەكەی دەكوژرێتەوەو، نابێ دەسـت بـۆ كەسـێكی تـر ببرێـتو، چـاو لـەباتی چـاو لـووت لەجیاتی لووتو، گوێ لە جیـاتی گـوێو، ددان لـەجیاتی ددانو، هـەموو زامو برینێكیش بـە گوێرەی خۆی قیاسو تۆڵەی هەیە.

جـا ئـەم جـۆرە هـەمان ئـەو جۆرەیـە كـە ڕاجیـایی نێـوان زانایـانی لەسـەرەو، سـەبارەت بەئاستی بەڵگە بوونی بۆ ئێمە دیسان ڕاجیایی هەیـە، هەنـدێ لـە زانایـان وەك حەنەفیـەكان بەبەڵگەی دەزانن‌و، بە بەشێك لە شەریعەتی خۆمانی دادەنێنو، گروپێكی تر لە زانایان ڕایان وایە، كە بۆئێمە نابنە شەریعەتو، هەر گروپەو بۆ پاڵپشتی ڕاكەی خـۆی ژمارەیـەك بەڵگـەی

[1] سورة (المائدة/ ٤٥).

هێناوە[1].

٢٥١- لەڕاستیدا ئەم ڕاجیاییە گرنگ نییە، چونکە ڕاجیاییەکە لە حاڵەتی پراکتیکیدا ڕەنگ ناداتەوەو، تەنها تیۆرییەو، هەر حوکمێك لە ئەحکامەکانی شەریعەتەکانی پێشوو، خودا بۆ ئێمەی باسکردووە، یاخود کە پێغەمبەر (ﷺ) بۆ ئێمەی ڕوون کردۆتەوە، بەدڵنیاییەوە لە شەریعەتی خۆماندا بەڵگە هەیە، لەسەر هەڵوەشاندنەوەی ئەو حوکمە، یاخود لەسەر مانەوەی ئەو حوکمە لەسەر ئێمەیش، ئیتر چونیەکە بەڵگەی مانەوەی حوکمەکە یاخود هەڵوەشانەوەکەی لەدوو توێی ئەو دەقەکەدا هاتبێت، کە حوکمە شەرعییەکەی گەلانی پێشوومان بۆ باس دەکات، یاخود بەڵگەکە لە جێگایەکی تری دەقەکانی قورئانو سوننەتتدا دەرکەوتبێت، هەر چونیەکە.

لێرەدا بۆ پاڵپشتی قسەکەی خۆمان باسی چەسپاندنی ئەو ئەحکامانە دەکەین کە لە ئایەتە پێشووەکەدا هاتبوون، بەسەر ئێمەیشدا، کە ئایەتەکە فەرمووی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ .........﴾، کە بە بەڵگە گەلێك لە شەریعەتی خۆماندا دەیسەلمێنین، کە ئەم حوکم گەلە لە بۆ ئێمەیشن، چونکە هەندێ خەڵك بانگەشەی ئەوە دەکەن، کە تۆڵە سەندنەوە لەسەر ئەندامەکانی لەشو بریندار کردن، ئەمە نەکراوەتە شەرع بۆ ئێمە، و بەڵکو ئەوە شەریعەتی گەلانی پێش ئێمەیە و لەسەر ئێمە نییە، کە پێوەی پابەند بین، و ئەمەیش غایەلەیەکی ڕووتو قوتە، و لەسەر بنەمای بەڵگە دانەمەزراوە، و ڕاجیایی لە نێوان زانایاندا نییە کە حوکم گەلی ئەم ئایەتە پیرۆزە لەسەر ئێمەیش پێویست کراونو، بەشێکن لە شەریعەتی ئێمەو، هەر کەس ئاگاداری پەرتوکی شەرعزانانی سەرجەم ڕەوتە فیقهییە جیاوازەکان بێت، ئەوە دەزانێت، کە بەشێکی تایبەتیان تیادا هەیە، کە سەبارەت بە تۆڵەسەندنەوەیە لەسەر گیانو ئەندامەکانو، ئەم حوکمەیش بە بێ ڕاجیایی چەسپێنراوە لەسەر ئێمەیشو دەبێت پێوەی پابەندبین.

**ئیمامی شافیعی** (ڕەحمەتی خوای لێ بێت)، سەبارەت بەم ئایەتە پیرۆزە دەفەرموێت: خوای پەروەردگار باسی ئەو شتانەی کردووە لە تەوراتدا کە لە لەسەر بەنی ئیسرائیل پێویست کراونو، فەرمویەتی: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ وَٱلْعَيْنَ بِٱلْعَيْنِ

---

[1] بڕوانە ((المستصفی)) ل١٣٢و دواتر، والآمدي ب٤، ل١٨٦ و دواتر، وشرح مسلم الثبوت، ب٢، ل١٨٤-١٨٥، المسودة، ل١٩٣، الأحکام، لأبن حزم، ب٥، ل٧٢٤، التلويح والتوضيح، ب٢، ل١٦.

..........﴾[1] جا من لەم بارەیەوە ڕاجیاییەك پێ نازانم، كە تۆڵە سەندنەوە لەناو ئەم گەلەدا، بە هەمان ئەو جۆرەیە كە خودا سەبارەت بە ئەهلی تەورات (جولەكەكان) باسی كردووە، و هەروەها هیچ ڕاجیاییەكیشم لەسەر ئەوە نەدیوە، كە تۆڵە سەندنەوە لە نێوان دوو كەسی ئازادی مسوڵماندا، لەسەر كوشتن بە تەواوەتی، و كەمتر لەوە، واتە بریندارکردن بوونی هەیە، بەڵام بریندارکردنێك كە دەتوانرێت تۆڵەی لێ بكرێتەوە، بە بێ ئەوەی كە ئەو جێگایەی تۆڵەی بریندارکردنی لێدەكرێتەوە، دەبێت وەك خۆی بێت، و تیاچوونی تەواوەتی بەدوادا نەیەت[2].

هەروەها لە پەرتووكی (المغني) ئیبن قودامەی مەقدیسیدا هاتووە، كە دەفەرموێت: مسوڵمانان كۆڕان لەسەر ئەوەی كە تۆڵەسەندنەوە لەسەر غەیری گیان، واتە برینداركردن و تۆڵەی ئەندامەكان دروستە، ئەگەر دەگونجا و دەكرا[3].

هەروەها پێشەوا ئیبن كەسیر لە تەفسیرەكەیدا، ئیجماعێكی باسكردووە، كە هەیە، لەسەر پێویستی كاركردن بەمەغزای ئەو ئایەتە پیرۆزە[4].

جا ئەحكامەكانی ئەم ئایەتە بۆ ئێمە كار پێكراون لەسەر ڕای هەردوو ئەو گروپەی كە (شرع من قبلنا) بە بەڵگە دادەنێن و هەروەها ئەو گروپەی كە پێچەوانەن، گروپی یەكەم بە بەڵگەی دەزانن، بەپێی مەزهەبەكەی خۆیان، و گروپی دووەمیش هەر دەیكەنە بەڵگە چونكە بەڵگە هەن لە شەریعەتی خۆماندا، كە دەلالەت لەسەر بوون بەشەرعیان دەكەن بۆ ئێمەیش، لەو بەڵگانەیش، وەك :

- یەكەم: خوای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿كُتِبَ عَلَيْكُمُ ٱلْقِصَاصُ فِى ٱلْقَتْلَى ﴾[5] واتە: لە كوشتندا تۆڵەسەندنەوە لەسەرتان پێویست كراوە، و هەروەها لە فەرموودەدا هاتووە، كە دەفەرموێت: (والعمد قَوَدٌ ، إلاّ أن يعفو وَلِيُّ القَتِيل)، واتە لەكوشتنی دەست ئەنقەستدا كوشتنەوە پێویستە، مەگەر كەسی یەكەمی خاوەن كوژراوەكە لێی ببورێت، و هەروەها لە فەرموودەیەكی تردا دەفەرموێت: (وَمَنْ قُتِلَ لَهُ قَتِيلٌ فَهُوَ بِخَيْرِ النَّظَرَيْنِ: إِمَّا أَنْ يُفْدَى، وَ إِمَّا أَنْ يُقْتَلَ)، واتە: ئەگەر كەسێك بەدەستی ئەنقەست كوژرا، ئەوە كەسی یەكەم و خاوەنەكەی

---

[1] سورة (المائدة/ ٤٥).

[2] أحكام القرآن، للأمام الشافعي، ب١، ل٢٨٠-٢٨١.

[3] المغني، ب٧، ل٧٠٢-٧٠٣.

[4] تفسير إبن كثير، ب٢، ل٦٢.

[5] سورة (البقرة/ ١٧٨).

دەتوانێت یەکێك لەم دووکارە ئەنجام بدات، یان پارە لەبکوژ وەربگرێت و لێی ببورێت، یاخود بیکوژێتەوە.

ئەم بەڵگانە ڕاشکاوانە دەلالەت دەکەن، لەسەر پێویستی تۆڵەسەندنەوە لە کوشتنی بە ئەنقەسدا، و کوشتنەوەیش یەکێکە لەو حوکمانەی کە لە ئایەتەکەی پێشوودا هاتبوو، کە ئێمە قسەمان دەربارەی دەکرد.

دووەم: پێغەمبەر (ﷺ) بڕیاری داوون، لەسەر تۆڵەسەندنەوە لەسەر بریندار کردن[1] و، هەروەها لەسەر تۆڵەکردنەوە لە ددان شکان، بەڵام کابرای ستەملێکراو لێبوردە بووە، تۆڵەی نەکردۆتەوە[2].

سێیەم: هەروەها لە پێغەمبەر (ﷺ) گێڕدراوەتەوە، کە فەرموویەتی: ((من أصيب بدمٍ، أو خَبْلٍ ، أي: جراحٍ، فهو بالخيار، بين إحْدَى ثَلَاثٍ ، ما آن يقتص، او يأخذ العقل، أي: الدية، أو يعفو))[3]، واتە: ئەگەر کەسێك دووچاری کوشتن، یان بریندار کردن بوویەوە، سەرپشکە لە نێوان ئەم سێ حوکمەدا، یان تۆڵە بەکوشتنەوە ئەنجام دەدات، یاخود خوێن وەردەگرێت و، واتە پارەو سامان، یاخود کابرای تاوانبار دەبورێت.

– چوارەم: خوای مەزن دەفەرموێت: ﴿فَمَنِ ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ فَٱعْتَدُوا۟ عَلَيْهِ بِمِثْلِ مَا ٱعْتَدَىٰ عَلَيْكُمْ﴾[4] واتە هەر کەس دەستدرێژی کردە سەرتان ئەوا ئێوەیش لە تۆڵەدا هەر هێندەی ئەو تۆڵە بکەنەوەو زیادە ڕەوی مەکەن زانایان دەفەرموون: لە ژێر ڕۆشنایی ئەم ئایەتە پیرۆزەدا، تۆڵەسەندنەوە بە کوشتنەوە و تۆڵەسەندنەوەی ئەندامەکان و بریندار کردن بوونی هەیە، ئەو تۆڵەسەندنەوە بریندار کردن و بەبریندار کردن و ئەو ئەندامانەی کە لەم ئایەتەدا هاتبوون، کە دەفەرموێت[5]: ﴿وَكَتَبْنَا عَلَيْهِمْ فِيهَآ أَنَّ ٱلنَّفْسَ بِٱلنَّفْسِ﴾[6] واتە: لە سەرجەم ئەمانەوە بۆمان ڕوون دەبێتەوە، کە ئەحکامەکانی ئایەتەکانی تۆڵەسەندنەوە کە بۆ گەلانی پێشوو هەبووە و، شەرع بووە بۆ ئەوان بۆ ئێمەیش هەر چەسپاون، بەو بەڵگانەی کە لە شەریعەتی ئێمەدا هەن، و دەبنە بەڵگە لەسەر ئەم ڕاستییە.

---

[1] أقضية الرسول (ﷺ) للشيخ عبدالله بن محمّد بن فرج، ل ٩.

[2] هەمان سەرچاوە، ل١٣.

[3] نيل الأوطار، للأمام الشوكاني، ب٧، ل٧.

[4] سورة (البقرة/ ١٩٤).

[5] الأمدي، ب٤، ل١١٩، المستصفى، للأمام الغزالي، ب١، ل١٣٤–١٣٥.

[6] سورة (المائدة/ ٤٥).

# ﴿بەشی یانزدەهەم﴾

## ((بەڵگەی یانزدەهەم:- ئیستیصحاب))

### - پێناسەکەی:

٢٥٢- ئیستیصحاب، لە زمانی عەرەبیدا بەمانای ویستی هاوڕێیەتیو بەردەوامی پێدانی هاتووە، و لە زاراوەی زانایانی زانستی ئوصولی فیقهدا بریتییە لە بەردەوامی پێدانی جێگیر بوونو چەسپاندنی ئەو شتانەی کە پێشتر جێگیر بوونو، هەروەها بەردەوامی پێدانو نەچەسپانی ئەو شتانەی کە پێشتر نەچەسپاو بوون[١]، یاخود بریتییە لە هێشتنەوەی شتێ، لەسەر ئەو شێوازەی کە هەبووە، ئەگەر فاکتەرێ نەبێت، لە ئارادا کە بیگۆڕێت[٢]، جا بۆیە هەر شتێك زانرا، کە لە ڕابردوودا هەبووە، بەڵام دواتر دڵە ڕاوکێ دروست بوو، لەسەر ئەوەی کە لەوانەیە لەسەر ئەو شێوازە نەمابێت، ئەوا حوکم دەدەین لەسەر مانەوەی ئەمە وەك هاوڕابوونێ لە گەڵ بوونی ئەو شتەدا لە ڕابردوودا، بەڵام شتێ کە زانرا لە ڕابردوودا، نەبووە بەڵام دواتر لە دڵدا خورپەیەك پەیدا بوو، لەسەر بوونی ئەوا هەر حوکم دەدەین، لەسەر نەبوونەکەی، وەك هاوڕێو هاوڕابوونێ لەسەر نەبوونی ئەو شتە، لە ڕابردوودا.

لەم ڕوانگەیەوە، هەر کەس لەکاتێکی دیاریکراودا زانرا، کە لە ژیاندا بووە، ئەوە هەر حوکم بە بەردەوامی ژیانی ئەو کەسە دەکەین، تا بەڵگەیەك پەیدا دەبێت، لەسەر مردنیو، هەرکەس ئافرەتێکی مارەکرد، بەنرخی کچایەتیو، دواتر لە دوای خەوتن لەگەڵیدا، بانگەشەی ئەوەی کرد، کە ژن بووە! ئەوە قسەکەی بەبێ بوونی بەڵگە وەرناگیرێت، ئەمەیش وەك هاوڕێو هاوڕابوونێ لەگەڵ بوونی کچایەتیدا لەو ئافرەتەدا، چونکە ئەو حاڵەتە حاڵەتە ئەسڵیەکەیە، کە هەر لەسەرەتاوە لەسەر ئەو بنەمایە گەشەی کردووە، وە هەرکەس سەگێکی کڕی، بە نرخی ئەوەی کە ((سەگی پۆلیسییە)) کە بە چاکی شوێن پێ وەردەگرنو شوێنەوار ناسن، و هاوکاری دەکەن لە بەرامبەر ئاشکرا کردنی تاوانەکاندا، یاخود بە نرخی سەگی ڕاو یان تانجی ڕاو کڕی، بەڵام دواتر کڕیار بانگەشەی ئەوەی کرد، کە سەگەکە توانای ئەو کارانەی نییەو، ئەو خەسڵەتانەی تیادانییە، قسە لێرەدا، قسەی کابرایە، و قسەکەی لێ وەردەگیرێت، مەگەر بەڵگەیەك بێتە ئاراوە، کە قسەکەی ڕەت بکاتەوە، ئەمەیش وەك

---

[١] إعلام الموقعين، ب١، ل٢٩٤.

[٢] الشوكاني، ل٢٠.

هاوڕێو هاوڕابوونێ لە گەڵ حاڵەتە نەبوونیەکەی ڕابردوودا، چونکە لە ئەسڵدا نەبوونی ئەو وەصفو خەسڵەتە لە ئارادا هەیە، و دواتر ئەو حاڵەتە لەو سەگەدا بە ڕاهێنان تیایدا دروست دەکرێت، و فێر دەکرێت.

## ٢٥٣- جۆرەکانی ئیستیصحاب:

**- یەکەم: ئیستیصحاب، حوکمی موباح بوونی ئەسڵیی شتەکانی هەیە:**[1]

شتە سوودمەندەکانی، وەك خواردنو خواردنەوەو ئاژەڵو ڕووەكو بێ گیانەکان، کە بەڵگە نییە، لەسەر حەرام بوونیان، ئەمانە موباحن، چونکە موباحو حەلاڵ بوون حوکمی بنەمایىو ئەسڵی شتەکانی ناو ئەم بوونەوەرەیە، و ئەو شتانەی کە حەرامن لە بوونەوەردا، بە بەڵگەی شەرعی حەرام دەبن، لەبەر هۆکاری زیانمەند بوونیان.

بەڵگە لەسەر ئەوەی کە حوکمی ئەسڵیی شتەبەسوودەکان، بریتییە لە موباح بوونیان ئەو فەرمایشتەی پەروەردگارە، کە وەك پێزانینێ بەسەر بەندەکانیدا دەفەرموێت: ﴿وَسَخَّرَ لَكُم مَّا فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِي ٱلۡأَرۡضِ جَمِيعٗا مِّنۡهُ﴾[2] واتە: هەر چی لە ئاسمانەکانو زەویدا، هەیە هەر هەموو خودا بە میهرەبانی خۆی بۆ ئێوەی ڕامکردووە، جا پێزانین (إمتنان) و ڕامکرن (التسخیر) بە تەواوی کامڵ نابن، و پڕ بە پێست نابن، تا کاتێك کە سوود وەرگرتن لەو دروستکراوانە موباح نەبێت، بەڵام شتە زیانمەندەکان، ئەسڵ تیایاندا حەرام بوونە، لەبەر ئەم فەرمایشتەی پێغەمبەر (ﷺ) کە دەفەرموێت: (لَا ضَرَرَ وَ لَا ضِرَارَ)، واتە: کەس مافی زیان لە خەڵکدانی نییە، و تۆڵەی زیانگەیاندنیش، بەزیان گەیاندن نابێت.

**- دووەم: ئیستیصحابی بەڕائەتی ئەسڵیی، یان عەدەمی ئەسڵیی:**

پەیامی تەکلیف لەسەر شان بوونی مرۆڤ، ئەکتیف ناکرێت تا بەڵگەیەك لە سەر بوونی تەکلیف لەسەری پەیدا نەبێت، کەواتە ئەگەر کەسێك بانگەشەی ئەوەی کرد، کە مافی لەسەر کەسێکی دیاریکراو هەیە، ئەوە سەلماندنی ئەم داوایەی لەسەرە، چونکە داوای شتێتێکی پێچەوانەی ئەسڵ دەکات، پێویستە بەڵگەیەکی پێ بێت، کە ئەو داوایەی خۆی

---

[1] لطائف الأشارات، ل٥٥-٥٦.

[2] سورة (الجاثية/ ١٣).

پـێ بـچەسپێنێت، و هـەروەها تۆمـەتبار لەئەسلّدا دووره لـەو تۆمەتـەی بـۆی کـراوە، و نموونەیەکی تر وەك ئەوەی کە ئەگەر دووکەس شەریك بوون لە کاسپییەکدا یـەکێیان گـوتی: خێرمـان نـەکردووە، ئـەوە قـسەکەی لێ وەردەگیرێـت، چـونکە ئەسـلّ تیایـدا، قـازانج نەکردنەکەیە، بۆیە ئەو قازانج نەکردنە دەکرێتە هاوڕێو هاوڕای ئەسلّەکە، کـە نەبوونەکەیـە، تاوەکو بە بەلّگە خێرەکەی لەسەر دەچەسپێنرێت.

- **سێیەم: ئیستیـصحابو مانـەوەی ئەو وەصـفەی کـە چەسپێنەری حوکمـە شەرعییەکەیە، تا کاتێك کە بەلّگەی پێچەوانە پەیدا دەبێت:**

بۆیە هەر کەسێك چەسپا، کە فلّانە خانوو، یان سامانی گواستراوە، هی ئـەوە، ئـەوە هـەر ئەو مولّکیەتەی بۆ دەمێنێتەوەو، ئێمەیش هەر بڕیار بەوە دەدەیـن، مەگـەر بەلّگەیـەك بێتـە ئـاراوەو پەیـدا ببێـت، کـە دەلالـەت بکـات لەسـەر ئـەوەی کـە ئـەو کەسـە فـڕی نـەماوە بـە خاوەنێتی ئەو مولّکەوە، وەك ئەوەی کە فرۆشتبێتی، یان کردبێتیە وەقـف، یـان بـە خـەلّات دابێتـی بـە خـەلّك، و هـەروەها وەك لـە ئەسـتۆدا بـوونی قـەرز، لـەکاتی بـوونو مانـەوەی هۆکارەکانیدا، وەك پابەندبوون وایە بە مولّکێکەوە، یان بـە لـەناوبردنی مـولّکی کەسـێکەوە، هەروەك چۆن لەسەر لەناوبەرە بیبژێرێت، ئەمیش هەروایەو لە ئەستۆیدایە مەگـەر بەلّگەیـەك پەیدا ببێت، پرۆسەکەی بگۆرێت، واتە، یاخود مەگەر بەلّگەیەك پەیدا ببێت، ئەو لە ئەسـتۆدا بوونـەی قـەرزە لا بـەرێت، بـەوەی کـە بەلّگەکـە بیسەلمێنێت، کـابرای قـەرزار قەرزەکـەی داوەتەوە، بەخاوەنەکەی یاخود کابرای داواکار لەقەرزەکـەی خـۆش ببێـتو، هـەروەها وەك جێگیر بـوونی حـەلّالێتی ژنو پیـاو لـە یـەکتری بـە هـۆی گرێبەسـتی مـارە کردنـەوەو، ئـەم گرێبەستە هەر بەردەوامە، تا بەلّگەیەك بەر پابێت، کە دەلالەت بکات، لەسەر جیابوونـەوەی ئەو دووکەسە لەیەکتریو هتد....

## ٢٥٤- بە بەلّگە بوونی ئیستیصحاب:

ئیستیصحاب، لەلای حەنەفییەکانو هاوڕاکانیان بەلّگەیە، بۆ هێشتنەوەی شتەکان لەسـەر ئەو شـێوازەی کـە هەیانـەو، لادانـی پێـچەوانەکانیانو، ئەمـەیش مانـای ئـەو قسەیەیانە کـە دەڵـێن: ئیستیـصحاب بەلّگەیـە، بـۆ ڕەتکردنـەوەی گـۆڕانی حـوکم نـەوەك بـۆ چەسـپاندنی حوکمی نوێ، بەلّام لەلای حەنبەلیو شافعییەکان بەلّگەیە بۆ هەردووکیان، چ بۆ هێـشتنەوەی حوکمو مافێکی جێگیر و چ بۆ سەلماندنی مافێکی تازە، واتە: بۆ دەفعیشو بـۆ ئیسباتیش،

یاخود بە مانایەکی تر، واتە: بۆ چەسپاندنی حوکمە پێشینەکە، و خستنە قاڵبی ئەوەی کە بە بەڵگەیەکی نوێی ئامادە دیسان چەسپێنراوەتەوە، چونکە ئیستیصحاب لایەنی مانەوەی گومانی مرۆڤـ زیاتر بەلای ئەوەدا دەبات، کە ئەو شتە لەسەر ئەو شێوازە ماوەتەوە، کە هەیبووە، و (گومانی پەشتڕاستکراوە: الظـن الـراجح)یش، لە ئەحکامە شەرعییە پراکتیکییەکاندا بایەخدارە، جا لەم ڕاجیاییەوە پرسی ڕاجیایی لەسەر کەسی وون بوو، قوت بووەتەوەو، ڕەنگی داوەتەوە، کە ئەم کەسە وون بووە، لە لای حەنەفییەکان بەزیندوو ئەژمار کراوە، بەپێی یاسای ئیستیصحاب، بۆیە حوکمی زیندووی بەسەردا دەدرێت، سەبارەت بەماڵو سامانیو مافەکانی، لەکاتی وونبوونیدا، بۆیە ماڵو موڵکی بەسەر میراتگرەکانیدا دابەش ناکرێتو، هاوسەرەکەی لێ جیاناکەینەوە، بەڵام ئەم ژیانە گریمانەییەی نابێتە هۆکار بۆ دەست کەوتنی مافی نوێ، واتە بۆ چەسپاندنی مافێك، کە ناکرێت بۆ کەسی وون بوو، لەکاتی ونبوونیدا بچەسپێنرێت، بۆیە میرات، لە میرات دەرەکەی نابات، ئەگەر میرات دەرەکە پێش وونبووەکە مرد، واتە مافی ئەوەی نییە کە ئەو بەشەی کە هەیەتی، بۆی دابنرێتو، بەڵکو ئەو بەشەی ئەو تا بەدیارکەوتنی چارەنووسەکەی هەر بەوەستاوی دەهێڵرێتەوە، جا یان دەردەکەوێت، کە زیندووەو، جا بەشە وەستێنراوەکەی پێ دەدرێت، و یاخود بە فەتوای قازی مردنی ئەو کەسە دەچەسپێنرێت، و بەشەکەی بەسەر ئەو میراتبەرانەیدا دابەش دەکرێت، کە لەو کاتەدا لە ژیاندان.

بەڵام ئەوانەی کە ئیستیصحاب لە هەموو حاڵەتێکدا، چ بۆ هێشتنەوەی حوکمو مافێکی جێگیر و چ بۆ سەلماندنی مافێکی تازە، واتە بۆ دەفعیشو، بۆ ئیسباتیش لەلای ئەمانە کەسی ونبوو، بەزیندوو دادەنرێت و بە تەواوی حوکمی کەسی زیندووی هەیە، لە لای ئەم گروپە و مافی موڵکایەتی لەسەر لانابرێتو، هاسەرەکەیی لێ جیا ناکرێتەوە، و ئەگەر میراتدەرەکەی لە پێشەوە مرد، ئەوا میراتی لێ دەباتو، هەروەها بەشە وەسیەتی پێ دەدرێتو، نموونەی ئەم ڕاجیاییە یان، وەك ئەو ڕاجیاییە وایە، کە لەسەر سوڵح کردنو ئاشتەوایی هەیانە، لەسەر پرسێك کە تۆمەتبار نکۆڵی دەکات، کە ئەو تاوانەی کردبێت، کە لەم پرسەدا حەنەفییەکان ڕایان وایە کە دەرەنجامی ئەم پرۆسەی ئاشتەواییەی نێوان سکاڵاکارو تۆمەتباری نکۆڵیکار دروستە، بەڵام غەیری حەنەفییەکان، وەك شافعییەکان بەدروستی نازانن، و بەڵگەیشیان ئەوەیە کە ئیستیصحاب لە هەموو حاڵەتێکدا بەڵگەیە، چ بۆ دەفع و چ بۆ ئیسباتیش!

## ٢٥٥- تێبینییەکان لە سەر ئیستیصحاب:

- یەکەم: لەڕاستیدا، ئیستیصحاب، حوکمێکی نوێ جێگیر ناکات، بەڵکو بەردەوامی دەدات، بەو حوکمە ڕابردووەی کە جێگیر بووە، بەهۆی بەڵگەیەکی بایەخدارەوە، کەواتە: ئیستیصحاب لەخودی خۆیدا بەڵگەیەکی فیقهی نییەو، هەروەها سەرچاوەیەکیش نییە، کە حوکمی لێوە هەڵبهێنجرێت، بەڵکو تەنها نیشانەیەکە لەسەر مانەوەی حوکمە پێشووەکە، ئەو حوکمەی کە بە بەڵگە چەسپێنراوە.

- دووەم: تا بەڵگەی تایبەت لەسەر هەر پرسێك هەبێت، ناچین بەلای ئیستیصحابدا، ئەوە کە بەڵگە نەبوو، جا دەچینە لای بەجۆرێك کە کەسی شەرعزان لێکۆڵینەوە دەکات، و تەواوی هەوڵی خۆی لە گەڕان بە دوای بەڵگەدا دەخاتە گەڕ، کە دەستی نەکەوت، ئیتر دەگەڕێتەوە بۆلای ئیستیصحاب، هەر بۆیەش هەروەك هەندێکیان دەڵێن: کە ئیستیصحاب دوا پێگەی خولانەوەیە، لە فەتوادا، چونکە موفتی ئەگەر سەبارەت بە پرسێك پرسیاری لێکرا، ئەوا بۆ دەسکەوتنی حوکمەکەی لە قورئانو سوننەتدا دەگەڕێت، و تا سەرچاوەکانی تریش......... جا کە حوکمەکەیی نەدۆزییەوە، ئەوا لە ئیستیصحابدا بەهەردوو بەشی دەفعو ئیسباتەکەیەوە حوکمەکەی دەست دەخات، ئەگەر دڵە خورپەی هەبوو، لەسەر نەمانی حوکمەکە، ئەوە ئەسڵ تیایدا مانەوەیەتیو، ئەگەر دڵە ڕاوکێی هەبوو، لەسەر جێگیر بوونی، ئەوە ئەسڵ تیایدا جێگیر نەبوونیەتی![1]

## ٢٥٦- ئەو یاساو ڕێساو میتۆدانەی، کە لە سەر بنەمای ئیستیصحاب بنیات نراون، و یاخود لە هەناوی ئەو هاتونەتە دەرەوە، لەوانە:

یەکەم: (الأصل فِي الأشياء الأباحة)، ئەسڵی شتەکان هەموویان ئەوەیە کە حوکمدا موباحنو حەڵاڵنو، لە هەناوی ئەم یاسا ئەسڵیەوە ئەو حوکمە تایبەتە هاتووەتە دەرەوە، کە سەرجەم گرێبەستو هەڵسو کەوتو مامەڵە جۆراو جۆرەکانی نێوان خەڵکی، موباحن، مەگەر دەقێك بێتە ئاراوە کە حەرامیان بکاتو، ئەمەیش ڕای گروپێکە لە شەرعزانەکان.

- دووەم: ئەسڵ ئەستۆ پاکییە، لەسەر مرۆڤ، و لە سەرجەم پرسە مەدەنیو سزادانەکاندا وەك یەك کار بەم ئەسڵە کراوە، بۆ نموونە ئەگەر کەسێك بانگەشەی ئەوە

---

[1] الشوكاني، ل٥٠٨.

بكات، كە مافێکی (وەك قەرزی))، لەسەر کەسێکی تر هەیە، ئەوە لەئەسڵدا حوکمەکە ئەوەیە کە ئەو مافە لەسەر کەسی دووەم نییە تا کاتێك کە سکاڵاکار بە بەڵگە ئەو داوایەی خۆی بسەلمێنێت، هەروەها وەك ئەوەی کە تۆمەتبارێ تاوانە تا تاوانەکەی بە بەڵگە دەچەسپێنرێتو، ئەم قسەیەش هەر لەمەوە هاتووە، کە دەڵێت: بوونی گومانیو ڕاڕایی دەبێت لەبەرژەوەندی تۆمەتباردا بەکار بهێنرێت، و هەڵەکردن لە چاو پۆشینی تۆمەتباردا باشترە لە هەڵەکردن لە تاوانبارکردنی کەسی بێ تاواندا.

– سێیەم: دڵنیایی بەگومانو ڕاڕایی لاناچێت، بۆیە هەرکەس دەستنوێژی گرتو دوایی گومانی بۆ پەیدا بوو، کە لەوانەیە دەستنوێژەکەی شکابێت، ئەوە هەر بەدەستنوێژدار ئەژمار دەکرێتو، هەرکەس چەسپا کە گرێ بەستی هاوسەرگیری ئەنجامداوە، ئەوە ئەو بڕیارەی لەسەر لاناچێت مەگەر بە بەڵگەیەکی دڵنیاکەرەوە، و هەرکەس بە ڕێگایەکی شەرعیی بوویە خاوەنی موڵکێك، تەنها لە کاتی بوونی هەڵسوکەوتێکی وادا، ئەو مافەی لەسەر لا دەچێت، کە ئەو هەڵسوکەوتە هۆکاری هەڵوەشانەوەی موڵکیەتەکە بێت، و عیللەتی ئەم یاسایەش ئەوەیە کە دڵنیایی (یقین) شتێکی بەدی هاتوو بووە، و گومانی تیادا نەبووە، بۆیە ئەو یەقینە دەکرێتە هاوڕێو هاوڕای بڕیارەکە، مەگەر بەڵگەیەك پەیدا ببێت لەسەر پێچەوانەکەی، بەڵام گومان بە تەنها خۆی ناتوانێت، کار لەسەر دڵنیایی (یەقین) بکات، بۆیە کار بە گومان ناکرێت.

والحمد لله اوّلاً، وَ آخِراً

وَ صَلّى اللهُ عَلى سَيِّدِنا مُحَمَّدٍ، وَ عَلى آلِهِ الطَّيِّبِينَ الطاهِرين، وَ عَلى أصْحابِهِ المُجاهِدين، وَ مَنْ تَبِعَهُم بِإحْسانٍ إلى يَوْمِ الدِّين.

## ﴿ دوا وتـار، بـۆ يـادگـار﴾

بەندەی ناتـەوان، لـە تـەواوی ئـەو خزمەتـە گـچکانەی لـە بـواری پـەرچـڤە و تـوێـژینـەوەی زانـستەکانی شـەریعەتدا – ئـەگـەر خـوا گـیان وەری گـرتبـن – پێشکەشیان دەکـەم، ئەگـەر چـی مەبەسـتم سـوودمەند بـوونی هـەموو تامەزرۆیـەکی زانـستی شـەرعییە، بـەڵام نایشارمەوە، کە زۆرینـەی ئاڕاستەی دڵـم لـە کارەکانمدا خزمـەت بـە حـوجرە، و فـەقێیانی نـاو حـوجرەیە، چونکە بـە هەقیقـەت ئـەوەی فێری بـووم، و دەیـزانم، هـەم هەوێنەکـەی لـە حـوجرە، و زەمـانی فەقێیەتیـدا وەرمگرتـووە، و هـەم بەشـی زۆری ئـەو کەمـە زانـستەی، خـوای گـەورە لـە فـەزڵی خۆیـەوە پێـی بەخـشیوین، هـەر زادەی کـونجی حوجرەکـان، و سـەردەمی زێڕینـی فەقێیەتییـە، ئەمـەیش ڕاسـتییەکە زۆر لا دەیـزانن، کـە لـە نـاو چـوار دیواری شڕ و دوکەڵاوی حوجرە گەلی مزگەوتەکانی کوردستاندا، بە ژیانێکی زۆر سادە، و کولەمـەرگی، فـەقێیان بـەخێو و پـەروەردە دەکـران، و زانایـان و ئـەدیبان و شـاعیری زۆر گـەورە گـەورەیان لـێ دەرچـوو، و ئەگـەر جیهـانی کـوردەواری تـا سـەدەی بیستەمیش لـە ئاسمـانی خوێندەواریـدا، لـە جیهانـەکانی تـرەوە دیـار بێـت، ئـەوا ئەسـتێرەی گەشـی ئـەو ئاسمانە، تەنها ئەم تیرەی فەقێ و مەلایە بوون، کە لـە حـوجرەوە بەرهـەم هـاتوون[1]، لـەم نێوەندەدا و سەبارەت بـە دەورانـی فەقێیەتـی، و ژیـانی حـوجرە، جـەنابی (مامۆسـتا مـەلا سـەیید مـستەفا مـەحموودیان – زەمزیـرانـی)، زانـای پایەبـەرزی ناوچـەی سـەردەشـت، لـە ڕۆژهەڵاتی کوردستان، جوانترین و دۆکیۆمێنتارترین پەڕتووکی، لـەم بارەیـەوە نووسـیوە، بە ناوی (فەقێ، و فەقێیەتـی لـە کوردسـتان)، کـە چاپی یەکـەمی لـە مێـژووی (١٣٨٢)ـی، کۆچی – هەتاوی، بەرامبەر بە ساڵی (٢٠٠٤)ـی، زایینی، لە لایـەن ناوەنـدی بڵاوکردنـەوەی ئیحـسان، لـە شـاری تـاران، دراوەتـە دەرەوە، جـەنابی مامۆسـتا سـەیید مـستەفای زەمزیـرانـی، مامۆسـتای شـەیدای حـوجرە، و فەقێیایەتـی، لـە لاپـەڕە، (٢٢٦)دا، کـەفو کـوڵێکی زۆر سـۆزدارانەی نـاو دڵـو دەرونـی خـۆیی بەرامبـەر بـە حـوجرە، و دەورانـی فەقێیایەتـی، لـە دێڕی هەڵبەستدا دەربڕیوە، هەم لە بەر گرنگی هۆنراوەکە، و هـەم وەك وەفای خۆیشم بۆ ڕۆڵی حوجرە، و دەورانی فەقێیایەتی، ئەم هۆنراوە شیرینەی (مامۆستا سەیید مستەفای زمزیـرانی)، دەکەمە، دوا وێستگەی ئـەم پەرچـڤەی (الوَجیـز فـِي أُصـوُل الفِقه)ـە، بە کوردی، خوای گەورە پشتیوانی هەموو لایەك بێت.

---

[1] لە (مێژووی ئەدەبی کوردی)، مامۆستا عەلائەددین سەجادی، بە دەسکاریـیەوە وەرگیـراوە.

# حوجرەکەم

ئەی گلێنەی هەردوو چاوم حوجرەکەم
هێزی ئەژنۆم، و هەناوم حوجرەکەم

ئەی هەوێنی سەروەریم و غیرەتم
هەر لە تۆیە ڕێز و ناوم حوجرەکەم

تۆ مەکۆی زانست و دینی و فێرگەمی
تۆم نەبی، بێ دەست و چاوم حوجرەکەم

تۆ لە جێی زانستگەمی، مێژوو دەڵێ:
تۆ نەجاتت دام، لە داوم حوجرەکەم

تۆ دژی هەر ناحەزێکی ئەم گەلەی
بوویتە سەنگەر، جێگە ڕاوم حوجرەکەم

هەر لە تۆ ڕایە کە مێژوو دەسپڕە
لەو حەماسانەی ڕووداوم حوجرەکەم

ڕێبەران و پێشەوایانی گەلم
کاری تۆ بوون، وەك بزاوم حوجرەکەم

زۆر دەمێکە هاوبەشین، و بێ بەشین
وەرگری مافی خوراوم حوجرەکەم

هەروەکوو دایك، لە کۆشت گەرم و گوڕ
پەروەراندت مێشکی خاوم حوجرەکەم

نەیبەزاندین تاڵ و تفتی ڕۆژگار
من بە ڕەنجی تۆیە ماوم حوجرەکەم

تا ئەبەد مەمنوونی تۆم، و چاوەدێر
گەر بە ئامێزت گیراوم، حوجرەکەم

هەردوو لامان، بێ بژێو، ڕامان بوارد
وەك هەتیوی بەر هەتاوم حوجرەکەم

تۆ لە فەرش و مافوران بێ بەش کرای

مـن لە تێشوو، و نان و ئاوم حوجرەکەم

تۆ، کە نیتە خشتی سوور، و بانی قیل

مـن بـە بێ بەرگ و پێلاوم حوجرەکەم

تۆ، کە نیتە پەنجەرە، و دەرکی لـە بار

من وە بەر دەرکـان خراوم، حوجرەکەم

نیتە ئـەندازیار، بڕێژێ نەخشەکەت

من لە "تـاقـی" دابڕاوم، حوجرەکەم

تۆ، بێ دەرك، و بەر بێلایی، و حەوشی چاك

مـن بێ ماڵی هەور و ساوم حوجرەکەم

هێندەی ئەو سینگەی لە دیوارت دران

وا بە تـیـری خەم پێکاوم حوجرەکەم

بارتەقای ڕێژنەی دڵـۆپەی میچەکەت

ئاوی ئەسرین دێ، لـە چاوم حوجرەکەم

هەروەکو قەڵشی دیوار و بـانـی تۆ

لەت لەتە، جەرگ و هـەناوم، حوجرەکەم

خۆ، لە سایەی هەوڵ و تێکۆشانی تۆ

وا گزینگی دا، هـەتـاوم، حوجرەکەم

وا دیـــاره، وردە وردە لێك دەبین

بۆیە خەمگین، داگراوم، حـوجـرەکەم

من بەڵێنت پێ دەدەم، ئەی ماکی بیـر

هەر لە بیـرمی، تاکوو ماوم، حوجرەکەم

گەر شیاوی مـامۆستاییشم نەبێ

پێت دەبەخشم، نـان و ئاوم، حوجرەکەم

تا، نـەفـەوتێ، بارەدان و کۆششت

بۆت دەنێرم، تـازە لاوم حـوجرەکەم

وا بە هیوام، هەر دەگەڵ، تۆ تاکوو سەر

تێپەڕێنم، عــومـــری ماوم، حوجرەکەم[1]

**وصلى الله على سيدنا و نبينا محمد و على آله و صحبه وسلم و الحمد لله رب العالمين**

[1] (فەقێ و فەقێیەتـی لە کوردستان)، نووسینی، (مامۆستا مەلا سەیید مستەفا مەحـموودیان – زمـزیـرانـی)، چاپی یەکەم، ساڵی (١٣٨٢)ـی، کۆچی – هەتاوی، بەرامبەر بە ساڵی (٢٠٠٤)ـی، زاینی، ناوەندی بڵاوکردنەوەی (ئیحسان)، لە شاری (تاران)، ل (٢٢٦)، (٢٢٧)، (٢٢٨).

# ﴿بەرهەمەکانی تری وەرگێڕ﴾

١. کورداندنی (دَلالات النُصوُص، وَ طُرُق أستِنباطِ الأحكام)ى، د. مستەفا زەڵمی.

٢. کوردانـدنـی ﴿الطلاق مرّتان، فِــي تفاسيرِ القرآن﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٣. کوردانـدنـی ﴿خُطُوات الطّلاق، فِــي القُرآنِ الكَريم﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٤. کوردانـدنـی ﴿الطّلاق المُعَلّق، فِــي الشّريعَة الأسلامِيّة﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٥. کوردانـدنـی ﴿الطلاق المقتَرن بِالعَدَد، لا يَقَع بِهِ ألاّ طَلقة واحِدَة﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٦. کـوردانـدنـی ﴿الطّلاق فِــي الـقُــرآنِ الـكَـريم﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٧. کـوردانـدنـی ﴿الطّلاق فِــي الأسلام قَبلَ المَذاهِب﴾ى، د. مستەفا زەڵمی.

٨. (جهوُد الدكتور مصطفى الزلـمي، وَ مَنهجه فِي الدّراسات القرآنية) **ماستەرنامە**.

٩. ژیان و بیـروڕاکانی دکتۆر مستەفا زەڵمی.

١٠. کوردانـدنی کتێبی (الوَجيز فِــي أُصوُل الفِقه)ى، د. عبدالكريم زەيدان.

١١. کوردانـدنی کتێبی (تيسير مُصطلح الحَديث)ى، دکتۆر مَحمود الطَحّان.

١٢. کوردانـدنی (صَحيح مُسنَد أسباب النزوُل)ى، "الشيخ مقبل بن هادى الوادعى".

١٣. کوردانـدنی (هِدايَة المُستَفيد)، دەربارەی زانستی تەجوید.

١٤. کوردانـدنی موناجاتی ئیمامی شافیعی.

١٥. کوردانـدنی، (مَنظومَة أبن فَرَح الأشبيلى)، لە زاراوەکانی فەرموودەدا.

١٦. شـەرحی (أُصـوُلُ الـحَديث)ـی، شێخ (مُحَمّد أفَنـدي البُركَـوي)، لـە زانستەکانی فەرموودەدا.

١٧. شەرحی (نُخبَةُ الفِكَر)ی، ئیبنو حەجەری عەسقەلانی، لە زاراوەکانی فەرموودەدا.

١٨. شـەرحی (نُزهَـةُ النّظَـر)ـی، ئیبنـو حەجـەری عەسـقەلانی، لـە زانسـتەکانی فەرمـوودەدا.

١٩. شەرحی (المَنظومَة البَيقوُنيّة)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.

٢٠. شەرحی عەوامیلی جورجانی. (کورتە شەرح + شەرحی درێژ).

٢١. شەرحی عەوامیلی بورکەوی.

٢٢. شەرحی عەوامیلی مەلا موحسین.

٢٣. شەرحی (المُقدمة الآجرومية). (کورتە شەرح + شەرحی درێژ).

٢٤. شەرحی (الهِدايَة فِي النّحو).

٢٥. شەرحی (مِفتاحُ الآداب)ی، (مامۆستا مەلا عەبدولکەریمی مدرّس)، بە کوردی.

٢٦. شەرحی (الفَوائدالصَّمَديّة)، لە زانستی نەحودا.

٢٧. کورداندنی ﴿أرمغان جوانان﴾ی، مامۆستا مەلا باقری بالك. (نەحو)

٢٨. کورداندنی ﴿شەرحی ئیبن عەقیل – بەرگی یەکەم﴾.

٢٩. کورداندنی (مَتْنُ الأمْثِلَة)، لە زانستی صەرفدا.

٣٠. کورداندنی (صیغ المشکله)، لە زانستی صەرفدا.

٣١. پوختەیەك دەربارەی زانستی ﴿صەرف﴾، (کە لە فارسییەوە وەرمگێڕاوە).

٣٢. کورداندنی پەڕاوی (الأِسلام ، حَقیقتە وَ مُوجباتُە)ی، د. محەممەد عەقلە - ئەردەنی.

٣٣. شەرحی (عُمْدَةُ الطُلاّب)ی، شێخ عباس المدنی الشافعی، لە زانستی ئوصولی فیقهدا.

٣٤. شەرحی (الورقات)ی، ئیمامی حەرەمەین، لە زانستی ئوصولی فیقهدا.

٣٥. کورداندن و ڕاڤەی (الأسئِلَة وَ الأجوبَة فِي أُصوُل الفِقە)ی، مامۆستا مەلا عوسمان عەبدولعەزیز.

٣٦. پوختەیەك دەربارەی زانستەکانی قورئانی پیرۆز، (علوم القرآن).

٣٧. ڕیزبەندی قورئانی پیرۆز، بە گوێرەی باس و بابەتە جیاوازەکان.

٣٨. گوڵچنێ لە گوڵزاری فەرموودەکانی پێغەمبەری ئیسلامﷺ.

٣٩. (حەفتا و سێ فیرقەی جیاواز). دەربارەی دەستە، و تاقمە ئیسلامییەکان، (الفِرَق الاِسلامِيَّة).

٤٠. المُلاّ أبوبکر المُصَنِّف، حیاته ومؤلفاته وآراؤهُ. (بە عەرەبی)

٤١. مەلا ئەبوبەکری موصەنیف، (ژیان، و کتێب، و بیروڕاکانی).

٤٢. چمکێك لە ژیان وکەسایەتی موتەصەویفی مەزن، شێخ عەبدوڵڵای دەمەیوی.

٤٣. تەحقیقی ﴿حەج نامەی کوردی﴾، مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵڵا دەمەیوی.

٤٤. ئامادەکردنی، ﴿دیوانی جەلال﴾، شیعرەکانی: مامۆستا شێخ جەلال، شێخ عەبدوڵڵا دەمەیوی.

٤٥. (نەقشبەند و نەقشبەندییەکان)، پوختەیەکە لە مێژووی شێخانی نەقشبەندیی هەورامان و زانا و پیاوچاکان و مەلا و شاعیرانی موخلیس و هەوادارایان.

٤٦. شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی، و دوو پەیامی عیرفانیی لە لووتکەدا.

٤٧. خوشکم حیجاب خۆش بەختییە.

٤٨. کورداندنی پەڕاوۆچکەی (تەصەووف لە ئاسیای ناوەڕاست)،(کە لە فارسییەوە

وەرمگێڕاوە).

٤٩. لێکۆڵینــەوەی پــەرتووکی (ڕێگــەی ڕەهبــەر)ــی، (مامۆســتا مــەلا عەبدولکەریــمی مدرّس)، لە زانستەکانی فەرموودەدا.

٥٠. لێکۆڵینــەوەی پــەڕاوی (نیکــاح و تــەلاّق – الــهَديّة الــمَحمودِيّة)ــی، مامۆســتا مــەلا باقری بالك.

# وَ صلى الله على سيدنا و نبينا محمد و على آله و صحبه وسلم و الحمد لله رب العالــميــن

عەللامە مامۆستا (نوری فارس حەمەخان) دەربارە به وەرگێڕانی ئەم پەڕتووکە فەرموویەتی:

سوپاس بۆ خودا، لە کوردستانی لانەی ئایینو ژیانو مسوڵمانەتیو کوردایەتیو مەردایەتیو زانست پەروەردا، کۆمەڵێ لاوی خوێنگەرم، و زیرەكو ڕۆشنبیرو بیر ڕووناكو زاناو دانا، بە پێی پێویست، چاکی مەردییان لێ هەڵکردووە، و لە هەموو بوارە باشەکاندا بە قەڵەمە نوورانییەکانیان شاکاری جوان دەڕازێننەوە، و پێشکەشی دەکەن بە جەماوەری سەربەرزی خوا پەرستو ئیسلامدۆستی کوردستان.

جا لەم خاڵەوە، لاوی خامە ڕەنگین: (مامۆستا عەبدوڵڵا مەلا ئەحمەد، ئەحمەدئاوایی)، هەڵساوە بە تەرجەمەی ئەم شاکارە جوانە، شاکاری (الوَجيز فِي أُصُول الفِقه)، و سوپاس بۆ خودا لە زۆر ڕووەوە، گەلێ سەرکەوتووە، و تەوفیقی خودای لەگەڵە، لە ڕاستیدا بۆ ئوصولخوێنی کورد، ئەم وەجیزە کوردییە، دەبێ بە هۆکارێکی کاریگەر بۆ تێگەیشتنی تەواو، لەم زانستە پیرۆزە، کە زانینیو فێربوونیو بەخششی گەورەترین عیبادەتو پەرستشە، خوا بە ڕەحمەتی خۆی بەشی باشمانی تێ بخات، ئامین.

و بەندەی خادیمی زانایانو مەشایخو هەژاران، زۆر ئەم وەرگێڕانەم بە دڵە، و دەستخۆشی لە (م. عەبدوڵڵا) دەکەم، و لە خودای گەورە و مەزن داوا دەکەم، کە نموونەی (مامۆستای زەیدان) و (مامۆستا عەبدوڵڵا) زۆر بێ لە وڵاتا، و دەنگی زوڕنای زوڕناژەنەکانی شەیتان لە هەموو لایێ کپ بێ.

کورت و پوخت بە کوردی پەتی، لە پەسنی ئەم پەڕاوەدا ئەم شیعرە بەسیەتی:

لَخَيْرُ ما يُهْدى إِلـى عَبْدٍ وَفي لِرَبِّهِ، نَظيـرُ ذَا المُصَنَّفِ



لەبڵاوکراوەکانی کتێبخانەی بێخود- سەیدصادق
07501246818

نرخی هەشت هەزار دینار